ژیانی ئەمیری باوەڕداران

خەلیفەی چوارەم

# عەلی کوڕی ئەبو طالیب

خوا لێی ڕازی بێت

نووسینی

دکتۆر علی محمد الصلابی

وەرگێڕانی

مامۆستا عومەر تۆفیق الخطاط

کتێبخانەی نارین

هەولێر

دار المعرفة

بەیرووت

ژیانی ئەمیری باوەڕداران

خەلیفەی چوارەم

# عەلی کوڕی ئەبو طالیب

خوا لێی ڕازی بێت

ژیانی ئەمیری باوەڕداران

خەلیفەی چوارەم

# عەلی کوڕی ئەبو طالیب

## خوا لێی ڕازی بێت


نووسینی

دکتۆر علی محمد الصّلابی

وەرگێڕانی

مامۆستا عومەر تۆفیق الخطّاط



دار المعرفة

بەیرووت

کتێبخانەی نارین

هەولێر

## سوپاسنامەی بەڕێز دکتۆر عەلی موحەممەد الصّلابی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد المرسلين محمد وعلى آله وصحبه وسلّم ، اما بعد فاني اتقدّم الى مكتبة نارين في اربيل –كوردستان العراق بالشكر الجزيل لقيامهم بترجمة وطبع مؤلفاتي الى اللغة الكردية ، كما اتقدم بالشكر الجزيل الى الشاب اليافع نهاد جلال الذي ترجم اول كتبي الى اللغة الكردية (الدولة العثمانية) كما اخص بالشكر الاستاذ عمر توفيق الخطّاط الذي ترجم ثلاثة من كتبي (سيرة ابي بكر الصديق ،وسيرة امير المؤمنين علي بن ابي طالب ، وسيرة عمر بن عبدالعزيز )رضي الله عنهم اجمعين واشكر الاخوة الاخرين الذين ترجموا بقية مؤلفاتي الى اللغة الكردية، وارجو من الله تعالى لهم الموفقية و السلام عليكم ورحمة الله

الدكتور علي محمد الصلابي

## پێشەکی وەرگێڕ

پاش ئەوەی بە کۆمەکی و هاوکاری پەروەردگاری خۆشەویستم توانیم ژیانی دووەمین کەسایەتی ئیسلام پاش پێغەمبەری ئەکرەم (ﷺ) کە ژیانی یەکەمین خەلیفە ڕاشیدی پێغەمبەرمان (ﷺ)- ئەبو بەکری صدیق بوو - ﷺ - وەرم گێڕایە سەر زمانی کوردی و بەڕاستی من ئەوەندە سوودم لێ وەرگرت کە وام دەزانی هەنگاو بە هەنگاو وەك خزمەتکارێکی دڵسۆزو گوێ ڕایەڵ - لەخزمەتی ئەو پیاوە دام و بە شمشێرەکەم لەگەڵ ئەو پیاوە مەزنەدا دژ بە هەڵگەڕاوەکان دەجەنگام و لەگەڵ گریان و فرمێسك ڕشتنەکانیدا منیش چاوەکانم قەتیس مابوون، بەڕاستی ڕێڕەوی ژیانمی گۆڕی و هەموو جارێ لەخۆم دەپرسی ئایا ئێمەی موسڵمانی ئەم ڕۆژگارە چەند پێویستمان بە زانین و لەبەرکردن و چاولێکردنی ژیانی پیاوانی خودا - هاوەڵانی بەئەمەکی پێغەمبەری نازدار (ﷺ)، و ئای لاوەکانمان چەندێ بێ ئاگان لە ئۆقیانوسێك غەفڵەت و بێ ئاگاییدا دەژین کە دوژمنان نەخشەیەکی وایان ڕەخساندووە کە هەر لاوێك ناوی یاریزانە ناودارەکانی جیهان و تیپەکان و مۆندیالەکان نەزانێت، بەگەنجی ئەو سەردەمەی نازانن، بەڵام خوا ئاگادارە خەلیفە ڕاشیدەکان هەوێنی چاك کردنی گەورەو بچووکی کۆمەڵگەکانن، و ژیارەکان زۆر پێویستیان بە داڕشتنەوەی هەموو بۆچوونەکانیانە لەسەر ڕارەوی ئەو پیاوانەی کە هەرگیز مێژوو ناتوانێت وێنەیان دوبارە بکاتەوە. منیش لە خۆشی ئەو چێژو لەزەتە ڕۆحی و مەعریفەیەی لەو کاری وەرگێڕانەمدا دەستم کەوتن دنیای نووسینم بەجێ هێشت، چونکە نووسین لە عەقڵ و مەعریفەتی خۆت لێ دەکەیتەوەو دەیبەخشیت بە خوێنەر، بەڵام وەرگێڕان تێکەڵ بوون و ئاوێتە بوونە لەگەڵ هەست و هەناو و گیان و گوزەران و بانگەوازو خواپەرستی ئەو پیاوە بەرزانەی کە من بەهرەمەند بووم بە وەرگێڕانی ژیانیان بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی.

پاش ئەوەی ژیانی خەلیفەی یەکەم -ئەبو بەکری صدیق- کەوتە بازاڕەوە - لە بەرگێکی جوان و قەشەنگ و لاپەڕەی (شاموا)، کە کاك فائق خاوەنی کتێبخانەی نارین لە شاری هەولێری بە ئەمەك، ئەرکێکی زۆری لەپێناودا کێشا تا ناردی بۆ لوبنان و لە (دار المعرفة) ی بەناوبانگ

چاپی بکات و بەوشێوازە جوانە بکەوێتە بەردەستی خوێنەران. و لەگەڵ کاك أحمد حمە امینی پورزام لە هەڵەبجەی شەهید دوو فاکتەری سەرەکی بوون لە هاندانم بۆ نووسن و وەرگێڕان و زۆریش سوپاس گوزاریانم، و لە خوای زەوی و ئاسمانەکان دەپاڕێمەوە ئەگەر ئەم کارەم خزمەتە بە ئیسلامی عەزیز و پێغەمبەرە نازدارەکەی (ﷺ) و بانگەوازە غەریبەکەی، ئەوا یارمەتیم بدات و تاقەتم پێ ببەخشێت تا منیش لەم سنوورەوە خزمەت بکەم و هەر هیچ نەبێت ڕۆڵەکانمان بە ڕۆشنبیری بهێننەوە و بەڵکو ڕۆژێ بێت -إنشاء الله- ئەم مورووە پچڕاوانە کۆبکاتەوە و لەگەڵ تاریکی و دوور لە خوایدا دەستەو یەخەیان بکاتەوەو پێکەوەو بە هەموومانەوە قورئان بکەینەوە بە چرای ڕووناکی ژیان...

وا ئەم جارەش دەچینە خزمەت خەلیفەیەکی ڕاشیدی تر، کە ئامۆزای نازدارەکەی پێغەمبەری سەروەرمانە (ﷺ)، عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رضي الله عنه).

عەلی (رضي الله عنه) ئەو لەو جۆرە پیاوانەیە کە (وەك کەنز وان) بۆ موسڵمانان بەڵام هیچ یەکێك لە موسڵمانان بەهەموو چین و تایفەکانیانەوە مافی شیاوی خۆیان پێ نەداوەو بەتەواوی نەیان ناساندوە.

لەسەردەمێکدا عەلی (رضي الله عنه) زۆر پێویستی بەوە بوو کە پشتی بگیرێت و هاوکاری بکرێت لە پەڕاندنی ئەو سەردەمە پڕ لە ئاشووبەی پاش شەهید کردنی عثمان (رضي الله عنه) بۆ خەلیفەی نوێ هاتبووە کایەوە بەڵام دۆست و شیعەکانی دەوروبەری لەپاش ئاشت بوونەوەی لەگەل موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان - خوا لە خۆی و باوکیشی ڕازی بێت- ئەوان چاویان بەرایی نەدا کە عەلی (رضي الله عنه) پەروەردەی دەستی پێغەمبەرەو زۆر خۆ بەکەم زان بووەو قبووڵی تەحکیمی کرد لەگەڵیداو ئەوانیش پێیان ناخۆش بوو، ئەویش دەری کردن و ووتی پێیان: ئەی دەرکراوان و ناوی خەوارجیان بەسەردا سەپا.

ئیتر لەو ڕۆژە بەدوا بەبێ ئەوەی خۆی ڕازی بێت قودسیەتێکی وایان پێ دا کە لەبەر چاوی موسڵمانە سادەو ساکارەکان - گەورەترو موبارەکتر بێت - لە هەموو هاوەڵان و بگرە لە پێغەمبەری خوایش و بگرە وایان لێهات هاواری تێ بکەن و لە نەهامەتی یەکاندا بە شمشێرەکەیەوە فریایان کەوێت! و لە حاڵەتی ناڕەحەتیدا بڵێن (یا علی)!! کە پێغەمبەری خوا

(٢٣) ساڵ بە شەو و ڕۆژ بەبێ وەستان، هەوڵی دا تا وای کرد لە مرۆڤەکان هاوار بۆ هیچ کەس و هیچ خوایەك نەبەن جگە لە (الله) نەبێت ..

لەم بەرهەمە تازەیەدا .. بەوردی برای خوێنەر دانیشەو (عەلی) (ﷺ) ئەوە دەهێنێ کە یەك مانگی ژیانتی بۆ تەرخان بکەیت و بیخوێنیتەوە .. سوود گەلێکی زۆرت چنگ دەکەوێت کە خوا دەیزانێت هەموو ڕۆژنامەکان لەم پەڕ بۆ ئەو پەڕ بخوێنیتەوە (عوشرێکی) ئەو کتێبە ناوازەیە بیرت ڕووناك ناکاتەوە..

ئەگەر لەپیاوی قانون ز یاسایی دەپرسیت لەم کتێبەدا سەرسام دەبیت کە بۆچی زانکۆکانی دونیا کۆلێژی یاسا، کارە دادگایی یە پڕ لە دادەکانی (أبو الحسن) ناخوێنن؟!

ئەگەر خواناسی و بەندایەتیت لاوازە .. ئەوا سەرێك بدە لە مزگەوتەکەی کوفەو وا -عەلی- لەناو میحرابەکەدا بەچۆکدا کەوتووەو بەهەردوو دەستی ڕیشی خۆی گرتووە و هاوار دەکات و لە خوا دەپارێتەوە کە لەم نیوەشەوەدا لەم بەندەیەت خۆش ببە!! و دژایەتی دنیا پەرستی دەکات و دەڵێت ئەی دنیا منت بۆ ناخەڵەتێم بڕۆ خەڵکی تر بخەڵەتێنە، ئەی نازانی من سێ بەسێ کەم خستۆتە مشتت؟!.

ئەگەر دەتەوێت بزانیت هاوەڵان هەموویان لەیەك ئاستدان و کەسیان – بێ تاوان و فریشتە ئاسا نەبوون و یەکتریشیان زۆر خۆش ویستووە ئەوا سەیری عەلی بکە (ﷺ)کە چۆن ئەبو بەکرو عومەر لەخۆی بە بەڕێزتر دەزانێت و کچی خۆی دەدات بە عمر و ناوە زیاتر لە (١٥) کەسی بنەماڵەکیان بەناوی ئەبو بەکرەوە ناونابوو .. بە پێچەوانەی ئەوانەی ئەمڕۆ ئیدیعای شوێن کەوتەی عەلی (ﷺ) دەکەن بەڵام لە هەموو جیهاندا یەك منداڵی خۆیان بەو ناوەوە ناونانێن و خۆیشیان بە شوێن کەوتەی عەلی دەزانن!!.

هەروەك چۆن ئەحکامی ((پاشگەزبوونەوە)) ـ الردة ـ و چۆنیەتی بەرەنگار بوونەوەی لە ژیانی ئەبو بەکردا بە کردەوە فێری بووین

هەر بەو جۆرەش لەژیانی عەلیدا (ﷺ) فێری ئەوەمان دەکات کە ئەگەر ناکۆکی و جەنگ لەگەڵ برا موسڵمانەکاندا دروست بوو چی بکەین؟ هەموو مێژوو لەسەر ئەوەن کە خەواریج چ نامەردیەکیان لەگەڵ عەلیدا نواندو سەنگەریان لێ گرت، و عەلیش بۆ پارێزگاری لە هەیبەتی

خیلافەتی ئیسلامی و پەرتەوازە نەبوون لەگەڵیان جەنگا بەڵام چۆن جەنگێك؟ وەك جەنگی بـاوك لەگەڵ جگەرگۆشەی خۆی! هەمیشە دەیفەرموو: بریندارییان مەکوژن! شوێن هەڵاتوانیان مەکەون! بە کافرییان مەزانن! و براماننن و لێمان هەڵگەڕاونەتەوە – إخواننا بغوا علینا – و هەرگیز شوێن کەوتوان و هەوادارانی نەگرتوون و ناڕەحەتی نەکردوون! نەی خستوونەتە ژێر چاودێری! لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا وەك هەموو موسڵمانێکی تر ژیاون و دەری نـەدەکردن و دەسـتی نـەدەگرت بەسەر ماڵ و حاڵیاندا وەك حیزبەکانی ئەمڕۆ بەیەکتری دەکەن ... و لە غەنیمەو دەستکەوت بێ بەشی نەدەکردن و دەشی زانی دژی خۆی بەکاری دەهێننەوە!

لە کۆتاییدا بە وتووێژێکی نێوان خۆم و پیاوێکی شیعە مەزهـەب کۆتـایی بـەم پێـشەکی یـە دەهێنم کە لەسەردەمی خوێندنی زانکۆمدا لە بەغدا ڕووی داوە و واز لە خوێنەر دێـنم تـا خـۆی بکات بەناو گوڵستانی خەلیفەی چوارەمی ئیسلام دا گوزەر بکات و خۆی لەو گوڵزارە شیلە بمژێت و لە خوایش داواکارم هەموو لایەکمان لەو شیلەیە بێ بەش نەکات.

من: ئێمە زۆر عەلیمان خۆش دەوێت و وەك ئەهلی سوننە ڕێزی تایبـەتیمان هەیـە بـۆی (ﷺ)، کابرای بەرامبەرم سەری سوڕماو سەرێکی باداو بە لاقرتێوە لێمـی پرسـی: ئـەی ئەگـەی ڕاسـت ئەکەن و خۆشتان دەوێت بۆچی کردتان بە خەلیفەی چوارەم؟ و منیش وتم: ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خۆشمان ویستووە! ووتی یانی چی؟ ووتم: پێغەمبەری ئەکرەم (ﷺ)خۆشەویست ترین کەس نیە لەلای خوای گەورە؟ ووتی: بەڵێ .. ووتم: دەی چی لێ کەم بۆتەوە کە کردوویـەتی بـە دوایـن پێغەمبەر؟. کابرا ووتی: (صدگ واللە)...

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای ـ عز وجل ـ ئەو کاتانەم بەزایە نەڕوات کە شەوانە تـا ١١-١٢ ی شەو خەریکی وەرگێڕانی بـووم و بیکاتـە مایـەی سـوود و کـەڵك بـۆ خوێنـەران و دڵـی خوێنەرانی بۆ نەرم بکات ئامیـــــن.

وەرگێڕ

عمر توفیق الخطاط

# بەشی یەکەم

## عەلی کوڕی ئەبو طالیب لە مەککەدا:

## جێباسی یەکەم

### ناو و نەژاد و نازناو و ڕەوشت و خانەوادەی:

یەکەم: ناوو شورەت و نازناوی:

١- ناوونەژادی: عەلی کوڕی ئەبو طالیب (عبد مناف)[1] ی کوڕی (عبـدالمطلب)، پێیـان ووتـووە (شیبە الحمد)[2] ی کوڕی هاشم ی کوڕی عبد مناف ی کوڕی قوسەی کوڕی کیلاب ی کوڕی موڕڕە ی کوڕی کەعب ی کوڕی لوئەی کوڕی غالب ی کوڕی فەهری کوڕی مالیك ی کوڕی نەزری کوڕی کەنانەی ی کوڕی خوزەیمەی کوڕی مدرکەی کوڕی ئیلیاس ی کوڕی موزی ی کوڕی نزار ی کـوڕی مەعد ی کوڕی عەدنان.[3]

کوڕی مامی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) لە باپیری یەکەمیدا پێی دەگاتـەوە کـە (عبـدالمطلب) ە، و باوکیشی ناوی ئەبو طالیب ی بـرای عبـدالله ی بـاوکی پێغەمبـەری خوایـە (ﷺ) و عـەلی لـە سەرەتای لەدایك بوونیدا ناوی نرا ـ ئەسەد ـ کە دایکی ئەو ناوەی لێنا و کاتێ باوکی گەڕایـەوە ئەو ناوەی بە دڵ نەبوو بۆیە ناوی نا ـ عەلی ـ[4] بەم شیعرەشدا دیارە ناوی حەیدەرە بووە کە خۆی دەڵێت:

أنا الذي سمتني أُمي حيدرة　　　　كليث غابات كريه المنظرة.[5]

٢- شورەتی: پێیان ووتووە (أبو الحسن) بەناوی کوڕە گەورەکەی (حەسەن) ەوە بوو کە لە فاطمە ی کچی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ). و پێیشیان ووتووە (ئەبو توراب) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئـەم

---

[1] ئەبو طالیب ناوی عبد مناف بووە.

[2] عبد المطلب ناوی (شيبة الحمد) بووە.

[3] الطبقات الكبرى (١٩/٣). صفة الصفوة (١/٣٠٨).

[4] غريب الحديث للخطابي (١٧٠/٢).

[5] الرياض النظرة في مناقب العشرة، لا ٦١٧.

نازناوەی لێنا، و خۆشترین نازناو بوو لەلای خۆی، و هۆکارەکەشی ئەوە بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ سەردان چوو بۆ ماڵی فاطمە ی کچی و عەلی لە ماڵەکەدا نەبینی، فەرمووی: ((أین إبن عمك))؟ واتە ((کوڕەکەی مامت لەکوێ یە))؟ فاطمە یش ووتی: ناکۆکیەك کەوتە نێوان من و ئەوەوە و توڕەی کردم، و خۆیشی لە ماڵ دەرچوو لێرە نەمایەوە، پێغەمبەری خوایش(ﷺ)بە کەسێکی ووت: ((أنظر أین هو))؟ واتە ((ئا بزانە لە کوێ یە))؟ هاتەوە وە ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مزگەوت ڕاکشاوە، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) ڕۆشت بۆ لای و دەبینی ڕاکشاوەو عەباکەی لەسەر شان کەوتۆتە خوارەوە، خۆڵاوی بوو بوو، پێغەمبەریش (ﷺ)دەستی پیا دەهێناو دەیتەکاندو دەیووت: ((قم أبا تراب))[1] واتە ((هەستە ئەی خۆڵاوی)).

و لە ڕیوایەتێکی بوخاریشدا هاتووە دەڵێت: سوێند بەخوا جگە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەس ئەم ناوەی لێ نەناوە.[2]

لە شورەتەکانی تریشی ((أبو الحسن والحسین، أبو قاسم الهاشمي[3]، أبو السبطین)).[4]

٣- نازناوەکانی: (أمیر المؤمنین) ، (رابع الخلفاء الراشدین).

دووەم/ لە دایك بوونی:

ڕیوایەتەکان جیاوازیان هەیە لە دیاری کردنی ساڵی لە دایك بوونیدا، حەسەنی بەسری ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ دەڵێت: پانزە ساڵ تا شانزە ساڵ پێش ئیسلام لە دایك بووە.[5] بەڵام (إبن ئیسحاق) دەڵێت: (١٠) ساڵ پێش هاتنی ئیسلام لە دایك بووە.[6] و (إبن حجر) یش ئەم ڕایە پەسەند دەکات.[7]

---

[1] مسلم في صحيحه ژمارە ٢٤٠٩.

[2] البخاري في صحيحه ژمارە (٤٤١، ٣٧٠٣، ٣٢٨٠).

[3] البداية والنهاية (٢٢٣/٧).

[4] أسد الغابة (١٦/٤).

[5] المعجم الكبير للطبراني (٥٤/١).

[6] السيرة النبوية (٢٦٢/١).

[7] الاصابة (٥٠١/٢).

(الباقر محمد بن علی) دوو ڕای هێناوه: یەکەمیان: وەك ئەوەی (ابن ئیسحاق) ە کە (ابـن حجـر) پەسەندی کردووە، کە (دە) ساڵ پێش هاتنی ئیسلام بووە،[1] و دووەمیان: دەڵێت (٥) سـاڵ پـێش هاتنی ئیسلام لە دایك بووە، و منیش بۆچوونی (ابن ئیسحاق) و (ابن حجر) م پەسەند کردووە کە (١٠) ساڵ پێش هاتنی ئیسلام لە دایك بووە.[2]

(فاکهی) ئەوەی باسکردووە کە (علی) (ﷺ) یەکەمین کەس بووە کە لە ناو کەعبـەدا لـە دایـك بووە، و (حاکم) یش دەڵێت: هەموو هەواڵەکان کۆدەنگن ـ متواتر ـ لەسـەر ئـەوەی ئیمـام علـی (ﷺ) لەناو کەعبەی پیرۆزدا لە دایك بووە.

سێ یەم/ خانەوادەو کاریگەری لەسەر نەوەکانی دواتر:

زانستی لێکۆڵینەوە ئەوەی سەلماندووە کـە بونیـەی لـەش و دەروونناسـی، و ڕەوشـت ناسـی، و کۆمەڵناسی، کاریگەری خۆیانیان هەیە لەسـەر چـاکی و لێهـاتوویی و ڕەوشـت بـەرزی و ووزەو تواناکانی نەوەکانی دوای خۆیان، بەڵام تا ڕادەیەك لە زۆربەی کاتەکاندا، ئەمـەش لە سێ ڕێگەوە دەبێت:

أ- قیەم و ڕەوشتێ کە باو باپیرانی هێشتا پارێزگاری لێ دەکەن و باوەڕی تەواویان پێ یەتی، یان هەوڵیش دەدەن نەوەکانی دوای خۆیان بە جـوانترین شـێوە بیپـارێزن، و بـە گـەورە ڕای بگـرن و بانگەشەی بۆ بکەن، و ئەو کەسەشی لەناو بنەماڵەکەدا لێ ی لابدات و دژایەتی بکات بە نامۆ و لەڕیز دەرچوو سەیری بکەن و قینیان لێی هەستێت، و بەبێ نرخ و ناپیـاو سـەیریان بکـەن و بـە جوڵانەوەیەکی خراپی بدەنە قەڵەم لەگەڵ باو باپیرانیان و لەناو ئەم بنەماڵەیەدا بۆتـە یاسـایەك و لێخۆش بوون نی یە بۆ هەر کەسێك لێ ی لابدات لە وەچەکانیان.

ب- چیرۆك و بەسەرهاتی باو باپیرو گەورە پیاوو ناودارانی ناو خانەوادە کە هەر لە پاڵـەوانێتی و لاوی و سوارچاکی و ناوداری و سەربازی و قبووڵ نەکردنی ناڕەوا و خێرومەندی و دەرماڵ بوون، و پارێزگاری ستەم لێکراو و چەوساوان، کە نەوە لەدوای نەوە بۆ منداڵەکانی خۆیانیان گێڕاوەتـەوەو شانازیان پێوە کردوون، ئیتر بۆ کاتی منداڵی یان لاوی یان پیری. ئەمـەش کاریگەری تەواوی خۆی

---

[1] المعجم الكبير للطبراني (٥٣/١).
[2] فتح الباري (١٧٤/٧).

هەیە لەسەر ژیری و هەست و نەستی ئەو منداڵە، و پێوانەی گەورەیی و پیاوەتی دێتە پشتی و چاکە لەگەڵ باوك و دایك، و پاراستنی ناوبانگی خانەوادەکە کاری دەبێت.

جـ- کاریگەری خوێنی باو باپیران کە دەگوازرێتەوە بۆ ناو دانە دانەی خێزانەکەو هەر بە گەورەیی دەمێننەوە، ئەمەش لە خانەوادەیەکدا کە بیانەوێت پارێزگاری لە ئەسڵ و فەسڵی بنەماڵەکەیان بکەن، هەرچەندە ئەمەش پڕاو پڕ وانی یە، کە ببێتە بنەمایەك و پێچەوانە قبوڵ نەکات وەك سوننەتی خوایی لەسەر زەویدا وەك خوای (عز وجل) دەفەرموێت ((فَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَحْوِيلاً)) "فاگر/٤٣".

بۆ ئەم خاڵی سێ یەمەیە کە پێغەمبەری خوا ئاماژە دەکات و دەفەرموێت ((الناس معادن كمعادن الفضة والذهب، خيارهم في الجاهلية خيارهم في الاسلام اذا فقهوا))[1] واتە: ((مرۆڤەکان کانزان وەك کانزای ئاڵتون و زیو، ئەوەیان لە سەردەمی نەفامیدا چاکترین بوو بێت لە ئیسلامیشدا چاکترین دەبێت ئەگەر لە دینی خوا بەجوانی تێ بگەن)).هەروەك دەفەرموێت ((من بطئ به عمله لم يسرع به نسبه))[2] واتە ((هەرکەسێ لە کردەوەی چاکەدا دوابکەوێت، ئەوە نەژادو باو باپیر پێشی ناخات)).

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێتکە بەپیرۆزی سەیری هەندێ خوێن و بنەماڵە بکرێت، و هەموو سەرکردایەتی دین و دونیا بدرێتە دەستیان، و پێشەوایەتی ئەممەت لەواندا قۆرخ ببێت چ لە لایەنی ڕۆحی و ئاینی و زانستی یەوە، ئێ هەر ئەمەش بوو لە گەلانی پێش ئیسلام پێوەی دەیانناڵاند، و گەندەڵی کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی و دیکتاتۆری و چەوسانەوەی ژێر دەستەکانیان لێ دەکەوتەوە، و کتێبە مێژوویی و شایەتی مێژوو نووسەکان زۆرن لەو بارەیەوە کە چیان بەسەر ئیمبراتۆریەتی ڕۆم و ساسانی و کۆمەڵگەی ئەغریقی و هیندیدا هێناوە.[3]

بۆیە وا جوانە ئاماژەیەك بکەین بۆ ئەو بنەماڵەیەی کە ئیمام علی (ﷺ) تێدا لەدایك بوو، و پەروەردەیش بوو، کە خاوەنی کۆمەڵێ ڕەوشتی بەرزو هەندێ بۆماوەی ڕەوشتی و دەروونی بوون،

---

[1] مسند أحمد (٢٣٩/٢) ئیسنادەکەشی (صحيحه)

[2] مسلم، كتاب الذكر والدعاء والتوبة.

[3] المرتضى ـ ندوي لا ٢٠.

وە چۆن عەرەب بەگشتی بە چاوێکی گەورەوە سەیریان دەکردن و دانیان بە چاکیاندا دەنا، و لە قورەیشەوە دەست پێ دەکەین پاشان بەنیهاشم.

١- هۆزی قورەیش:

عەرەب بەگشتی دان بە بەرزی و گەورەیی و ڕەوانبێژی و ڕوناکبیری و بەخشندەیی و ئازایەتی و سواچاکی قورەیشدا ناوە، و ئەمەش لە ناویاندا بۆتە نموونەو جێگای وتووێژ نی یە.[1]

لەناو یەکدا هاوپەیمانی یەتێکی توندو تۆڵیان هەبوو، و دەستیان گرتبوو بە بڕێکی زۆر لە شەریعەتی ئیبراهیم پێغەمبەر (ﷺ)، و وەك عەرەبە دەشتەکی یەکان نەبوون کە ڕێزیان لە هیچ ئاینێك نەدەگرت، و بە ڕەوشتی بەرزیش خۆیان نەدەڕازاندەوە، ئەمان منداڵی خۆیانیان زۆر خۆش دەویست، حەجیان دەکرد و ئەرکەکانی حەجیان جێبەجێ دەکرد، مردووی خۆیانیان کفن دەکرد، و ئەگەر لەشیان قورس ببوایە خۆیان دەشۆرد، و خۆیان لە ئاگر پەرستی فارس و هیندەکان بە دوور دەگرت، لە ژنهێنانیشدا خۆیان لە خوشك و خۆشکەزاو کچ و کچەزا دەپاراست، ئەمەش بە پێچەوانەی ئاگرپەرستەکانەوە، پاشتر قورئانیش ئەو کارە جوانانەی جێگیر کرد لەناو کۆمەڵگەی موسڵماندا، کچیان بە شوو دەدا بە مارەیی و شایەت و تەڵاقی سێ بەسێ[2]، زیاتر ڕێزداریان لەوە دابوو کە ئەگەر ئەوان ژنیان لە هەر هۆزێك بخواستایە مەرجیان لێ نەدەگیرا، بەڵام ئەگەر ئەمان کچیان بە هەر هۆزێك بدایە مەرجیان لێ دەگرت کە بەرنامەو پرۆگرامیان جێبەجێ بکات و لێ ی لانەدات[3].

٢- (بنو هاشم) لە ناو قورەیش دا هۆکاری پەیمانەکان بوون، و ئەگەر بە ووردی بڕوانینە ئەوەی مێژوو بۆی پاراستووین و زانایانی سیرەت نووسیویانە دەربارەی هەواڵ و بەسەرهاتی (بنی هاشم) کە شتێکی کەمە لە زۆر، بۆمان دەردەکەوێت کە تا چ ڕادەیەك هەستی بەرزی مرۆڤایەتیانتێدابووە، مام ناوەند بوون لە هەموو شتێك دا، و ژیرمەند بوون، باوەڕی پتەویان بەوە هەبوو کە (کەعبەی پیرۆز) گەورەیی یەکی زۆری هەیە لەلای پەروەردگار، و لە ستەمکاری خۆیان

---

[1] السير النبوية، ندوى، لا ٧٤.

[2] بلوغ الادب في معرفة احوال العرب (٢٤٣/١) ئالوسى.

[3] المرتضى ـ ندوى، لا ٢٢.

بەدوور دەگرت، و لە ئاستی هەقـدا لـووت بـەرزیان نەدەنوانـد، و هەمیـشە ورە بـەرز بـوون، و بەبەزەیی بوون لەگەڵ لاوازو ستەم لێکراودا، سەخی بوون، و ئازا بوون، و هەموو ماناکانی (سوار چاکیان) لەناو عەرەبدا تێدا هاتبوویە دی، خاوەنی ژیاننامەیەك بوون كـە لایـەقی بـاو بـاپیرانی پێغەمبەری خودا بێت (ﷺ)، ڕەوشتیان زۆر گونجاو بوو لەگەڵ ئەو بەرنامەیەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) بانگەشەی بۆ دەکرد، بـەڵام ئەوەنـدە هـەبوو لـە سـەردەمی (الفـترە)[1] دا دەژیـان و وەك بـاقی گەلەکەیان بیرو باوەڕی نەفامی زاڵ بوو بوو بەسەریاندا[2]، و بەنی هاشمیش بەئاسانی نەگەیشتبوونە ئەم شوێنەوارە بەرزە مەگەر بە قوربانی دان و بەخشن و بەخشندەیی و خزمەت کدنی خەڵکی.

٣- (عبدالمطلب بن هاشم):

باپیری پێغەمبەری خوا (ﷺ) و علی کوڕی ئەبو طالیب بوو (ﷺ)، و ئەم پیاوە لە هاشم ی باوکی یەوە کاری ئاودان و نان ئامادەکردن بۆ حاجیانی ماڵی خوای پێ سپێردرابوو، و ئەویش بـەجوانی بۆ خەڵکی ساز دەکرد، و ئەوەی باوباپیری بۆ خەڵکی یان دەڕازاندەوە ئەمیش وای دەکرد، و لەناو هۆزەکەیدا ڕێزێکی وای پەیدا کرد کە کەس نەگەیشتبووە ڕێزی ئاوا، و زۆر خۆشەویست و خاتردار بوو لەلایان[3].

خۆ (عبدالمطلب) دەوڵەمەندترین کەسی مەککە نەبوو، یـان بەرپرسـی یەکـەم نـەبوو، وەك چـۆن (قصی) وابوو، وە لەناو مەککەدا پیاوی زۆر هەبوون لەو دەوڵەمەندترو لەو دەسەڵات دارتر بوون، بەڵکو ئەم ڕێزداری ناو هۆزەکەی بوو، چونکە نان و ئاوی حاجیانی خستبووە ئەسـتۆی خـۆی، وە بیری زەمزەم ی بەدەست بوون ئەمەش ڕێزداریەکە پەیوەندە بە کەعبەی پیرۆزەوە،[4]

باوەڕی پتەوی عبدالمطلب بەوەی کە خوایەك هەیەو ئـەم کەعبـە پـیرۆزە دەپارێزێـت و هـەروەها دەروونێکی بەرزو بەڕێز بووە، ئەمەش بەو گفتووگۆو وتووێژەیدا دەردەکەوێت کە لەگەڵ ئەبرەهـە پادشای حەبەشەدا کردی، کە ئەو پادشایە دای بەسەر شـاری مەکـەداو ویـستی سـوکایەتی بـە کەعبەی پیرۆز بکات و لە پلەو مەقامی کەم باتـەوە و دووسـەد حوشـتری عبـدالمطلب ی داگـیر

---

[1] الفترە: ئەو سەردەمەبوو کە زۆر لە سەردەمی پێغەمبەران دوور کەوتبوونەوە.

[2] بلوغ الادب في معرفة أحوال العرب، ئالوسی (٢٤٣/١).

[3] المفصل في تاريخ العرب قبل الاسلام (٧٨/٤)

[4] سيرة ابن هاشم (٤٩/١).

کردبوو، و بۆ ئەو مەبەستە داوای کرد ڕێی پێ بدەن کە بچێتە لای ئەبرەھە، و ئەبرەھەش ڕێز شیاوی خۆی لێ گرت و لەسەر کورسیەکەی خۆی ھاتە خوارەوە بۆی، و لەگەڵ خۆی داینیشاند و دەربارەی پێداویستی پرسیاری لێ کرد، و (عبدالمطلب) یش ووتی: ھەموو پێویستی یەکم ئەوەیە دوسەد حوشتری منت گرتووە بمدەرەوە،

ھەرکە ئەوەی ووت یەکسەر لەبەرچاوی ئەبرەھە کەوت و بە سوك سەیری کرد و پێی ووت: تۆ داوای (٢٠٠) حوشتری خۆت دەکەیت کە من دەستم بەسەردا گرتووە، و بەڵام گوێ بەماڵێك نادەیت کە دینی باو باپیرتەو من بۆ ڕوخاندنی ھاتووم و داوای پاراستنیم لێ ناکەیت؟!

(عبدالمطلب) یش ووتی: من خاوەنی ئەم حوشترانەم، و ئەو ماڵەش خاوەنی خۆی ھەیەو دەیپارێزێت، ئەبرەھەش ووتی: لەدەستی من نایپارێزێت. ئەویش ووتی: دەی ئەوە تۆو ئەوەش ماڵەکە[1].

دەی ھەروایش بوو کە عبدالمطلب ووتی و بە فرت و فێڵی ئەبرەھەو سوپاکەی تەفرو تونا کرد و ماڵەکەی خۆی پاراست. وەك خوای گەورە لە سورەتی (فیل) دا دەفەرموێت ((أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ (٢) وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْراً أَبَابِيلَ (٣) تَرْمِيهِمْ بِحِجَارَةٍ مِنْ سِجِّيلٍ (٤) فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَأْكُولٍ)).

ئەم (عبدالمطلب) ە فەرمانی بە منداڵەکانی دەکرد کە واز لە زوڵم و ستەم بهێنن، و ھانیان دەدات بۆ ڕەوشتی بەرزو وەرگری لێ دەکردن لە کارە ناشایستەکان، و عبدالمطلب لە تەمەنی زیاتر لە (٨٠) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و تەمەنی پێغەمبەرمان (ﷺ) لەو کاتەدا (٨) ساڵان بوو، و دەگێڕنەوە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێکی زۆر بازاڕو دوکان داخرابوو بە بۆنەی ئەو کۆچەوە.[2]

٤- (ئەبو طالیب) باوکی ئیمام عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ):

ئەبو طالیب ساماندار نەبوو، بەڵام (محمد) ی برازای زۆر خۆش دەویست و گۆشکردنی گرتبووە ئەستۆی پاش مردنی باپیری و ھەمیشە لەلای بوو، و لەگەڵیشی بوو،[3] و کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگەوازی خۆی ڕاگەیاند، ھەمو قوڕەیش بەرپوویدا وەستانەوە تەنھا ئەبو طالیب نەبێت کە

---

[1] سيرة ابن هاشم (٤٩/١).

[2] انساب الاشراق لبلاذري لا (٧٨/١).

[3] السيرة النبوية (ابن هشام) (١٧٩/١).

پشتی گرت و بڕیاری دا سەری بخات و پشت گوێ ی نەخات. و ئەمەش غەم و پەژارەی لەلای قورەیشی یەکان دروست کرد، بەجۆرێ پشتی پێغەمبەری خوای گرت و لەگەڵیدا قبوڵی جۆرەها ئەشکەنجەو ئازاری کرد کە مرۆڤ سەرسام دەبێت لەبەردەم پیاوەتی ئەبو طالیب دا کە پاشەڕۆژی خۆی بەست بە پاشەڕۆژی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) و بەوەی کە گەورەی بەنی هاشم بوو توانی (بەنی هاشم و بەنی مطلب) یەکبخات، و بە موسڵمان و کافریانەوە بڕیاری پارێزگاری پێغەمبەری خوا بدەن لە مان ونەماندا،[1]

و ئەبو طالیب توانی پشتی برازاکەی بگرێت و لە جەنگیدا لەگەڵ قورەیش سەری بخات، و بەشیعرە مەزنەکانیەوە توانی بەرەنگاری قورەیش بێتەوە و بیان لەرزێنێ، و کاتێ ئیسلام چووە ناو دڵی هەندێ لە پیاوانی هۆزەکانی ترەوە، قورەیش لەنێوان خۆیاندا ڕێکەوتن نامەیەکیان نووسی و تیایدا بڕیاریان دا کە کەس لەگەڵ (بەنی هاشم و بەنی عبدالمطلب) دا تێکەڵی نەکەن و نە شتیان لێ بکڕن و نە شتیان پێ بفرۆشن، و ئەو نامەیەشیان لەناو کەعبەدا هەڵواسی[2]، و هەردوو هۆزی (بەنی عبدالمطلب و بەنی هاشم) چوونە لای ئەبو طالیب و قبوڵی ئەوەیان کرد لە مەکە دەرچن و بڕۆنە شیوی ئەبو طالیب و بۆ ماوەی سێ ساڵ ئەو برسێتی و سەرماو گەرمایە قبوڵ بکەن کە مەگەر بەدزیەوە کەسێك خواردنی بۆ بهێنایە، تا ئەوە بوو مۆریانە ڕێکەوتن نامەکەی خواردو پێغەمبەریش (ﷺ) ئەبو طالیبی لەو شتە ئاگادار کرد، و ڕۆیشتن و نامەکەیان دڕاندو گەمارۆکەیش هەڵوەشایەوە، و ئەبو طالبیش لە (١٥) ی شەوالی ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتیدا کۆچی دوایی کرد کە لەوکاتەدا تەمەنی لە سەرووی (٨٠) ساڵیدا بووە و موسڵمانیش نەبوو[3]. کە هەر لەو ساڵەیشدا خەدیجەی خێزانی پێغەمبەری خوایش کۆچی دوایی کرد و نەهامەتی یەکان لەسەر پێغەمبەری خوا زیادی کرد و ئەو ساڵەیش بە ساڵی ((خەمباری)) ناونرا.[4]

---

[1] فقه السيرة النبوية ـ غضبان لا (١٨٤).

[2] السيرة النبوية لابن هشام (١/٣٧٣ ـ ٣٧٧).

[3] بلوغ الادب (٣٢٤).

[4] السيرة النبوية لابن هشام (١/٤٥ ـ ٤٦).

**٥- دایکی ئیمام عەلی (ﷺ):**

وە دایکی ئیمام عەلی یەکێك بوو لە ئافرەتە صەحابیە بەرێزەکان کە ناوی (فاطمە ی کچی ئەسەدی کوڕی هاشم) بوو، کە یەکەمین هاشمی بوو لەدایك بوو،[١].

و ئەو خانمە بەختەوەر بوو بە خزمەت کردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە لەسەر وەسیەتی عبدالمطلب لەلای ئەوان مایەوە، کە جێگای دایکی بۆ گرتبوویەوەو بە ئەوپەڕی توانا هەموو پێداویستی و کارەکانی بۆ ئەنجام دەدا، و خۆشەویستمان(ﷺ )نزیکەی (٢٠) ساڵ لەژێر خانەی ئەودا مایەوەو بەدەم بانگەوازی ئیسلامەوە هات و بەو شێوەیە بوو بەیەکێ لەو ئافرەتانەی کە زۆر زوو هاتن بەدەم بانگەوازەوەو، بوو بە یەکێ لەو خوشکە پێشینانەی لە ڕێبازی پاکیزەکیدا هەڵکەوتن، و هەروەك ئەو خوشکە (رضی الله عنها) نموونەی سۆزو میهرەبانی بوو بۆ فاطمە (الزهراء) (رضی الله عنها) کە هەردەم هاوکاری دەکرد لە بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکانیدا وەك چاکەو وەفایەك بۆ زەهراو و باوکی بەڕێزی (ﷺ).

لە ئیمام عەلی یەوە(ﷺ) دەگێڕنەوە کە دەڵێت: ((ووتم بە دایکم تۆ بەس ئاو بێنە و پێداویستی ئامادە بکە و فاطمە یش هەویر شێلان و نان کردن لەئەستۆ دەگرێت)).[٢]

(ابن حجر) یش لە (الاصابة) کەیدا باسی کردووەو دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) دەڵێت ((پێغەمبەری خوا(ﷺ) پۆشاکێکی ڕەنگاو ڕەنگی پێ بەخشیم و فەرمووی پێم: ((اجعلهاخمرا بین الفواطم)) واتە بیکە بە چەند سەرپۆشێك و لەنێوان فاطمە کاندا بەشی بکە)) و منیش کردم بە چوار سەرپۆشەوە و دانەیەك بۆ فاطمە ی کچی پێغەمبەر (ﷺ)دانەیەکی تر بۆ فاطمە ی کچی ئەسەد(رضی الله عنها) - واتە دایکی- و دانەیەکیش بۆ فاطمە ی کچی حەمزە (رضی الله عنها) و چوارەمی ناو نەبرد.[٣]

---

[1] فضائل الصحابة (٢/٦٨٥).

[2] مجمع الزوائد (٩/٣٥٦). رجال السند رجال الصحيح.

[3] الاصابه (٨/٢٧) ذ ١١٥٣.

ئەم فاطمە یە چ لەکاتی ژیانیدا و چ لە ساتە وەختی مردنیشیدا بەختێکی باشی هەبوو، چـونکە ڕێزی تایبەتی هەبوو لەلایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ).[1]
لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە (ﷺ) کە ووتوویەتی: کـاتێ دایکـی عـەلی کـوڕی ئـەبو طالیب ـ فاطمە ی کچی ئەسەد کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە سەر تەرمەکەی و فەرمووی ((رحمك الله يا أمي، كنت أميّ بعد أمي، تجوعين و تشبعينني، وتعـرين و تكـسينني، وتمنعين نفسك طيباً وتطعمينني، تريدين بذلك وجه الله والدار الأخرة)).[2] واتە: ڕەحمەتی خوات لێ بێت دایکی شیرینم، تۆ دایکم بوویت لەدوای دایکم، خۆت برسی دەکرد لەپێناو تێرکردنی مندا و خۆت بێ بەرگ دەکرد لەپێناو پۆشتەکردنی مندا، خۆشیت لەخۆت بڕیبـوو بـۆ مـن و ئەمەشـت لەبەر خاتری خوا و ڕۆژی قیامەت دەکرد.

٦- براکانی ئیمام عەلی (ﷺ):

ئەبو طالیب چوار کوڕی هەبووە ـ یەکەمیان ـ طالـب ـ کە بەو نـاوەوە ناویـانگی دەرکـردووە، و عەقیل و جعفر و عەلی، لەگەڵ دوو کچدا: یەکەمیان (أم هانيء) و (جُمانە) کـە هـەموویان لـە فاطمە ی کچی ئەسەد بوون هەریەکەیان (١٠) ساڵ لەوی تریان گەورەتر بوو.

ئەمەش کورتەیەکە لە ژیانی براکانی:

أ- طالب ی کوڕی ئەبو طالب: لە دوای جەنگی بەدر بە بێباوەڕی مردووە ، و دەڵێن ڕۆیشتووە بۆ جێ یەك و نەگەڕاوەتەوە و بێ سەرو شوێن بووە ، پێغەمبەری زۆر خۆشدەویست و شـیعری زۆری وتووە بە پێغەمبەری خودادا (ﷺ) . و بەناچاریش بەشداری جـەنگی بـەدری کـرد و نێـوان ئـەو قوڕەیش دەمەقاڵێەك ڕووی دا وپێیان ووت : وەڵلاهی ئەی بەنی هاشم چاك دڵنیـاین کـە لەگـەڵ ئێمە دەرچوون بۆ جەنگ بەڵام دڵتان هەر لای محمدە، و طالبیش لەگەڵ چەند کەسێکدا گەڕانـەوە بۆ مەککە .

---

[1] امير المؤمنين علي بن ابي طالب ـ احمد السيد لا (٢٤).
[2] السلسلة الضعيفة للألباني (٢٣/١) ژمارە (٢٣).

ب - عەقیل ی کوڕی ئەبو طالب: ئەبوو زەیدیان پێ دەوت ، و موسڵمان بوونی دواکەوت بۆ دوای فەتحی مەککە، وە دەڵێن لە دوای (صوڵحی حودەیبیە موسڵمان بووە و لە ساڵی (٨) ی کۆچیدا کۆچی کردووە بۆ مەدینە، و لەڕۆژی بەدردا ئەسیر کرا و عەباسی مامی (ﷺ) ئازادی کرد و لە ڕیوایەتە صحیحەکاندا زۆر ناوی هاتووە، و بەشداری جەنگی (مؤتە) ی کردووە و (ابن سەعد) باسی ئەوەی کردووە کە لە فەتحی مەککە و جەنگی حونەین دا بەشداری نەکردووە لە بەر نەخۆشی، و لەسەردەمی خیلافەتی معاویەدا (ﷺ) کۆچی دوایی کردووە لە تەمەنی (٩٦) ساڵیدا.

ج - جەعفەری کوڕی ئەبو طالب: یەکێك بووە لە مەفرەزە سەرەتاییەکانی ئیسلام و دۆستی هەژاران بووە و لەگەڵیان دانیشتووە و خزمەتی کردوون و قسەی خۆشی لەگەڵدا کردوون و کۆچی کردووە بۆ حەبەشە و لەسەر دەستی ئەودا نەجاشی دارو دەستەکەی موسڵمان بوون و لە جەنگی (مؤتە) دا لەولاتی شام شەهید بووە .

د- أم هانئ: کچی مامی پێغەمبەر بوو، دەڵێن ناوی (فاختە) بووە، هەندێکیش دەڵێن ناوی (هند) بووە، بەلاّم فاختە مەشهورترە، یەك کوڕی هەبووە بە ناوی (عەمر) ولەفەتحی مەککەشدا دوویت پەرستی داڵدە داو پێغەمبەری خواش فەرمووی: (( أجرنا من اجرتِ یا أم هانئ)) واتە: داڵدەمان دا ئەو کەسانەی تۆ داڵدەت دا ئەی دایکی هانی، ولەپێغەمبەرەوە فەرموودەی گێراوەتەوە لەپاش عەلیش (ﷺ)هەرژیا[1].

هـ - جومانەی کچی ئەبو طالب: ناوی (أم عبد) کوڕی ئەبوو سوفیانی کوڕی حارث ی کوڕی عبدالمطلب، و( ابن سعد) دەڵێت لە ئەبو سوفیان کوڕێکی بوو ناوی (جەعفەر) بوو،پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خەیبەردا (٣٠) ویسق ی خورمای پێبدا .[2]

٧ – خێزانەکانی و منداڵەکانی :

لە فاطمە ی کچی پێغەمبەرمان(ﷺ).( حەسەن و حوسەینی بوو، (ﷺ) وە زەینەب و أم کلثوم ی بووە و تا لەژیاندا بووە ژنی بەسەردانەهێناوە.و لە خەولەی کچی جەعفەری کوڕی قەیس و

[1] الأصابة في تمیز الصحابة ( ٩\٣١٧-٣١٨) .
[2] هەمان سەرچاوە (٤/٢٥٩- ٢٦٠).

کوڕێکی بوو بەناوی محمدی گەورە کەبە ( محمد بن الحنیفە) ناوبانگی دەرکردووە)وله (لەیلای کچی مەسعود ی بەنی تەمیم عبدالله و ئەبوبکری بووە، لە أم البنین کچی حیزام یش : عەباسی گەورەو عثمان و جەعفەری گەورە و عبدالله ی بووە.

وله ئەسمای کچی حومەیش: یەحیا و عەونی بووە.[1]

وله (صهباء) یش عومەری گەورەو روقیەی هەبووە.

وله ( ئومامەی کچی عاصیش – محمدی ناوەنجی بووە .

وله ( أم سعید کچی عروه الثقفی) یش ( أم الحسن و رملەی گەورەو أم کلثوم ی بچوك و فاطمەو ئومامەو خەدیجە و أم زینب ی بچوك و ام سلمه و أم جعفرو جومانه و نەفسەی بووە) .

لە موحیاتی کچی ئومرؤء القیس یش کچێکی بوو بەلاّم نەما . وإبن سەعد دەڵێت لەم منداڵانه زیاتر هیچ منداڵێکی تری نەبووە . کە بەهەموویانەوە (١٤) کوڕو (١٩) کچی بووە.

٨- شێوازی عەلی کوڕی ئەبوو طالب (ﷺ):

(أبن عبدالله ) ڕەحمەتی خودای لێبێت دەڵێت : جوانترین شێوازی پیاوانێك من بە دڵم بـوبن لـه عەلی کوڕی ئەبو طالبدا (ﷺ): ئەوەیە کە پیاوێکی مام ناوەندی نزیك ی کورتە باڵیی بووە.

(أبعم العینین) و ڕومەت جوان بە جۆرێ وەك مانگ وا بووە لە شەوی بەدردا، ورگی گەورە بووە، وناوشان پان بووە، و دەستی زۆر گەورە بووە، گەردنی وەك مەسینەی زیووابوە،سەری –ئەسلەع- بوو،واتە تەنها پشتی سەری مووی پێوە بووە، وریشی زۆر گەورە بـووە، بـەرزی یـەك لەشـانیدا هەبووە وەك گورش خواردنەوەی شێرو پڵنگ وابووە، و قۆڵ و بـاڵی لەیـەك جیـا نەدەکرایـەوە و پێکەوە نوساوبوون، ئەگەر دەستی کەسێکی بگرتایە – ئەوەندە ئازاری پێدەگەیشت خەریك بـوو هەناسە نەدات ، لە قەڵەوی یەوە نزیك بووە، و کاتێ بچوایە بۆ جەنگ بە هەروەلـە دەچـوو، زۆر بەهێز و دڵ ئەستوور بوو.[2]

---

[1] البدایة و النهایة ( ٧ / ٣٣٢)

[2] الأستیعاب في معرفة الأصحاب ( ٣ / ١١٢٣).

## جێباسی دەووەم

## موسڵمان بوونی و گرنگترین کارەکانی لە مەککە لەپێش کۆچدا:

**یەکەم: موسڵمان بوونی:**

لە بەخششەکانی پەروەردگار بەسەر عەلی کوڕی ئەبو طالیبە وە (ﷺ) و نیازی خێرو چاکەی پێی ئەوەبوو قوڕەیش توشی قەیرانێکی ئابووری هات، ، ئەبو طالیبیش خاوەنی ماڵ و منداڵێکی زۆر بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە عەباسی مامی ووت ـ کە وەزعی مادی لە هەموو بەنی هاشم باشتر بوو ـ: ((يا عباس ان أخاك، أبا طالب كثير العيال وقد ترى ما اصاب الناس في هذه الازمة، فانطلق بنا فلنخفف عنه عياله، آخذ من بيته واحداً وتأخذ واحداً، فنكفيهما عنه))

واتە ((ئەی عەباس، ئەبو طالیبی برات خێزانێکی زۆری کەوتووە بەسەردا، خۆیشت دەزانیت خەڵکی تووشی چ قەیرانێك بووە، با پێکەوە بڕۆین و کەمێ لە منداڵەکانی لەسەر سووك بکەین و من دانەیەك دەبەم و تۆش دانەیەك لە منداڵەکانی بەرە بۆ لای خۆت، و لەکۆڵی ئەوی بکەینەوە)).

عەباسی مامیشی ووتی: بەڵێ باشە، و چوون بۆ لای ئەبو طالیب و پێیان ووت: نیازمان وایە لەم وەزعە گرانی یەدا کە تووشی خەڵکی بووە هەندێ لە منداڵەکانت بگرینە ئەستۆ تا وەختێ وەزع باش دەبێتەوە، و ئەبو طالبیش پێی ووتن: بەس عەقیلم مەبەن، کێ دەبەن بیبەن، و پێغەمبەری خوایش (ﷺ)عەلی گرتە ئەستۆ و عەباسیش جەعفەری بردە لای خۆی، ئیتر لەو ڕۆژە بەدوا عەلی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ)دەژیا تا هاتنی ئیسلام و عەلیش (ﷺ) شوێنی کەوت و باوەڕی پێکرد و جەعفەریش لەلای عباس مایەوە تا موسڵمان بوو، ئەویش وازی لێ هێنا[1]،

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەك وەفایەك بۆ ئەو گرتنە ئەستۆ و خزمەتگوزاریەی ئەبو طالیب بۆی لەپاش مردنی (عبدالمطلب) و ئەمەش گەورەترین بەخششی خوا بوو بەسەر عەلی یەوە (ﷺ)، کە بەو جۆرەی پەروەردەکرد کە خوای گەورە ئەوی پەروەردە کردبوو، و کە هەموو ڕەوشتی قورئانی بوو، و ئەم پەروەردە جوانەش لە عەلی دا ڕەنگی دایەوە

[1] السيرة النبوية (٢٤٦/١) ابن هشام.

(ﷺ). و بەسیشە پەروەردەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ عەلی (ﷺ) کە لەماڵی ئیسلامدا گەورەبوو، و هەر لەسەرەتای هاتنی ئاینی نوێ وە شارەزای هەموو نهێنی یەکانی بوو، و بۆیە هەر پێش ئەوەی بانگەواز لە سنوری ئەو ماڵە دەربچێت و بەدوای دۆست و پشتیواندا بگەڕێت و خەڵکی لە تاریکی یەوە بەرەو ڕووناکی بەرێت، عەلی (ﷺ) موسڵمان بوو، تەنانەت زانایان لەوەدا جیاوازیان هەیە کە پاش (خەدیجەی گەورە) (رضی الله عنها) کێ دووەم کەس موسڵمان بووە؟ ئایا ئەبو بەکر بووە؟ یان عەلی (ﷺ)؟ بەڵام ئەوەی زۆربەی زانایانی لەسەرە ئەوەیە کە لەپیاواندا ئەبو بەکر بووە (ﷺ)، و لە منداڵانیشدا عەلی (ﷺ) و لە ئافرەتانیش خەدیجەو لە بەندەکانیش دا زەیدی کوڕی حارثە یەکەمین کەس موسڵمان بوو - خوا لە هەموویان ڕازی بێت[1]، ئا بەم جۆرە عەلی یەکەمین لاو بوو هاتە ڕیزی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە.

دووەم: عەلی (ﷺ)چۆن موسڵمان بوو؟

(ابن اسحاق) دەگێڕێتەوە کە عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ) هات بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبینێ لەگەڵ خەدیجەی خێزانیدا پێکەوە نوێژ دەکەن، ووتی: ئەمە چی یە ئەی مەحەممەد (ﷺ)؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ((دین الله اصطفاه لنفسهِ، وبعث به رسله، فادعوك الى الله وحده والى عبادته وتكفر باللات والعزى)) واتە ((ئاینی پەروەردگارە بۆ خۆی هەڵیبژاردووە و پێغەمبەرانیشی بۆ ڕەوانە کردوەو منیش بانگت دەکەم بۆلای خوای تاك و تەنها و بۆ پەرستنی و باوەڕپیشت بە لات و عوزا نەمێنێ)).

عەلیش (ﷺ) ئەو شەوە مایەوەو پاشان خوای گەورە خۆشەویستی ئیسلامی خستە دڵیەوەو بەیانیەکەی تا لای پێغەمبەری خوا نەوەستاو پێی ووت: ئەوە چی بوو بۆت باس کردم ئەی موحەممەد؟پێغەمبەریخوا(ﷺ) فەرمووی پێی ((تشهد الّا الـه الا الله وحده لا شريك لـه وتكفر بالات والعزى وتبرأ من الانداد)) واتە ((شایەتی بدە کە هیچ خوایەك نی یە جگە لە (الله) نەبێت کە تەنهایەو هاوبەشی نیە و باوەڕپیشت بە لات و عوزا نەمێنێ و لە هاوبەش پەیداکردن خۆت

[1] البداية والنهاية (٣/٢٦- ٢٨).

بەری بکەیت و عەلیش (ﷺ)وای کردو موسڵمان بوو، و لەوکاتە بـەدوا بـەدزی ئـەبو طالیبـە وە سەردانی پێغەمبەری دەکرد و موسڵمان بوونی خۆی بەنهێنی هێشتبوویەوە.[1]

سێ یەم: نێوان عەلی و ئەبو طالیب:

(ابن اسحاق) دەڵێت: هەندێ لە ئەهلی عیلم باسی ئـەوەیان کـردووە کـە هـەرکاتێ کـاتی نوێـژ بهاتایەتە پێشەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و عەلیش بەدزی باوکی یەوە بەرەو شـیوەکانی مەککـە دەڕۆیشتن و نوێژیان دەکرد و ئێوارانیش هەر بەو شـێوەیە دەڕۆیـشتن بـۆ نوێـژ لـەناو کێوەکـانی مەککەدا، تا ئەوەبوو ڕۆژێکیان ئەبو طالیب چوو بەسەریانا دەبینێ نوێژ دەکەن،

لە پێغەمبەری پرسی: ئەی برازای خۆم ئەم دینە چ دینێکە کە خەریکیتی؟ ئەویش فەرمووی ((اي عمّ، هذا دين الله ودين ملائكته ودين رسله ودين أبينا إبراهيم)) واتە ((بەڵێ مامی خۆم، ئەمە ئـاینی خوایـەو ئـاینی فریـشتەکانیەتی و ئـاینی پێغەمبەرانیـەتی و ئـاینی باوکـە گـەورەمان ئیبراهیمە)).

یان فەرمووی ((بعثني رسولاً الى العباد وأنت ـ أي عم ـ أحق من بذلت له النصيحة، ودعوته الى الهدى، واحق من أجابني اليه وأعانني عليه)) واتە ((خوا ناردوومی بۆ هەموو خەڵکی و تۆش ـ ئەی مامە ـ لەهەموو کەس شایانتری چاکەی تۆم بوێت و بۆ ڕێگـای ڕێنمـایی بانگـت بکـەم، و تۆش لە هەمووان شایانتری کە بێیت بەدەممەوە و یارمەتیم بدەیت.

ئەبو طالبیش پێی ووت: ئەی برازای خۆم، من ناتوانم لە ئاینی باو باپیرانم دەست هەڵبگرم، بەڵام ناهێڵم یەك کەس بچوکترین ناخۆشی بێنێتە ڕێگات تا ماوم. دەڵێن بە عەلیـشی ووتـووە: ئـەی کوڕی خۆم ئەمە چ ئاینێکە تۆ شوێنی کەوتوویت؟ و ئەویش لە وەڵامدا ووتی: بەوکە گیان باوەڕم بەخوا و پێغەمبەرەکەی هێناوەو باوەڕم کردووە بەو پەیامەی هێناویەتی و لەگەڵیدا نوێژم کردووە شوێنی کەوتووم، دەڵێن پێی ووتووە: محمد هەرگیز بـۆ شـتی چـاك نـەبێت بـانگی نـەکردوویت، بەردەوام بەو دەستی پێوە بگرە.[2]

---

[1] هەمان سەرچاوە (٣/٤).

[2] السيرة النبوية (ابن هاشم) (١/٢٤٦).

چوارەم: ئایا عەلی (ﷺ)لەگەڵ پێغەمبەردا لە مەککە بتەکانی شکاندووە؟

لە عەلی (ﷺ) دەگێڕنەوە کە ووتوویەتی: من و پێغەمبەری خوا نەوەستاین تا ناوەڕاستی کەعبە و پێغەمبەر (ﷺ) پێی ووتم (دانیشە) و ویستی بچێتە سەر شانم و منیش ویستم بەرزی بکەمەوە، بەڵام هەستی کرد کە من ناتوانم بەرزی بکەمەوە، بۆیە دابەزی و دانیشت بۆم و پێی ووتم: ((اصمد علی منکبي)) واتە ((بچۆرە سەر شانم))، و منیش چوومە سەر شانی و بەرزی کردمەوەو لە خەیاڵی خۆمدا وام دەزانی بەرەو ئاسمانەکان بەرزم دەکاتەوە، و بەرزی کردمەوە تا ئاستی کەعبە، دەبینم بتێکی زەرد یان مسی لێ یە و منیش بەلای راست و چەپدا دەستم وەشاند تا دەستم گەیشتە بتەکەو گرتم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ووتم: فڕێ دە خوارەوە، و منیش هەڵم دایە خوارەوەو وەکو شووشە ووردو خاش بوو، و پاشان دابەزیم، و من و پێغەمبەری خوا بە پەنا پسکێ خۆمان کرد بەناو کۆڵانەکاندا و لەبەر چاو وون بووین لەترسی ئەوەی نەوەك یەکێ بمان بینێت[1]. هەرچەندە ئەم بەسەرهاتە لەلایەن کۆمەڵێ لە زانایان لاوازە چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەردەمی مەککیدا هەوڵی داوە ڕووبەڕووبوونەوە ڕوونەدات لەگەڵ بێ باوەڕاندا و کارەکەی بە نهێنی بپارێزێت تا ڕۆژی خۆی، کە ئەوەبوو لەپاش فەتحی مەککە کەعبە بەتەواوی لە بت پاك کرایەوە.

پێنجەم: ئایا عەلی (ﷺ) لەسەر ئامۆژگاری پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو طالیب ی ناشت:

لە ئیمام عەلی یەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە: کە هاتووە بۆلای پێغەمبەری خوا و پێی ووتووە: ئەبو طالب مرد، پێغەمبەری (ﷺ) پێی فەرموو ((اذهب فواره)) واتە ((برۆ بینێژە))، عەلی ووتی: دەی بە بت پەرستی مردووە، دیسان پێی فەرموو ((برۆ بینێژە))، دەڵێ: کاتێ لە ناشتنی بوومەوە،هاتمەوەبۆلایپێغەمبەر(ﷺ) و پێی ووتم: ((اغتسل)) واتە ((خۆت بشۆ)).

لە ڕیوایەتێك تردا پێی فەرمووە ((اذهب فاغتسل ثم لا تحدث شيئاً حتى تأتيني)) واتە ((برۆ خۆت بشۆرە و پاشان هیچ باس مەکە تا دێیتەوە لام)). ئیمام عەلی (ﷺ) دەڵێت: خۆم شت و پاشان هاتمەوە خزمەتی و چەند دوعایەکی خێری بۆ کردم کە لە سوورە ووڵاخ و ڕەشە ووڵاخ

[1] صحیح المسند في فضائل الصحابة لا ١٨٨، و (مصطفى العدوي) دەڵێت: حەدیسێکی حەسەنە بەهەموو ڕێگاکانیەوە.

خۆشتر بوون لام. یەکێ لە ڕاویەکان کە ناوی (عبدالرحیم السلیمی) یە دەڵێت: لەسەر ئەمە عەلی (ﷺ) هەرکاتێ مردویەکی بشۆردایە دوا بەدوای ئەو خۆی دەشۆرد.

شەشەم/ هەستی پاراستنی ئاسایش لەلای ئیمامی عەلی (ﷺ)و بردنــی ئــەبو زەر (ﷺ) بــۆلای پێغەمبەر(ﷺ):

یەکێ لــە نیــشانەکانی قۆنــاغی مــەککی ـ کــارکردن بــوو بــەنهێنی و خــەباتی ژێرزەمینــی، و شاردنەوەی تەنانەت لە نزیکترین کــەس، و فەرمانــەکانی پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) زۆر ئاشــکراو ڕاشکاوانە باسی لە نهێنی پارێزی دەکرد.و ئیمام عەلی (ﷺ)ڕۆڵێکی زۆر گەورەی بینی لە بردنی (أبو ذر الغفاري) (ﷺ) بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وە ئەم (أبو ذر) ە هەڵس و کەوتی نەفامی زۆر پێ ناخۆش بوو، و هەرگیز بتی نەدەپەرست، هەرکەس هاوەڵی بۆ خــوا دابنایــە سەرزەنــشتی دەکرد، و سێ ساڵ پێش موسڵمان بوونی دەستی کردبوو بەنوێژ بۆ خوابــەبێ ئــەوەی قیبلەیــەکی هەبێت، کە وادیارە لەسەر ئاینی حەنەفی ئیبراهیمی بووە، هەرکە هەواڵی پێغەمبەرایەتی محمدی بیست ـ خۆی گەیاندە شاری مەککە، و حەزی نەدەکرد هەواڵی بپرسێت، تا هات و بۆخۆی لەوێ ڕاکشا، و ئیمام عەلی (ﷺ) بینی کە غەریبەخولکی کرد بۆ میوانداری و هیچیشی لێ نەپرسی، و لەبەیانی ڕۆژی داهاتوودا ڕۆشتەوە بۆ کەعبەو لە ئێوارەکەیدا ئیمام عەلی (ﷺ) بینــی یــەوەو میوانداری کردەوەو بەم شێوەیەش شەوی سێ یەمیش ڕابورد، پاشان هۆی هاتنی بۆ مەککەی لێ پرسی، و کاتێ ئەبو زەریش زانی کەسێکە جێی متمانەیە پێی وت: من هاتووم تــا پێغەمبــەری خوا ببینم.

ئیمام عەلیش (ﷺ) پێی ووت: ئەو لەسەر هەقە، و پێغەمبەری خوایە (ﷺ) ئەگەر ڕۆژ بوویــەوە بەدوامدا وەرە، و ئەگەر ترسام پێت بزانن خۆم وا نیشان دەدەم ئاو دەڕژێنم، و ئەگەر لەچــاو وون بووم شوێنم کەوە، و ئەویش شوێنی شوێنی کەوت و پێغەمبەری خوای بینی و گوێ ی گــرت بــۆ فەرموودەکانی و پاشان موسڵمان بوو، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) پێی فەرموو ((إرجع الی قومك فاخبرهم حتی یأتیك أمري)) واتە ((بڕۆرەوە بۆ ناو هۆزەکــەت و هــەواڵی منیــان پــێ بگەیەنــەو چاوەڕوان بە تا فەرمانی منت بۆ دێت)).

(أبـو ذر) یش (ﷺ) ووتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منـی بەدەسـتە، ئەڕۆمـە ناوەڕاسـتی بـیّ باوەڕان پڕ بەدەم هاوار ئەکەم، و ئەوە بوو خۆی گەیاندە ناوەڕاسـتی کەعبـەو بەهـەموو توانـای هاواری کرد" ((أشهد أن لا اله الّا الله وأن محمداً رسول الله)) ـ خەڵکی پەلاماریان داو خـستیانە ژێر پیّ لەقە، بەڵام عەباسی کـوڕی عبـدالمطلب هـات و پێـی ووتـن: بـەنی غـەفار تۆڵـەتان لیّ دەکەنەوەو ڕیّ بەکاروانی بازرگانی یەکانتان دەگرن کە بەناو هۆزەکەی ئەواندا تیّ دەپەڕێت بەرەو شام و ڕزگاری کرد لە دەستیان[1].

ئەم ( أبو ذر) ە پێش هاتنی خۆی بۆ مەککە برایەکی خۆی ناردبووبۆ سـۆراغی ئـەو پێغەمبـەرە تازەیەو بچێتە لای و گویّ ی بۆ بگرێت، و براکەشی هات بۆ مەککەو گویّ ی گرت بۆ ووتەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پاشان گەڕایەوە لای (أبو ذر) ی برای و پێی ووت:بینیم کە فـەرمانی بـە چاکەو ڕەوشتی بەرز دەدا، و ووتەیەکیشی دەخوێندەوە لە شیعر نەدەچوو، (أبو ذر) یش پێی ووت: ئەوەی لە دڵی مندا بوو تەواو بۆت نەکردم، و بۆیە هەوڵی دا بەخۆی سۆراخی پێغەمبـەری خـوا بکات (ﷺ )و براکەشی پیّ ی ووت: زۆر ئاگات لەخۆت بێت چونکە خەڵکی مەککە زۆریان ڕق لیّ یەتی و دژایەتی دەکەن.

## هەندیّ پەندو وانەی گرنگ لەم بەسەرهاتە:

١- پەلە نەکردن و شێنەیی بۆ دەستکەوتنی زانیاری، بەجۆریّ (أبو ذر) دەزانێـت قـوڕەیش پێـی قەڵسە هیچ کەسیّ قسە لەگـەڵ محمـد دا بکـات، و ئـەم پەلـە نەکردنـەش هـەڵس و کـەوتێکی ئاسایشیانەیە کە کاتەکە ئەوەی دەخواست، چونکە ئەگەر هەواڵی بپرسیایە ئەوا قوڕەیش پێیـان دەزانی، دواتریش توشی چەندان ئازارو ناڕەحەتی و دەرکردن دەبوویەوە و نەیدەتوانی ئەو ئامانجە بپێکیّ کە لە پێناویدا هاتووەو هەموو خزم و کەس و هۆزی بۆ بەجیّ هێشتووەو جۆرەها ناڕەحەتی لەپێناودا چەشتووە و ڕێگای دووری بۆ بڕیوە.

٢- ئیحتیات کردن و ئاگاداربوون لەوەی بچووکترین زانیاریت پیّ بدرکێنن، ئەوەتا کاتیّ ئیمامی عەلی (ﷺ) پرسیاری لیّ دەکات لە هۆی ئەم هاتنەی بۆ مەککە، ئەو هەر هیچی پیّ ناڵێت کـە لەگەڵ ئەوەشدا (٣) ڕۆژیشە لە ماڵەکەیدایە و نانی ئەو دەخوات، یـان پـێش ئـەوەی پێـی بڵـیّ

[1] صحيح البخاري (فتح الباري) (١٧٣/٧).

مەرجی لێ دەگرێت کە لای کەس باسی نەکات، و لەهەمان کاتیشدا رێ ی پێ نیشان دەدات، ئەوەش ئەوپەڕی پارێزگاری نهێنی یە ومەبەستەکەشی هاتەدی.

٣- ئاگاداری مەسەلەی ئەمنی تەنانەت لە جم و جۆڵیشدا: ئەوەبوو ئیمام عەلی (ﷺ) و (أبو ذر) لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە بەئاماژە، یان جوڵەی تایبەتی پەنجە بڕۆن بۆ ئەوێ، وەك ئەوەی دانەوێتەوە نەعلەکانی چاگ بکات یان وابزانێت ئاو ئەڕژێنێت، ئەوەش لە حاڵێکدا کە بیزانیایە یەکێ سەیریان دەکات و دەیان بینێت. ئەم کارەش زۆر گرنگە لەکاتی ڕۆشتن بەرەو بارەگای گشتی کە ماڵی (ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم) بوو، یان ڕۆیشتنی ئیمام عەلی (ﷺ) لەپێشەوەو ئەبو زەریش لە دوایەوە بڕوات و ماوەیەك لەنێوانیاندا هەبێت، ئەمەش ئەوەك لەکاتی ڕۆیشتنیاندا شتێك ڕوویدات و پێیان بزانرێت.

٤- ئەم کارە ئەمنی یەی کە هاوەڵان بەوردی ڕەچاویان کردووە لەلایەنی ئەمنی یەوە بەڵگەیە لەسەر پێشکەوتنیان لەم بوارەدا و تا چ ڕادەیەك هەستی پاراستن و ئاسایشیان تێدابووە. تا وایان لێ هاتبوو ئەم مەسەلەیە تێکەڵ بوو بوو بە هەموو ژیانیان و لەهەموو کارێکی بانگەواز یان شەخسی خۆیاندا جێ بەجێیان دەکرد، و هەموو هەنگاوەکانیان دووربین و نەخشە بۆکێشراو بوو. دەی ئێمەش ئەمڕۆ زیاتر پێویستمان بەو هەستە ئەمنی یە هەیە کە لەلای هاوەڵان هەبووە خوایان لێ ڕازی بێت، بەتایبەت پاش ئەوەی مەسەلەی ئەمن ئەمڕۆ گرنگی یەکی گەورەی هەیە لە مانەوە یان لەناوبردنی دەوڵەت و شارستانیەتەکان و بەهێزی و لاوازیان، و وای لێ هاتووە قوتابخانەی تایبەتی بۆ کراوەتەوە و هۆکارو شێوازەکانی ڕوون کراوەتەوە و ئەمڕۆ بودجەی زۆر گەورە دیاری دەکرێت بۆ دەزگا ئەمنی یەکان، و ئەمڕۆ کڕینی هەواڵ گرانترین بەهای هەیە و زۆر جار خەڵکی گیانی خۆیان دادەنێت لەپێناو بەدەست هێنانیدا.

کەواتە مادەم ئەم بوارە ئەوەندە گەورەیە، شایانە ئێمەی موسڵمانیش گرنگی پێ بدەین تا هەموو مەسەلەکانمان لە هەموو زارێکدا نەبن و نهێنی یەکانمان دەستاو دەست نەکات[1].

[1] دروس في الكتمان ـ محمود شيت خطاب ـ ل ٩.

حەوتەم: ئیمامی عەلی (ﷺ) لەگەڵ پێغەمبەری خـوادا (ﷺ) بەسـەر هۆزەکانـدا دەگـەڕێت و ئامادەی ئەو ڕێکەوتننامە بوو کە لەگەڵ ـ بەنی شەیباندا ـ بەسترا:

ئەبانی کوڕی تغلب لە (ابن عباس) ەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێـت: عـەلی کـوڕی ئـەبو طالیـب بـۆی باسکردم و ووتی: کاتێ خوای گەورە فەرمانی دەرکرد بۆ پێغەمبەرەکەی کە بانگەوازەکەی بخاتـە بەردەستی هۆزەکان، و ئەویش کەوتە ڕێ و من و ئەبو بەکریش بەرەو (منی) لەگەڵی ڕۆیـشتین و گەشتینە یەکێ لە دیوەخانەکانی عەرەب و ئەبوبەکر پێش کەوت و سڵاوی لێ کردن، کە ئەبو بەکر لەهەموو کارێکی خێردا لەپێشەوە بوو، و پیاوێکی نەژادناس بوو، ... تا دەڵێت: پاشتر خۆمـان گەیاندە دیوەخانێکی تر، کە نیشانەی ڕێزو ویقاریان پێوە دیاربوو، و ئەبو بـەکر پـێش کـەوت و ووتی: ئەم هۆزە کێن؟ ووتیان: (شیبان بن تغلبـە)، لەم کاتەدا ئەبو بەکر (ﷺ) لای کردەوە بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ووت: بە دایك و باوکەوە بەقوربانتن بم، ئەمانە ژێرمەندەکانی خەڵکن، و (مەفروق) یان لەناودایە لە جوانی و زمان پاراویدا کەسی ناگاتێ، دوو پەلکـەی درێـژی هەیـە دەگەنە ناو شانەکانی، و لە ئەبو بەکرەوە نزیك بوو، ئەبو بەکر (ﷺ) پێی ووت: ئێـوە ژمارەتـان چەندە؟ مەفروق ووتی: لە هەزار زیاترین و هەزاریش لەبەر کەمی ناشکێت ... و ئەبو بەکر لێـی پرسی: بەرگری کردن چۆنە لەناوتاندا؟ مەفروق ووتی: توڕەترین کاتمان ئەو کاتەیـە بـە دوژمنـان دەگەین، ناڕەحەت ترین کاتی بەیەك گەیشتنیشمان ئەو کاتەیە کە توڕە دەبین، و ئەسپەکانمان لـە منداڵەکانمان خۆشتر دەوێت و چەکەکانمان لـە دار خورماکانمـان خۆشـتر دەوێـت، و سـەرکەوتنیش بەدەست خوایە، جارێ دەمانداتێ و جارێ لێمان دەگرێتەوە، وادیارە تۆ برایەکی قوڕەیشیت؟

ئەبو بەکر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر بیستووتانە پێغەمبەرێك هاتووە ئەوە ئا ئەمەیە لە پاڵتاندایە، مەفروق ووتی: ئەی برای قوڕەیشی بۆچی شتێك بانگمـان دەکـەیت؟ پێغەمبـەری خـوایش (ﷺ) فەرمووی ((أدعوكم الى شهادة الّا اله الّا الله وحده لا شريك له، واني عبدالله ورسـوله، والى ان تؤتوني و تنصروني، فإن قريشاً قد تظاهرت على الله، وكذبت رسله، واستغنت بالباطل على الحق، والله هو الغني الحميد)).

واتە ((بانگتان دەکەم بۆ شایەتی دان کە هیچ خوایەك نی یە شایانی پەرستن بێت جگە لە خـوای تاکو تەنها و دانیش بەوەدا بنێن کە من بەندەو پێغەمبەری خوام، و بەڵێن بدەن بۆ یارمەتی دان

و سەرخستنم. چونکە قورەیش دژایەتی خوا دەکات و پێغەمبەرەکەی بەدرۆ دەخاتەوە، و لەبەر خاتری پڕو پوچی خۆی لە ڕاستی ڕاددەکات، و خوایش دەوڵەمەندو سوپاسکراوە)).

مەفروق ووتی: بۆ چیتر بانگی خەڵکی دەکەیت برای قورەیشی؟ چونکە سوێند بەخوا تا ئێستا ووتەیەکی جوانی ئا لەم چەشنەم نەبیستووە.

پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە ((قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَلا تَقْتُلُوا أَوْلادَكُمْ مِنْ إِمْلاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ)) "الأنعام/١٥١".

مەفروق ووتی: سوێند بەخوا بانگەشە بۆ چلەپۆپەی ڕەوشت بەرزی و چاکەکاری دەکەیت، بەڕاستی ناهەقیان کردووە ئەوانەی بەدرۆیان خستوویتەوە و دژایەتیت دەکەن، و پاشان دوا بڕیاری گەڕاندەوە بۆ هانئی کوڕی قوبەیسە - ووتی: ئەمە هانئ ەو گەورەمانەو خاوەنی ئاینداریمانە، هانئ ووتی: قسەکانتم بیست ئەی برای قورەیشی، وە من وا دەبینم واز لە ئاینەکەمان بێنین لەبەر یەك دانیشتن کە لەگەڵمان دانیشتوویت ئەمە ڕای ژیرانە نی یە و وورد نەبوونەوەشە لە پاشەڕۆژی ئەم هەنگاوە و هەمیشە تێکەوتنیش لەگەڵ پەلەکردندایە، و پێشمان ناخۆشە ڕێکەوتن نامە بکەین لە پشتە ملەی هۆزەکەمان، و بەڵام ئەگەڕێینەوەو لەم مەسەلەیە وورد دەبینەوە، و پاشان وەك بلێی‌حەزی کرد(مثنی کوڕی حارثە ی شە یبانی)ش بەشداری قسەکان بکات و ووتی:

ئەمەش (مثنی) یەوسەرداروخاوەنی بڕیاری‌جەنگمانە.

و (مثنی) یش - کە پاشتر موسڵمان بوو - ووتی: منیش ووتەکانتم بیست ئەی برای قورەیشی، و منیش وەڵامی هانیئی کوڕی قوبەیست دەدەمەوە لە مەسەلەی وازهێنان لە ئاینی خۆیان و شوێنکەوتنی ئاینەکەی تۆدا، بەڵام ئێمە لەنێوان دوو بەرداشدا دەژین، یەکەمیان یەکەمیان یەمامەیەو دووەمیان سەمامەیە، لێرەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو ((ما هذان الصريان؟)) واتە ((ئەو دوو بەرداشە چین؟)) موسەننا ووتی: ڕووبارەکانی کیسرا و ئاوەکانی عەرەب، بەڵام هەرچی ڕووبارەکانی کیسرایە ئەوە زۆر ترسناکەو گوناهێکە و لێخۆشبوونی نی یە و هیچ بڕو بیانوویەکیش ناخوات، و ئێمە کیسرا پەیمانی لێ وەرگرتووین کە شتی تازە نەهێنە

کایەوەو کەسێکی لەو چەشنەیش دالّدە نەدەین، و من ئەم مەسەلەیەی کە تۆ هێناوتە ئەی بـرای عەرەب وادەبینم پاشاکان زۆر نیگەران دەکات، ئەگەر پێت خۆشە لەلایەن عەرەبـەوە چـۆنت پـێ خۆشە دەتپارێزین و دالّدەت دەدەین.

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) پێی فەرموو ((ما أسأتم في الرد، اذا افصحتم بالصدق، وان دين الله عز وجل لن ينصره الّا من احاطه من جميع جوانبه، أرأيتم ان تلبثوا قليلاً، حتى يـورثكم الله تعـالى أرضهم وديارهم،و يفرشكم نسائهم، أتسبحون الله وتقدسونه؟)) فقال النعمان بن شريك: اللهم فلك ذالك[1].

واتە ((وەڵامەکەتان خراپ نەبوو، کە ڕاستیەکەیتان ووت، بەڵام ئاینی خوا ـ عـز وجـل ـ دەبـێ کەسێ پشتگیری بکات لەهەموو لایەکەوەو لەهەموو کەسێك بیپارێزێت، ئەی چۆنە کـەمێ دان بەخۆتانـدا بگـرن، تـا خـوای گـەورە زەوی و زارو خانوویـەرەکانی کیـسرا دەکاتـە هـی ئێـوەو خێزانەکانیشیان دەکاتە جێ ڕاخەرتان، دەی ئایا ئەو کاتە خوا بە بەرزو پیرۆز ڕادەگرن و شـوێنی دەکەون؟ نوعمان ی کوڕی شەریك ووتی: بەڵێ، ئەمەت بۆ دەکەین.

ئەم ڕووداوەش کۆمەڵێ پەندو ئامۆژگاری لەخۆ گرتووە کە عەلی (ﷺ) سوودی باشی لێ وەرگرت لەوانە:

١- عەلی (ﷺ) ئەو وانەیە فێربوو کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕەدی ئەوەی کردەوە کـە هـیچ کەسـێکی بەتوانا هاوکاری بکات لەسەر خستنیدا بەرامبەر بە دانی گرتنی پێیان کە لەدوا ڕۆژدا دەسەڵات و سوودمەندی تێدا دەبێت بۆیان لە بەرامبەر پشتگیریان لە بانگەوازی ئیسلامی، لەبەرئەوەی کە بانگەوازی ئیسلامی بانگەوازە بۆ خوا، مەرجی سەرەکی باوەڕ پێهێنـانی ئەوەیـە کـە بەنیـەتی پاکەوە بۆو بۆ خودا بێت و بەس، و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەوی مەبەست بێت لە قوربانی دان و سەرخستن و هەوڵەکانیدا لەو پێناوەدا نەك حەز لە کورسی و دەسەڵات و بەرپرسیارێتی کـردن، چونکە دیاری کردنی ئامانج کە مرۆڤ بۆ خۆی دیاری دەکات پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت کە هەڵسێ بە کارو چالاکیەکانی، کەواتە هاوکاری کـردن و سەرخـستنی بانگـەواز دەبێـت دابڕێـت لەهـەموو

[1] البداية والنهاية (١٤٢/٣/١٤٥). اسناده حسن ونقل عن البيهقي ابن كثير.

بەرژەوەندیەکی دنیایی بۆئەوەی هاریکاری کردنی بەردەوام بێت و لانەدان لێ ی و پێشکەش کردنی ئەوپەڕی قوربانی و گیان فیدایی لە پێناویدا.[1]

کەواتە زۆر پێویستە لەسەر ئەو کەسەی دەیەوێت لەناو کۆمەڵێکی ئیسلامیدا کاریکات مەرجی ئەوە دانەنێت کە پلەوپایە یان سوودی دنیایی پێبدەن چونکە ئەم بانگەوازە هی خوایەو خوایش خۆی چاك دەزانێت کێ لە چ جێگایەکدا بەکار دەهێنیت، و ئەوەی دەچێتە ناو کاری بانگەوازەوە دەبێت بەنیازی ڕەزامەندی خواو بەرزکردنەوەی ئاڵای ئاینەکەی کاربکات، بەڵام ئەگەر مەبەستێکی تری هەبوو جگە لەم مەبەستە بەرزانە ئەوە نیشانەیەکی ترسناکەو نیەت پاکی خاوەنەکەی لێڵ دەکات هەر بەم هۆیەوە (یەحیای کوڕی مەعازی رازی) دەڵێت ((لا یفلح من شمت منه رائحة الرياسة))[2] واتە: سەرکەوتوو نابێت ئەوەی بۆنی حەزکردن لە سەرکردایەتی تێدا بێت.

٢- عەلی (ﷺ) ئەوەش فێربوو لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە ئەو هاوکاری و سەرخستنەی کە پێغەمبەری خوا داوای دەکرد لە سەرەك هۆزەکانی ئەوە بوو کە پەیوەندیان نەبێت بە ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی یەوە کە پێچەوانەی بانگەوازی خوا بێت و نەتوانن لێ ی دەرباز بن، ئەمەش لەبەر ئەوەیە گرتنە ئەستۆی بانگەواز لەلایەن ئەو جۆرە کەسانەوە وادەکات لە بانگەواز کە بەرەو لەناوچوون بچێت، بەتایبەت واش بزانن کە ئەو بانگەوازە زیان بە بەرژەوەندی یەکانیان دەگەیەنێت.

چونکە پارێزگاری و داڵدە دانی مەرج دار هەرگیز مەبەست ناهێنێتەدی، چونکە (شەیبانی یەکان) ئامادە نەبوون بانگەشەی جەنگ دژی کیسرا بکەن ئەگەر داوایان لێ بکات (محمد) ی بدەن بەدەستەوە یان بیەوێت هێرش بکاتە سەر پێغەمبەری خواو شوێن کەوتوانی، بۆیە لێکۆڵینەوەو وتووێژەکان سەرنەکەوتن[3].

٣- نابێ کەسێ ئاینی خوا سەربخات کە سەرخستنەکەی هەمەلایەنە نەبێت، کە ئەمەش لە وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەردەکەوێت کە ڕەدی موسەنای کوڕی حارسەی دایەوە، کاتێ کە

---

[1] الجهاد والقتال في السياسة الشرعية (١/٤٢١).

[2] التحالف السياسي في الاسلام، منير عضبان، لا ٥٣.

[3] التحالف السياسي في الاسلام، منير عضبان لا ٥٣.

باسی لەوە کرد کە لەلایەن عەرەبەوە ناهێڵێن پەنجەت بۆ ببرێت بەڵام لەلای فارسەوەنایکەین، ئەوەی لە مەسەلەی سیاسەتدا دووربینی تێدابێت ئەم دووربینی یە ئیسلامی یەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەئاشکرا بەدی دەکات[1].

٤- عەلی (ﷺ) هەستی بەو کاریگەری یە کرد کە ئیسلام لەسەر موسەناو هۆزی شەیبان دروستی کرد پاش موسڵمان بوونیان، و چۆن ئەرکی قورسی ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای فارسیان گرتە ئەستۆ، و دواتر موسەنای کوڕی حارسەیش بوو بە یەکێ لە فەرماندەکانی سوپای ئیسلام لەسەردەمی ئەبو بەکری صدیق دا (ﷺ) لە ڕزگارکردنی غێراق دا، و باوەڕهێنانیان بەم ئاینە کێوێك غیرەتی تێدا دروست کردن بۆ جەنگ دژی فارسەکان.

هەشتەم: عەلی (ﷺ)خۆی دەکات بە قوربانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) :

کاتی خۆی قوڕەیش لە (دار الندوة) کۆبوونەوە و ڕایان هاتە سەر ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناوبەرن و ڕزگاریان بێت لەدەستی، و خوای ـ عز وجل ـ یش لەم پیلانە گڵاوە پێغەمبەرەکەی ئاگادار کردەوە، و پێغەمبەریش (ﷺ) ژیرترین کەس بووە، بۆ ئەوەی سەر لەو کەسانە تێك بدات کە هاتوون بیکوژن وابزانن ئەو هەر لە جێگاکەی خۆی خەوتووە و هەر لەبەرەرگاکەیدا چاوەڕوانی بن کەی بێتە دەر بیکوژن، بۆ ئەو مەبەستە داوای لە عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ) ی کرد کە لەجێگاکەیدا بخەوێت، کێ بێ ئەوەندە جەرگ قایم بێت لە جێگای پێغەمبەری خوادا بخەوێت لەکاتێکدا ماڵەکە دەوری گیراوەو بەتەمای کوشتنی بن لەجێگاکەیدا؟ کێ بێ بتوانێت لەجێگاو پێخەفی کەسێکدا بخەوێت کە دوژمنانی دڵڕەق بێنە ژوورەوە سەیری ئەوە ناکەن کە کێ لەناو جێگەکەدا خەوتووە؟ ئەمەش لەکەس نایەت جگە لە پیاوانی پاڵەوان و ئازا و بەیارمەتی خوایش.[2] و پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای لێ کرد چەند ڕۆژێك لە مەککە بمێنێتەوە تا هەرچی سپاردەی خەڵکی هەیە و لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایان نابوو، بیگێڕێتەوە بۆیان کە هەموو

---

[1] التحالف السياسي في الاسلام، لا ٦٤.

[2] الحكمة في الدعوة الى الله، القحطاني (٢٣٥).

ئەوانە دوژمنی پێغەمبەریش بوون (ﷺ) کە ئەمەش چلەپۆپەی دادپەروەری یە، و سپاردە پارێزی یە،[1]

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە عەلی کوڕی ئەبو طالب ی فەرموو ((نم في فراشي و تسبح ببردي هذا الحضري، فنم فيه، فانه لن يخلص اليك شيء تكرهه منهم))[2] واتە ((لە جێگاکەمدا بخەوە و کەواکەم لەخۆت بپێچە و تیایدا بخەوە، و بشزانە کە ناتوانن هیچ ناخۆشیەکت بەسەردا بهێنن))

(ابن حجر) دەڵێت: موسای کوڕی عەقبە دەڵێت: عەلی (ﷺ) لە جێگاکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەوت تا سەر لە بێ باوەڕەکان بشێوێنێ و تا بەیانی لەناو خۆیاندا باسیان لەوە دەکرد کە کێ زووتر بڕوات و لەناو جێگەکەیدا بیکوژێت، بەم شێوەیە مانەوە تا بەیانی، لە بەیانیدا بینیان عەلی لە جێگاکەیدا خەوتووە و هەواڵی محمدیان لێ پرسی، ووتی: نازانم، لەویدا بۆیان دەرکەوت کە لەدەستیان دەرچووە.[3]

(ابن عباس) یش دەڵێت: عەلی (ﷺ) هەر لەوشەوەدا خۆی فرۆشت بەخوای گەورە کە جلەکانی پێغەمبەری لەخۆی پێچاو تیایدا خەوت.[4]

لە ئیمام عەلی و برا هاوەڵە موجاهیدەکانیدا ئەوانەی لەپێناو ڕەزامەندی خواو دەستکەوتی ئاخیرەتدا تێ دەکۆشان ئایەتی قورئان دابەزی و فەرمووی ((وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاةِ اللَّهِ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ)) "البقرة/٢٠٧".

لەم هەڵوێستە مەزنەشدا کۆمەڵێ وانەو پەندی لێ وەردەگرین لەوانە:

١- یەکێك لە نەخشەکانی کۆچ ئەوەبوو، پێویستی دەکرد کەسێك لە پێخەفەکەی پێغەمبەردا (ﷺ)بمێنێتەوە تا بێباوەڕان بخەڵەتێنێ و وابزانن هەر لە ماڵدایە، و هەندێ کات بەوەوە خەریك بن تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) و (صديق) ەکەی هاوەڵی دووربکەونەوە و بگەنە جێگەی بێ ترس.[5]

---

[1] تاريخ الخلفاء، السيوطي، ١٦٦٧.

[2] فتح الباري (٧/٢٣٦).

[3] فتح الباري (٧/٢٣٦).

[4] فضائل الصحابة ژمارە (١١٦٨) إسناده حسن.

[5] العشرة المبشرون بالجنة، محمد صالح.

٢- گوێڕایەڵی عەلی (ﷺ) لەو ساتە پڕمەترسی یەدا ئەوپەڕی سەربازیەتی ڕاستەقینەیە، و ئەوپەڕی دڵسۆزی یە بۆ بانگەوازی ئیسلام، بەجۆرێ گیانی خۆی کردە قوربانی سەرکردەکەی، چونکە سەلامەتی سەرکردە دەبێتە هۆی سەلامەتی بانگەوازەکە، و لەناوچوونیشی فەوتانی بانگەوازە یان لاواز بوونی، و ئەوەی عەلی (ﷺ) لەو شەوەدا نواندی ئەوپەڕی قوربانیدانە، چونکە لەوانەبوو گەنجەکانی قوڕەیش شمشێر بارانی پێخەفەکەی پێغەمبەریان بکردایە و عەلیان شی و شیتاڵ بکردایەتەوە، بەڵام عەلی (ﷺ) گوێی بەم ترسە نەدا، و ئەوەی لەلا بەس بوو کە پێغەمبەری خواو سەرکردەی ئەممەتی ئیسلام بەبێ وەی ڕزگاری ببێت.[1]

٣- دانانی بێباوەڕەکان ئەمانەتەکانیان لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ئەو هەموو دژایەتی و بەدرۆخستنەوەو هەوڵی کوشتنەیدا زۆر پێچەوانەی یەکتر بوون، کە لەکاتێکدا کە بەدرۆیان دەخستەوەو بە ساحیرو شاعیر و دورۆزن و فاڵچیان لە قەڵەم دەدا، کەچی کەسێکی تریان شك نەدەبرد کە دەستپاك و ئەمانەت پارێزبێت جگەلە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو بت پەرستانە گومانیان نەبوو لە ڕاستگۆییەکەی، بەڵام خۆبەزل زانین و لووت بەرزی نەیدەهێشت باوەڕی پێ بهێنن،و دەشترسان پلەو پایەو سەرگەورەییان لەدەست دەربچێت،[2] و خوای گەورە جوانی فەرمووە کە دەفەرموێت ((قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لا يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ)) "الأنعام/٣٣" واتە ((ئێمە باش دەزانین کە قسەکانیان خەفەتبارت دەکات، بەڵام ئەوان تۆ بەدرۆزن نازانن بەڵام ستەمکاران لە ئایەتەکانی خوادا ملەجەڕێ دەکەن)).

٤- فەرماندانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە عەلی (ﷺ)کە هەستێت بە گەڕاندنەوەی سەرجەم ڕاسپاردەکان بە خاوەنە بت پەرستەکانیان، لەگەڵ ئەو ساتە وەختە ترسناکەداشدا کە ترسی ئەوە هەبوو نەخشەی کۆچکردنەکە سەرنەگرێت، کەچی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئەوەی لەیاد نەچوو کە ڕاسپاردەکان بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئیتر با ساتەکەش ئەوەندە ترسناك بوو بێت کە مرۆڤ خۆیشی لەیاد بچێتەوە.[3] و هەرگیز قبووڵی نەبوو ناپاکی بکات تەنانەت لەگەڵ دوژمنەکانیشیدا

---

[1] السيرة النبوية للسباعي، لا ٣٤٥.

[2] السيرة النبوية للسباعي، لا ٣٤٥.

[3] فقه السيرة للبرطي لا ١٥٣.

که ئازاریان دەدا چونکە ناپاکی کردن لە ڕاسپاردەدا لە ڕەوشتی دووڕووەکانە و باوەڕداران خۆیانی لێ دەپارێزن.[1]

٥- ئەم بەسەرهاتە مەزنە بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ئازایەتی و جەرگ قایمی ئیمام عەلی (ﷺ)، و ئەو زۆر باش دەیزانی لەو خەوتنی ئەو شەوەدا چ مەترسیەکی گەورەی تێدایە، و ئەوان دەرگای ماڵەکە دەشکێنن و پێش ئەوەی بکۆڵنەوەو بزانن کێ ی لێ خەوتووە دەیکوژن، یان کتوپڕ دەدەن بەسەریدا کاتێ سبەینێ دەڕواتە دەرەوە، و بێ باوەڕان بەدرێژایی ئەو شەوە دەوری ماڵەکەیان گرتبوو، ماندوو بوو بوون و کەی دەیانتوانی لەو کەسە بکۆڵنەوە کە لەژوورەوەیە یان دێتە دەرەوە، کە ئەو کەسە (محمد) ە یان پیاوێکی تر لە جێگەکەیدایە؟

خۆ ڕەنگە ئەم شتانە هەموویان هاتبن بە خەیاڵی عەلی (ﷺ) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بێ دوودڵی فەرمانەکەی جێبەجێ کرد، ئێ یەکەم ئەوخواو پێغەمبەرەکەی زۆر خۆش دەویست و بێ وەیی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەورەترین ئامانجی بووە ئیتر با لەوپێناوەشدا گیانیشی بەخت بکات.

و دووەم ئەوەش کارێك بووە دەبوایە بیکردایە تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەلامەتی لەناو چنگی دوژمنانی دەربچوایە تا دواتر بتوانێت بانگەوازەکەی ئیسلام بڵاو بکاتەوە لەهەموو جێگایەکی سەر زەوی، و کەواتە کارەکە بەند بوو بە بەرژەوەندی ئیسلامەوە.

لەگەڵ ئەم هەموو ترسانەدا کەچی عەلی (ﷺ) لە جێگاکەی پێغەمبەری خوادا خەوت کە ئەمەش ئەوپەڕی باوەڕ بوونی بووە بە مەسەلەی (قەزاو قەدەر) و بەڕاستی باوەڕی بەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان هەبووە کە دەفەرموێت ((قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلاَنَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُؤْمِنُونَ)) "التوبة/٥١".

## نۆیەم/ کۆچ کردنی بۆ شاری مەدینە:

لە سبەینێ ی ئەو شەوە پیرۆزەدا کە پێغەمبەرمان (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەو لە جێگاکەی خۆی هەستا، و خەڵکەکە ناسیانەوە، و بۆیان دەرکەوت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی دەرچووە، بۆیە بە عەلیان ووت: کوا هاوڕێکەت؟ ووتی: نازانم، ئایا من چاودێرم بەسەریەوە؟ و ئێوە ناچارتان کرد دەربچێت و ئەویش دەرچوو. خەڵکەکە بەو وەڵامە بەغیرەتە و بوێرانەیە زۆر قەڵس بوون و

[1] جولة تاريخية في عصر الخلفاء الراشدين لا ٤٢٣.

بەدەرچوونی پێغەمبەریش (ﷺ) ئەوەندەی تر دڵتەنگ بوو بوون، کە دابووی بەلایاندا و کوێراییان داهاتبوو، بۆیە عەلیان دایە بەرشەق و زلە بردیان و لەناو کەعبەدا بۆماوەی کاتژمێرێك بەستیانەوەو پاشان کردیانەوەو وازیان لێ هێنا[1]. و عەلی (ﷺ) لەسەر ئەو ناڕەحەتیانە هەر خۆشحاڵ بوو چونکە پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ وەی دەرچووە و لەبەردەم هەڕەشە و لێداندا خۆی گرت و شوێن و مەبەستی پێغەمبەری خوای بۆ نەدرکاندن، و بۆماوەی سێ ڕۆژ بەجادەو کۆڵانەکانی مەکەدا دەگەڕا و ڕاسپاردەکانی دەگێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیان و گەردنی پێغەمبەری خوای لێ ڕزگار دەکرد و پاش ئەوە بەرەو شاری مەدینە کەوتە ڕێ.[2]

و عەلی (ﷺ) بەڕۆژدا خۆی حەشاردەدا و بەشەودا ڕێگەی دەکرد تا خۆی گەیاندە شاری مەدینەو ژێر پێکانی ئاوسابوون و تلۆقیان کردبوو.[3] و عەلی (ﷺ) ئا بەم جۆرە بوو، بەڕۆژدا لەبەرگەرماو لەترسی ئاشکرابوون ڕێگەی نەدەکرد و بەشەوە تاریکە ترسناکەکاندا ئەو بەتەنها و بەبێ هاوەڵ ئەو بیابانەی نێوان مەککەو مەدینەی بڕی چونکە دەیزانی لەپێناوی خودایە و ئێ پاشان دەگات بە خۆشەویستەکەی کە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) و لەو گەشتە ناڕەحەتەیدا بەرەو شاری مەدینەو لەڕێگادا لەلای (بەنی عەمری کوڕی عەونی) و بەتایبەت لەلای (کلثوم ی کوڕی هەدم) لایدا و حەوایەوە وەك چۆن پێغەمبەری خوایش (ﷺ) لەلای هەمان هۆزو هەمان پیاودا لایدا لە کۆچەکەیدا. و کاتێ لە (قوباء) مایەوە تێبینی ئەوەی کرد کە ئافرەتێکی موسڵمان ی بێ مێرد هەبوو، و پیاوێکیش لەنیوەی شەودا دەیدا لە دەرگاکەی و ئەویش دەهاتە دەرەوە و شتێکی دەدایە دەستی و دەڕۆیشت.

با گوێ بگرین بۆ عەلی خۆی بۆمان بگێڕێتەوە کە باسی بەسەرهاتەکەی کردو ووتی: کەوتمە گومانەوە لێی، بۆیە بەو خوشکەم ووت: ئەی بەندەی خوا، ئەوە کێ یە وا هەموو شەوێك لەدەرگاکەت دەدات و تۆش دێیتە دەرەوەو شتێکت پێ دەدات نازانم چی یە؟ و تۆش ئافرەتێکی موسڵمانیت، تەنیایت، هاوسەرت نیە!؟ ئەویش ووتی: ئەمە سەهلی کوڕی حەنیفە و دەزانێت من ئافرەتێکی موسڵمانم و تەنیایشم و هەموو شەوێك دەدات بەسەر بتەکانی هۆزەکەیداو

---

[1] تاريخ الطبري (٢/٣٧٤).

[2] البداية والنهاية (٧/٣٣٥).

[3] الكامل (٢/١٠٦).

دەیانشکێنێت و پاشان ئەیانهێنێ بۆ من و پێم دەڵێ: بەکاریان بهێنە بۆ سووتاندن. وە عەلیش (ﷺ) ئەمە کاری کردبووە سەر دەروونی و سەهلی کردبووە هاوەڵی خۆی تا ئەوکاتەی لە عێراق شەهید بوو لەلای.[1]

و هەروەك لەم بەسەرهاتەوە تێبینی ئەوەش دەکەین کە وریایی و چاوکراوەیی عەلی دەبێت لە هەموو موسڵمانێکدا هەبێت و ژیرانە بزانێت لە چوار دەوری چی ڕوودەدات.

---

[1] محمد رسول الله، صادق عرجون (٢/٤٢١).

## جێ باسی سێ یەم

## ژیانی لەژێر سایەی قورئانداوکاریگەری لەسەری:

**یەکەم: تێڕوانینی بۆ خوداو بەنەوەر و ژیان و بەهەشت و دۆزەخ و قەزاو قەدەر:**

ئەو پڕۆگرامە پەروەردەیی یەی کە عەلی کوڕی ئەبو طالب ی لەسەر گۆش کرابوو هەر ئەو پڕۆگرامە بوو کە سەرجەم هاوەڵە بەڕێزەکانی تری لەسەر پەروەردە بوو، کە لەسەر پڕۆگرامی قورئانی پیرۆز پەروەردە بوو بوون، مامۆستاکەشیان سەرداری مرۆڤایەتی محمد (ﷺ) بوو، کە زۆر سووربوو لەسەر ئەوەی یەك پەروەردە و یەك لایەنە شتەکان وەربگرن، و قورئانیش تاکانە مامۆستایان بێت لەگەڵ ئەو فەرموودە جوانانەی کە خوای گەورە دەیخستە دڵی پێغەمبەرەوە (ﷺ).

بەو شێوەیە تاکی موسڵمان و خێزانی موسڵمان و کۆمەڵی موسڵمانی پەروەردە دەکرد لەسەر بیرو باوەڕو پەرستشەکان و کارەکانی ڕۆژانە و ڕەوشتێ کە قورئان و سوننەت پێی هاتووە، ئەو ئایەتە پیرۆزانەی لە زاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەردەچوو، یەکسەر کاریگەری لەسەر کەسایەتی عەلی دەکرد، و دڵی پێ خاوێن دەکردەوە و دەروونی پێ زاخاو دەدایەوەو ژیری پێ ڕووناك دەکردەوە و گیانی لەگەڵیدا ئاوێتە دەبوو، بۆیە گۆڕا بۆ مرۆڤێکی نوێ بە قیەم و هەست و نەست و ئامانج و هەڵس و کەوت و ئاواتی نوێ وە.[1]

عەلی (ﷺ) لەڕێگای قورئانی پیرۆزو پەروەردە ناوازەکەی پێغەمبەرەوە ئەو خوایەی بۆ دەرکەوت کە دەبێت بپەرسترێت، و پێغەمبەری خوایش (ﷺ) ماناو ڕاڤەی ئەو ئایەتە پیرۆزانەی لەناو دڵیاندا دەچاند، پێغەمبەرمان (ﷺ) زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی کە هاوەڵانی بەجۆرێ گۆش بکات کە بەجوانی و بەتەواوی خودا بناسن و بزانن چ مافێکی هەیە لەسەریان، چونکە باش دەیزانی ئەم جۆرە تێگەیشتنە یەقین و دڵنیاییەکی وا دروست دەکات کە دەرونیان پاك و خاوێن دەکاتەوەو سروشتیان ڕاست دەکاتەوە، و عەلیش (ﷺ) بەم تێڕوانین و تێگەیشتن لە قورئان و سوننەتی

---

[1] السيرة النبوية، صلّابي (١/١٤٥).

پێغەمبەرە دەیڕوانی یە خوداو بونەوەرو بەهەشت و دۆزەخ و قەزاو قەدەر و دژایەتی کردن لەگەڵ شەیتان. لەرێگەی ئەو ئایەتە پیرۆزەوە کە دەفەرموێت ((تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ (١٦) فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)) "السجدة/١٦-١٧". واتە ((لەناو جێگەدا خەو لە چاوەکانیان تۆرابوو، هاواریان دەکردە خوا لە ترسی دۆزەخ و حەز کردن بە بەهەشت و لەو ماڵ و سامانەی خوا پێی بەخشیبوون دەیانبەخشی، کەس نازانێ چ نازو نیعمەتێکیان بۆ ئامادە کراوە لەبەهەشتدا)).

عەلی (ﷺ) ئا بەم جۆرە لەگەڵ خواناسیدا خۆی جۆش دابوو شەو لەناو جێگەدا ئەم دیو دیوی دەکرد و لەترسی خواو وەستان لەبەردەمیدا خەوی لێ نەدەکەوت و غەرقی ناو دنیای شەونوێژ دەبوو.

دووەم - پلەوپایەی قورئان لەلای عەلی (ﷺ):

ئەمیری موسڵمانان علی (ﷺ) بەدرێژایی ژیانی لەگەڵ قورئاندا دەژیا، دەیخوێندەوەو لەبەری دەکرد و لێی تێدەگەیشت و کاری پێ دەکرد، هەموو جارێ دەیگووت ((من قرأ القرآن فمات فدخل النار فهو كمن يتخذ آيات الله هزوا))[1] واتە ((هەرکەسێ قورئان بخوێنێ و بچێتە ناو دۆزەخەوە ئەوە ئەو کەسانەن کە گاڵتەو لاقرتێیان بە ئایەتەکانی خوا کردووە)).

و دەیگووت ((طوبى لهؤلاء كانوا احب الناس الى رسول الله (ﷺ) واتە ((خۆشبەختی بۆ قورئان خوێنان کە خۆشەویست ترین کەس بوون لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ).[2] لە جێیەکی تردا دەڵێت ((ما كنت أرى أحداً يعقل ينام قبل ان يقرأ الايات الثلاث الأواخر من سورة البقرة))[3] واتە ((وا نابینم کەسێك ژیر بێت و بخەوێت تا ئەوەی سێ ئایەتەکەی کۆتایی سورەتی بەقەرە نەخوێنێت)).

لەبەر گرنگر دانی لە ڕادە بەدەری عەلی (ﷺ) بە قورئانی پیرۆز، بوو بوو بە خاوەنی زانیاریەکی گەورە و دەگێڕنەوە لێی کە ووتوویەتی (( والله ما نزلت آية الّا وقد علمت فيم نزلت، واين نزلت، وعلى من نزلت، ان ربي وهب لي قلباً عقولاً ولساناً صادقاً ناطقاً))[4] واتە ((سوێند بەخوا

---

[1] المستطرف (٢٩/١).

[2] التبيان في أداب حملة القرآن، لا (١٤٦).

[3] هەمان سەرچاوە، لا (٢٦٦).

[4] الطبقات لإبن سعد (٣٣٨/٢).

ئایەتێك نەهاتۆتە خوارەوە من نەزانم هۆی هاتنە خوارەوەی و لەکوێ و دەربارەی کێ هاتۆتە خوارەوە، پەروەردگارم دڵێکی ژیرو زمانێکی پاراو و ڕاستگۆی پێ بەخشیوم. و بەهاوەڵەکانی خۆی دەگووت ((سلوني قبل ان تفقدوني)) واتە پرسیاری جۆراو جۆرم لێ بکەن پێش ئەوەی لەدەستتان دەربچم.

سێیەم - ئەو ئایەتانەی دەربارەی عەلی (ﷺ)دابەزیوە:

قورئانی پیرۆز بۆ چارەسەری ڕوداوو کێشەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دادەبەزی یە خوارەوە، یان بۆ دەستخۆشی کارێك بوو، یان ئاگادارکردنەوە بوو، یان دەرخستنی هەڵە بوو، هەندێ لەو ئایەتانەی کە هەتا هەتایە لەگەڵ خوێندنەوەیاندا عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ) یاد دەخاتەوە لەوانە:

١- ووتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت ((هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِنْ نَارٍ يُصَبُّ مِنْ فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ)) "الحج/١٩".

بوخاری دەگێڕێتەوە لە عەلی کوڕی ئەبو طالب ەوە (ﷺ)کە ووتوویەتی (من یەکەمین کەس دەبم لە ڕۆژی دواییدا کە لەبەردەمی (ڕەحمان) دا لەسەر ئەژنۆ دەکەوم بۆ شکات کردن – الخصومە-).

و قەیسی کوڕی عوبارەش (ﷺ) دەڵێت: ئایەتی (خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ) لەو کەسانەدا هاتە خوارەوە کە بۆ شمشێر بازی لە ڕۆژی بەدردا لەڕیزەکان هاتنە دەرەوە کە (حەمزە و عەلی و ابو عبیدەی کوڕی حارث و شەیبەو عوتبەی کوڕانی ربیعەو وەلیدی کوڕی عوتبە)[1]

٢- عەلی (ﷺ) یەکێکە لەو کەسانەی کە ئەم ئایەتەی لەسەر هاتە خوارەوە ((فَمَنْ حَاجَّكَ فِيهِ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ وَنِسَاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنْفُسَنَا وَأَنْفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَلْ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ)) "آل عمران/٦١" واتە ((ئەگەر کەسانی لەدوای ئەوەی ڕاستیان بۆ دەرکەوت کەچی هەر دەمەقاڵەت لەگەڵدا بکەن و مل بە هەق نەدەن ئەوا پێیان بڵێ وەرن (موباهەلە) بکەین و هەردوو لامان کوڕەکانمان و هاوسەرەکانمان و خۆمان و خۆتان کۆببینەوە و پاشان نەفرین بکەین لە درۆزنەکەمان. ئەمەش لەگەڵ وەفدی نەجران دا ڕووی دا کە پێغەمبەرمان (ﷺ) سەبارەت بە عیسای کوڕی مەریەم کە بەندەو پێغەمبەری خوا بووە و نە

[1] البخاري ژمارە ٣٩٦٥.

کوڕی خوا بووه و نه خۆیشی خوایه و نەسیانی یەکەش ڕوایە -التثلیث- و بانگی کردن بۆ موسڵمان بوون، بەڵام ملیان نەداو ئەویش بانگی کردن بۆ (موباهەلە) و دوعا لەخۆکردن ـ کە درۆزنەکەیان بگرێتەوە و عامری کوڕی سەعیدی کوڕی وەقاص (ﷺ)دەڵێت: هەر کە ئایەتی (فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ) هاتە خوارەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ)عەلی و فاطمە و حەسەن و حوسەین ی کۆکردەوە و فەرمووی ((اللهم هؤلاء أهلي)) خوایە ئەمانە کەس و کاری منن.[1]

٣- قورئان پشتگیری لە بۆچوونی عەلی دەکات:

لە (صحيح) دا هاتووە کە پیاوێك وتی: من لەپاش موسڵمان بوون وانازانم لە خزمەت کردنی کەعبەو حاجیان زیاتر کردەوەیەك هەبێت گەورەتربێت، و عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ) ووتی: جیهاد لەپێناوی خودا لەهەموو ئەم کارانە باشترە، و عمریش (ﷺ) ووتی: لەپاڵ مینبەری پێغەمبەری خوادا دەنگ هەڵمەبڕن، وازبهێنن من لەپاش نوێژ لە پێغەمبەری خوا دەپرسم لەم بارەیەوە، و پاشان پرسیاری لێ کرد و ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ((أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لا يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ)) "التوبة/١٩" واتە ((ئایا ئاودان بە حاجیان و خزمەتی کەعبە وەك یەك دەبینن لەگەڵ باوەڕ بە خواو قیامەت و جیهادکردن لەپێناوی خوا؟ لای خودا وەك یەك نین و خوایش ڕێنمایی ستەمکاران ناکات)).

٤- بەزەیی هاتنەوەی بە ئوممەتی محمد (ﷺ)دا:

عەلی (ﷺ) کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمْ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً ذَلِكَ خَيْرٌ لَكُمْ وَأَطْهَرُ فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ)) "المجادلة/١٢".

واتە ((ئەی باوەڕداران ئەگەر ویستتان بێن بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) با پێش وەخت پارەیەك ببەخشن لەڕێگەی خوا ئەوە زۆر باشترو چاکترە بۆتان و ئەگەر لە دەستیشتاندا نەبوو ببەخشن خوا لێبووردەیە قەیناکا)). پێغەمبەر (ﷺ)لەپاش ئەو ئایەتە بە عەلی فەرموو ((مُرهم ان يتصدقوا)) واتە فەرمانیان پێ بدە خێر بکەن، عەلی ووتی: چەندێ ببەخشن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی ((دینارێك)) عەلی ووتی: زۆرە ناتوانن، فەرمووی ((نیو دینار))، عەلیش (ﷺ) ووتی: ئەوەش

[1] مسلم (١٨١/٤) (٤٢٥)، (١٧١/١).

زۆرە ناتوانن، و پێغەمبەری خوایش فەرمووی ((ئەی چەند باشە؟)) عەلیش ووتی: قورسایی دنکەجۆیەك.[1] و پێغەمبەریش (ﷺ)پێ ی فەرموو ((إنك لزهيد)) واتە ((چەند کەم تەماحی)).

و خوای گەورەش لەسەر ئەو مشت و مڕە ئایەتی نارده خوارەوەو دەفەرموێ ((أَأَشْفَقْتُمْ أَنْ تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا وَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ)) "المجادلة/١٣" واتە ((ئایا لەوەشدا بەزەیی بەکاردێنن کە بۆبینینی پێغەمبەری خوا – خێری بکەن؟ دەی ئەگەر نەتان کرد ئەوە خوا لێتان خۆش دەبێت و نوێژو زەکات بەرپا بکەن، و پاش ئەوە عەلی (ﷺ) ووتی: (بِيَّ خفف الله عن هذه الأمـة)) واتە: لەبەرمن بوو خودای گەورە ئەم ئاسان کاریەی بۆ ئوممەت کرد.[2]

چوارەم : گەیاندنی تەفسیری پێغەمبەر (ﷺ) بۆهەندێ ئایەتی قورئان:

عەلی زۆر سوودی وەردەگرت لە تەفسیرەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆهەندێ لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەوانە:

١- ووتەی خوای گەورە کە دەفەرموێ ((وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ)) "الواقعة/٨٢". عەلی دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا سەبارەت بەو ئایەتە فەرموویەتی ((شكركم انكم تكذبون، مطرنا بنۆ كذا وكذا، وبنجم كذا وكذا)) واتە ((سوپاسگوزاریتان درۆیە چونکە ئێوە دەڵێن بەهۆی فلانەوە بارانمان بۆباری یان بەهۆی فالچی یەوە ...

پێنجەم/ ئەو بنەمایانەی کە عەلی (ﷺ) بەهۆیانەوە حوکمی شەرعی لەقورئان دەرهێناوە:

عەلی (ﷺ)زۆر شارەزا بووە لەقورئان و مەبەستەکانی قورئان، بۆیە ڕای وابووە قورئان هەموو حوکمە شەرعیەکانی لەخۆگرتووە ئیتر چ ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، و لەوبارەیەوە هەموو جارێ دەیووت: خوای گەورە هیچی لەبیر نەچووە.

هەندێ لەو بنەمایانە:

[1] الفتاوى (١٦٦/٨) قورسایی دنكە جۆیەك ئاڵتون.

[2] رواه الترمذي ذ ٣٢٩٧ حسن غريب.

١- پابەندبوون بەمانا ئاشکراکانی قورئان:

عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ)هەرکاتێ شتێك نەبوایە کە مانا ئاشکراکانی قورئـان بگۆڕێـت بـۆ مەبەستێکی دەرەکی ئەوا دەستی دەگرت بە (ظاهر) ی مانای ئایەتەکانەوە، بۆنموونە بۆ هـەموو نوێژێ دەستنوێژی گرتۆتەوە بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت ((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ))[1] "المائدة/٦" واتـه ((ئـەی کۆمەڵـە بـاوەڕداران هـەرکاتێ هەستان بۆ نوێژ دەست نوێژ بگرن))، و زاهیری ئایەتەکە ئـەوە دەگەیـەنێت کـە لەگـەڵ هـەموو نوێژەکاندا دەستنوێژ پێویستە،

و هەروەها ڕۆژوو بەفەرز دەزانێت لەسەر کەسێك کە لەماڵـەوە بێـت و ڕەمـەزان بێـت و پاشـان سەفەر بکات، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی کە دەفـەرموێت ((فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ))[2] "البقرة/١٨٥"

٢- تەفسیرکردنی ئایەتە مانا نەکراوەکان بەئایەتە تەفسیرکراوەکان:

جارێك پیاوێك لێی دەپرسێت سـەبارەت بـەمانای ئایـەتی ((هَدْياً بَالِغَ الْكَعْبَةِ)) واتـه شـتێك لەکەعبەدا سەربڕێت؟ وە دەڵێت: هەدی مانـای چیە؟ عـەلیش (ﷺ)دەڵێـت پێـی ((ئایـا ئـەم ئایەتەت نەخوێندۆتەوە ((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ)) واتـه ((ڕاوشـکار مەکەن لەکاتی بەجێهێنانی ئەرکەکانی حەجدا))[3].

٣- مانای ئایەتە بێ پاشکۆکانی کردووە بەئایەتە پاشکۆدارەکان ـ حمل المطلق على المقيد:

بۆ نموونە لەمەسەلەی بڕینی دەستی دزدا، بۆ جاری سێ یەم، ئیمام عەلی (ﷺ)پـێ ی وایـە کـە جاری یەکەم، دەستی چەپی دەبڕدرێت و ئەگەر دووبارەی کردەوە قاچی چەپی، بەڵام بۆجاری سـێ یەم هیچ ئەندامێکی نابڕدرێت، و لەعەلیشەوە دەیگێڕنەوە کە ووتوویەتی: (إني لأستحي مـن الله ان لا أدع له يداً يأكل بها ويستنجي))[4] واتە: من شەرم دەکەم لەخوا کە دەستێکی بۆ نەهێڵمەوە تا نانی پێ بخوات و خۆی پێ خاوێن بکاتەوە.

---

[1] تفسير القرطبي (٨٠/٢).

[2] فقه الإمام علي (٤٥/١).

[3] الدر المنثور (١٣/٣).

[4] فقه الامام علي (٨١٨/٢).

٤- سوود وەرگرتن لە ئایەتی ((أَوْ لامَسْتُمْ النِّسَاءَ)) "النساء/٤٣" واتە ((لەخێزانەکانتان نزیك بکەونەوە)) کە (لمس) لەلای عەرەب واتە چوونە لای خێزان بەڵام خوای گەورە ناڕاستەوخۆ نـاوی بردووە.[1]

[1] هەمان سەرچاوە (٤٨/١).

# جیٚ باسی چوارەم

## ژیان لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ)

عەلی (ﷺ) ی یەکێك بوو لەو کەسانەی کە دەینووسی و دەیخوێندەوە لەناو کۆمەڵگەیەکی نەخوێندەواردا، کە ئەمەش مانای ئەوەیە هەر لەمنداڵی یەوە شەیدای زانست و زانیاری بووە، و هۆیەکەشی ئەو کەش و هەوایە بوو کە تیایدا گەورە بوو کە ماڵی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) وکاریگەری تەواوی هەبوو لەسەر پێگەیشتنی عەقڵ و هۆش و تەقاندنەوەی وزەکانی،و دڵی پاك کردەوەو ڕۆحی زیندوو کردەوە، و بەجۆریٚ چ لەمەککەو چ لەمەدینە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بووە بەبەردەوامی.

زۆر سوربوو لەسەر ئەوەی لەسەر دەستی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەشاگردی بمێنێتەوە، و لەگەڵ دابەزینی هەرئایەتێکدا ئەویش وەك هاوەڵانی تر – لیٚ ی وورد دەبوویەوەو لیٚ ی تیٚ دەگەیشت و کاری تیٚ دەکرد و لەوساتەوەی موسڵمان بوو بوو گرنگی بەلەبەر کردنی قورئان دەداو لێی دەکۆڵی یەوە و لیٚ ی تیٚ دەگەیشت تا وای لێهات هەموو ئورئانی لەبەر بوو، و لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ)زانیاری زۆری دەستکەوتبوو، بۆیە شارەزایی یەکی باشی هەبوو لەسوننەت و ژیانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)و پێغەمبەری خوای لەڕادە بەدەر خۆش دەویست و دڵی وابەستەی بوو بوو، و خۆی دەکردە قوربانی خۆی و ڕێبازە ناوازەکەی و هەموو جاریٚ ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد و پێی دەووتن: (إقتدوا بنبيكم، فإنه أفضل الهدى واستنوا بسنته فإنه افضل السنن) واتە: شوێن پیٚ ی پێغەمبەری خوا هەڵگرن، چونکە باشترین ڕێنموونکەرە، و لەسەر سوننەت و ڕێڕەوی بن چونکە باشترین سوننەت و ڕێڕەوە.

١- گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ)ودەست گرتن بە سوننەت وپارێزگاری کردنی.

ئیمام (ﷺ)باش لەوە حاڵی بوو بوو کە گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) واجبە لەسەرشانی هەموو موسڵمانێك، و ئەوەش بەبەڵگەی ئەوەی کە قورئان دەفەرموێت ((مَنْ يُطِعْ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ)) واتە ((هەرکەسیٚ گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکات (ﷺ)ئەوە گوێڕایەڵی خوای کردووە)).

هەروەرك پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەفەرمودەیەکدا کە بوخاری لەژمارە (٧٢٨٠) دا هێناویەتی کە: فەرموویەتی ((کل أمتي یدخلون الجنة الّا من أبی، قیل ومن یأبی یا رسول الله – قال: من أطاعني دخل الجنة ومن عصاني فقد أبی)) واتە ((هەموو نەتەوەکەم دەڕۆنە بەهەشت مەگەر کەسێك خۆی نەیەوێت! ووتیان: بۆ کەسێ هەیە خۆی نەیەوێت؟! فەرمووی: بەڵێ هەرکەسێ گوێڕایەڵم بکات دەچێتە بەهەشتەوە و هەرکەسیش سەرپێچیم بکات ئەوە بەهەشتی ناوێت.

ئیمام عەلی لەهەمووان زیاتر بەپەرۆشەوە بووە کە لەبچووکترین فەرماندا لەقسەی پێغەمبەری خوا دەرنەچێت وەك خۆی دەڵێت ((ما کنت لأدع سنة النبي (ﷺ)لقول أحد))[1] واتە: ئەوە من نیم بۆقسەی کەس لەسوننەتی پێغەمبەری خوادا دەربچم. و لەشوێنێکی تردا دەڵێت (من نەپێغەمبەرم و نە نیگایشم بۆدێت بەڵکو من ئەوەندەی پێم بکرێت کار بەقورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا دەکەم.)

و زۆر حەزی لە پابەندی کردووە بەسوننەتەکانی پێغەمبەری خواوە (ﷺ)زۆر ڕقی لە بەکارهێنانی عەقڵ و ژیری بوو، لەبواری شەرعدا ووتوویەتی ((لو کان الدین بالرأي لکان أسفل الخف أولی بالمسح من أعلاه)) واتە: ئەگەر ئاین ڕاکاری و بۆچوون کاری بوایە، ئەوە دەبوایە لە مەسەلەی (خف) دا ژێرپێ مەسح بکرایە نەك سەرپێ.

٢-فەرموودەی ئەمیری باوەڕداران علی کوڕی ئەبو طالیب لە سەر نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی محمدﷺ :

ئەمیری باوەڕداران هەندێك لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺی ڕوونکردۆتەوە کە ئەمانەی خوارەوە هەندێك لەو بەڵگانەن:

أ- بەرەکەتی دوعاکانی پێغەمبەر (ﷺ)بۆی:

عەلی (ﷺ)نەخۆش دەکەوێت و بەدەم خۆوە دەڵێت ((خوایە ئەگەر ئەجەلی پێوەیە زوو بمحەوێنەوە، و ئەگەر ئەجەلیشم نایەت هەڵمسێنەوە، ئەگەر تاقیکردنەوەیشە ئارامیم پێ ببەخشە)) پێغەمبەری خوا(ﷺ)پێی فەرموو: چیت ووت؟ ئەویش بۆی دووبارە کردەوەو پێغەمبەریش (ﷺ)فەرمووی ((اللهم اشفه، اللهم عافه)) واتە ((خوایە شیفای بدەیت، خوایە

[1] فتح الباري (٣/٤٢١).

خۆشی کەیتەوە)). و پاشان پێی فەرموو ((قُم)) هەستە و ئیمامی عەلیش (ﷺ)هەستایەوەو دەڵێ دوای ئەوە جارێکی تر ئەو ئازارە نەهاتەوە بەلامدا.[1]

ب - هەواڵە غەیبی یەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەلایەن عەلی یەوە (ﷺ):

عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ)دەڵێت: ئەگەر لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)فەرموودەتان بۆ بگێڕمەوە، پێم خۆشە لەئاسمان فڕێم دەنە خوارەوە بەڵام بەناوی ئەوەوە درۆیەك هەڵنەبەستم، بەڵام ئەگەر قسەی ناو خۆمان بوو ئەوە جەنگ فرت و فێڵە،[2] و و لەپێغەمبەری خوام بیست (ﷺ)کە دەیفەرموو ((يأتي في أخر الزمان قوم حدثاء الاسنان، سفهاء الاحلام، يقولون من قول خير البرية، يمرقون من الإسلام كما يمرق السهم من الرمية، لا يجاوز إيمانهم حناجرهم، فأينما لقيتموهم فاقتلوهم، فإن في قتلهم أجراً لمن قتلهم يوم القيامة))[3] واتە ((لەئاخر زەماندا کۆمەڵێ کەس پەیدا دەبن تەمەنیان کەمە، تێگەیشتنیان سفرە، فەرمودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)باس دەکەن، چۆن تیر لەکەوان دەردەچێت ئاوا لەئیسلام دەچنە دەرەوە، و لەهەرکوێ گەشتن بەوانە بیانکوژن، چونکە کوشتنیان پاداشتی لەسەرە لەرۆژی قیامەتدا.

ج- سەرکەوتنی بەترس:

یەکێ لەنیشانەکانی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ)لەو فەرموودەیەدا دەردەکەوێت کە ئیمام عەلی (ﷺ)گێڕاویەتی یەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرموویەتی ((أعطيت ما لم يُعط أحد من الانبياء)) فقلنا: يا رسول الله ما هو؟ قال: ((نصرت بالرعب، واعطيت مفاتح الأرض، وسميت أحمدا، وجعل التراب لي طهوراً و جعلت أمتي خير الأمم))[4] واتە ((پێنج شتم پێ بەخشراوە کە بەهیچ پێغەمبەرێکی پێش خۆم نەبەخشراوە)) دەڵێ: ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)کامانەن؟ فەرمووی ((بەترس خستنە ناو دڵی دوژمنان و ڕزگارکردنی وڵاتان، و ناوم نراوە أحمد، و خۆڵ بەکارهێنان بۆ تەیەموم کردن و ئومەتەکەشم باشترینی ئومەتانن.

---

[1] مسند أحمد (١٥١/٢) أحمد شاكر (اسناده صحيح).

[2] منهج علي (ﷺ) في الدعوة الى الله لا (١١٧).

[3] البخاري كتاب المناقب (٢٨١/١). والمذكرون هم الخوارج.

[4] البخاري ژمارە (٣٣٥)

د - مۆری پێغەمبەرایەتی:

ئیمام عەلی (ﷺ) لەباسی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)دەڵێت: لەناو شانیدا مۆری پێغەمبەرایەتی پێوەبوو،[1] کە ئەمەش نیشانەیەك بوو جولەکەو گەورەکان بەوەدا دەیان ناسیەوە کە شتێکی بەرزی سور بوو لەلای شانی چەپیدا بوو، ئەوەندەی هێلکە کۆترێك دەبوو کاتی چوونەیەك و کاتی گەورە بوونیش ئەوەندەی مشتێك بووە.[2]

هـ- کێوەکان سڵاویان لە پێغەمبەری خوا کردووە (ﷺ):

گەورەی باوەڕداران ئیمام عەلی (ﷺ)باسی ئەوەی کردووە و فەرموویەتی: جارێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووم لەمەککە، و پێکەوە بۆ جێگایەك دەڕۆیشتین، دەگەیشتین بەهەر کەژێك یان بەهەر درەختێك سڵاویان لە پێغەمبەری خوا دەکردو دەیان ووت ((السلام علیك یا رسول الله)).[3]

٣ - هاندان بۆ ڕێنمونیەکانی پێغەمبەر (ﷺ) :

ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ) هانی موسڵمانانی ئەدا بۆ بەرز ڕاگرتنی ڕێنمونیەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ، ولە ووتەیەکیدا لە (الربذة) بە هاوەڵانی فەرموو (الزموا دینکم واهتدوا بهدي نبیکم ، واتبعوا سنته ، واعرضوا عما اشکل علیکم علی القرآن ، فما عرفه القرآن فالزموه وما انکره فردوه ))[4]ولە کاتی گەڕانەوەی لە شەڕی خەوارجەکان وتارێکی بە پێزی دا بۆ هاوەڵەکانی کە هانیدان بۆ بەرزڕاگرتنی ڕێنمونیەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وفەرمووی (واقتدوا بهدي نبیکم (ﷺ) ، فانه افضل الهدی، واستنوا بسنته فانها افضل السنن).

٤- ڕوونکردنەوەی گەورەیی پێغەمبەر(ﷺ) وئەو مافانەی خۆشەویست(ﷺ) کە لەسەر ئوممەتەکەیەتی:

ئیمامی علی(ﷺ) ، چاکەو گەورەیی پێغەمبەر(ﷺ) ی بۆ موسڵمانی ڕوون دەکردەوە وەکو ئەوەی خوای گەورە ڕێزی لەم ئوممەتە ناوە بە ناردنی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)بەوەی فێری

---

[1] مصنف ابن ابي شيبة (١١/٥١٣).

[2] فتح الباري (٦/٥٦١).

[3] المستدرك (٢/٦٢٠) إسناده صحيح.

[4] البداية والنهاية (٧/٢٤٦)، تاريخ الطبري.

خوێندن و حیکمەت وفەرزو سوننەتیی کردوون، بە مەبەستی ڕێنموونی کردنیان، هەروەها کۆیکردوونەتەوە بۆ ئەوەی پەرتەوازە نەبن و تزکیەی کردوون بۆ ئەوەی پاك خاوێن بن وکاتێك بە ئەرکی پێغەمبەرایەتی خۆی هەستا خوای گەورە گیانی کێشا (ﷺ) .

أ- باوەڕکردن بە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وهەڕەشەکردن لەهەڵبەستنی درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ):

ئەمیری باوەڕداران هەڕەشە دەکات لەودرۆهەڵبەستن بە دەم پێغەمبەر(ﷺ) ەوە ، ریعی کوڕی خراش دەڵێت گوێم لە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب بوو دەیووت : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (لا تكذبوا عليّ فانّه من كذب عليّ فليلج النّار) واتە ئەوەی درۆم لە گەڵدا بکات ئاگر جێیەتی ، هەروەها ئیمامی عەلی هەڕەشە لەوانەش دەکات کە فەرموودەی درۆ دەگێڕنەوە (کە دەشزانن درۆیە) کاتێك ئەم فەرموودەیەمان بۆ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ):(من حدث عني حديثا وهو يرى انه كذب فهو احد الكاذبين) سنن ابن ماجه (١٣/١) قال الالباني حديث صحيح

واتە ئەوەی فەرموودەیەك لە منەوە بگێڕێتەوە - ویشزانێت درۆیە - ئەوە ئەو کەسەی ئەو قسەیە دەگێڕێتەوە یەکێکە لەو درۆزنانە.

ب – خۆ دوور گرتن لەو هۆکانی بەدرۆخستنەوە

ئەمیری ئیمانداران(ﷺ) خەڵکی ڕێنموونی دەکرد بەوەی خۆیان دوور بگرن لە هەر کار و کردەوەیك دەبێتە هۆی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) وەك ئەوەی فەرموودەیەکی بگێڕیتەوە بۆ کەسانێك تێی نەگەن و لەو ئاستە نەبن وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە( حدثوا الناس بما يعرفون ، اتحبون ان يكذب الله ورسوله) واتا( بەو شێوەیە قسە لەگەل خەڵکیدا بکەن کە تێتان بگەن ئایا پێتان خۆشە خواو پێغەمبەرەکەی بە درۆبخرێنەوە) وئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی نابێت شتی متشابە بۆ عەوامی خەڵکی باس بکرێت هەروەکو چۆن ئیمامی ئەحمەد پێی مکروە بوو باس لە هەندێ فەرموودە بکات کە بە ڕواڵەت ئەوەی دەگەیاند بەرانبەر بە سوڵتان بوەستیتەوە ، وئیمامی مالك یش لە (الصفات) وئەبوو یوسف یش لە نامۆیەکان( الغرائب) ، وپێش ئەوانیش ابو هريرە، مەبەستیش ئەوەیە هەندێك فەرموودە بە ڕواڵەت بیدعە بە هێز

دەكات ومەبەستەكەشی ئەوە نییە بۆیە نابێت ئەم شتانە لای خەڵكانێك باس بكرێت كە ڕواڵەتی فەرموودەكان وەردەگرن بە بێ ئەوەی لە مەبەستەكەی تێبگەن .

ج – سلاوات لێدان لە سەر پێغەمبەر(ﷺ): خوای گەورە دەفەرموێت (إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴿٥٦﴾ )الاحزاب ٥٦

خوای گەورە لە ئایەتەدا باس لە گەورەیی پێغەمبەر (ﷺ) دەكات لە ئاسماندا بەوەی سەنای دەكات لە لای مەلائیكەتەكان ، وملائیكەتەكانیش یلاواتی لەسەر ئەدەن ، پاشان خوای گەورە ئەمر بە جیهانی خوارەو دەكات كە كە سلاواتی لەسەر بدەن بۆ ئەوەی سەنای هەردوو جیهانی ئاسمان و زەوی كۆبێتەوە لەسەری پێغەمبەر (ﷺ) وئیمامی عەلی یش (ﷺ) ئەم مافەی دووپات كردۆتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) كاتێك ئەم فەرموودەیەمان بۆ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر(ﷺ)(( البخيل الذي ذكرت عنده فلم يصلّ عليّ) .

٨- خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) : لە ئیمام عەلییان پرسی (ﷺ)خۆشەویستیتان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن بووە؟ ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: كان والله أحب الينا من أموالنا وأولادنا وأبائِنا وأمهاتِنا ومن الماء البارد على الضمأ))[1]

واتە: سوێند بەخوا خۆشترمان دەویست لە ماڵ و سامان و منداڵ و باوك و دایكمان و ئاوی ساردیش لەكاتی زۆر تینوێتیدا.

٩- چەند نموونەیەك لە شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە لایەن ئەمیری باوەڕدارانەوە:

أ/ عبدالرزاق دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئەوانەی عەلییان بینیوە لە كاتی سوار بوونی وولاخ ووتوویانە كاتێ پێی خستۆتە سەری فەرموویەتی (بسم الله) كاتێ لەسەر پشتی جیگیر بوو، فەرموویەتی (الحمد لله، سُبْحانَ الَّذي سَخَّرَ لَنا هَذا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ)، و پاشان سێ جار (الحمد لله) و سێ جار (الله أكبر) ی دەكردو دەیووت (اللهم لا اله الّا أنت،ظلمت نفسي فاغفر لي، إنه لا يغفر الذنوب الّا انت) و پاشان پێكەنی، پێیان ووت ئەی ئەمیری باوەڕداران هۆی چی بوو پێكەنیت؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوام دیوە بەم شێوەیەی كردوەو بەم شێوەشی ووتووە و پاشان پێكەنیوە و

---

[1] الشفا ـ قاضي عياض (٢/٥٦٨).

لێمان پرسیوە بۆچی پێدەکەنیت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ ئەویش فەرمووی ((عجبت للعبد - اذا قال لا اله الّا أنت ظلمت نفسي فاغفر لي فإنه لا يغفر الذنوب الّا أنت، يعلم إنه لا يغفر الذنوب الّا هو[1])). واتە ((سەرم سوڕدەمێنێ لەبەندە کاتێك دەڵێت: هیچ خوایەك جگە لەتۆ نیەو من ستەمم لەخۆم کردووەو لێم خۆش ببە، ئەگەر تۆ لێم خۆش نەبیت کەس نیە لێم خۆش بێت، ئەزانێ جگە لەخوا کەس ناتوانێ لێی خۆش ببێت)).

ب/ ئاو خواردنەوە بەدانیشتنەوەو بەپێوە دروستە:

عەتای کوڕە سائب لە زازانەوە دەگێڕێتەوە کە: عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ) جارێکیان بەپێوە ئاوی خواردەوە، خەڵکەکە بەجۆرێ سەیریان دەکرد وەك ئەوەی بەڕەوای نەزانن، ئەویش پێ ی وتن: چی یە سەیرم دەکەن؟ هەر ئەوەندەی بەپێوە ئاوم خوارد، من پێغەمبەری خوام دیوە (ﷺ) بەپێوە ئاوی خواردەوە و بەدانیشتنیشەوە ئاو دەخۆمەوە چونکە بەهەمان شێوە پێغەمبەری خوام دیوە (ﷺ) بەدانیشتنەوە ئاوی خواردۆتەوە[2] ..

---

[1] مسند أحمد رقم (٩٣٠) حسن لغيره.

[2] مسند أحمد ژمارە ١١٢٨ إسناده حسن.

# جێباسی پێنجەم

## گرنگترین کارەکانی عەلی (ﷺ)لەنێوان کۆچ و جەنگی خەندەق دا:

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەشاری مەدینە جێگیر بـوو، دەسـتی کـرد بەتۆکمـەکردن و دامەزراندنی بنەمای دەوڵەتی ئیسلامی، برایەتی خستە نێوان کۆچەریان و پـشتیوانان، و پاشـان مزگەوتی دروست کرد، و لەگەڵ جولەکەکانی ناوشاردا پەیماننامەی بەست، و لەو ساتە وەختـەوە جم و جۆڵە سەربازیەکان دەستی پێکرد بە دەرکردنی سریەو پەلەکان، و بنیادنانی لایەنی ئابوری و زانستی و پەروەردەیی لە کۆمەڵگەی نوێدا و لەم هەنگاوانەشدا عـەلی (ﷺ)هـەنگاو بەهـەنگاو وەك سەربازێکی ئامادەباش لەخزمەت پێغەمبەری سەروەردا بووە(ﷺ).

**یەکەم/ دەرکردنی سریەکان:**

هەر کە موسڵمانان بەسەرکردایەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەمەدینەدا دامەزران، بەدوایدا جم و جۆڵی سەربازی و دەرکردنی سریەکان دەستی پێکرد بە مەبەستی دروست بوونی هەیبەت بـۆ دەوڵـەتی ئیسلامی لە ناوەوەو لە دەرەوەدا و ڕاکێـشانی هۆزەکـانی دەوروبـەر و تەسـك کردنـەوەی ڕۆڵـی عەرەبە دەشتەکی یەکانی چواردەور، و هەروەها بەمەبەستی ئامادە سازی هاوەڵەکانی بـۆ کـاری جەنگ و جیهادی گەورەو ڕزگارکردنی وڵاتان و دروست کردنی سەرکردەی مەیدانی و لەهەموو ئەم سریانەدا عەلی (ﷺ)شێرانە بەشداری کردووە کە پێش جەنگی بەدرو دوای بەدریش ڕوویانداوە:-

**ئەوانەی پێش بەدر ڕوویداوە:**

**١- غەزای (العشیرة):**

لەم غەزایەدا لەگەڵ قورەیشیەکاندا تێك ئاڵان و پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەجێگەی خۆی لەمەدینە ئەبو سەلەمەی کوڕی عبدالاسد ی دانا، و ماوەیەك کە چەند ڕۆژێ لە ناوچەی (العشیرە) مایەوە، وئەم ناوچەیە لەنێوان مەککەو مەدینەدا بـوو و لـەوێ لەگـەڵ بـەنی مودلـەج وبـەنی چـەمرە دا هاوپەیمانی بەست و پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە، عەماری کوڕی یاسر (ﷺ)بۆمـان دەگێڕێتـەوەو دەڵێت: من و عەلی لەجەنگی (العشیرة) دا پێکەوە هاوڕێ بـووین، و هەرکـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) گەیشتە ئەوێ، لەوێ جێگیر بوو، ئێمەش کۆمەڵێ لە خەڵکی بەنی مودلەج مان بینـی کـە

خەریکی چاك کردنی کانی یەك بوون و ئێمەش ماوەی کاتژمێرێك سەیرمان کردن تا چاومان چووە خەو، و هەرکە بەخەبەر هاتین ئەوێمان بەجێ هێشت و خۆمان گەیاندە ناو دارخورماکان و لەسەر خۆڵەکە خەوتین، و بەخەبەر نەهاتین تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەخەبەری هێنـاین و بەقاچـەکانی ئەیداین بەم دیو دیودا، و هەموو سەرو چاومان خۆڵاوی بوو بوو، بۆیـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بەعەلی فەرموو: هەستە ئەی ئەبو توراب، واتە ئەی خۆڵاوی، ((أحدثكما باشقى النـاس رجلين؟ فقلنا: بلى يا رسول الله، قال: ((احمير ثمود الذي عقر الناقة، والذي يضربك يا علي على هذه حتى تبل منه هذه ـ أي لحيته ـ ))[1] واتە: باسی نەگبەت ترین کەستان بۆ بکەم کە دوو کەسن؟ ووتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، فەرمووی: ئەو پیاوە سورەی نـاو سـەمود کـە حوشـترەکەی سەربڕی و پیاوێکیش کە شمشێر درکێشێ بەسەرتدا و ڕیشت لەخوێندا سور دەکات

٢- غەزای بەدری یەکەم:

هۆکاری ئەم غەزایە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کرزی کوڕی جـابری فهـری دای بەسـەر لەوەڕگـەی مەدینەداو هەندێ حوشترو مەڕو ماڵاتی فڕانـد، و پێغەمبـەری خـوایش (ﷺ) دەرچـوو بـۆی و شوێنی کەوت تا گەیشتە دۆڵێ کە پێیان دەوت (دۆڵی سەفوان) لەنزیك بەدر، بەڵام کرزی لەدەست دەرچوو، بۆی نەگیراو گەڕایەوە بۆ شاری مـەدینە.[2]

دووەم/ جەنگی بەدر:

نەوەوی ـ (ﷺ) ـ دەڵێت: هەموو مێژوو نووسان لەسەر ئەوەن کـە ئیمـام عـەلی (ﷺ)بەشـداری جـەنگی بـەدر و هـەموو جەنگـەکانی تریـشی کـردووە جگـە لـە تـەبوك، و لـەزۆر جەنگـدا پێغەمبەر(ﷺ) ئاڵاکەی داوەتە دەستی ئەو[3]. ئیمامی عەلی (ﷺ)خـۆی یـەکێك بـوو لـە شـۆڕە سوارەکانی ئەم جەنگەو با خۆی بۆمان باس بکات،

حارثـە ی کـوڕی مـضرب ی کـوڕی عـەلی کـوڕی ئـەبو طالـب بۆمـان دەگێڕێتـەوە کـە عـەلی (ﷺ)ووتوویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی بەدری بۆ دەکرێت، هەر کە هەواڵی ئەوەمان زانی کە بێباوەڕان گەیشتوونەتە سەر کانیاوەکانی بەدر، یەکسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی گەیاندە

---

[1] فضائل الصحابة (٨٥٥/٢) ژمارە ١١٧٢ أسنادە حسن.

[2] سيرة ابن هشام (٦٠١/٢).

[3] تهذيب الأسماء واللغات (٢٤٥/١).

ئەویٚ، و بەدریش بیری لیٚ بوو، پیٚش ئیٚمە بت پەرستەکان خۆیان پیٚ گەیاندبوو - بینیمان دوو پیاو لەویٚن کە یەکیٚکیان قورەیشی بوو یەکیٚکی تریشیان خزمەتکاری عەقەبەی کوڕی ئەبی موعیط بوو، قورەیشی یەکە ڕای کرد و بەلاٚم خزمەتکارەکەمان دەستگیر کرد، و پیٚمان دەووت: سوپای ئیٚوە چەند کەسن؟ ئەویش هەر دەیووت: وەللاهی زۆر زۆرن و زۆر بەهیٚزن، و هەر نەیدەووت چەند کەسن، تا هیٚنایان بۆلای پیٚغەمبەر (ﷺ) ئەویش لیٚی پرسی، و هەمان وەلاٚمی دایەوە، بۆیە پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) لیٚی پرسی: چەند حوشتر سەر دەبڕن؟ کابرا ووتی: (دە) پیٚغەمبەری خوا زانی لە هەزار زیاترن بۆیە فەرمووی ((اللهم إنك ان تهلك هذه الفئة لا تعبد)) واتە ((ئەگەر ئەم دەستەیەمان لەناو بەریٚت ئیتر لەسەر زەوی ناپەرستریٚت)).

ئەوە بوو بەیانی پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) هاواری کرد - خەلکینە نویٚژەکانتان - و پیٚغەمبەریش بەرنویٚژی بۆ موسلمانەکان کردو هانی داین لەسەر جەنگ و جیهاد و فەرمووی ((أن جمع قريش تحت هذه الصلع الحمراء من الجبل)) واتە ((سوپای بیٚ باوەڕان لەبنی ئەم کیٚو سورەدا کۆبونەتەوە بۆمان)). کاتیٚ نزیك بوونەوە لیٚمان بەرامبەری یەك ڕیز بووین، کابرایەکمان بینی بەسواری حوشتریٚکی سورەوە بوو، پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) بەعەلی فەرموو ((حەمزەم بۆ بانگ بکە)) کە لەهەمووان نزیکتر بوو لە کافرانەوە (ئایا کیٚ خاوەنی ئەو حوشترە سورەیە، و چیان پیٚ دەلیٚت)؟ پاشان فەرمووی ((ئەگەر کەسیٚکیان تیٚدابیٚت قسەی خیٚریان بۆ بکات، ئەوە خاوەنی ئەو حوشترە سورەیە).

حمزە (ﷺ)هات ووتی: ئەوە عوتبەی کوڕی ڕەبیعەیە، پیٚیان دەلیٚت جەنگ مەکەن، من دەبینم کۆمەلیٚك بۆ گیان فیدایی هاتوون و ئیٚوە ناتوانن دەستیان بۆ بەرن، خۆ پیاوچاکتان تیٚدا ماوە، ئەی هۆزەکەم ئەمە بەسەری منەوە ببەستن و بلیٚن عوتبە دەترسا، خۆشتان چاك دەزانن من ترسنۆکی ناوتان نیم، ئەبو جەهل گویٚی لە ووتەکانی عوتبە بوو ووتی: ئەمە تۆی وادەلیٚیت؟ وەللاهی کەسیٚکی تر ئەم قسەیەی بکردایە گازیٚکم لیٚ دەگرت، تۆ جەرگ و دلت پڕبووە لە ترس. عوتبەیش ووتی: قسە بەمن دەلیٚیت هەی زەردەلٚ، ئەمڕۆ دەردەکەویٚت کاممان ترسنۆکین. پاش ئەوە عوتبە ڕووی کردە سوپای باوەڕو پیٚی ووتن: کیٚ دیٚتە دەرەوە بۆ شمشیٚربازی؟ سیٚ گەنجی پشتیوانان هاتنە دەر. عوتبە ووتی: ئەوانەمان ناویٚ با ئامۆزاکانی خۆمان بیٚنە دەرەوە.

پێغەمبەریش (ﷺ)فەرمووی : هەستە عەلی، تۆش ئەی حەمزە،و تۆش عوبەیدی کـوڕی حارث. خوای گەورە لەسەر دەستی ئێمەدا عوتبە و شیبەی کوڕی ربیعە و وەلیدی کوڕی عوتبە کوژران،و حەفتا کەسمان لێ کوشتن و حەفتامان لێ بەدیل گرتن .

پیاوێکی بچکۆلەی کورتە بالاّ لە پشتیوانەکان عەباسی کوڕی عبدالمطلب ی بە دیلی ڕادەکێشا و عەباسیش ووتی : ئەی پێغەمیەری خوا، من ئەمە دیلی نەکردوم، بـەلکو پیـاوێکی دەم و چـاو جوان بەسەر ئەسپێکی بالەکەوە بوو کە ئێـستا نـایبینم ... پیـاوە پـشتیوانەکەش ووتـی: ئـەی پێغەمبەری خوا خۆم دیلم کردووە، پێغەمبەریش (ﷺ)پێی فەرموو ((أسکت فقد أیدك الله تعالی بملكٍ کریم )) واتە بێ دەنگ بە خوای گەورە بە فریشتەیەکی بەڕێز هاوکاری کردویت. عەلی (ﷺ) دەڵێت (( لەنەوەی عبدالمطلب عەباس و عقیل و نوفلّ ی کوڕی حارپ مان بەدیل گرت.[1]

سێیەم/ هاوسەرگیری لەگەڵ فاطمە دا (ﷺ):

ناوی فاطمـە ی کچی پێـشەوای لـە خواترسـان و سـەرداری مرۆڤایـەتی ( رسـول الله ) (ﷺ) و دایکیشی خەدیجەی کچی خوەیلدە ، وە لەپێش پێغەمبەرایەتیدا لـە دایـك بـووە، کـە تەمـەنی پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتەدا ( ٣٥) ساڵ بوو.

و لە پاش جەنگی بەدر و لە ساڵی دووەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) مارەی کرد لە عـەلی (ﷺ)و حەسەن و حوسەین و ئوم کەلسومی لێبوو، شەش مانگیش دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش وەفات دەکات خوا لێی ڕازی بێت .[2]

١ ـ مارەیی و جیازی :

عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ)دەڵێت: فاطمە لەلایەن پێغەمبەری خواوە دیاری کرا، خزمەتکارێکم ووتی : ئەزانی فاطمە لەلایەن پێغەمبەری خواوە دیاری کراوە ؟. دەڵێ ووتم نەمزانیوە . ووتـی : بەڵێ دیاری کردووە ، بۆ ناچیت بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و داوای بکەیت لێت مارە بکات . عەلی (ﷺ)دەڵێت : ووتم: هیچ شتێکم هەیە تا ژنی پێ بێنم ؟ ئەو خزمەتکارە ووتی : کوڕە بـڕۆ ئەگەر بچی ئەتداتێ،دەڵێ وەلاهی لە کۆڵم نەبویەوە و و هەر داوای لێدەکردم کە بڕۆم تا ڕۆیـشتم

[1] مسند احمد ژمارە ٩٤٨ اسناد صحیح .
[2] حلیة الأولیاء ( ٢/٣٩ ـ ٤٣).

بۆ لای پێغەمبەرو لەبەردەستیدا دانیشتم و ئارەقێکی زۆرم کرد وسوێند بەخوا لەبەر هەیبەتی پێغەمبەری خوا نەم توانی لێو بکەمەوە .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ووتم: کارێکت هەبوو هاتی؟ پێویستیەکت هەبوو؟ منیش هەر بێدەنگ بووم، ووتی : لەوانەیە بۆ داوا کردنی فاطمە هاتویت؟. ووتم: بەڵێ، و ئەویش ووتی ((وهل عندك من شيءٍ تستحلها)) واتە هیچت هەیە لە مارەیی یەکەیدا بیدەیت. ووتم: نەوەڵاهی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەی ئەو درعەت چی لێهات کە دام پێت؟ سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە ئەو درعە (( ٤٠٠ )) درهەم دەکات.. ووتم: ماومە ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (( قد زوجتكما،فابعث اليها بها فاستحلها)) واتە دەی لەسەر ئەو درعە مارەم بڕی بۆت و تۆش بۆی بنێرە، ئا ئەوە بوو مارەیی فاطمە ی کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ).[1]

لە ڕیوایەتی شیعەکاندا هاتووە، کە ئیمام عەلی (ﷺ) فەرموویەتی : درعەکەم هەڵگرت و بەمەبەستی فرۆشتنی ڕێگەی بازاڕم گرتە بەر و فرۆشتم بە عثمانی کوڕی عەفان بە چوار سەد درهەم،کاتێ پارەکەی پێدام و درعەکەی لێ وەرگرتم و پێی ووتم: ئەی باوکی حەسەن ، ئایا ئێستا من خاوەنی ئەو درعە نیم و تۆش خاوەنی پارەکەی؟ ووتم:بەڵێ . ووتی : دەی ئەو درعە لەلایەن منەوە دیاری بێت بۆ تۆ، منیش پارەکەو درعەکەشم هێنایەوە و خستمە بەردەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) . و ئەوەشی کە عثمان لەگەڵی کردم بۆم باس کرد ، ئەویش دوعای خێری بۆ کرد.

٢- شایی یەکەی:

ئەسمای کچی عومەیس دەڵێت: من لە شایی یەکەی فاطمە دا بەشداریم کرد، و لەبەیانی ئەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە بەر دارگاکەو فەرمووی ((يا أم أيمن ادعي اليّ أخي)) واتە ئەی ئوم ئەیمەن براکەمم بۆ بانگ بکە، ووتم: براتە کەچی کچی خۆتی ئەدەیتێ؟ فەرمووی: بەڵێ ئەی ئوم ئەیمەن. و عەلی هات و پێغەمبەریش ئاوی پرژاند لەدەم چاوی و دوعای خێری بۆکرد و پاشان فەرمووی: فاطمە م بۆ بانگ بکەن، و فاطمە ش هات بەڵام لەشەرماندا خەریك بوو دەکەوت بەلا، و پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو ((اسكتي فقد انكحتك احب اهل بيتي

[1] دلائل النبوة للبيهقي(٣ /١٦٠) اسناده صحيح.

الي)) [1] واتە ((بێ دەنگ بە ئەوا تۆم دا بەخۆشەویست ترین کەسی بنەماڵەکەم، و پاشان پێغەمبەری خوا هەندێ ئاویشی پژاند بە دەم و چاوی ئەویشداو دوعای خێری بۆکردن، و پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوەو ڕەشاییە یەکی بەدی کرد فەرمووی: من هۆا؟ ئەمە کێ یە؟ ووتم: منم، فەرمووی: ئەسمای؟ ووتم بەڵێ، فەرمووی: ئەسمای کچی عومەیس؟ ووتم: بەڵێ، فەرمووی ((جئت في زفاف بنت رسول الله تكرمة له؟)) واتە ((بۆ زەماوەندی کچی پێغەمبەری خوا وەك ڕێزلێنان هاتوویت؟ ووتم بەڵێ، ئەویش دوعای خێری بۆکردم. [2]

وەلیمەو چێشتی شایی:

بەریرە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کاتێ عەلی فاطمە ی خواست، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((انه لابد للعرس من وليمة)) واتە ((ژن خواستن دەبێت وەلیمەی بۆ بکرێت))، سەعد ووتی: بەرانێك لەسەر من و کۆمەڵێ لە پشتیوانەکانیش بڕێك گەنمەشامیان ئامادەکرد، و ئەو شەوەی کە فاطمە بگوێزێتەوە بەعەلی فەرموو: باسی هیچ مەکە تا دەمبینیتەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) داوای ئاوی کردو دەستنوێژی پێ گرت وئاوی دەستنوێژەکەشی پژاند بەدەم و چاوی عەلی داو فەرمووی ((اللهم بارك فيهما وبارك عليهما، وبارك في شبلهما)) [3] واتە ((خوایە پیرۆزیان کەیت و پیرۆزیان بێت و نەوەکانیشیان پیرۆزبێت.

٤- گوزەرانی عەلی و فاطمە ـ خوایان لێ ڕازی بێت ـ :

ژیان و گوزەرانی عەلی و فاطمە ـ کە خۆشەویسترین کەسی پێغەمبەری خوا بوون (ﷺ) زۆر نەداری و لە تەنگەشەدا بووە و نائارامی و ماندوویەتی زۆری پێ دابوون،

هەناد لە عەتاوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پێیان ووتووم کە عەلی (ﷺ) ووتوویەتی: چەند ڕۆژێ من و فاطمە ماینەوە کە هیچمان نەبوو بیخۆین و پێغەمبەریش هیچی نەبوو، و لەماڵ دەرچووم و لەڕێگا دینارێکم دۆزیەوە لەسەر ڕێگەکە کەوتبوو، ماوەیەك وەستام بەخۆمم دەووت ئایا هەڵیگرم یان بەجێی بهێڵم، پاشان هەڵم گرت لەبەر وەزعی خراپی ژیانمان، و بردم بۆ ئارد فرۆشەکان و ئاردم پێ کڕی و هێنامەوە بۆ فاطمە و پێم ووت: بیشێلە و بیکە بەنان و ئەویش دەستی کرد بەهەویر

---

[1] كشف الغمة للاربلي (٣٥٩/١)، بحار الانوار للمجلسي لا ٣٩.

[2] فضائل الصحابة (٩٥٥/٢)، ژمارە ٣٤٢ إسناده صحيح.

[3] فضائل الصحابة (٨٥٨/٢) إسناده صحيح.

شێلان و کە زۆر ماندوویی و هیلاکی پێوە دیاربوو ـ و پاشان کردی بەنان و منیش هاتم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و مەسەلەکەم بۆ گێڕایەوە و ئەویش فەرمووی ((کلوه فإنه رزق رزقكموه الله عز وجل))[1] واتە ((بیخۆن ئەوە ڕۆزیەکە و خوای (عز وجل) بۆی ناردوون.

شەعبی دەڵێت: ئیمامی عەلی (ﷺ) دەڵێت: من فاطمە ی کچی پێغەمبەری خوام هێنا، کەچی پێخەفێك نەبوو لەسەری بخەوین جگە لەپێستەی مەڕێك نەبێت کە بەشەو لەسەری دەخەوتین و بەڕۆژیش لەسەری دادەنیشتین و ئالفمان دەخواردو هیچ خزمەتکارێکیشمان نەبوو.[2]

لە موجاهیدیشەوە دەگێڕنەوە کە عەلی (ﷺ) ووتوویەتی: جارێك لە مەدینە زۆر زۆر برسیم بوو، چووم بۆ گەڕەکی سەرەوەی مەدینە تا ئیشێك بدۆزمەوە، و بینیم وا ژنێك خۆڵی زۆری کۆکردۆتەوەو گومانم برد کە ئاوی دەوێت بۆ شێلانی قوڕەکەی، و هاتم بۆلای لەگەڵی ڕێك کەوتم کە هەر سەتڵێ ئاوی بۆ بهێنم بەرامبەر دەنکێ خورماو شانزە سەفەرم بۆ هێنا تا وام لێهات دەستەکانم تڵۆقەیان کردو پاشان دەستم شۆری و چووم بۆلای و دەستم پێ پیشاندا و ئەویش (١٦) دەنك خورمای پێدام و هاتمەوە بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆم باس کردو ئەویش لەگەڵمدا دەستی کرد بەخواردنی خورماکە.[3] و ئەم خەبەرەش بەڵگەیە لەسەر هەژاری و گوزەرانی خراپی ـ گەورەی باوەڕداران عەلی (ﷺ) لەشاری مەدینەو لەم بەسەرهاتەشەوە فێری ئەوە دەبین بەشێوازی دروست ڕوو بەڕووی هەژاری ببینەوەو وەك عەلی وابین کاسبی بکەین و نەڕۆین دانیشین و چاوەڕوانی ئەوە بکەین خێرمان پێ بکەن و هەروەها ئەوپەڕی خۆنەویستی بەدی دەکەین کە (١٦) دەنك خورما پەیدا دەکات، و نایشارێتەوە بۆخۆی بەڵکو خێرا خۆی گەیاندە پێغەمبەری خواو لەگەڵ ئەودا خواردی.[4]

**٥- دنیا نەویستی و خۆگری فاطمە ( رضی الله عنها ):**

ژیانی زۆر سادە بوو، و دوور بوو لە ئاڵۆزی، لەژیانی زبرەو نزیکتر بوو نا خۆش گوزەرانی.

---

[1] المرتضى للندوي، لا (٢١).

[2] هەمان سەرچاوە لا (٤١).

[3] مسند أحمد ١١٣٥ إسناده ضعيف لانقطاعه.

[4] التاريخ الاسلامي للحميدي (١٩/٤٩-٥٠).

ئەم ڕووداوەی بۆتان باس دەکەم بەڵگەیە لەسەر ژیانی ناخۆش و زبری فاطمە (ﷺ)تا نارەحەتی ناچاری کردن کە بڕۆنە خزمەتی سەروەرمان (ﷺ) داوای لێ بکەن خزمەتکارێکیان پێ بدات لە بەیت المال.

جارێکیان عەلی (ﷺ)بە فاطمە ی ووت: وەڵڵاهی ئەوەندەم ئاو هێناوە خەریکە پشتم ئەشکێ، پاشان، پێی ووت: خوای گەورە کەنیزەیەکی چاکی لەجەنگدا بەباوکت بەخشیوە، بۆ داوای کەنیزەکێکی لێ ناکەیت؟ ئەویش ووتی: وەڵڵاهی منیش ئەوەندەم هەویر شێلاوە دەستەکانم خەریکە لەجولە ئەکەون.

فاطمە (رضی الله عنها)دەڵێت: هاتمە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) پێی ووتم: ((ما جاء بك يا بنية؟)) کچم بۆچی هاتوویتەوە؟ دەڵێ: تەنها بۆ ئەوە هاتمەوە کە سڵاوێکت لێ بکەم، و شەرمم کرد پێی بڵێم و گەڕامەوە، و عەلی پێی ووتم: ها چیت کرد؟ فاطمە یش ووتی: ڕووم نەهات پێی بڵێم، ئەمجارە پێکەوە هاتین بۆ لای و عەلی ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەندەم ئاو ڕاکێشاوە خەریکە پشتم دەشکێت و فاطمەیش ووتی: ئەوەندەم هەویر شێلاوە خەریکە پەنجەکانم لەجوولە دەکەون و خوای گەورەیش کۆمەڵێ کەنیزەك و شتی پێ بەخشیویت و خزمەتکارێکمان پێ بدە.

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی ((والله لا أعطيكما وأدع أهل الصفة تطوي بطونهم، لا أجد ما أنفق عليهم، ولكنني أبيعهم وأنفق عليهم أثمانهم))[1] واتە ((وەڵڵاهی ناتاندەمێ لەوەختێکدا ئەهلی صوفە ـ بێ ماڵ و حاڵەکان لەمزگەوت دەخەوتن ـ لەبرساندا سکیان دەوشێرن و شتێکیشمان نی یە سەرفی بکەین بۆیان، بەڵام من ئەو کەنیزەکانە دەفرۆشم و پارکەیان بۆ سەرف دەکەم)).

(بە نائومێدی) گەڕانەوە بۆ ماڵەوەو پێغەمبەری خوایش (ﷺ) سەردانی کردن دەبینی لێفەیەکیان هەیە ئەیدەن بەسەریاندا قاچیان دەردەکەوێت و دەیدەن بەقاچیاندا سەریان دەردەکەوێت، هەرکە بینیان هەستانەوە سەر پێ ـ شڵەژان پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون: لەجێی خۆتان مەجوولێن.و پاشان فەرمووی ((الا أخبركما بخير مما سألتمان؟)) قالا بلى، واتە: ئایا شتێکتان پێ بڵێم زۆر لەوە خێرترو باشتر بێت کە داواتان لێ کردم؟ ووتیان: بەڵێ. فەرمووی ((كلمات علمنيهن جبريل-عليه

---

[1] السيرة النبوية للصلابي (٢/٩٩)، مسلم ژ (٢٧٢٧)، بخاري ژ (٣٧٠٥).

السلام)) واته: شەند ووشەیەك كە جوبرەئیل فێری كردووم، فەرمووی ((تسبحان في دبر وكل صلاة عشرا، و تحمدان عشر، و تكبران عشراً، وإذا أويتما الى فراشكما فسبحا ثلاثاً و ثلاثين و احمدا ثلاثاً و ثلاثين، و كبرا اربعاً و ثلاثين))[1] واته: لەدوای هەموو نزێژێك (١٠) جار سبحان الله و (١٠) جار (الحمد لله) و (١٠) جار الله أكبر) بكەن و ئەگەر چوونە سەرجێگەی خەوتنیشتان (٣٣) جار (سبحان الله) بكەن و (٣٣) جار (الحمد لله) و (٣٤) جاریش (الله أكبر) بكەن

لەم بەسەرهاتەدا هەندێ بەهای بەنرخی لێ وەردەگیرێت لەوانە:

ئەم بەسەرهاتە ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆن قەیرانە ئابووریەكانی بەرێ كردووە كە بەسەر دەوڵەتی ئیسلامیدا هاتووە، ئەمەش لەسەر پیادەكردنی بەرنامەی (شتە گرنگەكان لەپێشترن) و نەهێشتنی برسێتی ئەهلی ـ صوفە ـ پێویست و گرنگەو ئەو پێداوستی یەی عەلی و فاطمە ـ خوایان لێ ڕازی بێت- كە داوای خزمەتكارێكیان كرد لەپلەی دووەمدا دێت و ناگاتە پلەی نەبوونی و هەژاری ئەهلی (صوفە) بۆیە ئەهلی صوفە لەپێشتر بوو لەلای.

(بەكارنەهێنانی پلەو پایەو دەسەڵات لەلایەن پێغەمبەرەی خواوە (ﷺ) بۆ خزمەتكردنی كچ و خزم و كەس و كارەكەی و(بڕژێنەو بیڕژێنە) سامانی نەخستۆتە بەردەمیان و هەژارو داماوانیش چاویان زلتەی بێت وەك بەرپرس و مەسولەكانی ئەمڕۆ بەگشتی كەوتۆتە ئەو تاوانەوە مەگەر كەسێك خوا ڕەحمی پێ بكات وانەبێت كە زۆر كەمیشن). ـ وەرگێڕ ـ

- ئەم پەروەردە ناوازەیە زۆر كاری كردبووە سەر دەروونی عەلی (ﷺ) و ڕۆژان تێپەڕین و عەلی بوو بە (گەورەی باوەڕداران) و كەچی پشتی لەدنیا خۆری و ژیانی نەرم و باق و بریق هەڵكرد لەكاتێكدا كە هەموو سامانی سەرزەوی دەهاتەوە بەردەستی چونكە یادی خوا ـ عز وجل ـ دڵ و دەروونی داگیر كردبوو، چونكە ئەو ئامۆژگاریە ناوازەیەی پێغەمبەری خوای لەیاد نەچوو بەردەوام ئەو زیكرانەی دەخوێند و دەیووت: وەڵڵاهی لەژیانمدا وازم لێ نەهێناون لەوەتی فێریان بووم .. ووتیان: تەنانەت شەوی كارەساتی (صفین) یش؟ ووتی: تەنانەت ئەو شەوەیش.[2]

٥- هەڵسان و خەوتنمان بەدەستی خوایە:

[1] البخاري ژمارە (٣٧٠٥)، مسلم ژمارە (٢٠٩٢/٤).
[2] مسلم (٢٠٩٢/٤).

عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ)دەڵێت: شەوێکیان من و فاطمە خەوتبووین و پێغەمبەری خوا(ﷺ) هات بۆ ماڵمان خەبەری کردینەوە بۆ شەونوێژ و پاشان خۆی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و دەستی کرد بە شەونوێژ، دەڵێ: هەستی بە جم و جۆڵمان نەکرد بۆیە دووبارە هاتەوە بۆ لامان و هەڵی ساندین و فەرمووی ((قوما فصلّیا)) واتە هەستن نوێژ بکەن.

دەڵێ: منیش لەخەو هەستام و چاوم دەپرواند و بەدەم خۆمەوە دەمووت: ((انا واللە ما نصلي الّا ما کتب لنا، إنما أنفسنا بید اللە، فإذا شاء أن یبعثنا بعثنا)) واتە ((وەڵڵاهی ئەتوانین ئەوەندە نوێژ بکەین کە بۆمان نووسراوە، و دەروونەکانمان لەدەستی خوادایەو گەر بیوێت هەڵمان دەستێنێ!.

عەلی دەڵێت: پێغەمبەری خوایش(ﷺ) پشتاو پشت گەڕایەوە و بەجێ ی هێشتین و دەستی دەکێشا بەڕانی خۆیداو دەیووت ((هەر ئەوەندە نوێژ دەکەین کە بۆمان نووسراوە — هەر ئەوەندە نوێژ دەکەین کە بۆمان نووسراوە و ئەم ئایەتەشی دەخوێند ((وَكَانَ الإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلاً)).

ئەمەش بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ئەوەی کە عەلی (ﷺ)هیچ زانیاریەك وهیچ مەسەلەیەکی زانستی نەشاردۆتەوەو گەیاندوویەتی ئیتر با پەیوەندیشی بەخۆیەوە هەبێت و باسکردنیشی زیان بە خۆی بگەیەنێت، و ئەگەر بیشی ویستایە ئەیتوانی بیشارێتەوەو کەس هەر باسیشی نەکات و شەو نوێژیش سوننەت بووە نەك واجب.

## چوارەم

## حەسەن و حوسەینی کوڕی عەلی(ﷺ):

١- حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوو طالب- الهاشمي کچەزای پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕەیحانەی بۆن خۆشی دنیای و یەکێ لە دوو سەرکردەی گەنجەکانی بەهەشت و دایکیشی فاطمە ـ الزهراء ـ یە، و لە (١٥) ی ڕەمەزانی ساڵی سێیەمی کۆچی و هەندێ دەڵێن لەشەعباندا لەدایك بووە و لەساڵی (٥٠) ی کۆچیدا وەفاتی کردووە.[1]

عەلی (ﷺ) دەڵێت: کاتێ حەسەنم بوو ناوم نا ـ حەرب ـ و پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ ماڵمان و فەرمووی ((أروني إبني ما سميتموه؟)) ئادەی نەوەکەمم پێ نیشاندەن ویزانم ناوتان ناوە چی؟ ووتم: (حەرب) فەرمووی ((بل هو حسن))[2] واتە بەڵکو ناوی حەسەنە.

ئا بەوجۆرە ناوی توندو تیژو ناخۆشی دەگۆڕی بۆ ناوی جوان و دلڕفێن کە خۆشی بەخش بێت بە دڵ و دەروونەکان. و کۆرپەکەی گرتە سەردەستەکانی و ماچی کرد، و ئەبو رافع (ﷺ) ئاگادارمان دەکات لەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کردی دەڵێت: پێغەمبەری خوام بینی (ﷺ) بانگی دا بەهەردوو گوێی حەسەندا.[3]

(أبو رافع) (ﷺ) دەربارەی (عەقیقە) کردن بۆ حەسەن دەڵێت ((کاتێ فاطمە حەسەنی بوو بەپێغەمبەری خوای ووت: ئایا دوو مەڕ سەربڕم بۆ کوڕەکەم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ((لا ولكن احلقي رأسه وتصدقي بوزن شعره من فضة على المساكين والاوفاض))[4] واتە ((نەکەی، بەڵکو سەری بتاشن و بەقورسایی مووەکانی سەری زیو بەسەر هەژاران و بێ ماڵ و حاڵەکان مزگەوتدا (أهل الصفه) ببەخشەرەوە)).

---

[1] حلية الأولياء (٣٥/٢).

[2] البخاري في الأدب (٢٨٦).

[3] سنن أبي داود ١ (٥١٠٥) و إسناده ضعيف.

[4] الطبقات (٢٣٣/١) إسناده ضعيف.

بەرائی کوڕی عازب (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: حەسەنی کوڕی عەلیم بەسەر شانی پێغەمبەری خواوە بینی و دەیفەرموو: ((اللهم اني أحبه فأحبه)) واتە ((خوایە گیان من خۆشم دەوێت و تۆش خۆشت بوێت)).

ئەبی بیکرە (ﷺ)دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا لەسەر مینبەرەکەی خۆی ووتاری دەداو حەسەنی لەبەردەمدا بوو، سەیرێکی خەڵکەکەی دەکردو سەیرێکی حەسەنیشی دەکرد و دەیفەرموو ((ابني هذا سيد ولعل الله ان يصلح به بين فئتين من المسلمين))[1] واتە ((ئەم کوڕەم سەیدو سەرگەورەیە و لەوانەیە خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە ئاشتی بخاتە نێوان دوو کۆمەڵی گەورە لە موسڵمانان. و بێگومان ئەم خەبەرەی باوای هاتەدی و ئەم کوڕە مەزنە کارێکی زۆر گەورەی ئەنجام دا کە پڕیەتی لە وانەی خۆنەویستی و کورسی نەویستی و دابەزین بۆ بەرامبەرە موسڵمانەکەی. و ئەوەبوو بوو بەهۆی نەڕشتنی خوێنێکی گەورە لەنێوان موسڵماناندا و وازی لە خیلافەت هێنا بۆ موعاویە، (خوا لەهەموویان ڕازی بێت) ئەمەش لەساڵی ٤١ ی کۆچیدا بوو.

سەعیدی مەقبەری دەڵێت: لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا دانیشتبووین حەسەنی کوڕی عەلی (ﷺ) هات و سڵاوی لێ کردین و هەموو وەڵامان دایەوە تەنها أبو هريرە (ﷺ) نەبێت کە ئاگای لێ نەبوو، ووتمان: ئەی ئەبو هريرە ئەمە حەسەنی کوڕی عەلی بوو سەلامی لێ کردین، ئەبو هریرەیش بەهەڵەداوان چوو بدوایداو پێ ی ووت: ((وعليك السلام يا سيدي، وثم قال إنه سيد))[٢] واتە: سڵاویش لەتۆ بێت ئەی گەورەم، پاشان فەرمووی: ئەو سید و گەورەیە.

هەروەها بخاری بەئیسنادی عەقەبەی کوڕی حارث دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئەبو بەکری صدیقم بینی (ﷺ)کە حەسەنی بەباوەشەوە بوو دەیفەرموو ((بأبي شبيه بالنبي وليس بعلي)) واتە: شێوەی لەپێغەمبەری خوایە دەکات هیچی لەعەلی ناکات و عەلیش گوێ ی لێ بوو پێدەکەنی.[٣]

---

[1] البخاري ژمارە (٣٧٤٦).

[2] المستدرك كتاب معرفة الصحابة (١٦٩/٣) صحيح الإسناد ووافقه الذهبي.

[3] البخاري ژ (٣٧٥٠).

۲- حسێن کوڕی عەلی ـ خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت ـ:

ناوی أبو عبداللە حسینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالب ە (ﷺ) و نەوەی پێغەمبەری خوایەو ڕەیحانەو خۆشەویستی بووە، و لەساڵی (٤) ی کۆچیدا لەدایك بووە. و لەڕۆژی عاشوڕا مانگی موحەرەم ی ساڵی (٦١) ی کۆچی شەهید کرا لە کەربەلای زەوی عێراق.[1]

ئیمام أحمد بەئیسنادی خۆی دەگێڕێتەوە لە یەعلای عامری یەوە (ﷺ) کە جارێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بۆ خوانێك دەعوەت کرابوون، و پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ خەڵکەکەدا بوو، حسەینی کەوتە بەرچاو کە لەناو منداڵاندا لەکۆڵان یاری دەکرد و پێغەمبەری خوا بەخێرایی چوو بەرەو ڕووی تا بیگرێت و منداڵەکانی هاوڕێ ی هەریەکەو بەلایەکدا ڕایان کرد و پێغەمبەریش بەپێکەنینەوە ئەم لاولای لێ گرت و گرتی دەستێکی خستە سەرسەری و دەستێکی تری خستە ژێر چەناگەی و دەمی بردو ماچێکی کردو فەرمووی ((حسین مني وأنا من حسين، اللهم أحب من أحبَّ حسيناً، حسين سبط من الأسباط))[2] واتە ((حسێن لەمنەو منیش لە حسینم، خوایە هەرکەسێ حسەینی خۆش دەوێت خۆشت بوێت، حسێن هەڵکەوتوویەکە لە هەڵکەوتووان)).

بوخاری دەگێڕێتەوە کە ئیسنادی دەکات بۆلای (ابن عمر) (ﷺ)کە پیاوێکی عێراقی پرسیاری لێ کرد دەربارەی حاجی لەکاتی ئیحرامدا مێش بکوژێت حوکمەکەی چۆنە؟ لە وەڵامدا (ابن عمر) پێی ووت: ئەی خەڵکی عێراق دەربارەی مێش کوشتن پرسیار دەکەن کەچی کچەزای پێغەمبەری خوایان کوشتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی فەرموویەتی ((هما ريحانتاي من الدنيا))[3]

فەرموودەی (الکساء) و عائیشە (ﷺ):

عائیشە (ﷺ)فەرموودەیەك دەگێڕێتەوەو دەڵێت: بەیانی یەکیان پێغەمبەری خوا هاتە دەرەوەو عەبایەکی گەورەی لەبەردا بوو ـ کساء ـ و عەلی و فاطمە و حسن و حسێن ـ خوایان لێ ڕازی بێت ـ ی خستە ژێری و پاشان فەرمووی ((إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيراً)) "الاحزاب/٣٣" واتە ((خوای گەورە دەیەوێت لەهەموو خەوشی یەك پاکتان

---

[1] البداية والنهاية (١٥٢/٨).

[2] فضائل الصحابة ژ (١٣٦١) إسناده صحيح.

[3] البخاري (٣٧٥٣).

بکاتەوە ئەی بنەماڵەکەم و بەتەواوی خاوێنتان بکاتەوە.[1] ئەمەش باشترین بەڵگەیە لەسەر درۆزنی ئەوانەی کە پاگەندەی ئەوە دەکەن کە هاوەڵان ـ خوایان لێ ڕازی بێت ـ ئەوفەرموودانەیان شاردۆتەوە کە باس لە پیاو چاکی و مەزنی عەلی دەکات ـ ئەوە عائیشەیە کە وادەزانن ڕقی لەعەلی یەو ئاوا باسی عەلی دەکات چجای هاوەڵانی تر.

## شەشەم/ فەرمانە تایبەتمەندی یەکانی خانەوادەی پێغەمبەر (ﷺ)

### ١- بۆیان نەبوو زەکات وەربگرن:

لەو فەرموودەیەی کە عبدالمطلب ی کوڕی ربیعە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی ((ان الصدقة لا تنبغي لآل محمد انما هي أوساخ الناس))[2] واتە ((خانەوادەی محمد دروست نی یە زەکات وەربگرن چونکە ئەوە پۆخڵەواتی خەڵکی یە))، واتە خەڵکی خۆی پێ پاک دەکاتەوە لەگوناه.

### ٢- میراتی پێغەمبەری خوایان پێ نابڕێت:

بەو فەرموودەیەی ئەبو بەکر گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی ((لا نُوَرث، ما ترکنا صدقة))[3] واتە ((من پاش خۆم میراتم نی یە، و هەرچی بەجێ دێڵم خێرە بۆ موسڵمانان)).

### ٣- (١/٥) ی دەستکەوتەکانی جەنگیان بۆ هەیە:

حوای (عز وجل) دەفەرموێت ((وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِنْ كُنتُمْ آمَنتُمْ بِاللَّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)) "الانفال/٤١".

### ٤- سڵاوات دان لەسەریان لەدوای سڵاوات لەسەر محمد (ﷺ)

کەعبی کوڕی عەجرە دەڵێت: پرسیارمان لە پێغەمبەری خوا کرد و ووتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن سڵاوات بدەین لەسەرتان ئەی (أهل البيت)؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی ((قولوا: اللهم

[1] مسلم (٢٤٠٨) باب فضائل الصحابة.
[2] مسلم ژ (١٠٧٢).
[3] مسلم ژ (١٧٥٧)، البخاري (٣٠٩٣).

صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميدٌ مجيد، اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميدٌ مجيد))[1]

٥- سۆزو خۆشەویستیەکی تایبەتی بۆیان:

ئەمەش لەو فەرموودەیەدا دەردەکەوێت کە زەیدی کوڕی ئەرقەم (ﷺ)لە پێغەمبەری خواوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی ((اذكركم الله في بيتي، اذكركم الله في أهل بيتي، اذكركم الله في أهل بيتي))[2] واتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ جار لەسەریەك فەرمووی ((خوای عز وجل دەخەمە یادتان کە باش بن پاش خۆم لەگەڵ خانەوادەکەمدا ـ أهل البيت ـ. هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو کە ئەبو بەکری صدیق (ﷺ)زۆر خۆشی دەویستن و ڕێزی تایبەتی لێ دەگرتن و فەرمانیشی بە موسڵمانان دەدا کە ڕێزیان زۆر بگرن لەبەر خاتری پێغەمبەری خوا (ﷺ) و دەیفەرموو ((أرقبوا محمداً (ﷺ) في أهل بيته))[3] واتە ((محمد (ﷺ) ڕازی بکەن بە ڕێزگرتن و خۆش ویستنی خانەوادەی موبارەکی)).

(ابن تيمية) یش دەڵێت: خۆشەویستنی خانەوادەی پێغەمبەر (أهل البيت) یەکێکە لەبنەما سەرەکی یەکانی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعە ئەوەیە کە بنەماڵەی پێغەمبەریان خۆش دەوێت و ئاگاداریان دەکەن و ئامۆژگاری و وەسیەتی پێغەمبەر (ﷺ)جێبەجێ دەکەن تیایاندا.[4]

---

[1] البخاري ژ (٣٣٧)، مسلم ژ (٤٠٦).

[2] مسلم ژ (٢٤٠٨).

[3] البخاري ژ (٧١٣).

[4] مجموع الفتاى (٤٠٧/٣).

## حەوتەم:

## عەلی (ﷺ)لەجەنگی ئوحود دا:

جەنگی ئوحود بەوە دەستی پێکرد کە عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ)بۆشمشێر بازی بەرامبەری طلحە ی کوڕی عثمان وەستا کە ئاڵای بێ باوەڕانی بەدەستەوە بوو و داوای شمشێر بازی دەکرد و عەلیش - وەك شێر - بۆی چووە دەرەوە و پێی ووت: ((سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە وازت لێ ناهێنم تا یان خوا بەدەستی من ئەونێرێت بۆ ناو ئاگری دۆزەخ - یان بەدەستی تۆ من ئەنێرێت بۆ بەهەشت)).

علی (ﷺ)شمشێرێکی دا لەقاچی و قرتاندی و کەوتە سەر زەوی و شەرمگەی دەرکەوت و بەعەلی ووت: ئامۆزا گیان لەبەر خوا و خزمایەتی! لێم مەدا! و عەلیش دەستی بۆ نەبردو گەڕایەوە دواوە و پێغەمبەری خوایش (ﷺ) الله أکبری دەکرد، و پاشان هاوەڵان لێیان پرسی: ئەوە بۆ هەڵت نەکوتایەسەری؟عەلی(ﷺ)فەرمووی: کاتێ عەورەتی دەرکەوت ووتی لەبەر خزمایەتی لێم مەدە و منیش شەرمم لێ کرد.[1] و لەپاش شەهید بوونی مصعب ی کوڕی عومەیر (ﷺ)عەلی ئاڵاکەی گرتە دەست و خەڵکێکی زۆر لە بێ باوەڕان کوژران لەگەڵ ئەو ناڕەحەتی یەی موسڵمانەکانی تێ کەوت، بەرگری زۆر مەردانەی لەپێغەمبەری خوا دەکردو هەر ئەویش بوو لەو ڕۆژەدا دەستی پێغەمبەری خوای گرت و لەو چاڵە دەری هێنایەوە کە کەوتبووە ناوی یەوە.[2]

لەو جەنگەدا بێ باوەڕان ڕوومەتی پیرۆزی پێغەمبەریان خوێناوی کرد و فاطمە و عەلی (ﷺ)دەیان شۆردو تەداویان دەکردو ئەو خوێنەیان دەوەستاندەو کە بەدەم و چاو و ڕیشیدا دەهاتە خوارەوە.[3]

ئازایەتی و نەبەردی عەلی (ﷺ)لەو کاتەدا دەرکەوت کاتێ هەواڵ بڵاوکرایەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کوژراوەو عەلی ووتی: ئیتر ژیان دوای ئەو چ تامێکی هەیە؟ بۆیە کێلانی شمشێرەکەی

---

[1] السيرة الحلبية (٢/٤٩٧-٤٩٨).

[2] السيرة النبوية، ابن هشام (٣/٨٩).

[3] البخاري ژ (٤٠٧٥).

شکاندو وەك شێر خۆی کرد بەناو سوپای بێ باوەڕاندا تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتە بەرچاوی[1] و ئەویش لەپشتی یەوە بەوێنەی پاڵەوان بەرگری لێ دەکرد و لەو ڕۆژەدا (١٦) جار برینـدار کـرا (ﷺ).[2]

پاش ئەوەی کە سوپای بێ باوەڕان پاشەکشەیان کردەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) عەلی کـوڕی ئـەبو طالب ی نارد بەدوایاندا تا بزانێت بەنیازن بەرەو کوێ بچن و پێی فەرموو: ((اخرج في آثـار القـوم وانظر ماذا يضعون وماذا يريدون، فإن كانوا جنبوا الخيل وامتطوا الابل فإنهم يريـدون مكـة، وان ركبوا الخيل وساقوا الإبل فهم يريدون المدينة، والذي نفسي بيده ان ارادوها لأسيرنَّ اليهم فيهـا ثـم لاناجزنهم)) واتە ((بڕۆ بەدوایانداو ورد بەرەوە ئەگەر لەوڵاخەکانیان دابەزیبوون و حوشترەکانیشیان دانیشاندبوو ئـەوە بـەرەو مەککـە دەچـنەوە، بـەڵام ئەگـەر بەسـواری ئەسـپەکانیانەوە بـوون و حوشترەکانیشیان بەپێوە بوون ئەوە بەرەو مەدینە دێت، و سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئەو مەبەستەیان هەبێت ئەوا بۆیان دەردەچم و دەرسیان دادەدەم.

عەلی (ﷺ)دەڵێت: ((کەوتمە دوایان بینیم لە ئەسپەکانیان دابەزیون و حوشترەکانیشیان نیشاندوە و بەرەو مەککە دەڕۆنەوە. و هاتەوەو هەواڵەکەی بە پێغەمبەری خوا- دا.[3]

هەندێ وانەو پەند لەم بەسەرهاتەوە وەردەگرین لەوانە:

١- ئازایەتی و جەرگ قایمی پێغەمبەرمان (ﷺ) بەشێوەیەك کە چووبووە ناو ڕیزەکانی بێ باوەڕان و لەوێ دەجەنگاو عەلی بەناڕەحەتی دۆزیەوەو خـۆی پـێ گەیانـد و دەبینـێ خـەریکی جەنگـەو کۆمەڵێ جاریش برینداز کراوە.

٢- وریایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە چۆن چاودێری جموجۆڵی دوژمنان دەکات و هەڵس و کەوت و کارەکانیان هەڵدەسەنگێنێ و مەبەستەکانیانتێ دەگات.

٣- وره بەرزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامادەیی دووبارەی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی بێ باوەڕان پاش ئەو جەنگە گەورەیەش هەر ئامادەیە بڕواتەوە بۆیان.

٤- متمانەی تەواوی پێغەمبەرمان (ﷺ) دەردەکەوێت بەعەلی (ﷺ)و ناسینی ناوکرۆکی پیاوان.

---

[1] مسلم، شرح النوي (١٤٨/١٢).

[2] مسند أبو يعلى (٤١٥/١، ٤١٦)، إسناده حسن.

[3] البداية والنهاية ((١٤/٤).

٥- پیاوەتی و ڕەوشت بەرزی عەلی (ﷺ)کاتێ کە وازی لە دوژمنەکەی هێنا وەختێ بینی شەرمگەی دەرکەوت و پێغەمبەریش (ﷺ) بەکارەکەی ڕازی بوو و ئەمەش گرنگی دانمان بەڕەوشت پێ نیشان دەدات ئیتر با لەناوبەرەی جەنگداو لەگەڵ دوژمنانیشدا بێت.
٦- ئازایەتی و جەرگ ئەستوری عەلی دەردەخات کە بەتەنها دوای سوپای قوڕەیش بکەوێت و نەترسێت لەوەی کە پێی بزانن و بۆی هەڵبگەڕێنەوە و بیکوژن.

هەشتەم/ عەلی (ﷺ)لەجەنگی بەنی نەزیردا:

لێکۆڵەرەوان لەسەر ئەوەن کە ئەم غەزایە لەپاش جەنگی ئوحود ڕویداوە لەمانگی ربیع الأول ی ساڵی چوارەمی کۆچی و (ابن کثیر) یش ئەم مێژووە پەسەند دەکات و لەم غەزایەدا (علی) (ﷺ) دیار نەما و هاوەڵان بەدوایدا گەڕان و کات شەو بوو، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((انه في بعض شأنكم)) واتە: بۆ هەندێ ئیش و کاری ئێوە دەرچووەو پاش ماوەیەکی کەم هاتەوە سەری (عەزوەك) ی هێنایەوە و هاتەوە چونکە بۆسەیەکی بۆ نابوویەوە و خۆی و چەند جوویەکی تریش و دەرچوون تا بدەن بەسەر موسڵمانانەدا و ئەو پیاوە تیرهاوێژێکی زۆر بەدەست و مشت بوو و عەلی (ﷺ) پڕی دایە سەری و کوشتی و جولەکەکانی تر هەموو ڕایان کرد.[1]

نۆیەم/ عەلی (ﷺ)لەغەزای (حمراء الأسد) دا:

ئەم غەزایە دوای (ئوحود) بوو، وەك تەواوکەری ئەو غەزایە وایە، و لەئێوارەی (١٥) ی شەوالی ساڵی (٣) ی کۆچی، و هەرکە ڕۆژ بوویەوەو بانگی بەیانی دراو پاش نوێژ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی دەرکرد کە بەخێرایی خۆتان ئامادە بکەن تا سوپای دوژمنان ڕاو بنێین و تەنها بەس بەشداربوانی ئەحودیش بۆیان هەیە لەگەڵمان بێن، و هەموو خەڵکەکە هاتن بەدەم داواکاریەکەی پێغەمبەری خواوە لەگەڵ هەموو ماندوو بوون و برینداری و شەکەتیانەوە و پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێشیان کەوت و سوپا کەوتە ڕێ.
و هەڵگری ئاڵای ئەم غەزایە هەڵگری ئاڵاکەی ئوحود بوو کە ئیمام عەلی کوڕی ئەبو طالب بوو، موسڵمانەکان بە سەرکردایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتنە ناوچەی ـ حمراء الأسد ـ کە

[1] إمتاع الاسماع للمقريزي (١/ ١٨٠).

(١٣) ميل له مەدینەوه دووربوو، و لەوێ ئۆردوگایان خست و ئەم هەنگاوەشیان جولەکەو دووڕووەکانی مەدینەی سەرسام کردبوو، چونکه پڕ بوو له غیرەت و جوامێری و دڵنیا بوون لەوەی که موسڵمانان ورە بەرزن و ئەگەر لەئوحود دا شکابن هەرگیز بەو جۆرە نەیان دەتوانی بکەونە شوێن قورەیش و بیانفڕێنن، و ئەمەش ئەوپەڕی مانای گرنگیدانی پێغەمبەری خوا بوو بەلایەنی جەنگی دەروونی و ڕووخاندنی ورەی دوژمنان و لەو شوێنە ماوەی (٣) ڕۆژ مانەوە فەرمانی دا ئاگرێکی زۆر بکەنەوەو لەدوورەوە دەبینرا و تا وای لێ هات قورەیش لایان کردەوەو لەوە دڵنیا بوون که موسڵمانەکان ژمارەیان زۆرەو کەس غیرەتی ڕوو بەڕوو بوونەوەی نی یه لەگەڵیاندا بۆیە ترس دڵی داگیر کردن و بەخێرایی بەرەو مەککە ڕایان کردەوە.[1]

دەیەم/ عەلی و هەڵوێستی له ڕووداوی (الأفك) :

(إفك) ئەو ڕووداوە بوو که دووڕووەکان دروستیان کردو ویستیان (عائیشه) ی دایکی باوەڕداران ی پێ لەکەدار بکەن.

بۆیە یەکسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئوسامەو عەلی بانگ کردو دەربارەی جیابوونەوە لێی ڕاوێژی پێ کردن و لەو کاتەدا نیگا نەدەهاتە خوارەوە و پێغەمبەرمان (ﷺ) زۆر نیگەران بوو، و ئوسامە باسی ئەوەی بۆ کرد که بەبۆچوونی من عائیشه بەری و لەو تاوانە بەدوورە و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خێزانی خۆتە، و لەچاکە بەولاوە هیچمان لێ نەدیوە،
و عەلی (رضي الله عنه)فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆ دنیات لێ نەهاتۆتە یەك هەر ژن زۆرە، و پرسیار له کەنیزەکەکەی بکه بەڕاستی وەڵامت دەداتەوە.[2]
عائیشه دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەریرەی بانگ کرد و پێی فەرموو: ((أي بريرة هل رأيت من شيء يريبك)) واته ((ئەی بەیرە هیچ شتێکت لە عائیشه دیوە جێگای گومان بێت؟)) بریرەیش ووتی: نەخێر، سوێند بەو کەسەی تۆی ناردووە به پێغەمبەر هیچم لێ نەدیوە که جێگای گومان بێت تەنها ئەوەندە هەیه عائیشه کەم تەمەن بوو جاری وا هەبووە بەدیار هەویرەکەیەوە

[1] عزوة احد لأبي فارس، لا (٥١).
[2] البخاري، ژ (٤٧٥٠).

خەوی لێ دەکەوت و کـارو گیـسکیش دەهـات و لێ ی دەخـوارد، پێغەمبـەری خـوایش (ﷺ) هەستایە سەر پێ و فەرمووی کێ سەرزەنشتم دەکات ئەگەر سزای عبداللە ی کوڕی ئەبی سـەلول بدەم لەسەر ئەو پاگەندەیەی بڵاوی کردۆتەوە و پاشان چووە سەر مینبەرەکەی و فەرمووی ((فوالله ما علمت على أهلي الّا خيراً، ولقد ذكروا رجلاً، ما علمت عليه الّا خيراً، وما كـان يـدخل علـى أهلي الّا معي)) واتە ((سوێند بەخوا لەچاکە بەولاوە لـەخێزانی خـۆم هیـچی تـرم نـدیوەو ئـەو پیاوەشی کە باسی کراوە ـ صفوان بن المعطل السلمي ـ لەچاکە بەولاوە هیـچی تـرم لێ نـەدیوەو لەگەڵ خۆیشمدا نەبێت هەرگیز نەهاتۆتەماڵەکەم.

ئەو بۆچوونەی ئیمام عەلیش (ﷺ)لەوەوە بوو کە بینی پێغەمبەر زۆر زۆر نیگـەران و غـەمباری ئەو مەسەلەیەیە، و بەو بۆچوونەی ویستی مەسەلەکە لەسەر دڵی پێغەمبەری خوا سووك بکـات و پاش ئەوەی کە بێ تاوانی دەردەکەوێت بیهێنێتەوەو وەك نەوەوی دەڵێت: ئەم ووتەیەی ئیمام عەلی (ﷺ)(ﷺ) لەبەرژەوەندی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) ویستی دەروونی پڕ لەکەف و کـوڵی خـاو بکاتەوەو لەو پەسـتی و ناڕەحـەتی یـەی کـە بـەو هەواڵـە توشـی بـوو بـوو. و بۆچوونەکەشـی لەبەرژەوەندی عائیشەیش بوو (ﷺ)چونکە بەو ووتانەی ئەو زیاتر پێغەمبەری خوا قەناعەتی بـۆ دروست بوو لەسەر پاکی عائیشە (ﷺ).

و هەروەك لە ووشەکانی عەلیدا هیچ مانایەکی ئەوەی لێ وەرناگیرێت کە ناپـاکی بداتـە پـاڵی و بەخراپە باسی بکات، بەڵکو داوای لە پێغەمبەر کرد کە پرسیار لە کەنیزەکەکەی بکات تا زیـاتر پاکی بۆ دەربکەوێت ...

و خوێنەری بەڕێز دەبێ زۆر ووریا و تێگەیشتوو بیت و بەووتەی هەندێ نووسەری بەناو موسڵمان نەخەڵەتێیت کە کەسێکی وەك عەلی إبراهيم حسن لە کتێبی التـأريخ الإسـلامی العـام داو طـه حسين لە (علي وبنوه) دا بۆی دەچن گوایە ڕقی عائیشە لە عەلی لەو سـاتەوە دەسـتی پێکـرد و لەپاشە ڕۆژدا بەکوشتنی عوثمان توانباری کرد و لە مەسەلەی جـەنگی ـ جەمـەل ـ دا بەدرێـژی باسی ئەو پەیوەندیە گەرم و گوڕەی نێوان عئیشەو عەلی دەکـەین و ئـەم مەسـەلەیەش لەلایـەن ناحەزو دوژمنانی پێغەمبەرو ئاینی نوێ، گەورە کراوەو ویستیان لە وەتـەری حەساسـی کەسـی یەکەمی ئەم ئیسلامە بدەن.

بەڵام پاش ئەوەی خوای گەورە پاکی ڕوون کردەوە بەئایەتی قورئان و وانەیەکی بەسودیش بوو بـۆ موسڵمانان تا وەك چۆن هاوەڵان بن ـ خوایان لێ ڕازی بێت ـ کە سنگ فراوانانە ووتیان گومـانی چاکەی پێ دەبەین و لەم کارەوە زۆر بەدوورە.[1]

[1] السيرة النبوية عرض وقائع وتحليل أحداث.

# جێباسی شەشەم

## کارە گرنگەکانی عەلی (ﷺ)لەنێوان

## جەنگی ئەحزاب و وەفاتی پێغەمبەردا (ﷺ) :

**یەکەم/ عەلی (ﷺ) لە غەزای (الأحزاب) دا:**

ڕۆڵی عەلی کوری ئەبو طالب (ﷺ)لەجەنگی (ئەحزاب) دا زۆر پاڵەوانانەو ناوازە بوو بەجۆرێك کە دەری خست تا چ ئاستێك بیرو باوەڕ جێگەی خۆی کردبویەوە لەناو دڵ و دەروونی هاوەڵانی پێغەمبەردا (ﷺ) و خەڵکیان بۆ بانگ دەکرد و گیانی خۆیان لەپێناویدا بەخت دەکردو جیادەبوونەوە لە هەرکەسێ بەو ئاینە پاکە ڕازی نەبوایە،

(إبن اسحاق) دەڵێت: پاش ئەوەی کە لەجەنگی خەندەق دا کۆمەڵی لە بت پەرستەکان توانیان لە گۆشەیەکی چاڵەکەوە بێنە ئەم بەرەوە، عەلی و دەستەیەك لە موسڵمانەکان چوون بۆیان و فڕاندنیانەوە ئەو بەرەوەو بێ باوەڕەکان بە سەرۆکایەتی ـ عەمر کوڕی عابد ـ کە ئەم پیاوە لەجەنگی بەدر دا بریندار بوو نەیتوانی لە ئوحودا بەشداری بکات و ویستی لە خەندەق دا جەدارەتی خۆی بسەلمێنێت بۆیە بەسەر قەراغی خەندەقەکەوە هاواری کرد کێ شمشێر بازیم لەگەڵ دەکات.

عەلی(ﷺ) چووە پێشەوە بۆی و پێی ووت: ئەی عەمر ئایا تۆ نەبوویت پەیمانت دا بەخوا دەتووت هەر پیاوێکی قورەیش بۆ هەرکارێك بانگم بکات دەچم بەدەمی یەوە؟ ووتی: بەڵێ، عەلی ووتی: دەی من بانگت دەکەم بۆلای خواو پێغەمبەرو ئیسلام، عەمریش ووتی: پێویستم بەوە نیە، عەلی (ﷺ) ووتی: دەی بانگت دەکەم بۆ شمشێر بازی، عەمریش ووتی: بۆچی ئەی برازای خۆم؟ سوێند بەخوا دڵم پێوە نی یە بتکوژم، بەڵام عەلی پێی ووت: بەڵام من سوێند بەخوا حەزدەکەم بتکوژم، عەمر ئاگری تێ بەربوو لەئەسپەکەی دابەزی و سەری بڕی و دای بەدەم و چاوی خۆیدا و

بەرەو عەلی ڕۆیشت، زۆر جەنگیان کردو لەئاکامدا عـەلی (ﷺ)کوشـتی و سوارەکانیـشی بـۆی دەرچوون و خەندەقەکەیان بەجێ هێشت و ڕایان کرد؟.[1]

پاش کوشتنی عەمر بەدەستی شێرەکەی ئیسلام عـەلی (ﷺ)بـێ باوەڕەکـان جوابیـان نـارد بـۆ پێغەمبەر کە تەرمەکەی عەمریان بداتەوەو لەبەرامبـەردا (١٠) هـەزار درهـەم دەدەن، ئـەویش فەرمووی: لاکەکەیان بدەنەوە، لاکەکە و پارەکەشی پیـسەو هیـچی لێ وەرنـەگرتن و لەکاتێکـدا موسڵمانەکان لەئەوپەڕی نەداری و هەژاریدا بوون.[2]

دووەم/ عەلی (ﷺ) لە غەزای (بني قريضة) دا:

عەلی(ﷺ)لەم جەنگەدا هەڵگری ئاڵای پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) و لەپێشەوەی سوپاوە بوو، تا کاتێ سەعدی کوڕی موعـاذ (ﷺ)حوکمی شەرعی بەسەردا دان، و لەسەرەتاوە بەو حوکمـە ڕازی نەدەبوون و لە قەڵاکانیان دانەدەبەزین،

(ابن هشام) دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ)هـاواری کـرد کـە گـەمارۆی قـەڵاکانی (بنـی قريضة) یان دابوو: ئەی دەستەی باوەڕ ـ خۆی و زوبێری کـوڕی عـەوام چـوونە پێـشەوەو ووتـی: وەڵڵاهی یان دەبێت وەك حەمزە شەهید ببین یان دەچینە ناو قەڵاکانەوە، بۆیە ترسان و لەترساندا هاواریان کرد: ئەی موحەمەد ـ ڕازین بە حوکمی سەعدی کوڕی معاذ.[3] و کـاتێ هاتنـە دەرەوە حوکمی سەعد وابوو جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و ژن و منداڵیشیان بکرێنە کـەنیزەك و عـەلی و زبێر (ﷺ)دەسیان کرد بەکوشتنی پیاوەکانیان.[4]

سێ یەم/ عەلی (ﷺ) لە (صلح الحديبيه) دا:

لەغەزای حودەیبیەدا و پێش ڕێککەوتنامەی حودەیبیە، هەندێ بەندە لە مەککەوە بەرەو مەدینە هاتن و خاوەنەکانیان لە مەککەوە جوابیـان نـارد بـۆ پێغەمبـەری خـوا کـە بیانگەڕێنێتـەوە و

---

[1] السيرة النبوية لإبن هشام (٣٤٨/٣).

[2] معين السيرة للشامي، لا (٩٤).

[3] البخاري ژ (١٤٢١).

[4] امتاع الاسماع مقريزى (٢٤٧/١).

پێغەمبەریش (ﷺ) ڕەدی کردەوە کە بیانداتەوە و فەرمووی ((یا معشر قریش لتنتهنَّ أو لیبعثنَّ الله علیکم من یضرب رقابکم بالسیف علی الدین، قد امتحن الله قبه علی الإیمان)) واتە ((ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش وازدەهێنن باشە ئەگینا خوای گەورە کەسێکتان بۆ دەنێرێ کە بەشمشێر لە ملتان بدات لەسەر ئیسلام کە خوای گەورە دڵی دامەزراندووە لەسەر باوەڕ.

هاوەڵان بەپەرۆشەوە لێیان پرسی: ئەو کەسە کێ یە ئەی پێغەمبەری خوا؟ کە هەر هەموویان ئاواتە خواز بوون ئەو کەسە بن وئەو شایەتی یە مەزنەیان بۆ بدرێت لە لایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆیە لەوەڵامدا فەرمووی ((هو خاصف النعل)) واتە ئەو کەسە نەعل دورەکەیە ـ کە نەعلەکانی خۆی دابوو بەعەلی تا بیدورێتەوە بۆی.[1] و کاتێ ڕێکەوتننامەکە دەنووسرا لەنێوان پێغەمبەرو قوڕەیشی یەکاندا، عەلی (ﷺ)بەندەکانی دەنووسی و نوسی من (محمد رسول الله) بێ باوەڕان وتیان مەنوسە (محمد رسول الله) چونکە ئەگەر وامان بگوتایە شەڕمان لەگەڵ نەدکردی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ((أمحه)) واتە: بیکوژێنەوە، عەلی ووتی: نایکوژێنمەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی دەستی بردو کوژاندیەوە ...

و عەلی (ﷺ)بیروباوەڕ و خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیهێشت ئەو ووشە مەزنە (محمد رسول الله) بکوژێنێتەوە و پێغەمبەریش تا چەندێ هاوەڵەکانی خۆش ویستووە و شتی بەسەردا فەرز نەکردوون و یان سەرپێچی کار ناوی نەبردوون بەڵکو خۆی بەدەستی موبارەکی خۆی کوژاندوویەتی یەوە و مەسەلەکەی لەوێدا کۆتایی پێ هێناوە.

چوارەم/ کێ کچەکەی حەمزە (ﷺ) دەگرێتە ئەستۆ؟:

ئیسلام بیرو هۆشەکانی گۆڕی و کاریگەری خۆی لەسەر دڵەکان دانـاو عـادەت و نەریتـەکان کـە جاران نەنگی و عەیبە بوو ئەمڕۆ وا لەئیسلامدا جێگەی شانازی یە ...

کچان لەپێش ئیسلامدا زیندە بەچاڵ دەکران و کەس ڕووی نەدەهات بڵێ کچێکم بووە یان کچێکم هەیە، بەڵام ئـەمڕۆ وا موسـڵمانان شـانازی دەکـەن بەکـچەکانیانەوەو پـێش بڕکـێ دەکـەن لـە

---

[1] مرویات غزوة حدیبیة ـ حافظ الحکمي لا (١٨٣)، والحدیث صحیح بجمیع طرقه.

پەروەردەکردنیان و گرتنە ئەستۆیان.[1] کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) ویستی لە مەککە بچێتە دەرەوە، کچەکەی حەمزە بانگی لێ کرد: مامە، وئەویش دایە دەستی عەلی، و دەستی گرت و بە فاطمە ی ووت: ئاگات لەم کچەی مامت بێت، بەڵام عەلی و زەیدو جعفر دەمیان تێگیرا، و عەلی ووتی: کچی مامەو لای من دەبێت. و جعفر ووتی: کچی مامی منیشەو خێزانەکەم پوریەتی، و زیدیش ووتی: برازامە. پێغەمبەری خوایش: دایە دەستی پورەکەی کە خوشکی دایکی بوو فەرمووی: پوور لەجێگەی دایکیدایە ((الخالة بمنزلة الأم)) و بەعەلیشی فەرموو: ((مني أنت و أنا منك)) من لەتۆم و تۆش لەمنی و بەجەعفەریشی فەرموو ((اشبهت خَلقي وخُلقي)) واتە لەشێوازو لە ڕەوشتدا لەمن دەکەیت، و بە زیدیشی فەرموو: ((أنت أخونا ومولانا)) واتە تۆ براو گەورەمانیت. عەلیش (ﷺ)بەپێغەمبەری ووت: ئایا کچی حەمزە ناخوازیت؟ و فەرمووی ((إنها أبنة أخي من الرضاعة)) ئەو بازامە لە شیرەوە.

## پێنجەم/ عەلی (ﷺ) و غەزای خەیبەر:

(ابن اسحاق) دەڵێت: لەمانگی محرم ی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا ڕووی دا لەپاش گەڕانەوە لەغەزای حودەیبیە و (ابن حجریش) ئەم مێژووە بەدروست دەزانێت.

لەم غەزایەدا پاڵەوانێتی گەورەی باوەڕداران عەلی(ﷺ) دەرکەوت، ڕزگارکردنی ئەم کۆمەڵگە جولەکەیی یە گرنگی یەکی سەربازی گەورەی هەبوو، چونکە جێگەیەکی ستراتیژی بوو هەروەك خاوەنی کۆمەڵێ قەڵای گەورەو بەرز بوون، دوایین شوێنی جولەکە بوو لەهەموو دورگەی عەرەبی دا، و هەموو کاتێ بۆ موسڵمانان لەمەڵاسدا بوون و بەردەوام لەگەڵ جولەکەکانی مەدینەدا کۆدەبوونەوەو باسیان لەوە دەکرد لەدەرفەتێکدا بدەن بەسەر شاری مەدینەدا. بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی دڵئاسودە بێت لێیان و لەو لایەنەوە خۆی بێ خەم بکات. کە (٧٠) میل لەباکوری ڕۆژهەڵاتی شاری مەدینەوە دوور بوو، و پێغەمبەر (ﷺ) سوپایەکی بەرەو ئەوێ خستە ڕێ کە ژمارەیان (١٤٠٠) کەس بوو، هەرکە گەیشتنە لای قەڵاکان، قەڵا قەڵا دەستیان کرد بەڕزگارکردن، تا گەیشتنە قەڵای (غموص) کە زۆر ئاستەم بوو گرتنی، و عەلی (ﷺ)لەوکاتەدا

---

[1] السيرة النبوية للندوي، لا (٣٢).

چاوئێشەیەکی قورس لێی دابوو.[1] پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((لأعطين هذه الراية غداً رجلاً يفتح الله على يديه، يحب الله وسوله ويحبه الله ورسوله)) واتە ((سبەینێ ئاڵای ئیسلام دەدەمە دەستی کەسێك کە خوا و پێغەمبەری خۆش دەوێت و خواو پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێت)) خەڵکەکە هەموویان کەوتنە مقۆ مقۆ و لەیەکتریان دەپرسی: ئاخۆ سبەینێ بەکێ ی دەدات؟.

لەسبەینێ دا هەموو هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) هەموو یەکێکیان ئاواتە خوازبوو ئاڵاکە بەو بدات، فەرمووی ((أين علي بن أبي طالب؟)) واتە ((عەلی کوڕی ئەبو طالب لەکوێ یە؟)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاواری چاوی دەکات. ناردی بەدوایداو هات و پێغەمبەری خوا (ﷺ) تفی موبارەکی خۆی دا لەچاوەکانی و دوعای شیفای بۆ کردو چاك بوویەوە بەجۆرێك کە وەك بڵێی ئێشی هەر نەبوویێت و ئاڵاکەی دایە دەستی، و ئەویش ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا بجەنگم لەگەڵیاندا تا وەك خۆمانیان لێ دێت؟.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ((أنفذ على رسلك حتى تنزل بساحتهم، ثم أدعهم الى الإسلام، وأخبرهم بما يجب عليهم من حق الله فيه، فوالله لان يهدي الله بك رجلاً واحداً خير لك من أن يكون لك حمر النّعم))[2]

واتە ((لەسەر خۆت بڕۆ ناوچەکەیانەوە و پاشان بانگیان بکە بۆلای ئیسلام و پاشان چی پێویستە لەسەریان کە بۆخوا بیکەن باسی بکە بۆیان، چونکە وللاهی ئەگەر خوای گەورە لەسەر دەستی تۆدا یەك کەس ڕێنموویی بکات باشترە بۆت لەوەی ببیتە خاوەنی سورە حوشتری زۆر)).

کەوتنە ڕێ تا خەیبەریان بەیەکجاری ڕزگار کرد لە پاڵەوانێتی یەکانی عەلی (ﷺ)ئەوە بوو (مرحب) پادشایان هاتە دەرەوە بۆ عەلی و ئەم دێڕە شیعرەی دەوتەوە:

قد علمت خيبر اني مرحب      شاكي السلاح بطل مجرب

واتە: هەموو خەیبەر دەزانن من مرحەبم ..... چەك بەدەستی پاڵەوانی بەئەزموون.

عەلیش (ﷺ)بەشیعرێك وەڵامی دایەوە و ووتی:

---

[1] المرتضى للندوي، لا (٥٣).

[2] مسلم ز (٣٤٠٦).

أنا الذي سمتني أمي حيدرة          كليث غابات كريه المنظرة.

واتە: من ئەو کەسەم دایکم ناوی لێنام حەیدەر          وەك شێری پێشەوا دایمەن ڕوو لەدەر

(كريه المنظرة : دەكرێت بوترێت پێشەنگ لە کاتی ڕوویە ڕووبونەوەدا یا خود ترسناك - وەرگێڕ) و دای لەملی مرحب و سەری پەڕاند و پاشان لەسەردەستی ئەودا بەیەکجاری خەیبەر ڕزگار کرا.[1]

چەند پەندو وانەیەك لەغەزای خەیبەر:

١- چاکی و جیایی ئاشکرای (أمير المؤمنين) علی (ﷺ):

ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) شایەتی ئەوەی بۆ دا کە ئەو خوای خۆش دەوێت و خوایش ئەوی خۆش دەوێت و (ابن حجر) دەڵێت: بەمەدا دەردەکەوێت واجبە لەسەر موسڵمان خواو پێغەمبەری خۆش بوێت تا ئەوانیش ئەویان خۆش بوێت، و ئەم شاهێدیەش لەلایەن پێغەمبەرەوە بۆ عەلی لەوەوەیە کە ئەو بەتەواوی بوو بووە شوێن کەوتەی پێغەمبەر (ﷺ) و خوایش ئەو کاتە خۆشی ویستووە وەك خوای گەورە لەسورەتی (آل عمران ئایەتی ٣١) دا دەفەرموێت ((قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ)).

٢- فەڕو بەرەکەتی نزاکانی پێغەمبەر (ﷺ) :

بەجۆرێ کە خوای گەورە دەهات بەدەم دوعاکانی یەوە و بۆی گیرا دەکرد وەك عەلی (ﷺ)دەڵێت: ((لەو کاتەوە کە پێغەمبەر تفی خۆی داوە لەچاوم چاوئێشەم نەگرتووە))[2]

٣- فەرمودەی خەیبەر ـ هیچ پەیوەندی بەخیلافەتەوە نی یە:

(شیعەکان) کۆمەڵێ بەڵگە دەهێننەوە لەسەر ئەوەی کە واجبە عەلی بکرێتە جێنشینی پێغەمبەر کە هیچ کامێکیان نابنە بەڵگەی خیلافەت بەڵکو بەڵگەن لەسەر بەڕێزی و گەورەیی ئەو پیاوە بەرزە (ﷺ)و هەندێ شتی زیادەی ناڕەواشیان پێوە ناوە کە لەگەڵ فەرمودەکەدا یەکناگرنەوە. چونکە هەر بەوەی خواو پێغەمبەر خۆشیان دەوێت بەڵگە نی یە لەسەر ئەوەی بۆ خیلافەت شایانە چونکە خوای گەورەش دەربارەی ئەبو بەکر (ﷺ)و باقی هاوەڵان دەفەرموێت ((يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ))[3] یان دەربارەی ئەهلی بەدر دەفەرموێت ((إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ

---

[1] مسلم ژ (١٨٠٧).

[2] مسند أحمد ژ (٥٨٩) إسناده حسن.

[3] المائدة/٥٤.

مَرْصُوصٌ)) "الصف/٤". يان لەپێغەمبەریان پرسی: کێ خۆشەویست ترین کەسە لەلات؟ فەرمووی: عائیشە (رضي الله عنها). ووتیان ئەی لەپیاوان؟ فەرمووی: باوکی.[1]

شەشەم/ عەلی (رضي الله عنه) و ڕزگارکردنی مەککەو غەزوەی حەنین:

لە ساڵی (٨)ی کۆچیدا قوڕەیش پەیمانی حودەیبیەی شکاند و هاوکاری بەنی بەکری کرد لە دژی خوزاعە کە هاوپەیمانی موسڵمانەکان بوون و بە چەك و بەووڵاخ و بە چەکدار هاوکاریان دەکردن و پێغەمبەری خوایش (صلى الله عليه وسلم) بە عەمری کوڕی سالم ی فەرموو (( نصرت یا عمرُ بن سالم ، لا نصرني الله إن لم أنصر بني كعب )).[2]

واتە ئەی عەمری کوڕی سالم پشتت دەگیرێت ، و خوا سەرم نەخات ئەگەر سەرت نەخەم.

قوڕەیش بەپەلە ئەبو سوفیانیان نارد بۆ مەدینە تا ڕێکەوتن نامەکە درێژکاتەوە بەڵام پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ڕەدی کردەوە و بە نائومێدی بەرەو مەککە گەڕایەوە.

هەندێ هەڵوێستی عەلی (رضي الله عنه) لە فەتحی مەککەدا:

١ ـ پوچەڵکردنەوەی هەوڵێکی سیخوڕی بۆ قوڕەیشیەکان:

لە حەسەنی کوڕی محمدی کوڕی عەلی کوڕی عبداللە کوڕی ئەبو ڕافیع دەگێڕنەوە کە ووتویەتی: لە عەلیم بیستووە کە ووتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مـن و زوبێـرو میقـدادی نـارد و پێـی فەرمووین:" إنطلقوا حتى تأتوا روضة خاخ ، فأن بها ضعينة معها كتاب فخذه منها " واتـە: بڕۆن خێرا تا دەگەنە ـ ڕوچە خاخ ـ کە ئافرەتێکی لێیە و نامەیەکی بۆ قوڕەیش پێیە لێی بسەنن، و ئێمەش دەرچوین تا گەیشتینە ئەو جێگایە و ئەو ئافرەتەمان پێ گەیـشت ، پێمـان ووت: ئـەو نامەیەمان بۆ دەربێنە، ووتی: نامەم پێ نیە، و پێمان ووت: نامەکەمان بەرێ باشە ئەگینا هەموو گیانت ئەگەڕێین، دەڵێ نامەکەی لەناو پەلکەی قژیدا شـاردبوویەوە و دەری هێنـا و نامەکـەمان هێنایەوە و هاتینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و نامەکەی کردەوە کە تیایدا نوسرابوو: لـە

---

[1] البخاري، فتح الباري (٧/٢٢).

[2] مسند احمد ژ (٥٨٩) إسناد حسن .

( حاطب کوڕی بەلتەعە) وە(ﷺ) بۆ کەسانێك لە قورەیش و هەواڵی پێدابون دەربارەی هەندێ نیازو خواستی پێغەمبەر بۆیان، و پێغەمبەریش ڕووی کردە حاگب و فەرمووی " یا حاطب ما هذا "؟ حاتەب ئەمە چیە کردووتە؟ حاتەبیش (ﷺ)وتی : بڕیاری پەلەم لەسەر مەکە، من کەسێك بووم هاتومەتە ناو قورەیش و من خەڵکی ناوخۆیان نەبووم و هەموو کۆچەرییانی هاوڕێت کەس و کارو خزمیان هەیە.ماڵ و منداڵەکانیان بپارێزن ، و حەزم کرد هەروەك لە خزمایەتیان بێبەشم ئەم چاکەیان لەگەڵ بکەم تا چاوێکیان لە ماڵ و منداڵەکەم بێت و من لە بێباوەڕیەوە یان پاشگەزبونەوەمەوە ئەو کارەم نەکردووە و هەرگیز پاش موسڵمان بوونم دڵم بۆ کوفر لێ ی نەداوەتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی " إنە قد صدقکم " واتە ڕاستی کرد لەگەڵتان ، عمر (ﷺ)وتی : لێم گەڕێ ئەی پێغەمبەری خوا با بدەم لە ملی ئەم دوو ڕووە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ((أنە قد شهد بدراً ، وما یدرك لعل الله قد اطلع الی أهل بدر فقال : أعملوا ما شئتم، فقد غفرت لکم )).[1]

واتە : عمر ، ئەو لە بەشدارانی جەنگی بەدرە، تۆ چوزانی لەوانەیە خوای گەورە بە ئەهلی بەدری وتبێت: چی دەکەن بیکەن من لێتان خۆش بووم ".

٢ ـ " ئەی پارێزین ئەوەی تۆ دەیپارێزیت ئەی ئوم هانی ".

( أم هانی) ی کچی ئەبو طالب دەڵێت : کاتێ پێغەمبەری خوا باڵە بەرزەکانی مەککەی گەمارۆدا و دوو پیاو ڕایان کرد   کە لە خەزوورانم بوون لە بەنی مەخزوم و پەنایان بۆ من هێنا، و عەلی کوڕی ئەبوو طالب (ﷺ)ی برام هاتە ژوورەوە و وتی: وەڵلاهی هەردووکیان دەکوژم، و منیش دەرگای ماڵەکەم لەسەر داخستن و خۆم گەیاندە پێغەمبەری خوا (ﷺ)کە لە کێوەکانی سەروی مەککە بوو، دەبینم لە تەشتێکدا خۆی دەشوات کە شوێنەواری هەویری پێوە مابوو، و فاطمە ی کچیشی بە قوماشێکی گەورە شاردبوویەوە،و کاتێ خۆی شۆرد جلەکانی وەرگرت و خۆی ووشك کردەوە و خۆی پۆشتە کردەوە و پاشان هەشت ڕکات نوێژی چەشتەنگاوی کرد و پاشان لای کردەوە بۆ لای من و فەرمووی " مەرحەبا ، چۆنی ئەی ئوم هانی، خێرە چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە ؟ و منیش هەواڵی دوو پیاوەکەو عەلی برام پێدا و ئەویش ووتی ((قد أجرنا من أجرتِ، و وأمنّا

[1] اسنادە صحیح ، مسندامام احمد ژ( ٦٠٠) .

من أُمنَّتِ، فلا تقتلنها)).[1] . واتە پەنای دەدەین ئەو کەسەی تۆ پەنات داوە و ئەمین بێت لەلای ئێمەوە ئەوەی تۆ ئەمانت پێداوە، وعەلی نەیانکوژێت .

٣- لە ڕزگارکردنی مەککەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی دەرکرد کە کەس نەکوژن مەگەر ئەوانەی کە ڕوو بەڕووتان دەبنەوە، بەڵام خوێنی هەندێکی حەڵاڵ کرد کە ژمارەیەکی کەم بوون و ناوی بردن و فەرمووی: بیانکوژن ئەگەر دەستیشیان گرتبوو بەپەردەکانی کەعبەوە، یەکێ لەوانە (حویرث) ی کوڕی (نقید) بوو کە کاتی خۆی لە مەککە زۆر زۆر ئازاری پێغەمبەری خوای دابوو، کاتێ عباس (ﷺ) ڕەشۆی حوشترەکەی فاطمە و أم کلثوم ی گرتبوو، ئەم (حویرث)ە خویەکی لەحوشترەکە کردو هەردوکیان کەوتنە خوارەوە، و کاتێ خوێنی حەڵاڵ کرا، عەلی (ﷺ)خۆی پێ گەیاندو کوشتی.[2]

٤- عەلی (ﷺ) کارێکی چاکخوازی ئەنجام دەدات:

دوای ئەوەی خالیدی کوڕی وەلید (ﷺ)هەڵەیەکی کردو کۆمەڵێ کەسی لە ـ هۆزی (جزیمە) کوشت ـ کە ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو کاتێ بانگی کردن بۆ موسڵمان بوون ئەوان بەنەزانین لەباتی ئەوەی بڵێن (أسلمنا) واتە موسڵمان بووین ووتیان (صبأنا) واتە: بووین بە (صائبە) و هەندێکی تری بەدیل گرتن.

و کاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر ناڕەحەت بوو، بۆیە دەستی بەرز کردەوە بۆلای خواو فەرمووی ((اللهم إني أبرأ اليك مما صنع)) خوایە من بەریم لەو کارەی خالید کردی، و دووجار دووبارەی کردەوە. بۆیە خێرا عەلی کوڕی ئەبو طالب ی ناردە ناویان و پارەیەکی باشیشی پێدا نارد تا خوێنەکەیان بدات و دڵیان بهێنێتەوە، و عەلی (ﷺ)بەجوانترین شێوە کارەکەی جێبەجێ کرد و خوێنی شەهیدەکانی دان و تەنانەت کولانەی سەگێکیش ڕوخابێت بژاردی و لەکۆتاییدا پێی وتن: هیچتان ماوە تا مافی خۆی پێ بدەم؟ ووتیان نەخێر، ئەویش ووتی: دەی من هەرچی پارەم پێ ماوە دابەشی دەکەمەوە بەسەرتانا نەوەك شتێك مابێت و نەئێوە لەبیرتان بێت و نە پێغەمبەری خوا هەواڵی هەبێت لێ ی، و کاتێ گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەرو هەواڵەکەی

[1] صحیح السیرة لا ٥٢٧.

[2] فتح الباري (١١/٨).

بۆ باس کرد پیّ ی فەرموو: ((أصبت وأحسنت)) واتە: چاکت کردو باشت کرد، و سەرزەنشتی خالیدیش ناکات چونکە ئیجتیهادێکی هەڵەی کردبوو ...

(تا بەو چەشنە پێغەمبەرمان (ﷺ) گرنگی بەزانستی دەروونناسی و ڕاگیرکردنی دڵان داوەو لەکاتێکدا کە سەرکەوتووەو قوڕەیشی سەرکز کرد، وە هەموو عەرەب ئامادەبوون موسڵمان بن کەچی خەمی دڵی هۆزی جوزەیمەیەتی و عەلی (ﷺ)دەنێرێتە ناویان و دڵیان خۆش دەکات و ڕازیان دەکات، ئەگەر دیل کارینجی ژیانی پێغەمبەری بخوێندایە موسڵمان دەبوو، زانستی ئیسلامیشی دوکردە بنەمای زانستەکانی خۆی لەو بوارەدا).[1] (ووتەی وەرگێر بۆ سەرزمانی کوردی)

٥- عەلی و غەزای حونەین:

یەکێ لە هەڵوێستە پاڵەوانێتی یەکانی عەلی (ﷺ)لەجەنگی حەنیندا و لەساڵی هەشتەمی کۆچیدا..لەکاتێکدا سوپای ئیسلام کەوتە ناو بۆسەی بیّ باوەڕانەوە لەهۆزی هوازن و موسڵمانەکان لەگەڵ ژمارەی زۆریاندا پەرتەوازە بوون و هەریەکەو بەلایەکدا ڕای کرد، جگە لەژمارەیەکی کەم نەبێت لەکۆچەریان و پشتیوانان کە وەم چیای دامەزراو لەدەورو پشتی پێغەمبەرە پاڵەوانەکەیانەوە وەستان و نەجوڵان و بەرگریان بەجەستەی خۆیان لە پێغەمبەر (ﷺ) دەکردو عەلیش یەکێك بوو لەو ژمارە کەمە. لەناو سوپای کافراندا پیاوێك هەبوو بەسواری حوشترێکی سورەوە بوو ئاڵاکەیانی بەدەستەوە گرتبوو، دەگەیشتە هەر کەسێك ڕمێکی دەکرد بەسکیداو ئەگەر دەستیشی پیّ ی نەگەیشتایە ئاماژەی دەکرد بۆ هاوڕێکانی و ئەوانیش دەچوون بۆی دەیان کوشت.

عەلی (ﷺ)بەسەلیقەی سەربازی خۆی بۆی دەرکەوت کوشتنی ئەو پیاوە هۆیەکی زۆر گرنگە بۆ وورە شکاندانی هاوڕێکانی و پشت ساردبوونەوەیان لەشەڕ. بۆیە خۆی و ئەنصاریەك چوون بۆی و لە حوشترەکەی خستیانە خوارەوە و کوشتی و هەرئەوەندەی نەبرد هەموو سوپاکەیان پاشەکشەیان کردو هەمو هەڵاتن و موسڵمانان سەرکەوتن.[2]

---

[1] ووتەی وەرگێڕ بۆ زمانی شیرینی کوردی.

[2] صحيح المسند لا (١٤١) عدوي.

### ٦ ـ عەلی بتەکانی فەلس دەشکێنێ :

دوای پاك کردنەوەی کەعبەی پیرۆز لە ژەنگ و ژیواری بت پەرستی، و پێویستی دەکرد کە هەموو دوورگەی عەرەبی لە بت پەرستی و ئاسەواری سەردەمی نەفامی پاك بکەنەوە یەکێ لەو سریانەی بۆ ئەم کارە ئامادەکرابوو، سریەکەی عەلی کوڕی ئەبو طالب بوو کاری پـاك کردنـەوەی ناوچـەی هۆزی " طه ی " بوو کە" حاتم الطائی " خەڵکی ئەم ناوچەیە بوو، کەتیبێکی گەورەیان هەبوویە ناوی " فلس " ، عەلی (ﷺ)بە (١٥٠) جەنگاوەرەوە چوو بۆیان و لەگـەڵ بەرەبەیانـدا بتەکـەی تێك شکاندو دەستیان گرت بەسەر مەڕو ماڵات و ئافرەتەکانیاندا کە یەکێ لەو ئافرەتانـە کـچی حاتەمی تەی بوو، عەدی برایشی ڕای کرد بۆ شام.[١]

### حەوتەم/ پێغەمبەر (ﷺ) لە جێی خۆی دایدەنێ لە مەدینە:

لە مانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچیدا غەزای تەبووك ڕوویدا، و گرنگیەکی زۆر تایبەتی هەبوو لەلای موسڵمانەکان و کارێکی باشی کردبووە سەردەروونی عەرەبەکان و دەوروبەرەکانیـشیان ، و پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمانانی بەرەو تەبوك خستە ڕێ و عەلی کوڕی ئەبوو طالـب ی لـە شـوێنی خۆی دانا لە مەدینە، و دوو ڕووەکان ئەمەیان بـە هـەل زانـی و دەسـتیان کـرد بـە دەم درێـژی بەرامبەر عەلی و لەناو خۆیاندا دەیـانووت : بۆیـە عـەلی لەگـەڵ خـۆی نـەبرد چـونکە چـێرەی نەدەویست و حەزی نەکردووە لەگەڵ خۆی جیهادی پێ بکات .

( عەلی) یش (ﷺ)لە وەڵامدا پێی ووتن (( والذی خلق الحبة ، وبرأ النسمة،انە لعهد النبی الأمي (ﷺ) أن لا یحبنی الأ مؤمن ولا یبغضنی الأ منافق )).[٢] واتە: سوێند بەو کەسەی تۆو ئەتەقێنێ و پێغەمبەری نەخوێندەوار (ﷺ) ڕای گەیاندووە کە خۆشی ناوێم جگە لە موسڵمان و ڕقی لێم نیە جگە لە دووڕوو.

---

[1] تاریخ الإسلام للذهبی لا ٦٢٤.

[2] مسلم ژ ( ٧٨ ) .

بۆیە لەداخاندا وازی لە جێنشینی هێنا و خۆی گەیاندە سوپاکەی پێغەمبەری خوا و پێی ووت : " ئەی پێغەمبەری خوا من بە جێ دێڵی لەناو ژن ومنداڵاندا و خۆتان دەڕۆن بۆ جیهاد" ؟ پێغەمبەریش فەرمووی (( الا ترضى أن تكون منّي بمنزلة هارون من موسى، غير إنه لا نبي من بعدي ؟ )) .[1] واتە : ئایا بەوە ڕازی نابیت کە لە پلەی هاڕوندا بێت لەلام بۆ موسی ؟ هەرچەندە ئەوەی تێدایە کە دوای من پێغەمبەرێکی تر نایەت .

هەشتەم/ ئەی عەلی تۆ ئەمیری یان مأمۆر؟

لە ساڵی ٩ی کۆچیدا حەجی بتپەرستان جیا نەبوویەوە بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە وەرزی حەج کردندا خۆی پێی خۆش نەبوو بچێ بۆ حەج و ئەو هەموو ناشەرعیەی سەردەمی نەفامی ببینێ و نەشتوانێت بەرگری لێبکات لەبەر ئەو هۆیە ئەبوبکری صدیق ی کرد بە ڕابەری حاجیان و پێی فەرموو (( إنه يحضر البيت عراة مشركون يطوفون بالبيت ، فلا أحب أن أحج )) واتە: بتپەرستەکان بەڕووتی ئامادەی حەج دەبن و بەدەوری کەعبەدا تەواف دەکەن، ومن پێم خۆش نیە حەج بکەم .

ئەبوبکریش (ﷺ)پێشەوایەتی ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵان کردوو بە قوربانی یەکانیانەوە بەرەو مەککە کەوتنە ڕێ.

دوای ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن ئایەتی بەرائەت هاتە خوارەوە کە دەبێت پاش ئەم ساڵ بۆ بت پەرست نەبێت حەج بکات و بۆیە بۆیە بەپەلە پێغەمبەر (ﷺ) عەلی بانگ کردوو پێی ڕاگەیاند کە خێرا بگەرە قافڵەی حاجیان و بڕۆ لەگەڵیان بۆ مەککە ئایەتی ـ بەرائەت ـ بخوێنەوە و پەیامی خوا بگەینن بەهەموو حاجیانی ماڵی خوا بە بت پەرست و موسڵمانەوە، و بۆ متمانەی زیاتریش حوشترەکەی خۆی ـ عضباء ـ ی پێدا تا بڕوات بۆ ئەو کارە ڕاگەیاندنی یە گرنگە عەلی (ﷺ)خۆی گەیاندە ئەبوبکر لە ناوچەی " ذي الحليفة " . و کاتێ ئەبو بەکریش (ﷺ)بینی پێی ووت : أمير أم مأمۆر؟ واتە : وەك ئەمیر نێردراویت یان وەك کەسێکی ئاسایی؟ فەرمووی : کەسێکی ئاسایی .

[1] البخاري ژ ( ٢٠٢٤) .

کە گەیشتە حەج ، هەروەك سەردەمی نەفامی ئیش و کارەکانی حەجی بە موسڵمانان ئەنجام دا و هەموو ئەرکەکانی حەجی یەك یەك ڕوون دەکردەوە و دوا بەدوای ئـەویش عـەلی (ﷺ)سـەرەتای سوڕەتی ( التوبه ) ی دەخوێندەوە و دەیفەرموو (( ناچێتە بەهەشت هەر کەسێ موسڵمان نەبێت، و نابێت کەس لەمەولا بەڕووتی حەج بکات، و هەر کەسێ پەیمانی لەگەڵ پێغەمبـەردا هەیـە بـە جێی خۆی و لەم ساڵ بەدواوە موسڵمان و بت پەرست نابێت پێکەوە حەج بکەن )).[1]

٩ـ عەلی (ﷺ) و وەفدەکەی نەجران:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) نامەیەکی نووسی بۆ نەجران و تیایدا فەرمووی (( اما بعد ، فاني أدعوكم الى عبادة الله من عبادة العباد ، و ادعوكم الى ولاية الله من ولاية العباد ، فـإن ابيـتم فالجزيـة فان ابيتكم أذنتكم بحرب ، والسلام )).[2]

واتە: پاشان ، بانگتان دەکەم بۆ بەندایەتی خوا لە باتی بەندایەتی بەندەکانی ، و لە ژێر دەستەیی خەڵکی یەوە بۆ ژێر سایەی پەروەردگاری خەڵکی، ئەگەر قبوڵی ئەوەش ناکەن ئەوا سەرانە بـدەن بە ئیسلام و ئەگەر ئەوەشتان نەکرد ئەوە جەنگتان لەگەڵ دەکەین، و السلام .

کاتێ نامەکەیان پێ گەیشت ، قەشەکانیان هەستان بـە کۆکردنـەوەی خـەڵکی و نامەکـەیان بـۆ خوێندنەوە و ڕاوێژیان پێکردن کە چی بکەن، و دواتر بڕیاریاندا وەفدێك کە هەندێ دەڵێن ( ١٤ ) کەسی ناوداریان بوون و هەندێ دەڵێن ( ٦٠) سوار و سێ کەسیان گەورە دەمڕاسیان بوون.[3]

وەفدەکەیان گەیشتە شاری مەدینە وجل و بەرگی سەفەریان داکەندو جل و بـەرگی جـوان وگـران بەهاو دەوڵەمەندی یان لەبەرکرد و ئاڵتونیان کردە پەنجەکانیان و بەو شێوازە وە هاتنـە خزمـەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و سلاَویان لێکرد پێغەمبـەریش وەلاَمـی سـلاَوەکەی نەدانـەوە و هەرچـی هەوڵیاندا گفتوگۆی لەگەڵ بکەن ئەو هەر پشتی تێدەکردن .

بۆیە خۆیان گەیاندە عثمانی کوڕی عەفان و عبدالرحمن کوڕی عەوف (ﷺ)کە پێشتر دەیانناسین، و لەسەردەمی نەفامیدا بازرگانیان لە نێواندا هەبوو، لەناو کۆمەڵێ لە پشتیوانانداندا دانیشتبوون، و

---

[1] مسند الأمام احمد ژ ( ٤٩٢ ) حديث صحيح .

[2] البداية والنهاية ( ٤٨/٥).

[3] السيرة النبوية لابى شبهه ( ٥٤٧/٢)

بانگیان کرد: ئەی (عثمان )، ئەی ( عبدالرحمن )، پێغەمبەرەکەتان نامەیەکی بۆ ناردوین و ئێمەش هاتووین بەدەم نامەکەوە کەچی سلاوّمان لیّ کردووە وەلاّمان نەداتەوە و بەدرێژایی ئەمڕۆ ئامادە نەبووە لەگەلّمان گفتوگۆ بکات، ئایا ڕای ئێوە چیە؟ ئایا پێتان وایە بڕۆینەوە ؟
عەلی کوڕی ئەبوطالب (ﷺ)لەناو خەلّکەکەدا بوو هەردووکیان لێیان پرسی: ئەی ( ابو حسن ) تۆ چیان وەلاّم دەدەیتەوە ؟ من وا بە باش دەزانم ئەو جل و بەرگ و ئالّتون و شتانەی بەریاندا بکەنن و جل و بەرگی ئاسایی سەفەرەکەیان لەبەر بکەنەوە ، وە وەفدەکەش وایان کرد و گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و سلاّویان لێکرد و ئەویش وەلاّمی سلاّوەکەی دانەوە و دەستیان کرد بە گفتوگۆ و لەناو قسەکانیاندا وتیان بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە لەپێش ئێوەشەوە موسلّمان بووین، پێغەمبەریش لەوەلاّمدا پێی وتن (( یمنعکم من الإسلام ثلاث: عبادتکم الصلیب، واکلکم الخنزیر، و زعمکم ان لله ولداً )).[1] واتە: ئێوە سێ شت ڕێگرە لە بەردەم موسلّمان بونتاندا : خاچ پەرستیتان ، بەراز خواردنتان ، وگومانبردنتان بەوەی کە خودا کوڕی هەیە).
دیسان وتیان : تۆ جنێو بە پێغەمبەرەکەمان ـ عیسی ـ دەدەیت کە پێی دەلّێیت ـ بەندەی خوایە ! ئەویش فەرمووی (( أجل انه عبدالله و رسوله و کلمته القاها الی مریم العذراء البتول )) واتە : بەلّێ بەندەو پێغەمبەری خوایە و ووشەی پەروەردگارە و بە فەرمانی خۆی خستویەتی نێو سکی مەریەمی خواناس .
بەو وتەیە زۆر توڕە بوون و وتیان : ئایا هەرگیز کەست دیوە بەبێ باوك لەدایك ببێت ؟ و ئەگەر ڕاستەکەیت نمونەیەکمان بەرێ ؟ خوای گەورەش لە وەلاّمیاندا ئایەتی قورئانی دابەزاند و فەرمووی (( إن مثل عیسی عندالله کمثل ادم خلقه من تراب ثم قال له کن فیکون )) . واتە: وێنەی لەدایك بوونی عیسی بەبێ باوك وەك دروست بوونی ئادەمە ـ علیه سلام ـ بەبێ باوك و دایك ، بەو وەلاّمە دەم کوتی کردن بە یەکجاری و قسەیان بۆ نەهات .
پاش ئەوەی زانی گفتوگۆ بێ سوودە لەگەلّیان دا بانگی کردن بۆ ( موباهەلە) واتە لەعنەت بکەین لەوەمان لەسەر ناهەقە و لام و جیم دەکات ،[2] و عەلی و حەسەن و حوسەین و فاطمە ی

---

[1] زاد المعاد ( ٦٣٣/٣)

[2] السرة النبوية لابی شبهة ( ٢ / ٥٤٧).

بانگ کرد و فەرمووی هەردووعایەکم کرد هەموولایەك بلێت ـ ئامین ـ و ئەوانیش لە نێوان خۆیاندا کەوتنە مقۆ مقۆ و چفە چف و ووتیان ـ ئامین ـ ناکەین ، چونکە دڵنیابوون کە ئەو پێغەمبەرە، و بۆیە پێیان ووت: خۆت چۆنت پێ خۆشە وامان لێبکە؟ پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەگەڵیان ڕێك کەوت لەسەر دوو هەزار خشڵ کە مانگی ڕەجەب هەزارو مانگی سەفەر هەزارەکەی تر بدەن.[1]

دەیەم / عەلی (ﷺ) بانگ خواز و دادوەری یەمەن :

لەپاش فەتحی مەککە زۆرێك لە هۆزەکانی عەرەبی دورگە هاتن بەدەم بانگەوازی ئیسلامەوە، و پێغەمبەری خوایش (ﷺ)بانگ خوازانی دەنارده ناویان بەتایبەت ئەو هۆزانەی کە هێشتا موسڵمان نەبوو بوون، لەوانە عەلی کوڕی ئەبو طالیبی (ﷺ)نارد بۆ هەمەدان لە یەمەن .

با گوێبگرین بۆ بەرائی کوڕی عازب (ﷺ)کە لەگەڵ عەلیدا هاوڕێی ئەم گەشتە بانگەوازی یە بوو ، و دەڵێت: کاتێ گەیشتینە سەرەتای ماڵەکانی یەمەن، هەواڵی هاتنمان بلاّوبوویەوە و هەمویان کۆبونەوە و عەلی بەر نوێژی کردین و نوێژی بەیانیمان ئەنجامدا،و کاتێ لێبویەوە هەموو بەیەك ڕیز وەستاین و عەلی(ﷺ)لە ڕیزەکە هاتە دەرەوە و سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان نامەکەی پێغەمبەری خوای بۆ خوێندنەوە و هەمەدان هەموویان موسڵمان بوون لەو ڕۆژەدا و ئەو هەواڵەی لەنامەیەکدا ناردەوە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەریش هەر لەوێدا سوژدەیەکی برد بۆ خوای گەورە و فەرمووی ((السلام علی همدان،السلام علی همدان))

و بەم کارە ئاواتی پێغەمبەری سەرکردە (ﷺ) هاتە دی کە حەزی دەکرد بەرەکانی باشوری وولاّتی ئیسلام ئەمین بێت و بەردەوام کەسانی تریشی وەك ـ خالیدی کوڕی وەلید و موعازی کوڕی جەبەلی ـ بۆ ناردن (خوایان لێ ڕازی بێت ).[2]

و پێغەمبەریش (ﷺ) بە عەلی فەرموو: ببە بە قازی ناویان و کێشەکانیان یەکلا بکەرەوە، و عەلی (ﷺ)خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت ((پێغەمبەری خوا ناردمی بۆ وولاّتی یەمەن،

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو(٢ / ٥٤٧)

[2] الفقه السیاسی للوثائق لا ٢٣١ .

ومنیش پێم ووت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ ئەم نێریت بۆ ناو هۆزێك كە هەموویان لەمن بە تەمەنترن و منیش لاوێكم دادوەری نازانم )).

دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەستی هێنا بەسەر سنگمدا و فەرمووی " اللهم ثبت لسانه وأهد قلبه، یاعلی إذا جلس الیك الخصمان فلا تقضی بینهما حتی تسمع من الأخر ما سمعت من الأول ، فأنك إذا فعلت ذلك تبین لك القضاء" واتە: ئەی عەلی ئەگەر دوو كەس بە كێشەكانیانەوە لە بەردەمتدا دانیشتن حوكم دەرمەبڕە تا گوێ لە دووەمیش دەگریت وەك چۆن گوێت لە یەكەم گرت، و ئەگەر وا بكەیت حوكمەكەت بۆ ڕوون دەبێتەوە ، و عەلی دەڵێت : پاش ئەوە هیچ مەسەلەیەكی دادوەریم لەدەست دەرنەچوو و هیچ مەسەلەیەكم لیَ تێك نەچووە.[1]

ـــ نمونەیەك لە دادوەریەكانی عەلی (ﷺ)لەناو یەمەنی یەكاندا:

مەسەلەی (( زبیة الاسد ))، حەنەش لە عەلیەوە دەگێڕێتەوە و كە دەڵێت (( پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردمی بۆ یەمەن و گەیشتینە ناو هۆزێك ، چاڵیان هەڵكەندبوو تا شێرێكی تیَ بكەوێت و ڕاوی بكەن و لەسەر چاڵەكە شان شانێنیان كردبوو یەكێكیان كەوتە خوارەوە و دەستی گرتبوو بەیەكی ترەوە و ئەویشی خستە خوارەوە و ئەویش دەستی گرتبوو بە یەكی ترەوە و تا چوار كەس كەوتنە ناو چاڵەكە و شێرەكەش هەموویانی بە سەختی بریندار كردبوو تاله ئاكامدا یەكێكیان بە خەنجەرەكەی شێرەكە دەكوژێت و بەلاَم لەتاو قوڵی برینەكانیان هەرچواریان دەمرن.

و كەس و كاری هەریەكەیان كردی بەچەكدا بۆ ئەوانی تر و عەلیش لەوكاتەدا حازر بوو بە سەریانەوە و پێی گوتن : ئایا ئێوە لەناویەكدا دەجەنگن هێشتا پێغەمبەری خوا لەناوتاندایەو زیندووە ؟ نەكەن بەڵكو من دادوەریەكتان بۆ دەكەم ئەگەر پێتان باش بوو جیَ بەجێی بكەن و ئەگەر بە دڵیشتان نەبوو ئەوا ئارام بن تا دەچنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەو دادوەری ئەوەتان بۆ بكات ئیتر پاش ئەوە هەركەسیَ داوای خوێن بكات مافی ئەوەی نیە و هیچی ناكەوێت.

لە هەموو هۆزی ئەوانەی كەوتبونە ناو بیرەكەوە ( ٤/١ ) و (٣/١)و (٢/١)و لەگەڵ دییەكی تەواودا لێی كۆكردنەوە و چارەكەكەی دا بەیەكەم چونكە یەكی تریشی خستۆتە خوارەوە و

---

[1] الفضائل الصحابة ( ٨٧١/٢) اسناده حسن ذ ١٩٩٥.

سێیەکەکەی دا بەدووەم و نیوەکەی دا بەسێیەم و دیە تەواوەکەشی دا بەچوارەم، بەلاّم هیچ لایەکیان بە حوکمەکەی عەلی ڕازی نەبوون. و خۆیان گەیاندە مەدینە و مەسەلەکەیان بۆ پێغەمبەری خوا باس کرد و ئەویش ویستی حوکمیان بکات، یەکێکیان ووتی: عەلی بەم جۆرە حوکمی نێوانمانی کرد و پێغەمبەریش بە حوکمەکەی ڕازی بوو.[1]

یانزدەهەم / عەلی (ﷺ) لە حەجی ماڵئاوایدا:

لە حەجی ماڵئاوایدا عەلی(ﷺ) خۆی گەیاندە پێغەمبەری خواو(ﷺ) و دەبینێ پێغەمبەر(ﷺ) بەدەستی موبارەکی خۆی قوربانیەکانی سەردەبڕێت و بە ژمارەی تەمەنی خۆی کە ( ٦٣) ساڵ دەکات وولاخی سەربڕی و پاشان دەستی هەلگرت و فەرمانی دا بە عەلی (ﷺ)کە قوربانی یەکانی تری بۆ سەربڕێت کە ( ١٠٠) دانە بوون.

و عەلی (ﷺ)شێوازی حەجکردنی پێغەمبەری ئازیزمان بۆ دەکات لە حەجی ماڵئاواییدا و لەعەلی دەگێرنەوە کە دەڵێت " پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر کێوی عەرەفە وەستا بوو بە تەنیشتی ئوسامەی کوڕی زەیدەوە فەرمووی ((هڎا الموقف و کل عرفە موقف )) واتە: ئێرە جێگای وەستانە وهەموو عەرەفە جێگای وەستانە و پاشان چووە ناو خەلکەکەو دەبینێ هەموو بە چەپ و ڕاستدا ئەم لاو ئەم لا دەکەن و ئەویش لای کردەوە بۆ لایان و فەرمووی (( السکینة ، السکینة، ایها الناس )) واتە: بە هێمنی، بە هێمنی، ئەی خەلکینە )) وتا گەیشتە " موزدەلیفە" و دوو نوێژی کۆکردەوە و لەسەر بەرزایی یەك وەستا بە تەنیشتی (فضل ی کوڕی عەباس ) ەوە فەرمووی (( هذا الموقف و کل الموقف مزدلفة)) واتە: ئەمەش شوێنی وەستانە و هەموو موزدەلیفەیش جێگەی وەستانە.

ولەو کاتەدا ئافرەتێك هاتە خزمەت سەروەر (ﷺ) پێی ووت: باوکم حەجی لەسەر فەرزە بەلاّم لەتوانایدا نیە حەج بکات ئایا من دەتوانم لە جیاتی ئەو حەج بکەم بۆی ؟ و پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ـ نعم ـ واتە بەڵێ ، لەوکاتەدا ڕووی فەضلی دەکردە پشتەوە و تا تەماشای ئەو ئافرەتە نەکات .

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ( ١٢٣٩)اسنادە صحیح.

و پاشان عەباسی مامی (ﷺ)لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من چاوم لێبوو ڕووی برازاکەت بۆ دواوە وەردەگێڕا؟ ئەویش فەرمووی (( أنی رأیت غلاماً شاباً، و جاریة شابة ، فخشیت علیهما الشیطان )) واتە: من کوڕێکی گەنجم دی و کچێکی گەنجیش بۆیە ترسام شەیتان لە خشتەیان بەرێت

دوانزەهەم/ عەلی (ﷺ) شەڕەف مەند بوو بەشۆرینی جەستەی پێغەمبەر (ﷺ) و ناشتنی :
کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد عەلی لەگەڵ فضل و ئوسامەدا شۆردیان.[1]
و عەلی (ﷺ)دەڵێت: کاتێ پێغەمبەری خوام (ﷺ) دەشۆرد، لەوە ورد دەبومەوە بزانم هیچی لەوەزعی مردوو دەکات، هیچی لە وەزعی مردووی نەدەکرد و بەزیندوویی و بە مردوویی بۆنی خۆش بوو.[2]
هەر عەلیش بوو (ﷺ)کە لەگەڵ فضل ی کوڕی عەباس و قثم ی کوڕی عەباس و شەقرانی خزمەتکاری پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چوونە ناو قەبرەکەو خۆش بەخت بوون بەناشتنی جەستەی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) .

سیازدەهەم/ بەسەرهاتی ئەو وەسیەتنامەیەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە نیاز بوو لەسەرەمەرگدا بۆ عەلی بنوسێت :
لە هەردوو صحیحی بوخاری و موسلم دا هاتووە کە ( ابن عباس ) (ﷺ)دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی مردنی هات کۆمەڵێ پیاو بەدەوریدا بوون، فەرمووی (( هلموا اكتُب لكم كتاباً لا تضلوا بعده )) واتە:وەرن باشتێکتان بۆ بنوسم تا دوای خۆم سەرتان لێ نەشێوێت.
لەوکاتەدا هەندێك ووتیان: ئازار زۆری بۆ پێغەمبەرمان هێناوە و ئێ قورئانیشمان لەناودایە و ئەو هەموو شتێکە بۆ ئێمە، هەندێ لەخانەوادەی پێغەمبەر (ﷺ) ـ لەوێ بوون: ووتیان نزیك ببنەوە

[1] ابو داود (٣ /٢١٣)صححه الألبانی لا ٥٠.
[2] سنن ابن ماجة ( ١ / ٣٦٢ ) و صححه الألبانی لا ٥٠ .

وەلیٰ تا شتێك بنوسێت بۆمان تا پاش خۆی سەرمان لیٰ نەشێوێت و کاتیٰ دەستیان کرد بە دەمەقاڵەو گفتوگۆ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : قوموا ، واتە هەڵسن بڕۆن.

و عبدالله دەڵێت: هۆکاری سەرەکی ئەوەی هیچی بۆ نەنوسین ئەوەبوو کە دەمەقاڵە و دەنگە دەنگ دروست بوو.[1]

لەم فەرموودەیەشدا هیچ شتێکی وای تێدا نیە کەلەکەو نەنگی بێت بۆ هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هەموو ئەو بۆچوون و بەڵگانەی شیعەکان دەیهێننەوە ناڕەوایە و بەئاشکرا بیٰ مانایە و زانایان لە کۆن و نوێدا وەڵامی ئەو قسەلۆکانەیان داوەتەوە لەوانە:

١ ـ ناکۆکی ناو هاوەڵاَن لەو مەسەلەیەدا ئاشکرایە، وهۆکارەکەشی ڕادەی تێگەیشتنیان بوو هەر کەسەو بە جۆرێك لە فەرموودەکەی و نەك سەرپێچی کردنی، و ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە ـ ئیجتهاد ـ و بۆ چوونی ڕەوایان هەبوو لە مەسەلەکاندا و هەموشیان پاداشتیان هەبوو لەسەر ئەو بۆچونانەیان و هەموو (مجتهد)ێکیش یان دەپێکیٰ یان بەرامبەرەکەی دەپێکیٰ و هیچ کامیان گوناه بارنابن و بەڵکو پاداشتیان هەیە.[2]

بەبەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) سەرزەنشتی هیچ لایەکی نەکرد و بەڕوویاندا هەڵنەشاخا بەڵکو بەس ئەوەندەی فەرموو (( وازم لیٰ بهێنن ئەمەی منی تێدام باشترە )).[3]

وێنەی ئەمەش لە جەنگی خەندەقدا ڕوویدا کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (( فلا يصلين احدا لعصر الا في بني قريضة )).[4] واتە کەس نوێژی عەسر نەکات تا دەگەینە بەنی قەریچە بەلاَم هەندیٰ لەهاوەڵاَن ترسان نوێژەکەیان بڕوات بۆیە نوێژیان کرد لە ڕێگەو هەندیٰ تریش نەیانکرد تا ئەویٰ و پێغەمبەریش (ﷺ) لە هەردوولایان ڕازی بوو و هیچی پیٰ نەووتن.

٢ ـ شیعەکان دەڵێن ئەو جیاوازی و دەمەقاڵەیەی هاوەڵاَن بووە هۆی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتێکی وای بۆ نەنوسین کە لەسەرگەردانی و گومڕایی بیانپارێزێت !!.

---

[1] البخاری ژمارە ( ٤٤٣١).

[2] الفهم لما أشكل ـ تلخيص كتاب مسلم ( ٤ / ٥٥٩ ) .

[3] " ادعوني ، فالذي انا فيه خير" البخاری ژ ( ٤٤٣١) .

[4] البخاری ٤١١٩.

ئەم بەڵگەیەش ناڕەوایە بە ئاشکرا ، چونکە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنها لەبەر دەمەقاڵەیەکی ناوخۆیی هاوەڵان پەیامی خوای شاردبێتەوە و پێی نەوتبن، و ئەگەر ئەمە وابێت ـ پەنا بەخوا ـ کەواتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەندێ پەیامی خوای شاردۆتەوە و باسی نەکردووە و ئەمەش تانەیەکی

گەورەیە لە پێغەمبەرمان (ﷺ)نی دەدەن و خوایش دەربارەی دەفەرموێت ((يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ )).[1] واتە: ئەی پێغەمبەر چی لەلایەن خوداوە بۆ دێت بیگەیەنە و ئەگەر وانەکەیت ئەوە بە ئەرکی پێغەمبەرایەتی هەڵنەساویت و خوایش لە خەڵکی دەتپارێزێت.

٣ ـ یان ئەوەی کە دەڵێن : گوایە پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی لە نوسینی ئەو شتە هەڵبژاردنی عەلی بوو بە خەلیفەی موسڵمانان لە دوای خۆی ! و شیعەکان دەڵێن لەمە بەولاوە تەفسیری تر هەڵناگرێت و ئەم وتەیەش پوچەڵ و ناڕەوایە: وەك ( ابن تیمیە) دەڵێت : هەرکەسێ وا گومان بەرێت کە ویستویەتی بەنامەی خۆی خیلافەتی عەلی بچەسپێنێت ئەوە بەڕای هەموو ئوممەت بە شیعەو سوننەوە کەسێکی گومڕایە. چونکە ئەهلی سوننە لەسەر ئەوە یەکن کە ئەبوبکر(رضي الله عنه)لەپێشتر بووە بۆ جێنشنی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوانەشی کە دەڵێن عەلی(رضي الله عنه) شایان بووە بکرێتە خەلیفە و دەڵێن چەندان دەق هەیە ئەو مافەی دەداتێ، دەی کەواتە چ پێویست بەوە دەکات کەلەسەرەمەرگدا شتێکی لەو بابەتە بنوسێت .

[1] المائدة ٦٧.

## بەشی دووەم

## عەلی (ﷺ) لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدکاندا:

### جێباسی یەکەم

### عەلی (ﷺ) لە سەردەمی ئەبوبکری صدیق دا (ﷺ):

**یەکەم/ بەیعەت دانی بە ئەبوبکری صدیق (ﷺ):**

ڕیوایاتی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی بەیعەت دانی عەلی (ﷺ)بە ئەبوبکر دواکەوت ، وەك چۆن زوبێری کوڕی عەوامیش (ﷺ)دواکەوت .

زۆرێ لەو ڕیوایەتانە صحیح نین و لە بەرامبەریشدا ڕیوایاتی صحیح زۆرە لەسەر ئەوەی کە ئەو دوانەش لە سەرەتاوە بەیعەتیان بە ئەبوبکرداوە.

لە ئەبی سعید الخودری یەوە دەگێڕنەوە (ﷺ)کە ووتویەتی : کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد، وتار بێژەکانی پشتیوانان قسەی خۆیان کرد بە درێژی لە" بیعة السقیفة دا"،و پاشان دەڵێت " کاتێ کەوتنە ڕێ ئەبوبکر(ﷺ)چووە سەر مینبەرو سەیری خەڵکەکەی کرد و عەلی نەبینی و هەواڵی پرسی، هەندێ لە پشتیوانان چوون بەدوایداو هێنایان و ئەبوبکر (ﷺ)پێی ووت : ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا و ئەی زاوای ئەو دەتەوێت نێوان موسڵمانان تێك بدەیت؟ ئەویش ووتی: تۆ هیچ شتێکت لەسەر نیە ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا ، و پاشان هەستاو بەیعەتی پێدا و پاشان دەبینی زوبێریش لەوێ نیە، و هەواڵی پرسی و چوون بۆیان هێنا ، و پێی ووت: ئەی پورزای پێغەمبەری خواو خۆشەویستی ئەو ، ئەتەوێ ڕیزی موسڵمانان تێك بدەیت؟ زوبێرش (ﷺ)ووتی : تۆ هیچت لەسەر نیە ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا و پاشان بەیعەتی پێدا.[1]

مسلم لە کتێبەکەی کە لەگەڵ کتێبەکەی بوخاریدا، صحیح ترینن دوای قورئانی پیرۆز لە پێناو ئەو فەرموودەیەدا دەچێت بۆ لای مامۆستاکەی (ابن خزیمە) کە خاوەنی ( صحیح ابن خزیمە ) یەو

---

[1] المستدرك ( ٣ / ٧٦ ) و السنن الكبرى ( ١٤٣/٨ ) بأسنادين صحيحين.

دەربارەی فەرموودەکەی سەرەوە لێی پرسی و پێشی ووت: ئەم فەرموودەیە لەلام لە قوربانییەکی گەورە و قەڵەو باشترە،وابن خزیمەیش ووتی: نەك ئەوەندەی ولاخێکی قەڵەوە بەڵکو ئەوەندەی کیسێکی پڕ لە پارە، و ( ابن کثیر ) یش لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت " اسنادە صحیح محفوظ " و کەڵکێکی گەورەی هەیە کە ئەوەی تێدایە عەلی (ﷺ) بەیعەتی داوە بە ئەبو بکری صدیق (ﷺ)ئیتر لە ڕۆژی یەکەم دا بووبێت یان دووەم.[1]

دووەم / عەلی (ﷺ) پشگیری ئەبوبکر دەبێت لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا :

عەلی (ﷺ)شلیفێك ئامۆژگاری بووە بۆ صدیق (ﷺ)و باشترین بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە دڵسۆز بووە بۆ ئەبو بەکرو قسەی خێری بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان و سووربوونی لەسەر پارێزگاری لە خیلافەت و کۆبونەوەی موسڵمانان لە چوار دەوری، لەوەدا دەردەکەوێت کە کاتێ ئەبو بەکر (ﷺ)سواری وولاخەکەی بوو و ویستی بڕوات بۆ ناوچەی ( ذی القصة) بۆ جەنگ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا، و عەلی کوڕی ئەبو طالب چووە ڕێگەی و ڕەشۆی وولاخەکەی گرت و پێی ووت: منیش هەمان شتت پێ دەڵێم کە پێغەمبەر (ﷺ) لە جەنگی ئوحود فەرمووی (( لُمّ سیفك، ولا تفجعنا بنفسك و ارجع الی مدینة فوالله لئن فجعنا بك لا یکون للاسلام نظام أبداً)) و فرجع.[2]
واتە: شمشێرەکەت بهەرەوە نێو کێلانْ و کۆسمان مەخە بە کوشتنت و بگەڕێوە بۆ مەدینە، و سوێند بە خوا ئەگەر تۆمان لە دەست دەربچێت ئیتر ئیسلام دەوڵەت و دەستووری نامێنێ هەرگیز، و ئەویش گەڕایەوە.

خۆ ئەگەر وەك دوژمنان و هەندێ نەزانانی ناوشیعەکان دەڵێن ئەبوبکر پۆستی جێ نشینی لە عەلی داگیر کردووەخۆ دەبوایە حەزی کردایە ئەبوبکر بچێتە ناو شەڕو بکوژرێت تا ئەو مافە زەوت کراوەی بۆ بگەڕێتەوە یان کەسێك بنێرێت لە ڕێگە تیرۆری بکەن، کە عەلی (ﷺ)زۆر لەوەوە دوورە ، وەك چۆن سیاسەت مەدارانی ئەمڕۆ لەگەڵ نەیارانیاندا دەیکەن.[3]

---

[1] البدایة والنهایة ( ٥ / ٢٣٩)

[2] هەمان سەرچاوە لاپەرە ( ٦/ ٣١٤، ٣١٥ ).

[3] المرتضی، الندوی لا ٩٧.

لە کاتی ئاشوبی هەڵگەڕانەوەدا ئەبوبکر ویستی بجەنگێت لە گەڵیاندا بەڵام ڕاوێژی بە عەلی کرد پێی ووت: تۆ چی دەڵێیت ئەی باوکی حەسەن؟ ئەویش لەوەڵامدا ووتی: ئەگەر هەر شتێکیان لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) داوە بە زەکات و ئێستا بە تۆی نەدەن و قسەش نەکەیت ئەوا لە ڕێڕەوی پێغەمبەر لات داوە ، ئەویش ووتی: کە مادام وات ووت دەی دەجەنگم لەگەڵیاندا تەنانەت ئەگەر ڕشۆیەکی ولاخیشم لێ بگرنەوە.[1]

سێ یەم / ئەبوبکری لەخۆی بە گەورەتر زانیوە :

ڕیوایەتی زۆر هاتووە لەسەر ئەم ڕێزلێنانەی عەلی لە ئەبوبکر (رضي الله عنه)لەوانە:

١ ـ محمدی کوڕی حەنەفی یە دەڵێت بەباوکم گوت: کێ باشترین کەسە پاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئو ئەویش ووتی : ئەبوبەکر، ووتم: ئەی پاش ئەو؟ ووتی: عمر ، بۆیە ترسام لەسێیەمدا بڵێ عثمان خێرا ووتم: پاشان تۆ؟ لەوەڵامدا ووتی : من تەنها یەکێکم لە موسڵمانان.[2]

٢ـ لە عەلیەوە دەگێڕنەوە کە ووتویەتی: ئایا پێتان بڵێم کێ باشترین کەسی ئەم ئومەتەیە لە پاش پێغەمبەرەکەی ئەبوبکر، و پاشان ووتی : ئەزانن دوای ئەبوبکریش کێ باشترینە عمر.

لە بەبی وائل شەقیقی کوڕی سەلەمەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: بە عەلی کوڕی ئەبو طالبیان وت ئایا کەسێ دیاری ناکەیت دوای تۆ بچێتە شوێنەکەت؟ عەلیش (رضي الله عنه)ووتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەسی دیاری نەکرد پاش خۆی تا منیش دیاری بکەم بۆ خۆم ، بەڵام ئەگەر خوای گەورە نیازی چاکەی بە خەڵکی هەبێت دوای من چاکترین کەسیان دەکاتە گەورەیان وەك چۆن دوای پێغەمبەرەکەی خەڵکی لەسەر باشترین کەسیان کۆکردەوە.[3]

٤ ـ عەلی (رضي الله عنه)دەڵێت (( لا يفضلني احد على ابى بكر و عمر الاّ جلدته حد المفترى )).[4] واتە: هەرکەسێ من بەباشتر بزانێت لە ئەبوبەکرو عمر ئەوە دارکاری دەکەم کە جەڵدەی بوختان چیە.

---

[1] الرياض النظرة لا ٦٧٠.

[2] البخاري . مسند امام احمد ( ١ / ١٠٦ ـ ١١٠)

[3] المستدرك ( ٣ / ٧٩) صحيح الأسناد.

[4] فضائل الصحابة ( ١/ ٨٣) فى سنده ضعف .

## خۆشەویستی و پەیوەندی نێوان عەلی و ئەبوبەکر:

١ ـ عەقبەی کوڕی حارپ دەڵێ : لەگەڵ ئەبوبەکری صدیقدا پێکەوە دەچوین بۆ نوێـژی عەسـرو عەلیش (ﷺ)بە تەنیشتیەوە بوو ـ ئەمە چەند ڕۆژێك پـاش وەفـاتی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) و حەسەنیش منداڵێکی بچکۆڵە بوو بەلایاندا ڕای کرد و ئەبوبەکر گرتی و خستیە سەرقەڵادو شانی خۆیی و دەیووت:

بأبی شبیه بالنبی ولیس شبیهاً بعلی

کت و مت لە پێغەمبەر دەکات وهیچی لە عەلی ناکات، و عەلیش لەولاوە پێدەکەنی .[1]

٢ـ ( ابن تمیه) دەڵێت: لە دەماو دەمێکی زۆرەوە لە گەورەی باوەڕدارانەوە عەلی کوڕی ئەبوطالب (ﷺ)کەوتویەتی " خیر الأمة بعـد نبیهـا ابـو بکـر ثـم عمـر " چـاکترینی ئـەم ئوممەتـە لـەپاش پێغەمبەرەکەی ئەبوبەکرە پاشان عمر.

دیسان لە ( ٨٠) ڕێگاوە ڕیوایەت کراوە کە ووتویەتی (( هەرکەسێ من بەباشتر بزانێت لە ئـەبو بەکرو عمر، ئەوە دارکاری دەکەم بە ژمارەی جەڵدەی بوختان چی )).[2]

### چوارەم / شوێن پێی صدیق ی هەڵگرتووە لە ئیش و کاریدا:

عەلی (ﷺ)زۆر ڕازی بوو بە جێنشینایەتی ئەبوبەکرو هاوبەشی بووە لە ئیش و کارو چارەسـەری کێشەکاندا، و خۆشی ویستووە لە دوایەوە نوێژی کردووە و ڕقیشی لەو کەسانە بوو، کە ڕقیان لێ ی بووە.[3]

---

[1] مسند احمد ( ١/ ١٧٠) اسناده صحیح .

[2] مناهج السنة ( ٣ / ١٦٢)

[3] الشیعة و اهل البیت ـ احسان الهی ضهیر ل ٦٩.

تەنانەت کەسێك کە لە نەیاری خەلیفە راشیدەکانیش دانی بەو ڕاستی یە داناوە و ئەوە ـ یەعقوبی ـ شیعەی توندڕەوە لەمێژوەکەیدا باسی سەردەمی خیلافەتی صدیق دەکات و دەڵێت " ئەبوبەکر ویستی غەزای وولاتی ڕۆم بکات ڕاوێژی بە کۆمەڵێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردو هەریەکەیان شتێکیان ووت و ڕاوێژیشی بە عەلی کرد و ئەویش ئاماژەی پێدا کە هەستێت بەو کارە، ئەبو بەکریش ووتی: تۆ بڵێی ئەم کارە بکەم سەرکەوتوبم؟ عەلی (ﷺ)ووتی: مـوژدەی خۆشت هەیە .

ئەبو بەکر ووتی: چ موژدەیەك؟ عەلی (ﷺ)ووتی :لەپێغەمبەری خوام بیستووە کە ئەو مژدەیەی داوە، و ئەبو بەکریش (ﷺ)(ﷺ) پێی ووت : ئەی باوکی حەسەن دڵت خۆش کردم بەو مژدەیەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە دڵی تۆش خۆش بکات )).[1]

و عەلی (ﷺ)هەمیشە دوعای خێری کردووە بۆ ئەبوبەکر لەسەر کاری مەزنی کۆکردنەوەی قورئان و ووتویەتی" اعظم الناس أجراً في المصاحف ، ابوبکر الصدیق ، هو اول من جمع بين اللوحتين ".[2] واتە: گەورەترین پاداشتی قورئان بۆ ئەبو بەکری صدیق ە کە ئەو یەکەمین کەس بوو قورئانی لە دوو توێی کتێبێکدا کۆکردەوە.

پێنجەم/ نێوان صدیق و فاطمە (ﷺ):

عائیشە (ﷺ)دەڵێت: فاطمە و عەباس ـ خوایان لێ ڕازی بێ ـ هاتن بۆلای ئەبو بەکر (ﷺ)داوای بەشی خۆیان کـرد لـەمیراتی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) . داوای زەویەکـەی فـەدەك و بەشـەکەی خەیبەریان دەکرد.

ئەبو بەکریش (ﷺ)ووتی: لەپێغەمبەری خوام بیستووە کە فەرموویـەتی ((لا نـورث مـا ترکنـا، صدقة))[3] واتە ((ئێمەی پێغەمبەران میراتمان نی یە لەدوای خۆمان و هەرچیشمان لێ بەجێ بێنێ ئەوە دەکرێت خێر)).

---

[1] تاريخ اليعقوبي ( ٢ / ١٣٢ـ ١٣٣ )
[2] مسند احمد ژ ( ٤٧ )
[3] بخاری ژ (٦٧٢٦).

و فاطمه یش ( رضی الله عنها ) وازی له داواکاریەکەی هێنا، هەرکە گوێی لەفەرمودەکە بوو، سەری بۆ هەق دانەواندو ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە فاطمە ئەو فەرموودەیەی نەبیستبوو، هەرکە بۆی باسکرا یەکسەر وازی هێنا لە داواکاریەکەی[1].

بەڵام هەندێ لە شیعەکان بەتایبەت زیادەڕەوەکانیان (غلو) ئەم بەسەرهاتی داواکاری میرات و ڕەدکردنەوەی ئەبوبەکریان کردۆتە تیرێکی ژەهراوی دەیگرنە ئەو پیاوەی ئیسلام و هەموو هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو هەموو فەرموودده (صحیح) ە ڕەد دەکەنەوە ـ پەنا بەخوا ـ هاوەڵان لەکەدار دەکەن و بەوە تاوانباریان دەکەن کە زوڵم و ستەمیان لە (أهل البیت) کردووەو دەیشیکەنە بنەمایەك بۆ جێگیرکردنی ناکۆکی نێوان هاوەڵان و ئالویەیت ـ

ئەوەی کتێبی شیعەکان بخوێنێتەوە سەبارەت بە ڕەد کردنەوەی ئەو فەرموودە صحیحانەی کە باس لەوە دەکەن پێغەمبەران میراتیان دابەش ناکرێت و پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەموێت ((نحن معاشر الأنبیاء لا نورث، ما ترکناه صدقة))[2] و گومانەکانیشیان بۆ ئەم فەرموودانە بەم جۆرەیە:

١- وا گومان دەبەن کە ئەم فەرموودەیە ـ پەنا بەخوا ـ ئەبو بەکر (رضي الله عنه)ئەم فەرموودەیەی هەڵبەستووە، و لەم بارەیەوە خوێندەوارەکانیان کە بۆنموونە ناوی هەندێك لەوانە دێنین تا موسڵمان بۆی دەربکەوێت کە تا چ ئەندازەیەك دژایەتی هاوەڵە گیان لەسەر دەستەکانی پێغەمبەریان کردووە:-

(الحلی) دەڵێت: حەدیسەکەی کە ئەبو بەکر هەڵی بەست (ما ترکناه صدقة)! فاطمە هەر باوەڕیشی پێ نەکرد!! یان دەڵێت: ئەبو بەکر بۆ پشتگیری کارەکەی لە پێ نەدانی میرات بە فاطمە و عباس، کۆمەڵێ فەرموودەی دروست کردووە کە بەس خۆی ڕیوایەتی کردوون[3].!!

و ( مجلسی ) یش پاش ئەوەی باسی ئەوە دەکات کە ئەبو بەکرو عمر (رضي الله عنه)گوایە پەنا بەخوا زەویەکەی فەدەکیان برد بۆ خۆیان، دەڵێت: لەبەر ئەو مەبەستە ئەو ڕیوایەتە پیسەیان دروست کرد کە دەڵێت ((نحن معاشر الأنبیاء لانورث ، ما ترکناه صدقة )) .[4]!!

---

[1] تأویل مختلف الحدیث، لا (١/١٩).

[2] مسلم، (١٧٥٨).

[3] منهاج الکرامة مطبوع مع (منهاج السنة)، (٤/١٩٣).

[4] حق الیقین لا ( ١٩١) لە کتێبی ( العقیدة في اهل البیت ) لا ٤٤٣ وەرگیراوە.

(خومەینی ) یش لە کەشف الاسراردا دەڵێت : ئەو فەرموودەیەی کە دراوەتە پاڵ پێغەمبەر - صحیح - نیە و ئەو فەرموودەیە یەشی لەبەر ئەوە دروستکراوە کە نەوەکانی پێغەمبەر لە ناو ببرێت .[1]

ئەم ووتانەی سەرەوەیش هەموویان ڕەت کرانەوە و بەدرۆخراونەتەوە زۆر ئاشکرایە کە ئەبو بەکر (ﷺ)تەنها نیە لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا بەڵکو فەرموودەی " لا نورث ما ترکناه صدقة " ئەبو بەکرو عمر و عثمان و عەلی و طلحة و زوبێر و سعد و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف و عباس ی کوڕی عبدالمطلب و خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەبوو هوریرە و حذیفة بن اليمان ریوایەتیان کردووە - خوا لە هەموویان ڕازی بێت.[2]

هەروەها سوننە و کۆدەنگی هاوەڵان - اجماع - لەسەر ڕاستی ئەو فەرموودەیەن:

( ابن تیمیە) دەڵێت (( ئەوەی کە کەس میرات لە پێغەمبەر (ﷺ) نابات بەرێگەی سوننەوە دوویات کراوەتەوە و کۆدەنگی هاوەڵانیشی لەسەرە و لەیەك هاوەڵ ملە جەرِێی لەم کارەدا نەکردووە و بەڵکو هەمویان وەریان گرتووە و قبوڵیان کردووە ، لەبەر ئەوەشە کەیەك خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) نابینی سووربوون لەسەر داواکاری میراتەکەیان لێی، و مامە عەباسیشی (ﷺ)سور نەبوو لەسەر داواکاریەکەی و هەموویان لەبەر خاتری ئەو فەرموودەیە دەستیان لە داواکاریەکەیان هەڵگرت و ئەمەش بە درێژایی ماوەی حوکمڕانی خەلیفەکان بەردەوام بوو تا گەیشتە یەر حوکمڕانی عەلی (ﷺ) و فەدەك و هەموو زەویەکانی تر کەوتە ژێر دەستی و کەچی کاری بەو فەرمووده ( صحیحە ) کردو هیچی بە فاطمە و منداڵەکانی نەداو هیچیشی بە دایکانی باوەڕداران نەدا، و ئەگەر وابوایە ئایا عەلی (ﷺ)نەیدەتوانی ئەو ستەمە لەسەر ( خانەوادەی پێغەمبەر) هەڵگرێت بەو هەموو هێزو توانایەوە کە جەنگی بەرامبەر معاویە دەکرد و سوپای مەزنی ڕێك دەخست بۆ ئەو مەبەستە ئیتر ئەو تۆزە ماڵە چی بوو بیدایەتەوە پێیان کە ئەوە زۆر ئاسانتر بوو.[3]

[1] کشف الأسرار- خمینی لا ( ١٣- ١٣٣) لة ( العقیدة في اهل البیت ) وەرگیراوە.

[2] العقیدة في اهل البیت لا ٤٤٤.

[3] منهاج السنة ( ٤/ ٢٢٠)،(٦ /٣٤٧).

( ابن الجوزي ) دەڵێت : جارێك عەباسی سەفاح لەسەر بڵند گۆ ووتاری دەدا و پیاوێـك هەسـتایە سەر پێ و ووتی: من لەنەوەی عەلیم و ئەی گەورەی موسڵمانان تۆڵەم بۆ بكەرەوە، سـەفاح پێـی ووت :كێ ستەمی لێكردوویت ؟ ووتی ئەبو بەكر ستەمی لە فاطمە كرد كە فەدەكی لێ داگیركرد. پێی ووت: بەردەوام لەسەر ئەو ستەمەبوو؟ ووتی: بەڵێ. ووتی : ئەی پاش ئەو؟ كابرا ووتی: عمر چووە سەر حوكم ، ووتی: ئەویش بەردەوام بوو لەسەر ستەم لێ كردنتان؟ ووتی: بەڵێ ، ووتی: ئەی پاش ئەو؟ ووتی: عثمان چووە سەر حوكم ، ووتی: بەردەوام بوو لەسەر ستەم لێكردنەكەتان؟ ووتی: بەڵێ، عەباسیش ووتی پێی ئەی پاش ئەو كێ چووە سەر حوكم؟ دەڵێ: كابراسـەیری ئـەم لاولای كرد تا كونێ بدۆزێتەوە و لێوەی ڕابكات.[1]

٤ ـ لێبوردەیی فاطمە لەگەڵ ئەبوبەكردا:

بەڕاشكاوانە جێگربووە كە فاطمە پاش ئەو داواكاریە لـە ئەبوبـەكر ڕازی بـوو و بـەو شـێوەیەش وەفاتی كرد، وبەیهەقی بەسەنەدی خۆی لە شعەبی یەوە دەگێرێتەوە كە وتویەتی (( كاتێ فاطمە نەخۆش كەوت، ئەبو بەكر هات بۆ سەردانی داوای هاتنە ژوورەوەی كرد، و عەلیش (ﷺ)ووتـی: حەزدەكەیت ڕوخسەتی بدەم ؟ ووتی: بەڵێ، و ئەویش فەرمووی لێكرد و هاتە ژوورەوە تا گەردەنی ئازاد بكات و پێی ووت: سوێند بەخوا تەنها لەبەر ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرەكەی و ڕەزامەندی ئێوەی ( أهل البیت ) وازم لە ماڵ و حاڵ و خزم و كەس و هـۆزی خـۆم هێنـاوە و پاشـان داوای گەردەن ئازادی لێكردو ئەویش گەردەنی ئەبوبەكری ئازاد كرد. وابن كـثیر دەڵێت ( اسـنادی ئـەم فەرمودەیە باشە و بە هێزە و دیارە شعەبی لە عەلی بیستووە یان لـە كەسـێكی بیـستووە كـە ئەویش لە عەلی بیستووە.[2]

شەشەم/ ژن و ژن خوازی نێوان صدیق و (آل البیت ):

پەیوەندی نێوان خەلیفەی موسڵمانان ـ ئەبو بەكری صدیق ـ و خانەوادەی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر پتەو بەهێزبووە و زۆر خۆشەویستی لە نێوانیاندا جێگیر بووە و ئیتر ئەو پڕو پاگەنـدەو

---

[1] تلبیس ابلیس لا ١٣٥.

[2] البدایة و النهایة ( ٥/ ٢٥٣)

چیرۆکە دەم هەڵبەستانەی کە نەیارانی صدیق و (ال البیت) دروستیان کردوون نەیانتوانیوە قەڵای ئەوخۆشەویستی یە بڕوخێنن.

و عائشەی پاك داوێن (ﷺ)کە کچی ئەبو بەکربوو و خێزانی سەرداری مرۆڤایەتی بووە و هەروەها (ئەسمای کچی عومەیس ) کە خێزانی جەعفەری برای عەلی بوو، لە پاش مردنی جەعفەر ئەبو بەکری صدیق خواستویەتی و کوڕێکیشی لێ بوە بەناوی ( محمد ) کە عەلی (ﷺ)لەسەردەمی حوکمڕانی خۆیدا کردوویەتی بە والی میسرو کاتێ ئەبو بەکریش وەفاتی کرد عەلی (ﷺ)خواستی و کوڕێکیشی لێ بوو ناوی نا ( یەحیا ) .

و هەروەها کچێك لەنەوەکانی ئەبوبکر(ﷺ)خێزانی (محمد الباقر) بوو کە بە ئیمامی پێنجەم دادەنرێت لای شیعەکان کە نەوەی عەلی بوو (ﷺ).

مامۆستا " احسان إلهي ظهير" دەڵێت: قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبوبەکر لەگەڵ عەلی کوڕی حوسەین ی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالب دا ،کوڕی پوری یەکتری بوون کە دایك هەردووکیان کچی یزدجری کوڕی شهریار کیسرای فارسی بوو کە لە عەهدی عمردا لە غەنیمەکاندا بوون.[1]

هەر (احسان ) دەڵێت: بەڵگەیەکی تری خۆشەویستی ( اهل البیت) بۆ ئەبو بەکری صدیق (ﷺ)لەوەدایە کە زۆریان ناوی منداڵەکانیان بەناوی ( ئەبوبەکرە) وە ناوناوە ئەوەش لەبەر خۆشەویستیان بۆ خاوەنی ئەو ناوە بوە، ئەمە عەلی یە (ﷺ)کوڕێکی ناودەنێت ـ ئەبو بەکر ـ و ئەم کوڕەشی لەپاش داناى ئەبو بەکر (ﷺ)بە جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم ناوە وە وەبگرە لەپاش وەفاتیشی .

دەی ئایا من بە هەموو شیعەکانی ئەمڕۆ دەڵێم ئایا تاقە منداڵێکتان بەناوی ئەبو بەرکرەوە ناوناوە؟ بێگومان نەخێر، کە لە کاتێکدا خۆیان بە شوێنکەوتەی عەلی و خۆشەویستی عەلی دەزانن (ﷺ)!!!

نەك هەر ئەوەندە بەڵکو بەڵگەی ئەوەی کە ( اهل البیت ) زۆر زۆر حورمەتی صدیقیان گرتووە و خۆشیان ویستووە و ناوەکەیان بە پیرۆز زانیوە ، ئەوەتا هەردوو کوڕی عەلی (ﷺ)حەسەن و

---

[1] الشيعة واهل البيت لا ( ٧٨ـ ٨٣)

حوسەین ،هەریەکەیان کوڕێکی خۆی ناوناوە ئەبو بەکر، کـە ( یـەعقوبی) و ( مەسـعودی ) کـە هەردووکیان لەگەورە مێژوونوسانی شیعەن ئەم مەسەلەیان گێڕاوەتەوە و یان نقل کردووە.[1]
ئەمەش بەردەوام بوو لەناو خانەوادەی بەڕێزی پێغەمبـەردا (ﷺ) لـە دوای ئـەوانیش، بـۆ نمونـە عبدالله ی کوڕی جەعفەر (ﷺ)برازاکەی عـەلی کوڕی ئـەبو طالـب ، کوڕەکـەی خـۆی ناونـاوە ( ئەبویەکر) و ئەمەش ئەو پەڕی مانای خۆشەویستی و پێکەوە ژیان لەناو هاوەڵانی بـەڕێزدا و بـە پێچەوانەی ئەوەی شیعە دەیڵێن کە گوایە ـ پەنا بە خوا ـ ڕقە بەرایەتی و دژایـەتی و نـەیاری و ستەمکاریان لەناودابووە بە تایبەت لەگەڵ ( اهل البیت)دا.[2]

حەوتەم/ عـەلی (ﷺ) لە کاتی وەفاتی ئەبوبەکردا (ﷺ):

عـەلی (ﷺ)یەکێك بـوو لـەو کەسـانەی کـە ئـەبو بـەکری صـدیق (ﷺ)لـەکاتی سـەرەمەرگیدا دەستنیشانی کردن بۆ خیلافەت لەپاش خۆی، بەڵام عـەلی خـۆی ڕای وابـوو کـە عمـری فـاروق (ﷺ)شوێنی صدیق بگرێتەوە ،[3]وکاتێ مردن نزیك بوویەوە و ئـەبو بـەکریش وەڵامـی دایـەوە و دواین ووشەی کە لەزاری دەرچوو ئەو ئایەتە پیرۆزەی سوڕەتی یوسف بـوو کـە دەفـەرمووێت " توفنی مسلماً و الحقني بالصالحين" واتە: بە موسڵمانەتی بمرم و پاشان بمگەیەنیتە کاروانی صاڵحان .

و لەو کاتە خەفەت ئامێزەدا مەدینە وەك بڵێی بومە لەرزە لێیداوە و لەوسـاتەوەی پێغەمبـەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی فەرمووە ، مەدینە خەفەت و ناڕەحەتی وای بە خۆیەوە نەدیبوو، و گریان و صەدا ئەو ئێوارەیە ئاسمانی ئەو شارەی پڕکرد بوو، عـەلیش (ﷺ)زۆر بە خێرایی و بـەگریان و ( إنا لله و إنا الیه راجعـون ) ەوە هات و لەبەردەم ئەو ژوورەدا وەستا کە ئـەبو بـەکر لـەوێ گیـانی سپاردبوو، پڕ بەدەم هاواری کرد و دەیوت " ڕەحمەتی خوات لێبێت ئەی ئەبو بەکر تـۆ هـاوڕێ و خۆشەویست و مایەی حەوانەوەی پێغەمبەرو جێگەی متمانەی بوویت، لە هەمووان دەوڵەمەندتر بوویت لە ئاینەکەی خوادا ، و لە هەموان زیاتر لە پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتبویت ، لـە هـەمویان

---

[1] تارخ الیعقوبی ( ٢/ ٢٢٨) التنیجة والأشراف لا ٨٢.
[2] الشیعة واهل البیت لا (٨٣) . رحماء بینهم – صالح درویش
[3] الکامل لابن الأثیر ( ٢/ ٧٩).

زیاتر ئیسلام دۆست بویت، له هەموویان پێشتر بوویت له چاکەدا، له هەمویان بەرزتر بویت له پلەدا، و له هەمویان نزیکتر بویت له هۆکاری چاکەدا، و شێوەو شێوازت له هەمویان زیاتر له پێغەمبەری خوا دەچوو، و له هەمویان پلەت بەرزتر بوو، دەی خوا پاداشتت بداتەوە له باتی ژیانت له پێناو پێغەمبەر و ئیسلامدا، باوەڕت به پێغەمبەر هێنا له کاتێکدا خەڵکی به درۆیان دەخستەوە، تۆ بۆ ئەو وەك چاو وگوێ وا بوویت، خوا له قورئانەکەیدا ناوی لێناویت ( صدیق ) ، وەك خوا دەفەرموێ (( والذی جاء بالصدق و صدق به........)).

تۆ دڵنەواییت دەکرد له کاتێکدا خەڵکی دوورە پەرێز دەبون لێی، تۆ لەهەموو ناڕەحەتی یەکاندا لەلای بوویت کە خەڵکی لەلای نەبوون، له ناڕەحەتی ترین کاتدا تۆ باشترین هاوڕێی بوویت، تۆ دووەم کەسی ناو ئەشکەوت بویت، کاتێ ئارامی دابەزییە سەری ، و هاوڕێی کۆچی بویت، و جێنشینی بوویت بۆ پارێزگاری له ئیسلام و ئوممەتەکەی، باشترین جێنشینی بوویت له کاتێکدا خەڵکی پاشگەز دەبونەوە.

تۆ بەشێوەیەکی واجوان هەستایت به کارەکانی کە هیچ جێنشینێ وای نەکردووە بۆ هیچ پێغەمبەرێك، تۆ لەسەر پێ وەستای له کاتێکدا هاوەڵەکانی لەسەر ئەژنۆ کەوتبون، تۆ سنگت دەرپەڕاند له کاتێکدا ئەوان سەریان کز دەرکرد،تۆ به هێز بویت له کاتێکدا خەڵکی تۆقابوون، پابەندی بەرنامەکەی پێغەمبەربوویت (ﷺ) له کاتێکدا خەڵکی لێی بێئاگا بوون، تۆ وەك پێغەمبەری خوا پێی دەوتیت لەلاشەدا لاواز بوویت، بەلام له ئاینی خوادا بەهێزبوویت.

لەلای خۆت بچوك بویت ، بەڵام لای خوا زۆر مەزن بوویت، بەڕێز بوویت لەبەرچاوی خەڵکی و مەزن بووی له دڵیاندا، کەسیان کینەیان لێت نەبوو، کەسیشیان قسەیان لەسەرت نەبوو، باکت له هیچ مەخلوقێك نەبوو، لاواز و بێ دەسەڵات لەلات بەهێز بوو تا مافی خۆیت دەست دەخست، و خزم بێگانە لەلات وەك یەك وابوون، و نزیك ترین کەس لەلات ئەوانە بوون کە زیاتر بۆخوا صوڵحا بوون و تەقوای ئەویان لەدڵدابوو.

ئیش و کارت هەمووی نەرم و نیانی و ڕاستگۆیی بوو، ووتەکانت به جێ بوون، بریتی بوون له سوربوون و لەسەرخۆیی، ڕاو بۆ چونت له زانست و کردەوە بوو، ئاین به تۆ ڕێك ڕاوەستا، و باوەڕ بەتۆ هێزی وەرگرت،و بەرنامەکەی خوا زاڵ بوو، تۆ پێشمان دەکەوتیت سوێند بەخوا پێش

کەوتنێکی دوور، کەسانی پاش خۆتت بەو کارە جوانانەت ماندوو کرد، ماندووبونێکی توند، لەکاری چاکە دا سەرکەوتیت بەسەرکەوتنێکی ئاشکرا، دەی سا " انا لله وإنا اليه راجعون" ڕازین بە قەزای خواو بە کارەکانی خوای تەعالا، و سەرنزمی دەبین، وەڵلاهی لەدوای کۆستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) موسڵمانان هەرگیز کۆسی وەك تۆیان ناکەوێت، و ئاین بەتۆوە سەربەرزو پارێزراو بوو، دەی خوا بتگەیەنێت بە محمد (ﷺ) ، لە پاداشتیشت بێ بەشمان نەکات و لەدوای تۆ سەرگەردانمان نەکات )) .

ئا لەم کاتەدا خەڵکەکە هەموو بێدەنگی ووتەکانی عەلی بوون ، و هەر کە لێ بوویەوە بانگ و صدای گریانیان لێدا بەیەك دەنگ هاواریان کرد: ڕاستەکەیت.[1]

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە کە دەچێتە ژوورەوە و ئەبو بەکر دەبینێ کفن کراوە هاوار دەکات و دەڵێت: هەر کەسێك گەڕابێتەوە بۆ لای پەروەردگار بە نامەی کردارەکانی ئەوەندەی ئەم ڕاکشاوە خۆشەویست نیە لەلام.[2]

---

[1] البصرة لابن الجوزي ( ١/ ٤٧٧ - ٤٧٨)

[2] التاريخ للذهبي عهد خلفاء الراشدين لا ( ١٢٠)

## جێ باسی دووەم

## عەلی (ﷺ)لەسەردەمی عومەری فاروقدا (ﷺ):

**یەکەم/ عەلی لە کاروباری دادوەریدا:**

عەلی ئەندامێکی گەورەو بەرچاوی ئەنجومەنی شورا بوو لە دەوڵەتەکەی عمردا، بەڵکو ڕاوێژ کاری پلە یەك بوو، عمر (ﷺ)چاکە و لێهاتویی و تێگەیشتنی عەلی لەبەرچاو دەگرت و ڕای زۆر باش بوو بەرامبەری و دەربارەی دەیووت " أقضانا علي " دادوەرترین کەسمان عەلی یە .[١]

( ابن الجوزی ) دەڵێت: ئەبو بەکرو عمر ڕاوێژیان بەو دەکرد و عمر (ﷺ)دەیووت (( اعوذ بالله من معضلة ليس لها ابو الحسن )).[٢] واتە:پەنادەبەم بەخوا لە مەسەلەیەکی قورس و " ابو حسن" یش نەبێت بۆ چارەسەرکردنی.

مەسروق دەڵێت: خەڵکی لە شەش کەسەوە زانستیان وەرگرتووە ( عمرو علي و عبدالله و ابی موسی و زيد بن ثابت و أبی بن کعب ) و دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەری خوام بۆن کردووە، و بۆم دەرکەوتووە زانست لەلای شەش کەسیان کۆبووەتەوە ( عمرو علي و عبدالله و ابی درداء و ابی بن کعب و زيد بن ثابت ) و ئەوانیشم بۆن کرد دوو کەسیان لە هەموان زیاتر زانا بوون : عەلی و عبدالله ی کوڕی مسعود .[٣]

هەروەها دەڵێت: زانست دەگەڕایەوە بۆ لای سێ کەس ، زانای مەدینەی پڕ لە نور عەلی کوڕی ئەبو طالب بوو، زانای کوفەیش عبدالله ی کوڕی مسعود بوو، زانای شامیش ابو درداو بوو، ئەگەر ئەو سیانە یەکیان بگرتایە زانای عیراق و شام لە زانای مەدینە یان دەپرسی بەڵام ئەو لەوانی نەدەپرسی.[٤]

به دادوەری یە ناوازەکانی دەوڵەتی نوێی ئیسلامی ڕازاندبوویەوە لەوانە:

١ ـ ئافرەتێك جار بە جار شێتی یەکی لێدەهات:

---

[1] الأستيعاب في معرفة الأصحاب لا ١١٢٠.

[2] فضائل الصحابة لا ( ١١٠٠) اسناده ضعيف.

[3] علل الحديث و معرفة الرجال علی بن المدينی لا ( ٤٢- ٤٣).

[4] المعرفة و التاريخ للفسوي ( ١ / ٤٤٤)

( ابی ضبیان الجنبي ) دەڵێت: ئافرەتێکیان هێنا بۆ لای عمری کوڕی خطاب (ﷺ)کە زینای کردبوو، فەرمانی دەرکرد کە سزای ڕەجمی بەسەردا جێ بە جێ بکەن، ئەوانیش بردیان بۆ ڕەجم کردن، لەڕێگا عەلیان پێ گەیشت ووتی: ئەوە چیە؟ ووتیان زینای کردووە و عمر فەرمانی داوە ڕەجمی بکەین، عەلیش (ﷺ)لە دەستی سەندن و بردیەوە، و ئەوانیش هاتنەوە بۆ لای عمرو ئەویش وتی: چی بوو هاتنەوە؟ و ئەوانیش ووتیان : عەلی گەڕاندینیەوە ، و عمر یش ووتی: دەی عەلی لەبەر شتێك نەبێت کە ئەو باشتر دەیزانێت نەی دەگەڕاندەوە، و ناردی بەدوای عەلیدا و عەلیش (ﷺ)هات و ئاسەواری تورەبونی پێوە دیاربوو، پێی ووت: ئەوە بۆچی ئەو خەڵکانەت گەڕاندۆتەوە؟ عەلی (ﷺ)پێی ووت: ئەی نەتبیستووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی ((رفع القلم عن الثلاث ، عن النائم حتی یستیقظ،وعن الصغیر حتی یکبر،وعن المبتلی حتی یعقل؟)) واتە: قەڵەمی گوناه هەڵگیراوە لە سەر سێ کەس، خەوتوو تا خەبەر دەبێتەوە، و منداڵ تا گەورە دەبێت ، و شێت تا چاك دەبێتەوە . عمر ووتی : بەڵێ. عەلی (ﷺ)ووتی: ئەمە فلاَن ژنە و لە فلاَن هۆزەو جار بەجار عەقڵی لەلای خۆی نامێنێ و کێ دەڵێ لەم کاتەدا ئەم شێتی یەی لێ نەهاتبێ، عمر ووتی: نازانم.

و سزای بەردبارانکردنی لەسەر هەڵگرت ، و عمر نەیزانیبوو کە شێت بوو.[1]

٢ ـ دوو قات کردنەوەی سزای ئارەق خۆر:

عمر (ﷺ)ڕاو بۆ چوونی عەلی قبوڵ کرد، سەربارەت بە سزای (حەدّی مەی نۆش) ئەمەش لەبەرئەوەبوو دیاردەی عەرەق خواردنەوە لەناو گەلە ڕزگاربووەکاندا بلاَوبووبویەوە و تازە موسڵمان بوو بون، و عمر ڕاوێژی بە عەلی کرد و ئەویش ووتی ( ٨٠) جەڵدە باشە کە ئەوەش خوارترین تۆڵەی حەدەکانی خوایە، و هۆیەکەیشی بۆ ئەوە گەڕاندەوە کە هەر کاتێ سەر خۆش بوو بوختانیش دەکات و بوختانیشی کرد (٨٠) جەڵدەی لێدەردرێت.[2]

---

[1] مسند احمد – ژمارە – ١٣٢٨ – ( صحیح لغیره )

[2] ارواء الخلیل للألبانی ( ٨ / ٤٦- ٤٧ ) اسناده ضعیف .

یان له جێبەکی تردا عەلی (ﷺ)دەڵێت: هەرگیز سزای حەدی کەسی نادەم و لەو کاتەدا بمرێت، و گوێی بدەمێ، مەگەر مەی خۆر کە ئەگەر مـرد، خوێنەکـەی ئـەدەم چـونکە پێغەمبـەری خـوا نەیکردووە بە سوننەت.[1]

وابن تیمیە یش ئەم ڕایەی پەسند کردووە و ووتویەتی: لە کاتێکدا عەرەق خۆرەکان کـەم بونـەوە سزای چل دارەکە جێگیر دەکرێتەوە.

٣ ـ دەستت ناڕوات بەسەر کۆرپە لەناو سکدا :

ئافرەتێکی سك پڕیان هێنا بۆ لای عمر و ئەویش پرسیاری لێکرد و ئەویش دانـی نـا بـە داوێـن پیسی یەکەیدا،و عمریش فەرمانی دەرکرد کە ڕەجم بکرێت ، لە دەرەوە عەلی (ﷺ)ئافرەتەکـەی بینی و ووتی : بۆ کوێ ی دەبەن؟ ووتیـان : (ئـەمیر المؤمنین ) فـەرمانی دەرکـردووە، عـەلیش (ﷺ)گەڕاندیەوە بۆ لای عمر و پێی ووت: تۆ فەرمانت داوە بە ڕەجم کردنی؟ عمر ووتـی: بـەڵێ. لەبەردەمدا دانی بەبەدڕەوشتی یەکەیدا ناوە، عەلیش (ﷺ)پێی ووت: تۆ دەتوانیت ئـەو ئافرەتـە بکوژیت بەڵام ناتوانیت سزای کۆرپەکەی ناو سکی بدەیت، و پێشی ووت: لەوانەیە سزات دابێـت یان ترساندبێتت؟ ووتی: بەڵێ واماں لێکردووە، و عەلیش (ﷺ)پێی ووت: ئەی نەت بیستووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: سزا جێ بەجێ ناکرێت بەسەر کەسێکدا بە لێدان دان بەتاواندا بنێت و هەر کەسێك بگیرێت و کۆت و زنجیر بکرێت و لەژێر هەڕەشەدا دان بەهەرچیدا بنێت ئـەو شتە ناچەسپێت بەسەریداو کاری پێناکرێت ، و عمریش (ﷺ)ئەو ژنەی بەڕەڵا کرد و پاشان ووتی (( عجزت النساء ان تلدن مثل علی بن ابی طالب ، لولا علی لهلك عمر )).[2] واتـە: ئافرەتـان نەیانتوانیوە وێنەی عەلی کوڕی ئەبو طالبیان ببێت ، و ئەگەر عەلی نەبوایە، عمر لەناو دەچوو.

( ابن تیمە) لەسەر ئەم ڕوداوە دەڵێت (( ئەگەر ئەم ڕووداوە ڕاست بێت ئـەوە مانـای وایـە عمـر (ﷺ)نەیزانیوە کە ئەو ژنە سکی پڕە کە عەلی ئاگاداری کرد، بە خۆشحاڵی یەوە لـە بڕیارەکـەی خۆی دابەزی، و ئەوەشی کە مەسەلەیەك لە عمر ئاڵۆزبێـت هـیچ نـەنگی نیـە بـۆی کـە عـەلی

---

[1] فتح الباری ( ١٢/ ٦٦)

[2] المختصر من کتاب الموافقة لا ( ١٣١).

(ﷺ)وەك برایەكی باڵڕاست بۆی ڕاست بكاتەوە و ئەوەش بەتەواوی مانای ئەوەیە كە خۆشەویستی نێوان عەلی و عمر زۆ لەوە مەزنترە كە هەندێك بەناو موسڵمان نێوانیان بشێوێنن.[1]

٤ ـ چی نازانن بیگێڕنەوە بۆ سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) :

ئافرەتێكیان هێنا بۆ لای عمر (ﷺ)كە لەكاتی عیدەدا شوی كردبوو، و عمریش جیای كردنەوە لە یەك و مارەیی یەكەشی خستنە ( بیت المال) و ووتی: مارەیی یەك نادەم بە كەسێك شوكردنەكەی دروست نەبێت و وتیشی " هەرگیز بۆیەكتریش ناشێن!" و ئەم هەواڵە گەیشتە عەلی (ﷺ) و ووتی: ئەمە حاڵی نەبونە لە سوننەت ، چونكە هەر بە گوێزانەوەی بۆ لای ئەو پیاوە مارەیی دەكەوێت و لەیەك جیا دەكرێنەوە و پاش تێپەربوونی ( عدە ) ئەو پیاوە هەموو داواكارێك ئەتوانێت داوای ئەو ژنە بكات، و عمریش لە ووتاردا ڕووی كردە خەڵكی و ووتی: شتێك لێی تێناگەن بیگێڕنەوە بۆ سوننەت، و عمریش گەڕایەوە سەر ووتەكەی عەلی .[2]

٥ ـ كچێك پیاوێك دەخاتە داوی خۆی:

جەعفەری كوڕی محمد دەڵێت: ئافرەتێكیان هێنا بۆ لای عمر (ﷺ)كە حەزی لە گەنجێكی ئەنصاری كردبوو بەڵام گەنجەكە زۆر خۆی لێ دەپارێزێت و ناچێت بەدەم داواكاری یە حەرامەكانی یەوە، و ئافرەتەكەش ویستبوی ئەو گەنجە پاك داوێنە ئابڕوو بەرێت، هاتبوو هێلكەیەكی هێنا بوو زەردێنەكەی فڕێ داو سپێنەكەی دابوو لەشەرواڵ و جلەكانی خۆی و هاتبو بۆ لای عمر و هاواری كرد: ئەو پیاوەی ئەنصار هاتۆتەلام و لەناو خزمەكانمدا ئابڕووی بردووم و ئەمەش ئاسەواری كارە پیسەكەیەتی كە لەگەڵم كردوویەتی، و عمریش لە ئافرەتانی پرسیبوو و ئەوانیش ووتیان ڕاست دەكات ئاسەواری مەنی پیاوی پێوەیە،

بۆیە نیازی كرد سزای ئەو گەنجە بدات، و لاوەكەش لاڵایەوە و ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران پەلەم لێ مەكە، سوێند بە خوا نە بەدڕەوشتیم كردووە و نە بیریشم لێ كردۆتەوە، بەڵام ئەو ژنە داوای شتێكی وای لێكردم و منیش بە گوێم نەكرد و خۆم لێ پاراست.

---

[1] منهاج السنة ( ٦ / ٤٢)

[2] المغنى والشرح الكبير ( ١١/ ٦٦-٦٧)

و عمریش ڕووی کردە عەلی و پیّ ی ووت: ئەی باوکی حەسەن تۆ چی دەڵێیت؟ و عەلیش (ﷺ)سەیری شوێنەواری ئاوەکەی سەر جلەکانی ژنەکەی کردو داوای کرد ئاوێکی زۆر گەرم بهێنن بۆی، و ڕشتی بەسەر جلەکانیدا و یەکسەر سپیایی یەکە بەستی و پاشان بۆنی کرد و بەزمانیشی لێی چەشت و لە ئافرەتەکە تورە بوو، ئەویش دانی نا بەکارەکەیدا،[1] ئا بەو جۆرە باوکی حەسەن ژیرانە توانی وەك وەزیرێکی دڵسۆزی دەوڵەتەکەی عمر ئەو لاوە پاکداوێنەی ڕزگار کرد و ئەو ئافرەتە حیلە بازەیشی بە سزای خۆی گەیاند.

دووەم/ عەلی (ﷺ) و کاروباری دارایی و ئیداری دەوڵەتەکەی عمر (ﷺ):

أ ـ مووچەی خەلیفە عمر (ﷺ): کاتیّ عمر بوو بە ئەمیری باوەڕداران لە دوای کۆچی دوایی ئەبویەکر، و ماوەیەك قبولی وەرگرتنی مووچەی ( بیت المال) نەبوو، تاوای لێهات گوزەرانی زۆر ناخۆش بوو، و ئەو پارەو پولەی لەکاری بازرگانیدا پەیدای دەرکرد بەشی خۆی و ماڵ و منداڵی نەدەکرد، چونکە بە بۆنەی ئیش و کاری موسڵمانانەوە نەیدەپڕژایە سەر ئیش و کاری خۆی.

بۆیە هاوەڵانی کۆکردەوە و لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵدا کردن و ووتی: چی بکەم باشە ڕێگەیەکم بۆ دابنێن؟ عثمانی کوڕی عفان (ﷺ)ووتی : بەشی خواردنی خۆتانی لیّ هەڵگرن و پاشان ڕووی کردە عەلی پێی ووت: ئەی تۆ چی دەڵێیت لەم بارەوە؟ ئەویش ووتی: نانی دوو وەختەت لەسەر بیت المال بێت وعمریش بە قسەی کرد و ووتی: من وەك سەرپەرشتیاری هەتیوو مامەڵە لەگەڵ ( بیت المال ) دەکەم و ئەگەر وەزعم باش بێت ئەو کاتە نامەوێت و ئەگەر پێویستیشم پێی بێت بە شێوەیەکی جوان لێی دەخۆم.[2]

ب ـ ڕای عەلی (ﷺ) دەربارەی زەوی عێراق :

کاتیّ زەوی عێراق بە ڕیگای زۆر و جەنگ ئازادکرا عمر (ﷺ) ڕاوێژی بەهاوەڵان کرد و هەندیّ لە هاوەڵان ووتیان با دابەشی بکەین بەسەر موجاهیدەکاندا، بەڵام لەبەر فراوانی و بە پیتی زەویەکە عمر دووربینی بەکارهێنا کە نەوەکانی دوای ئەوان بیّ زەوی دەبن، و حەزی نەکرد دابەشی بکات و

---

[1] الطرق الحكيمة لابن القيم لا ( ٤٨ )

[2] الخلافة الراشدة ـ سنده صحيح لا ٢٧٠.

پرسی به عەلی کرد کە لەولاوە بێدەنگ بوو، ئەویش هەمان ڕای عمری هەبوو، عمریش ووتی (( لولا آخر المسلمين ما فتحت قرية الاّ قسمتها بين اهلها كما قسم النبّي (ﷺ) خيبَر)).[1]
واتە: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە موسڵمانە موجاهیدەکانم پشت گوێ دەخرێن، ئەوا هەر ناوچەیەکم ئازاد بکردایە زەویەکانم دەدایەوە دەستی خاوەنەکانی خۆی .

ج ـ عەلی خۆت دابەشی بکە :

لەسەردەمی عمردا ماڵ و دارایی یەکی زۆ هات بۆ مەدینەو و عمر دەستی کرد بەدابەشکردنی و لەدواییدا زیادەیەکی لێمایەوە و نیازی کرد هەڵی بگرێت بۆ ڕووداوە لـەناکاوەکان ـ ڕۆژی ڕەش ـ بەڵام کاتێ ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد لەو بارەیەوە و عەلی (ﷺ)پێی ووت: کاتێ سامانی بەحرینیان هێنایەوە بۆ لای پێغەمبەری خـوا (ﷺ) (ﷺ) و دابـەشی کـرد بەسـەر موسـڵمانەکاندا و لـە کۆتایی زیادەیەکی لێمایەوە و ئەوەشی دابەش کردەوە بەسەریاندا، و عمریش (ﷺ)بە عەلی ووت : دەبێت تۆ دابەشی بکەیت، و ئەویش هەمووی دابەش کردەوە.[2]

۲ ـ عەلی (ﷺ) و کارو باری ئیداری :

کاتێ عمر (ﷺ)ویستی مێژوویەکی تایبەت بە دەوڵەتی ئیسلامی دابنێت تـا ئـیش و کارەکـانی لەسەر ڕێك بخات ، بۆیە خەڵکی کۆکردەوە و لەوبارەیەوە پرسیاری لێکردن: چ ڕۆژێك بکـەین بـە سەرەتای مێژوو؟ و عەلیش (ﷺ)ووتی: لەو ڕۆژەوەی کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) وازی لە زەوی بت پەرستان هێناو کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە، و عمریش : ئەو مێژووەی جێگیرکرد.[3]
و عمر (ﷺ)بە جۆرێ سەیری عەلی دەکرد کە باشترینی ناو موسڵمانەکانە و باشترین کەسـە بـۆ سەرۆکایەتی موسڵمانان لە دوای خۆی، بۆیە کاتێ ئەو نەفرەت لیکراوە لە نوێـژدا ـ لێیـدا ـ بـە چەقەوە بە ئەنصاریەکی ووت: دوای من حەزدەکەیت کێ جێ نشینم بێت؟ ئەویش : ناوی هەندێ لە موجاهیدەکانی بردو ناوی عەلی تیا نەبوو. و عمر فەرمووی: ئەی عەلی چۆنە لـەلاتان؟ وەڵلاهـی

---

[1] الأموال ، القاسم بن سلام لا ٥٧.
[2] مسند احمد ( ١/ ٩٤) إسناده ضعيف لا نقطاع فيه.
[3] التاريخ الكبير للبخاري ( ٩/١)

ئەگەر هەڵی بژێرن لەسەر هەق و دادپەروەری کارەکانتان بەڕێوە دەبات ئیتر با خۆشتان پێتان ناخۆش بێت.[1]

و بە ( عبدالله )ی کوڕی خۆی ووت: (أن ولوها الأجلح لسلك بهم الطريق ).[2] واتە: ئەگەر ئیش و کاری جێ نشینی بدەنە دەستی ( ئەم سەر ڕووتاوەیە) مەبەستی عەلی بووە - ئەوا بەڕێگەی ڕاستدا دەیانبات.

٣ - عمر چەند جارێك کردوویەتی بە جێگری خۆی لە شاری مەدینە :

ا - عمر (ﷺ)کاتێ لەگەڵ موجاهیدانی ئیسلامدا لە شاری مەدینە دەرچوو تا گەیشتە سەر ئاوی (صراء) و لەوێ سەربازگەی داکوتا و عەلی (ﷺ)لە جێی خۆی دانا بەسەر شاری مەدینەوە و بیستی کە ڕۆمەکان سوپایەکی گەورەیان بەرێ خستووە بۆ موسڵمانەکان و خەڵکەکەی کۆکردەوە ڕاوێژی پێکردن و هەموویان ئاماژەیان کرد بەوەی کە بڕۆین بۆیان.[3]

ب - کاتێ چوو بۆ ڕزگارکردنی فەلەستین:

کاتێ عەمری کوڕی عاص (ﷺ)گەیشتە ئەجنادین ، و ئەرتەبونی ڕۆم بۆی نووسی ووتی: وەڵڵاهی لەدوای ئەجنادین هیچ کوێی تر فەتح ناکەیت ، بۆیە مەغرور مەبە ویگەڕێرەوە، چونکە ئەو کەسەی ئەم ناوچانە فەتح دەکات ناوی لە سێ پیت پێك پێکهاتووە ، و عەمریش حاڵی بوو کە مەبەستی ( عمر ) ە و نامەی نارد کە ڕزگارکردنی ئەو ناوچانە بۆ عمر هەڵگیراوە و فریاکەوەو وەرە، و خەڵکیش هاواریان بۆ برد کەبڕوات بۆ ئەوێ، ئەویش ڕۆیشت و عەلی کوڕی ئەبو طالب ی کرد بە جێگری خۆی .[4]

[1] خلافة علي بن ابي طالب، عبدالحميد لا ٧٦.

[2] بغية الباحث من زوائد مسند الحارث(٣ / ٧٤) اسناده صحيح.

[3] المنتظم ( ٤/ ١٩٢).

[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ج ـ کاتێ عمر حەج بە دایکی باوەڕداران دەکات:
دواین حەجێك بوو عمر (ﷺ)لە ساڵی ( ٢٣) ی کۆچیدا بە موسلمانانی کردو دایکی باوەڕداران و کەس و کارەکانیانی لەگەڵ خۆی برد و لەو کاتەدا عەلی کوڕی ئەبو طالـب ی لە مەدینە لە جێی خۆی دانا.[1]

سێ یەم/ جێگای ڕاوێژی عومەر بووە لە کاروباری (جیهاد) دا:
عەلی (ﷺ)بەدرێژایی ژیانی عمر ـ ڕاوێژکارێکی ئەمینی دەوڵەتی ئیسلام بـووە، و زۆر عمـری خۆشویستووەو غەمی بۆ خـواردووەو عمـریش بـەو جـۆرە عـەلی خۆشویـستووەمتمانەی تـەواو لەنێوانیاندا هەبووە، کەچی دوژمنان و ناحەزان نایانەوێت سەردانی مێژوو بکەن و ئەم ڕاستیانە بەچاوی خۆیان ببیـنن بـەڵکو بەهەنـدێ ڕیوایـەتی لاوازو پـڕ لەمەبەسـتی بۆگـەن خەڵـەفاون و ویستوویانە سەردەمی زێڕینی خەلیفە ڕاشیدەکانی ئیسلام واپیشان بدەن هەموویان ڕقیان لەیەکتر بووەو لەکەمیندا بوون بۆ یەکتری و لەپشتەوە پیلانیان لەیەکتر گرتـووە.[2] و هـەموو ڕاسـتی یـە مێژوویی یەکان ئەوە دەسەلمێنن کە عەلی ڕاوێژکارێکی چاك و دەسـتپاکی هەرسـێ خەلیفەکـەی پێش خۆی بووەو هەرکاتێ عەلی (ﷺ)ڕایەکی پێشکەش بـە عمـر بکردایـە، ڕاسـتەوخۆ عمـر ـ لەهەموو دڵێکی یەوە وەری دەگرت و کاری پێ دەکرد.[3] بۆ نموونە فارسەکان پاش تێك شکاندنیان و ڕاونانی کیسرا، لەشاری نەهاوەند سەر لەنوێ کۆبوونەوەو بەسوپایەکی زەبەلاحەوە ویستیان بدەن بەسەر موسڵمانانـدا، و عمریش خەڵکی کۆکردەوەو ڕاوێژی پێکـردن و نیـازی کـرد بەسـوپایەکی گەورەوە بدات بەسەریانداو خەڵکەکەش هەمان ڕایان هەبوو بەڵام عـەلی (ﷺ)هەسـتایە سـەرپێ ووتی:
((پاشان .. ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەگەر هەموو خەڵکی شام هەڵکەنیت و بیانبەیت بۆ شـەڕی فارسەکان ئەوە ڕۆمەکان چاو دەبڕنەوە شام و دەیگرنەوە، و ئەگەر خەڵکی یەمەنیش بەریت ئـەوا حەبەشی یەکان زێدی خۆیان دەگرنەوە، و ئەگەر ئەم ناوەش مەبەسـتی ـ مەدینەیـە ـ هـەمووی

---

[1] المنتظم ( ٣٢٧) الفتح ( ٤ / ٨٧).
[2] عەلی کوڕی ئەبو طالب مستشار أمين للخلفاء الراشدين، لا (٩٩).
[3] هەمان سەرچاوە، لا(١٣٨).

بەریت بۆ ئەوشەڕە ئەوا عەرەبە خێڵەکی یەکانی چوادەور چاوی تێ دەبڕنەوەو پەلاماری دەدەنەوەو تا وات لێ دێت کە بڵێ ی ئەوەی لەدواوە بەجێم هێشتووە زۆر گرنگترە لەوەی بۆی دەڕۆم. بەڵکو هەموو سوپای گەلەکان لەجێ ی خۆیان بهێڵەوە، و سوپای بەسرە بکە بە سێ بەشـەوە بەشـێکی بەرگری لەشارەکەی خۆمان بکەن و بەشێك بەرگری لەناوچە ژێردەستەکانیان و بەشی سێ یەمیان بڕۆن بەدەم هاوکاری براکانیان لە کوفە، و ئەوەشی کە دەڵێیت ئەوان دێن بۆمان، خوا لەتۆ زیـاتر پێ ی ناخۆشەو لەتۆش باشترو بەتواناترە بۆیان. و ئەوەیشی کە دەڵێیـت ئـەوان زۆرن خـۆ ئێمـە هەرگیز بەژمارە شەڕمان نەکردووە بەڵکو بەسەرکەوتنی خوایی سەرکەوتووین و چونکە ئەوان تـۆ ببینن بەو ژمارە زۆرەوە دەڕۆیت بۆیان فارسەکان دەڵێن عەرەب بەئەمیرەکەیانەوە هاتوون و ئـەو کاتە خراپتر پشتی یەکتر دەگرن و لەگەڵت دەجەنگن)).

و عومەریش (ﷺ)ووتی: ئەمەیە ئەو ڕایە جوانەی کە دەبێت جێبەجێ ی بکەم.[1]

دەی یاران ئایا کەسێك بزانێت کە کەسانێك کۆمەڵی هاوەڵ قسەی پێغەمبەری خوایان شکاندووە کە گوایە فەرموبێتی - عەلی - جێنشینی خۆم دەبێت لەدوای خۆم و ئەوان بەزۆر ئەو لـە عـەلی (ﷺ)زەوت کردبێت! دەی توخوا ئا بەو جۆرە پشتیان دەگرێت و دەبێتـەوە زێڕێکـی زۆر دڵـسۆزو ڕاوێژکارێکی ئەمین؟! دەی کەواتە هەموو هاوەڵان تا سەردەمی هەر چوار خەلیفەکە گرنگ نەبووە لەلایەن کێ ببێتە خەلیفەو کەس کۆششی بۆ نەکردووەو یەك دڵ و گیان و هەست بوون.[2]

ئەمەش مانای ئەوە نی یە عمر - نەشارەزا بووبێت بـە کاروبـاری سـەربازی و ئیـداری و عـەلی دەستگری بووە لەژیانیدا بەڵکو ئەمە مانای ئەوەیە کە عمر ئەوپـەڕی خۆشویـستنی هاوەڵـان و کارکردن بەبنەمای شوراو ڕاوێژی مەبەست بووە وە گەرنا لەزۆر کاتـدا هاتۆتـە سـەر ڕای عمـرو ڕاکەی خۆی وەلا ناوە.

عائیشە (ﷺ) دەڵێت (( عەلی (ﷺ)لەزۆر شتدا هەمان ڕای عمری هـەبووە و یـان وازی لـەڕای خۆی هێناوە بۆ ڕای ئەو، تەنانەت عەلی (ﷺ)دەڵێت: عمر ڕاوێژم پێدەکات لەشـتێکداو منـیش

---

[1] فقه السيرة للبوطي، لا (٥٢٩).

[2] فقه السيرة للبوطي، لا (295).

ڕایەکی ترم هەیە لەو بارەیەوەو جیا لەڕایەکەی ئەو، و هەرچی دەڕوانم دەبینم هەردەبێت ئەو ڕایەی ئەو پەسەند بکەم))[1].

## چوارەم:

### پەیوەندی عەلی و نەوەکانی بە عومەرەوە ـ خوایان لێ ڕازی بێت ـ:

عمر (ﷺ)زۆر زۆر ڕێزی گرتووە لەکەس و کاری پێغەمبەری خواو نەوەکانیان و ئەمەش هەندێکە لەو هەڵوێستانە:

١ ـ بۆ سەردانمان ناکەیت ( حوسەین ) ؟

حوسەین ی کوڕی عەلی ابو طالب (ﷺ)دەگێڕێتەوە و دەڵێت " ڕۆژێکیان عمر پێی ووتم: ئەی کوڕی خۆم ئەوە بۆ سەردانمان ناکەیت و بەسەرمان کەیتەوە؟ منیش ڕۆژێك هاتم بۆ لای کە بەتەنها لەگەڵ موعاویەدا دانیشتبوو، (عبدالله ) ی کوڕیشی لەبەردەرگا وەستا بوو نەیاندەهێشت بڕواتە ژوورەوە، و منیش یەکسەر گەڕامەوە، پاش ماوەیەك بینیمی ووتی: کوڕی خۆم نەم بینی سەردانمان بکەیت؟ ووتم: هاتم تۆ لەگەڵ موعاویەدا دانیشتنتان هەبوو، ( عبدالله ) ی کوڕی خۆتم بینی گەڕایەوە منیش گەڕامەوە، و عمریش (ﷺ)ووتی: تۆ لە عبدالله کوڕی عمر شایەنتری بێیتە ژوورەوە، چونکە ئەوەی لە مێشکماندا چەسپێنراوە ئەوەیە کە خوامان خۆش بوێت و پاشان ئێوە ئەی (اهل البیت) . و دەستیشی هێنا بەسەریدا.[2]

٢ ـ دڵم خۆش نیە بە ئێوەم نەداوە :

( ابن سعد ) لە محمد باقر لە باوکی یەوە عەلی کوڕی حوسەین دەگێڕێتەوە: کە لە یەمەنەوە کۆمەڵێ جل و بەرگی جوان هات بۆ مەدینە و ئەویش خەڵکی پێ پۆشتە کردەوە و بەو جلە جوانانەوە دەگەڕان و عمر لە نێوان قەبری سەردار (ﷺ) و مینبەردا دانیشتبوو، خەڵکی دەهاتن بۆ لای و سڵاویان لێ دەکرد، و حەسەن و حوسەین لە ماڵی فاطمە دەرچوون بەناو خەڵکەکەدا

---

[1] الإمامة والرد على الرافضة ـ أصفهاني، ص (٢٩٥).

[2] المرتضى لا ١١٨ ، الأصنابة ( ١ / ١٣٣ ).

هاتن و لەو جلە جوانانەیان لەبەردانەبوو، هەرکەکەوتنە بەرچاوی عمر بەو شێوەیە ووتی: دڵم خۆش نیە کە جل و بەرگی یەمەنیم بە ئێوە نەداوە.
ئەوانیش ووتیان : ئەی ئەمیری باوەڕداران خەڵکەکەت پۆشتە کردەوە زۆر چاکت کرد. عمریش ووتی: لەبەر ئەو دوو لاوەی کە بەناو خەڵکەکەدا هاتن و لەو جلە جوانانەیان لە بەردانەبووە و داواشیان نەکردووە، و پاشان نامەی نووسی بۆ والی یەمەن کە دەست لەبەرگە یەمەنیانە بنێرێت بۆ حەسەن و حوسەین و ئەویش ناردی و پێی بەخشین و لەبەریان کرد.[1]

٣ ـ براو هاورێکەم پێی داووم:

جارێکیان عەلی (ﷺ)لەماڵ چووە دەرەوە عەبایەکی عەدەنی بەسەر شانەوە بوو ووتی : ئەم عەبایە هاورێ و براو دۆست و خۆشەویستم ئەمیری باوەڕداران عمر پێی بەخشیووم.[2]
لە ڕیوایەتێکی تردا لە (ابی السفر ) ەوە دەگێرنەوە کە ووتویەتی: عەبایەك زۆر لەبەری عەلیدا دەبینرا، بۆیە پێیان ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران تۆ ئەم عەبایە زۆر لەبەر دەکەیت مەسەلە چیە؟ ووتی : بەڵێ ، ئەمە هاورێ و خۆشەویستم عمری کوڕی خطاب (ﷺ)پێی بەخشیووم ئەو کەسەی لەبەر خوا هەمیشە ئامۆژگاری کەر بوو، پاشان گریا.[3]

٤ ـ زەوی یەنبەع :

عومەری کوڕی خطاب (ﷺ)زەوی ( یەنبەع ) ی بەخشی بە عەلی (ﷺ)و عەلیش خوای لێ ڕازی بێت زەوی تری بەدەمەوە کڕی و گەورەی کرد و پاشان بیرێکی تێدا لێدا هەر کە بیرەکە تەواو بوو ئاو فیچقەی کردە سەرەوە وەك گەردەنی گایەك کە سەری دەبڕێت خوێنی لێ دێت.
بە پەلە هاتن و موژدەیان دا بە عەلی ، و ئەویش لە خۆشیاندا کردی بەخێر بۆ هەژار و نەدارەکان لە ڕێی خودا تا ببێتە تێشوویەك بۆ ئەو ڕۆژەی رووی هەندێ ڕەش دەبێت و ڕووی هەندێکیش سپی دەبێت تا خوای گەورە لە ئاگر بیپارێزێت، لە وەسیەتنامەکەشیدا نووسی کە ئەوە نەوەك

[1] المرتضى ١١٨ ـ الأصنابة ( ١ / ١٠٦ ) .
[2] المختصر من كتاب الموافقة لا ١٤٠.
[3] المصف لابن ابى شبيه ( ١٢/ ٢٩ ) اسناده حسن .

میرات دابەش دەکرێت و نەدەفرۆشرێت و نەدەبەخشرێت و بەس لەبەر خاتری خوای گەورە دەستم لێ هەلگرتووە تا لێم قبولّ بکات .[1]

پێنجەم / ( عەلی و عمر ) زاوا و خەزووری یەکتر بوون :

عەلی (ﷺ)( ام کلثوم ) ی کچی خۆی بەخشی بە عمری کوڕی خطاب (ﷺ)کاتێ کە داوای کرد لێی و ئەویش لەبەر ڕێزو پیاو چاکی و سیرەت پاکی یەکەی و بۆ زیاتر پتەوکردنی دۆستایەتی و خۆشەویستی نێوانیان ڕازی بوو پێی و ئەم هەنگاوەش زیاتر دوژمنان و ناحەزانی ئەم ئوممەتە نا ئومێد دەکات کە دەڵێن کینەو ڕقایەتی و ناحەزی لە نێوانیاندا بوویێت.[2]

عمر (ﷺ)زۆر فەرموودەی بیستبوو لە زاری پێغەمبەر (ﷺ)کە ئامۆژگاری ئوممەتی کردووە کە لەگەڵ کەس و کاریدا باش ڕەفتار بکەن دوای خۆی، و کاتێ عەلی (ﷺ)بەو خوازبێنی یە ڕازی بوو، عمر لە خۆشیاندا ڕۆشتە ناو ـ ئەنصار و مهاجرین ـ و هاواری کرد " رفئـونی ..." واتە پیرۆزبایم لێ بکەن و دوعای خێرم بۆ بکەن .

و پاشان پێی ووتن هۆکاری ئەم کارەم لەبەرئەوەیە کە تێکەڵی و خزمایەتیم تێکەڵ بە خزمایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (بکەم چونکە لە پێغەمبەرم بیستووە فەرموویەتی (( کل سبب و نسبٍ منقطع یوم القیامة الا ما کان من سببی و نسبی )) واتە: هەموو خزمایەتی و هۆکارەکان لە ڕۆژی قیامەتدا دەپچڕێت تەنها خزمایەتی و پەیوەندی یەکانی من نەبێت . و حەزم کرد نێوان من وپێغەمبەری خوا خزمایەتی هەبێت .[3]

و ڕاستی و ڕوودانی ئەم هاوسەرگیریە ڕاستی یەکی مێژوویی یە و هیچ کەس لە زانایانی سوننەو شیعەیش ڕەدی ناکەنەوە .

(استاذ ابو معاذ الأسماعیلی ) لە کتێبەکەیدا دەڵێت : خواستنی (ام کلثوم ) ی کچی عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ)لەلایەن عمری کوڕی خطاب ەوە ڕاستی یەکەو هەڵبەستراو نیە .

لە بەرهەمی ئەو هاوسەرگیریە عمر (ﷺ) ام کلثـوم کچێکی بو ناوی نا روقیە و کوڕێکیشی بوو ناوی لێنا زەید، و هاوڕێکانی ئەم زەیدە دەگێرنەوە کە شەوێکیان کە نێوان ( بنی عدی کوری

---

[1] المحلى ( ٦ / ١٨٠) فقه علي، تقلعجي لا ٢٢٦.

[2] الشيعة و اهل البيت لا ١٠٥ .

[3] اسناده حسن اخرجه الحاكم في المستدرك ( ٣ / ١٧٣ ).

کەعب ) دا شەڕێك دروست بوو، زەید خێرا خۆی گەیاندە ئەوێ و کەوتە نێوانیان تا ناشتیان بکاتەوە و لەو نێوانەدا بەردێك بەری سەری زەید کەوت و هەرلەوێدا شەهید بوو، کاتێ دایکیشی هەواڵەکەی بیست لە خەفەتاندا لەهۆش خۆی چوو، دوا بە دوای ئەوەش بە کاتژمێر گیانی سپارد ، و عبدالله ی کوڕی عمر (ﷺ)نوێژی لەسەر کردو حەسەنیش کە عبدالله ی کردە پێش نوێژی خۆی لە دواوە لەڕیزەکەدا نوێژی لەسەر کرد .[1]

شەشەم/ عمر (ﷺ) چۆن دەڕوانێتە فاطمە (رضی الله عنها) و ناحەزانیش چی دەڵێن :

لە ( اسلم العدوی ) یەوە دەگێڕنەوە دەڵێت ((کاتێ بەیعەت درا بە " ابو بکر الصدیق " کە ببێتە خەلیفەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، لەو کاتەدا عەلی و زوبێری کوڕی عەوام هاتوچۆی فاطمە یان دەرکرد و ڕاوێژیان پێدەرکرد، و هەر کە عمر بەو هەواڵەی زانی ، چوو بۆ ماڵی فاطمە و پێی ووت : ئەی کچی پێغەمبەری خوا لەناو هەموو دروستکراوەکانی خوادا کەسمان ئەوەندەی باوکت خۆش ناوێت و دوای باوکیشت کەسمان ئەوەندەی تۆ خۆش ناوێت ، و قسەی لەگەڵدا کرد لەبارەی بەیعەتەکەوە و پاشان بە عەلی و زوبێری ووت: ژیرانە بڕۆنەوە، و ئەوانیش نەگەڕانەوە بەیعەتیان نەدا.[2]

ئەو ڕیوایەتەش تا ئێرە صحیحە و لەگەڵ ـ اسناد صحیح ـ یشدا لەگەڵ ئەوبەرە ناوازە پاکەی کە خوا لە قورئاندا شایەتی پاکیان بۆ دەدات ، ئیتر شیعەکان کۆمەڵێ ڕیوایەتی بێ بنەماو ناڕاست و دژ بە هەموو پاکی و ناوازەیی ئەو بەرە قورئانییە خاوێنە یان هێناوەو بەداخەوە ـ لەناو شوێنکەوتوانیاندا بڵاوی دەکەنەوە کە هەموو بوهتان و هەڵبەستراوە بەدەم ئەو دووەم پیاوەی مەزنەی ئیسلامەوە و گوایە بە فاطمە ی ووتوە: ئەوانە چی دەکەن وا کۆبونەتەوە لە ماڵەکەتدا ئەم جارە بیانبینم لێرە ماڵەکەیان پێوە دەنوسێنم وا دیارە دەیانەوێت موسڵمانان پەرتەوازە بکەن!!

[1] اسد الغابة ( ٧ / ٤٥ ) ، نساء اهل البیت مهند عبدالکریم ( لا ١٨٥ـ ١٨٦ ... ) .
[2] اخرجه ابن ابی شبیه / المصنف ( ١٤ / ٥٦٧) اسناده صحیح .

گوایە پاشتر هاتونەتەوە و فاطمە یش (رضي الله عنها) بە هەردووکیانی ووتوە: مەیەنەوە ئێرە عومەر هەڕەشەی کردووە کە ماڵەکە بەسەرماندا بسوتێنێ و بەخوا سوێندەکەیشی دەباتە سەر و ئەوانیش نەهاتنەوە تا پاش بەیعەت دان.[1]

ئەو قەڵەمە ناپاکانە هەر بەوەشەوە نەوەستاون بەڵکو وەك ( الذهبی ) لە میزاندا باسی دەکات کە ( الطبري الطبرسي) پیاوێکە بەکۆی دەنگی هەموو وانایانی فەرموودەیە شیعەیەکی درۆزنە، و گوایە وادادەنێن کە عمر لەسەر ئەو مەسەلەیە لە فاطمە ی داوە و تەنانەت ( کوڕەکەشی محسن ) ی لەباربردووە، و ئەمەو چەندان درۆ و دەم هەڵبەستی تر کە هیچیان هیچ بنەمایەکی ڕاستی تێدا نیە ، بەڵکو ئەو درۆو دەلەسانە تۆمەتبارکردنی عەلی کوڕی ئەبی طالیبیشی تێدایە . کە گوایە ئەو پیاوە ئازاو بە غیرەتەی ئیسلام کە بەجەرگترین هاوەڵی پێغەمبەر دادەنرێت ، بێ دەنگ بوبێت و نەی وێرابێت لەسەر دەستدرێژی کردنە سەر خێزانی و کچی پێغەمبەری خوا بێتە وەڵام و بەرگریان لێ بکات ، کە ئەو سەردەمە زێڕینەی ئیسلامیش ئازادی ڕادەربڕین لە ئەو پەڕی چڵە پۆپە دابوو!!.

ئەم درۆ و دەم هەڵبەستانە ئەوەندە ڕوون و ئاشکران پێویست بە وەڵام دانەوەناکەن و تەنانەت هەندێ لە سەرچاوەکانی شیعەش بەدرۆی دەخەنەوە،[2] و ئێ لەریوایەتی ( صحیح ) یشدا سابت بووە کە ( محسن ) هەر لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لە دایك بووە ئیتر نازانم چۆن ئەم سیناریۆوانە دروست کراون و چۆن لە خوا ترسان و ئەمانەتی زانستی ڕێگەی پێدابن کە ویستویانە ئەو جیلە ناوازەیەی کە محمد المصطفی لە ماوەی (٢٣) ساڵ پەروەردەکردندا وای لێکردوون کە ڕق لەیەك بوون و کورسی پەرستی و هەڵپە هەڵپی پلە و پایەی لەناو دڵیاندا ڕیشەکەن کردبوو.[3]

حەوتەم / عمر (رضي الله عنه) عەلی دەستنیشان دەکات بۆ جێنشینی خۆی :

١- دەست نیشانکردنی ـ ئەهلی شورا ـ کاتی عمر (رضي الله عنه) لەنوێژدا لێ ی دراو گومانی برد کە نامێنی، و موسڵمانەکانیش دەستە دەستە دەهاتنە لای و پێیان دەووت: وەسیەت بکە بۆ دوای

---

[1] عقائد الثلاثة والسبعين فرقة . ابن محمد اليمني ( ١ / ١٤٠).

[2] مختصر التحفة الأثني عشرية لا ٢٥٢.

[3] ووتەی وەرگێر.

خۆت، ئەویش دەیووت: من هیچ کەسێك نابینم شایانی ئەو کارە بێت جگە لەو شەش کەسەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ وەفاتی کرد لێیان ڕازی بوو - کە (علی) و (عثمان) و (زوبێر) و (طلحه) و (سعد) و (عبدالرحمن)[1].

پاشان کەسە تایبەتی یەکانی ناو ئەوانیشی بانگ کرد کە (علی و عثمان و عبدالرحمن) بوو، ئامۆژگاری زۆری کردن.[2] و ئەمەیە ئەوپەڕی دادپەروەری و ماف دان بە میللەت کە قۆرخی نەکرد لەیەك نەفەردا بەڵکو ئیختیاری دایە دەستی گەلی موسڵمان کە لەو شەشە خۆیان سەرپشك بن و چاکترینیان بۆ ئەو کارە قورسە هەڵبژێرن، و ئەمەش داهێنانێکی نوێ بوو کە ئەمڕۆ لەچەرخی بیستەم دا وولآتانی دنیا چاوی لێ دەکەن و بۆ بەرچاو ڕۆشنی گەل هەندێ کەس دەست نیشان دەکرێن.

۲- عەلی (ﷺ) چی بە عمر دەڵێت لەپاش شەهیدبوونیدا:

لە (صحیح البخاری) دا هاتووە لە (إبن عباس) ەوە دەگێڕنەوە کە ووتوویەتی: کاتێ عمر گیانی سپارد لەسەر جێگاکەی خۆی ڕایان کشاندبوو و خەڵکی بەچواردەوریدا وەستابوون و نوێژیان دەکرد، پێش ئەوەی بەرزی بکەنەوەو بیبەن، یەکێ لە دواوە لەناکاو ناوشانی گرتم لام کردەوە دەبینم (عەلی کوڕی ئەبو طالب) ە: داوای لێخۆشبوونی لەخودا بۆ عمر دەکردو ووتی: کەسێ شك نابەم بەکردەوە جوانەکانیەوە بۆ لای خوا بگەڕێتەوە ئەوەندەی تۆ مەزن بێت، سوێند بەخوا هەموو گومانم بۆ ئەوە دەڕوات کە خوای گەورە دەتگەیەنێتە خزمەت دوو هاوڕێکەی پێش خۆت، و ئەوەشت بەسە کە زۆرجار لە پێغەمبەرم دەبیست دەیفەرموو: ((من و ئەبو بەکرو عمر ڕۆیشتین)، و (من و ئەبو بەکرو عمر چووینە ژوورەوە)، و (من و ئەبو بەکرو عمر دەرچووین بۆ)).[3]

۳- ووتەی عەلی (ﷺ)دەربارەی عمر (ﷺ):

عمر (ﷺ) زۆر ژیر بووە، و کارەکانیشی زۆر کاریەجێ ی بووە .. و عەلیش (ﷺ)لەدوای مردنیشی نەیویستووە پێچەوانەی کارەکانی عمر بکات، (عبدالخیر) دەڵێت: ((لەلای عەلی بووم (ﷺ)کاتێ ئەهلی نەجران هاتن بۆ لای و منیش ووتم: ئەگەر عمر کارێکی کردبێ ئەمڕۆ ئێوە

---

[1] البداية والنهاية (١٤٢/٧).

[2] البخاري، ژ (٣٧٠٠).

[3] البخاري (٣٦٨٥).

دەتوانن هەڵی بوەشێننەوە، دەڵێ: هاتن و سەلامیان لێ کـرد و لەبەردەمیـدا بـەڕیز دانیـشتن، و یەکێکیان وەرەقەیەکی لەگیرفانی دەرهێناو دایە دەستی عەلی، ووتیان: ئەی گەورەی بـاوەڕداران ئەمە بەخەتی خۆت نووسراوەو بەحـچوری پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)، لـەم کاتـەدا عـەلیم بینـی چاوەکانی پڕبوون لە فمێسك و پاشان سەری هەڵبڕی ووتی: ئـەی ئـەهلی نـەجران: ئەمـە دوایـن نوسراو بوو کە لەخزمەت پێغەمبەردا بینووسم، ووتیان: دەی جێبەجێ ی بکەو پێمان بدە، ئەویش ووتی: ئەوەی عمر لێ ی سەندوون بۆخۆی نەبووە و لەخۆیەوە نـەیکردووە بـەڵکو بـەئامادەبوونی کۆمەڵێکی زۆر لە موسڵمانان، و ئەوەی کە لێ ی وەرگرتوون باشـترە لـەوەی کـە پێـی داوون، و سوێند بەخوا شتێك ئەو دایبنابێت هەڵی ناوەشێنمەوەو عمر ژیرو کاربـەجێ بـووە.[1] لەسـەر ئـەم ڕووداوە زاناکانی ئیـسلام ئـەوەیان ورگرتـووە کـە نابێـت حوکمڕایـان حوکمـەکانی پـێش خـۆی هەڵوەشێنێتەوە.

٤- عمر پێ ی ناخۆش بووە کەواتە منیش پێم ناخۆشە:-

کاتێ عەلی (ﷺ) لەڕووداوی (الجمل) بوویەوە، ڕۆشتە ناو بەسرەوەو عائشەی ڕەوانەکردەوە کاتێ ویستی بگەڕێتەوە بۆ مەککە، لەبەسرەوە کەوتە ڕێ بەرەو کوفە، و ڕۆژی دووشەممە (١٢) رجب ی ساڵی (٣٠) کۆچی چووە ناو شار، و پێیان ووت: بڕۆرە ناو کۆشکی سپی، ووتـی: ناچـم چـونکە کاتی خۆی عمری کوڕی خەطاب پێ ی ناخۆش بووە بچێتە ناوی منـیش پـێم خـۆش نـی یـە، و ڕۆیشتە ناو (الرحبە) و پاشان دوو ڕکات نوێژی لەمزگەوتی ـ جامع الاعچم ـ دا کرد.[2]

٥- (أهل البیت) ناوی عمریان خۆش دەوێت:

لەبەرامبەردا (أهل البیت) یش زۆر عمریان خۆش ویستووەو تەنانەت لەخۆشەویستی ناوی عمرەوە ناوی زۆربەی منداڵەکانی خۆیانیان بە عمر ناوە بەپێـچەوانەی ئەوانـەی ئـەمڕۆ بانگەشـەی ئـەوە دەکەن کە دۆستی (أهل البیت) ن کەچی ناوی عمر لە فەرهەنگەکانیاندا سڕاوەتەوە !!..

بۆنموونە یەکەمین کەس کە ناوی کوڕەکەی خۆی بەناوی (عمر) ەوە نا عەلی کوڕی ئەب طالب بوو (ﷺ)کە لە (أم الحبیب کچی ربیعە البکری) خێزانی بوو. و لەکێبی (الفصول) دا هاتووە کە یەکێ

---

[1] معجم البلدان (٥/٢٦٩)، فقه الإمام علی (٢/٨١٣) إسنادە مرسل.

[2] تاریخ الخلافق الراشدة، عمر کنعان، لا (٣٨٣).

لە کوڕەکانی عەلی ناوی عمرەو لەهۆزی (التغلب) کە کچێکی سەر بەئەو هۆزە بوو کە خالید لە (عین التمر) دای بەسەریاندا، و تەمەنی درێژبوو تا گەیشتە (٨٥) ساڵ و نیوەی میراتی باوکی کەوت چونکە هەموو براکانی پێش خۆی شەهید بوون لەگەڵ حوسەیندا (ﷺ) و ئەو نەکوژراو ئەو میراتە زۆرەی کەوت.[1]

و پاشان حەسەن (ﷺ)یەکێ لە منداڵەکانی ناو نا (عمر) (ﷺ)[2] و پاشان حوسەینیش (ﷺ)یەکێ لەکوڕەکانی ناو ناوە (عمر) و عەلی کوڕی حوسەینیش - زین العابدین - یەکێ لەمنداڵەکانی ناوناوە (عمر)[3] و یەکێ لە گەورە زانایانی ئیسلام بەناوی موسی بن جعفر کەناسراوە بە موسی کاظم یەکێ لەکوڕەکانی ناوی (عمر بووە).[4] و هەروەها بەناوی ئەبو بەکرو عثمان و عائیشەو گلحە و هەموو هاوەڵانی ترەوە ناوی منداڵەکانیان ناوەو بەڕاسی خوانەاس و لەئیسلام تێ گەیشتبوون بۆیە وا یەکتریان خۆش ویستووەو خۆزگە شیعەکانی ئەم ڕۆژگارەش ئا بەو دڵە سافە پڕ لەباوەڕەوە بیریان بکردایەتەوەو ناوی منداڵەکانیان بەناوی خەلیفە ڕاشیدەکان و دایکانی باوەڕدارانەوە ناو بنایەو تێکەڵێی خوێن و گۆشت لەناو موسڵمانادا دروست ببوایەتەوەو ئومێدی ئەوەش دەکەین - إنشاء الله -.[5]

٦- عمر نەبوایە هەموو نەوەکانی حوسەین (ﷺ) نەدەمان :

بێگومان ئەوانەی ئەمڕۆ خۆیان بەنەوەی حوسەین (ﷺ)دەزانن و خۆشیان دەوێن و سنگیان بۆ دەکوتن دەبێ ئەوە بزانن کە ئەگەر عمری کوڕی خطاب (ﷺ) لەدەستەوتەکانی فارسەکاندا کچی یەزد جەردی پاشای فارسەکانی پێنەبەخشیایە کە پاشتر عەلی کوڕی حوسەینی لێ بوو کە ناوی ( زین العابدین ) ی لێنرابوو حوسەین بەبێ نەوە دەمایەوە و ئەم شیعانەی ئەمڕۆش نەدەبوون.[6]

---

[1] الفصول المهمة، لا (١٤٣).

[2] الشيعة وأهل البيت، لا (١٣٣).

[3] هەمان سەرچاوە، لا (١٣٤).

[4] هەمان سەرچاوە، لا (١٣٥).

[5] إذهبوا فأنتم الرافضة، عبدالعزيز الزبيدي، لا (٢٣٠).

[6] اذهبوا فأنتم الرافضة لا ٢٣٢.

٧ ـ کوڕانی حەسەنیش (ﷺ) عمریان خۆش دەوێت :

( حفص ) ی کوڕی ( قیس ) دەڵێت : دەربارەی ( مسح علی الخفین ) پرسیارم لە عبداللە ی کوڕی حسن کرد و ئەویش لەوەڵامدا ووتی: مەسحی بکە ، چونکە عمری کوڕی خطاب (ﷺ) مەسحی کردووە ، دەڵێ: ووتم، من لەتۆم پرسیوە ئایا خۆت ( مسح علی الخفین ) دەکەیت ؟ لەوەڵامدا ووتی : ئەمە بۆ تۆ ناشێت ، من دەڵێم عمر مەسحی کردووە تۆ دەڵێت ئەی تۆ ؟! دەی عمر لە منیش و تۆیش و هەموو سەرزەوی باشترە، منیش پێم ووت: ئەی (ابا محمد ) هەندێ خەڵك وا گومان دەبەن کە ئەمە لە توقیەوە بووبێت لە لایەن ئێوەوە، ئەویش لە وەڵامدا پێی ووتم : (کە لەنێوان قەبری پێغەمبەر و مینبەرەکەیدا بوو) ، ئەی خوای پەروەردگارم من ئەمە قسەمە لە نهێنی و ئاشکرادا کەس داوای ئەم قسەیەم گوێ بۆ هیچ قسەیەکی تر نەگرێت ،

و پاشان ووتی: ئەمانە کێن وا دەزانن عەلی ترسنۆك بوو (ﷺ)گوایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێداوە و کەچی فەرمانەکەی شکاندوە ، هەر ئەوەندە بەسە کە عەلی سوك بکات کەسێك کە بڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەلی داناوە بە خەلیفە لەدوای خۆی و عەلیش جێبەجێی نەکردووە و قسەکەی شکاندوە.[1]

---

[1] النهی عن سب الأصحاب و ما فیه من الأثم و العقاب .

## جیٚ باسی سێیەم

## عەلی (ﷺ) لەسەردەمی عوسماندا (ﷺ):

### یەکەم / بەیعەت دانی عەلی (ﷺ ) بە عوسمان (ﷺ):

هەر کەموسڵمانان لە بە خاك سپاردنی عمر (ﷺ)بونەوە، خێرا کۆمەڵی ئەنجومەنی باڵای دەوڵەتی ئیسلام کە لە ئەهلی شوڕادا خۆی دەبینیەوە خۆیان گەیاندە ماڵی دایکی باوەڕداران عائشە (ﷺ) تا خێرا گەورەترین کێشە چارە بکەن کە هەڵبژاردنی خەلیفە و سەرکردەی ئوممەتە، و دوای تاوتویٚ کردنێکی زۆر و بەیارمەتی خوا گەیشتنە ئاکامێکی زۆر باش کە هەموو لایەك پێی ڕازی بوون.[1] بە کۆی دەنگ هاتنە سەر ئەوەی عبدالرحمنی کوڕی عەوف هەڵبژێرن (ﷺ)و خەریك بوو ئـەهلی شوڕایش جێگیری بکەن بەلاٚم وەك ( الذهبی ) دەڵێت : گەورەترین چاکی و لێهاتوویی عبدالرحمن لەوەدا بوو کە پێش ئەوەی ئەهلی شورا قسە بکەن خۆی لەو کارە ( عزل) کرد و هەڵسایەوە و ئەو بەرپرسیارێتی یە گەورەیەی دابەسەری ، عوسمانی کوڕی عەففان دا.

جا ئەگەر عبدالرحمن حەزی بە پلەو پایە بکردایە و کورسی پەرست بوایە ئەوا ئەو هەلە زێڕینەی لەدەست خۆی دەرنەدەرکرد یان هەر هیچ نەبوایە دەیدا بە کوڕی مامەکەی خۆی سـەعدی کـوڕی ئەبی وەقاص (ﷺ) تا لەبنەماڵەکەی دەرنەچوایە.[2]

لەڕیوایەتی (بوخاری) دا هاتووەدەڵێت: لەپەش نوێژی بەیانی ـ ئەو پیاوانە کۆبوونەوە، و ناردیان بەدوای هەموو ئـەو ئەنـصارو موهاجیرانـەی لەوکاتـەدا لـەوناوە بـوون، و ناردیـشیان بـەدوای سەرکردەکانی سوپاو فەرمانڕەوای ناوچەکاندا کە هەموویان لەو ساڵەدا عمر پێش شـەهیدکردنی بانگی کردبوونەوە تا پێکەوە حەجیان پیٚ بکات، و کاتی کۆبونەوە عبدالرحمن کوڕی عـوف (ﷺ) بەدەنگی بەرز شایەتمانێکی هێناو پاشان ووتی: ئەی عەلی هەرچی سەیری خەڵکەکە دەکەم هـەر

---

[1] عثمان بن عفان ـ صادق عرجون لا ٦٢ ـ ٦٣.

[2] سير أعلام النبلاء ( ١ / ٨٦).

هەمووی عوسمانیان بەدڵە و تۆش لەگەڵمان بە لەو کارەدا، بەعوسمانیشی ووت: بەیعەتت پێ دەدەم لەسەر سوننەتی خواو پێغەمبەرو هەردوو جێنشینەکەی دوای خۆی. و پاشان موهاجیران و ئەنصارەکانیش بەیعەتیان پێداو دواتر سەرکردەکان و فەرمانڕەواکانیش.[1]

و لەڕیوایەتی خاوەنی کتێبی (التمهید والبیان) دا هاتووە کە عەلی کوڕی ئەبو طالب دووەمین کەس بوو لەپاش عبدالرحمن ی کوڕی عەوف بەیعەتی خۆی دا بەعوسمان.[2]

## دووەم/ هەندێ ڕیوایاتی پڕوپوچ لەو بارەیەوە:

لە مەسەلەی هەڵبژاردنی عوسماندا، کۆمەڵێ ڕیوایەت دروست کراوە لەمێژوودا کە هیچ کام لەو ڕیوایەتانە (صحیح) نین، بەڵکو لەم دواییانەدا ڕۆژهەڵاتناسە کینە لەدڵەکان هاتن گەورەیان کردن و باسیان کردن چونکە لەگەڵ هەواو مەزاجی دژایەتی کردنی ئیسلام و موسڵماناندا دەگونجاو تۆوی ناکۆکی و جیاوازی پێ دەڕوێنرا لەناو موسڵماناندا و لەوانە (أبو مخنف) کتێبی تایبەتی لەسەر نووسی بەناوی (کتاب الشوری) و هەروەها (إبن عقدە) و (إبن بابویە).[3] ئێمەش هەندێ لەو دەمهەڵبەستە نیاز گڵاویانە دەهێنین و لێیان دەکۆڵینەوە:

١- گوایە، هاوەڵان خزم خزمێنەیان کردووە!:

ئەمە تۆمەتێکە بۆ هەرکەسێك شیاو بێت هەڵبەسترێت بەدەمی یەوە، بۆ هاوەڵان هەرگیز شیاو نی یە، ئەوانەی ئەم جۆرە تۆمەتانە ئەدەنە پاڵ هاوەڵە ئازیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە بەخۆیان بزانن یان نە ئەوە پێغەمبەری ئەکرەم تاوانبار دەکەن ـ پەنامان بەخوا ـ بەوەی کە نەیتوانیوە بەجۆرێ پەروەردەیان بکات هەق بڕۆن و مافی ماف داران نەفەوتێنن و خزمایەتی بەکارنەهێنن لەبەیعەت و دیاری کردنی خەلیفەدا!..

---

[1] البخاري، کتاب الأحکام، ژ (٧٢٠٧).

[2] التمهید والبیان، ل (٢٦).

[3] الذریعة الی تصانیف الشیعة (١٤/ ٢٤٦).

(الكلبي وأبـي مخنـف) لـەباوكي يـەوە أحمـد الجـوهري دەڵێـت (عمـر هەسـتا بـەوەی يـەكلايی كردنەوەكانی دايە دەستی عبدالرحمن و عەلیش لەوێدا هەستی كرد خيلافەتی لەدەست دەرچووە!! چونكە عبدالرحمن ـ عثمانی خزمی خۆی هەڵدەبژێرێت!!).[1]

(ابن تيميه) زۆر جوان وەڵامی ئـەم ووتانـە دەداتـەوە و دەڵێـت : عبـدالرحمن و عوسمـان هـيچ خزمايەتيەك لە نێوانيان نەبووە كە نزيك بوويێت نەبرای بوو، نە ئامۆزا، نەخاڵۆزا، بەڵكو هەر لە هۆزەكەشی نەبووە بەڵكو ئەم لە ( بنی زهره ) يەو ئەو لە ( بنی اميه ) و بنی زهـره لـە ( بـنی هاشم ) نزيك تر بون تا لە ( بنی أميه ) ، چونكە بنی زهره خاڵۆانی پێغەمبەر بوون عبـدالرحمن لەوانە و سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصيش لەوانە كە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی فەرموويـەتی ( هـذا خالي ، فليرني أمرؤ خاله ).[2] واتە: من ئەمە خاڵمە دەی كێ خاڵی خۆيم نيشان دەدات .[3]

بۆ دەبينی شيعەكان هەموو بەڵگەيەكيان لەم مەسەلەيەدا ئەو تۆمەتەيە كە گوايە عبدالرحمن بە پاڵنەری خزمايەتی عوسمانی دەست نيشان كردوە ئيتر ئەوەيان لەياد چوو كە خزمايەتی پشت لـە خزمايەتی ژن و ژن خوازی بەهێزترە و ئەوە لەلايەك و لەلايەكی تريشەوە بيركردنـەوە تێڕوانينـی ئەو بەرە ناوازەيەی كە لەژێر چاودێری خوا و پێغەمبەردا پەروەردەبوون و گەورەبوون ناگونجێـت و ناچێتە عەقلی هيچ مرۆڤێكەوە كە بابەتيانە و دوور لە ڕەگەز پەرستی و مەزهەب گـەرێتی بـير بكاتەوە كە بەهيچ جۆرێك خزم و خزمێنەيەيان كردبێت.

٢ ـ حيزبی ئەمەوی و حيزبی هاشمی :

لە ڕيوايەتی ( ئەبی مخنف ) هاتووە كە لەكاتی بەيعەت دانەكەدا خەڵكەكە بوبوون بە دوويەشەوە ، و بەشی بۆ بەنو هاشم و بەشی بنی اميە!! و ئەمەش بە هيچ شێوەيەك ڕاست و صحيح نيـە و هيچ ڕيوايەتێكی صحيح و چعيف ی لەسەر نيە ،[4] و ئەم ڕوداوەش پێويستی بەوەڵام دانەوە نيـە چونكە ئەو جيلە ناوازەيە ـ ناچێتە عەقڵەوە ـ ناكۆكی عەشايەريان بەكارهێنابێت كە پێغەمبەری

---

[1] أثر التشيع في الروايات التاريخية، لا (٣٢٢).

[2] صحيح السنن الترمذی ( ٣ / ٢٢٠) ژ ٤٠١٨.

[3] مناهج السنة النبوية( ٦ /٦٧١ـ ٦٧٢ ).

[4] مرويات ابی مخنف في تاريخ الطبری لا ( ١٧٧ـ ١٧٨ ).

ئیسلام ( ۲۳ ) ساڵ لە ژیانی پێغەمبەرایەتی توانی لەڕیشەوە دەری بهێنێ و برایەتی موسڵمانەتی لە جێگەیدا بڕوێنێت .

۳ ـ درۆ و بوهتان بەدەم عەلیەوە (ﷺ):

( ابن کثیر ) دەڵێت : کۆمەڵێ لە مێژوونوسەکان لە نێوانیاندا ـ ابن جریر ـ و کەسانی تریش ڕیوایەتێك دەگێرنەوە لە پیاوانێکەوە کە کەس نایانناسێت کە عەلی بە عبدالرحمانی ووت: فێڵت لێ کردم، و لەبەر خزمایەتی ژن و ژن خوازی نێوانتان و ئەو وتووێژەی ڕۆژانەی نێوانتان عوسمانت دەست نیشان کرد ، و ئەویش هەندێ بیانوی هێنایەوە و پاشان و ووتی " ان الذین یبایعونك انما یبایعون الله ید الله فوق ایدهم فمن نکث فأنما ینکث علی نفسه ومن اوفی بما عاهد علیه الله فسیؤتیه اجراً عظیماً " .

چەندان ڕیوایەتی تریش کە پێچەوانەی فەرمودە ـ صحیح ـ ەکانن و زۆرێ لە شیعەکان و چیرۆك نووسە گێلەکانیش بەبێ ئەوەی لە صحیح ـ ضعیف ـ ی بکۆڵنەوە و نقلیان کردوەو لەکتێبەکانیاندا نوسیویانەتەوە.[1]

سێیەم / عەلی (ﷺ) سزا شەرعیەکانی جێ بەجێ دەکات ـ الحدود ـ :

۱ـ عەلی سزا شەرعیەکانی کە بە " الحدود" ناسراون جێ بەجێ دەرکرد لە دەوڵەتەکەی عوسماندا، لە (حصین کوڕی منذر ) ەوە دەگێڕنەوە دەڵێت : لەلای عوسمان بووم کاتێ ولیدیان هێنا و دووکەس شایەتیان لەسەردا کە عەرەقی خواردۆتەوە و یەکێکیان ووتی عەرەقی خواردووە و ئەوی تریشیان ووتی من نەم بینی بڕشێتەوە ، عوسمانیش ووتی : ئێ نەڕشاوەتەوە تا خواردبێتیەوە.

عوسمانیش (ﷺ) ووتی : ئەی عەلی هەستە دارکاری بکە ، و عەلیش (ﷺ) ووتی : حەسەن هەستە تۆ دارکاری بکە، عوسمانیش ووتی : (( الحسن ولِّ حارها من تولیّ قارّها )) واتە حەسەن بزانم چۆن ئازاری دەدەیت وەك چۆن چێژی لەمەی وەرگرتووە، وەك بڵێی تۆ ناتوانیت بۆیە ووتی: ئەی عبدالله ی کوڕی جعفر تۆ هەستە دارکاری بکە، و جەعفەر دەستی کرد بە لێدانی و عەلیش بۆی دەژمارد و کە گەیشتە چل ، ووتی بەسە ، پاشان وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چل داری

[1] البدایة والنهایة ( ۷/ ۱۵۲ )

حەدی داوە لە عەرەق خۆر و ئەبوبەکریش چل و عمر کردویەتی بە (٨٠) و هەمویشی سوننەتە و ئەمەشم پێ خۆشە .[1]

وعەلی (رضي الله عنه)لەو بارەیەوە دەڵێت: ئێوە لەسەر وەلید تانە لە عوسمان دەدەن وەك ئـەو وایـە بڵـێین دوستێك هاوکار و دۆستەکەی خۆی بکوژێت و تاوانی عوسمان چیە لەسەر کاری ناشـەرعی خـۆی لێیداوە پاشانیش لەسەر کار لای برد.[2]

٢ ـ ڕاوێژکاری عوسمان بە عەلی لە ڕزگارکردنی ئەفریقیەدا :

لە ( رياض النفوس ) داهاتووە کە عوسمانی کوڕی عەفان (رضي الله عنه)لە والی میسر " عبدالله ی کوڕی سەعد " ەوە نامەی بۆ هات تیایدا نوسیبوی کە موسڵمانەکان جار بەجار دەچنە ناوچەی دوژمنان لە کەناری ئەفریقیە و هەندێ زیانیان پێ دەگەیەنن و دەگەڕێنەوە چونکە زۆر نزیکن لـە سـنوری موسڵمانانەوەو و عوسمانیش (رضي الله عنه) پاش ئەوە ( میسوەری کوڕی مەخزەمە ) ی بانگ کرد و پێی ووت : حەزدەکەم سوپا بەرێ بخەم بۆ ڕزگار کردنی ئەفریقیە، و پێی ووت : تۆ لەم بارەیـەوە چـی دەڵێیت: ووتی غەزویان بکـــە .

پاشان ووتی: هەروەها ئەمڕۆ گەورە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆدەکەمەوە و لەو بارەیەوە پرس و ڕایان پێدەکەم و ئەوان چیان پێ باش بێت وا دەکەم یـان زۆریـەیان چـی پـێ بـاش بێـت وادەکەم، عەلی و طلحە و زوبێر و عەباس ی بانگ کـردو یـەك یـەك دانیـشتنی پـێ کـردن لـە مزگەوتدا و پاشان ( ابا الأعـور)، سەعیدی کوڕی زەیدی بانگ کرد و ووتی: بۆ حەز ناکەیت ئەی (ابا الأعور) سوپای ئیسلام بەرەو ڕزگار کردنی ئەفریقیە بەرێ بخەین ؟ ئەویش ووتی : لە ( عمر ) م بیستووە کە دەیووت: یەك موسڵمان ناخەمە ڕێ بۆ جەنگی ئەفریقیە تا ئاوی تەڕ لە چاوەکانمدا بێت ، ومنیش نامەوێت تۆ سەرپێچی عمر بکەیت .

عوسمانیش پێی ووت : وەڵلاهی من لێیان ناترسم ئەوان خوا خوایانە کەس غەزویان نەکات و لـە جێی خۆیان بمێننەوە و ئیتر هیچ کەس لاری نەبوو لەو مەسەلەیدا و ئەویش چووە سەر مینبـەر و وتارێکی دا بۆ موسڵمانان و هانی دان بۆ جیهاد و ڕزگـارکردنی وڵاتـی ئەفریقیـە و هەنـدێ لـە

---

[1] شرح النووي على صحيح المسلم كتاب الحدود (١١/ ٢١٦)

[2] تاريخ الطبري( ٥ / ٢٧٨)

هاوەڵانیش بەشداری ئەو سوپایەیان کرد وەك " عبـدالله ی کـوڕی زوبـێر و ئـەبو زەڕی غـەفاری (ﷺ)" .[1]

٣ ـ ڕای عـەلی (ﷺ) سەبارەت بە یەك شێواز خوێندنەوەی قورئان :

عوسمان (ﷺ)موجاهدین و ئەنصاری کۆکردەوە و سەبارەت بە کۆکردنەوەی موسڵمانان لەسەر یەك جۆر قورئان خوێندن پرس و ڕای پێکردن و لەناو گەورە هاوەڵانـدا عـەلی کـوڕی ئـەبو طـالبیش ئامادەبوو،و عوسمان ئەم کارە گەورە و ترسناکەی خستە بەردەستی پوختەی ئوممەت و فەرماندە و سەرکردە هیدایەتخوازەکان ، و مەسەلەکەیان پێکەوە تاوتوێ کرد و گفتوگۆی تەواوی لەسـەرکرا، تا ئەوان ڕای عوسمانیان زانی و عوسمانیش ڕاو بۆچوونی ئەوانی بۆ دەرکەوت، و ئیتر هەموو ناوچە فراوانەکانی تری ئیسلام ئەم کۆ دەنگی یەیان پێ گەیشت و یەك کەس ملە جڕێی تێدا نەکرد.[2]

عوسـمـان (ﷺ) لـە خۆیـەوە و وەك بیدعەیـەك ئـەم کـارەی نـەکرد بـەڵکو پێـشتر (ابـو بکـر الصدیق)(ﷺ)کردویەتی و عوسمانیش بە پـرس و ڕاو ڕەزامەنـدی هـەموو هاوەڵـە بـەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم کارەی کرد و زۆر جوان بوو لەلایان و پێیان ووت : ئەم بۆ چونەت زۆر جوانە ـ نعم ما رأیت ـ .

( مصعب ی کـوڕی سـەعد) کـە هـاوەڵێکی پێغەمبـەری خـوا بـوو (ﷺ) بینـی کـە عـوسمـان قورئانەکانی تر دەسوتێنێت و هەموو موسڵمانان ئەو کارەیان پێ جوان بـوو،[3] و عـەلیش (ﷺ) هەموو جارێ دەیوت : دەربارەی عوسمان ڕۆمەچن و زۆر باسی مەکەن بە چاکە نەبێت، وەڵلاهـی ئەوەی ئەو کردی لەـ سـوتاندنی قورئانـەکان ـ لـە خۆیـەوە نـەیکرد و بـەڵکو بـە پـرس و ڕای هەمووومان کردی ، وەڵلاهی منیش بەرپرسیارێتی ـ خیلافەت ـ وەربگرم ئەوەی ئەوکردی منیش دەیکەم.[4]

---

[1] ریاض النفوس ( ١ / ٨،٩)

[2] عثمان بن عفان ـ صادق عرجون لا ٧٧٥.

[3] التاریخ الصغیر للبخاری ( ١/ ٩٤)اسنادە حسن لغیره .

[4] فتح الباری ( ٩/ ١٨) إسنادە صحیح .

چوارەم ـ هەڵوێستی عەلی (ﷺ) لە کاتی شەهید کردنی عوسماندا :

کۆمەڵێ هۆکاری جۆراو جۆر و تێکەڵ بەیەك، بوونە هۆی ئاژاوەی شەهید کردنی عوسمان (ﷺ) یەکێ لەوانە هۆکاری خۆش گوزەرانی کۆمەڵگەی ئیسلامی، و سروشتی گۆڕانکاریانە کۆمەڵایەتیەکان ، و هاتنی عوسمان (ﷺ) بە دوای عەمردا ،و زۆری لە گەورە هاوەڵان شاری مەدینەیان چۆڵ کرد، و ڕەگەز پەرستی سەردەمی نەفامی بەدی دەکرایەوە، و پیلانی ناحەز و کینە بازان ، هەنگاونانی وردی دوژمنان بۆ دۆزینەوەی بیانوو لە دژی عوسمان ،و هەستی خەڵکی جۆلاندن، و کۆمەڵێ هۆکاری تر کە بە درێژایی لە ژیانی عوسماندا هێناومە.

دوژمنانی ئیسلام لێزانانە هەستی موسڵمانانیان دەجولاند بەرەو بەرەنگاربونەوەی کارەکانی عوسمان ، کۆمەڵی پروپاگەندە دروست کراو بلاوکرایەوە لە ناو موسڵماناندا لە هەموو لاوە دەمەقالی دەکراوهانی خەلکیان دەدا لەدژی عوسمان و خیلافەت و موجادەلە کردن لەگەڵیدا بۆ شکاندنی لەبەردەم جەماوەرداو تەشەریان لەو والیانە دەدا کە ئەو دایمەزراندبوون و کۆمەڵێ تەزویر و ساختە کاری و ووتەی هەڵبەستراو بەناوی هاوەلانەوە (ﷺ)وەك عائشە و عەلی و زوبێر و طلحە

و ئەوەیان لەناو خەلکیدا بلاودەکردەوە کە عەلی شایانترە ببێتە خەلیفەی موسڵمانان و جێ وەسیەتی پێغەمبەری خوا بوو بۆ دوای خۆی و دامەزراندنی کۆر و کۆمەڵ بۆ برەو دان بەو درۆ و دەلەسە و ئاژاوانە لە شارە گەورەکانی ئیسلام وەك بەسرە و کوفە و میسر کە ئەوە دەگەیەنی پێشتر نەخشەی بۆ کێشرابێت.

خەلکی شارەکانیان بەوە دەخەڵەتاند کە لەسەر بانگەشەی هاوەلان ئەم کارەدەکەن و کارەکەیان ئەوەندە زل کرد تا پەنا بە خوا گەیاندیانە حەدی " خوێن ڕشتن"! .[1]

و ئەو خوێنرێژانە بۆ ئەوەی خەلکی بە پیاو چاك و دڵسۆزی ئیسلامیان بزانن بە ( الله اکبر) ەوە دەچوون بۆ شارەکان و ئەیان ووت دژ بە زوڵم و ستەمکاری دەوەستین و فەرمان بەچاکە و بەرگری لە خراپە دەکەین، و داوای گۆڕینی هەندێ والی و کار بەدەستیان دەرکرد، بەلام وردە وردە

[1] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة لا ٤٠١.

شتەکەیان گەورە کرد و نیازی پیسیان دەرخست کە لابردنی عوسمانە و هەر بەوەشەوە نەوەستان دەستی ڕەشیان بە خوێنی ئەو هاوەڵە دڵسۆز و گیان لەسەردەستەی پێغەمبەری ئیسلام سور کرد.

هەر کەزانیان لە شارەکانەوە سوپا بەڕێ کەوتووە بۆ پارێزگاری لە حورمەتی خەلیفە و پایتەختی خیلافەت، خێرا ئەو نیازە گلاوەی کە پێشتر بەتەما بوون ڕۆژی خۆی جێ بەجێی بکەن خەریك بوو لە دەستیان دەرچێت و بۆیان نەکرێت، بۆیە بە هەلیان زانی کە دەوری خەلیفە عوسمان (ﷺ) چۆڵە و عوسمانیش حەز بە خوێن ڕێژی ناکات بۆیە زۆریان بۆ هێناو شەهیدیان کرد.[1]

و ئەم کارە ڕێکخراوەش بە سەرکردایەتی " عبدالله ی کوڕی سەبەء " ی جولەکە بەڕێوە چوو، وە ئەم کوشتنەشی هەموو جیهانی ئیسلامی هەژاند و کاریگەری یەکی وای بە جێهێشت ئەمڕۆش موسڵمانان پێوەی دەناڵێنن.

١ ـ هەڵوێستی عەلی (ﷺ) لە سەرەتای ئاژاوەکەوە :

عەلی (ﷺ) وەك عادەتی خۆی گوێ ڕایەڵی و ئامۆژگاری و ڕاو بۆچونی پێویست و جوانی دەبەخشی بە خەلیفەی سێیەمی ئیسلام و ئەوەتا خۆی دەری دەبڕێت کە تا چەندی ئامادەی گوێڕایەڵی عوسمانەو پابەندە بە هەموو فەرمانێکیەوە با ئیتر زۆر قورس و ناڕەحەتیش بێت وەك دەڵێت (( لو سیّرنی عثمان الی صرار لسمعت واطعت )).[2]

واتە: ئەگەر عوسمان بڵێت بڕۆ بۆناو دەریایش دەڕۆم وگوێڕایەڵی دەکەم .

و کاتێ ئاژاوە گێڕان گەیشتنە (ذی المروة) پێش مانگ و نیوێك لە شەهید کردنی عوسمان (ﷺ)، عوسمان هەستا بە ناردنی عەلی (ﷺ)و پیاوێکی تر بۆ ناویان و عەلیش ڕۆشت بۆ لایان و پێی ووتن: ڕازین بە حوکمی قورئان و ڕازیش بکرێت لە هەموو ئەو شتانەی گلەییتان لێیان هەیە ، و ئەوانیش لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن.

پاشان لەسەر ( ٥) خاڵ ڕێك کەوتن:

---

[1] مصنف ابن ابی شیبە (١٥/٢٢٥) سندە صحیح

[2] تاریخ خلیفة لا ١٦٩.

أ: دورخراوەکان بگەڕێنەوە.

ب: بێ بەشەکان مافیان بدرێتەوە.

ج: ماڵی ـ فە یء ـ بلاّوبکرێتەوە و دادپەروەری بکرێت لە دابەش کردندا.

د: (ابن عامر) بکرێتەوە بە والی بەسرە .

هـ : ئەبو موسی یش بهێنێتەوە بەسەر کوفەوە.[1]

و پاشان عوسمان یەك یەك لەگەڵ وەفدەکاندا دانیشت و ڕێکەوتنی لەگەڵدا کردن و هەموویان بە خۆشی یەوە گەڕانەوە بەرەو شارو ناوچەکانی خۆیان.[2]

پیلان گێرانی پشتی پەردە عبداللە ی کوڕی سەبەئی جولەکەو هاوکارانی زانیان وا خەریکە نەخشەکەیان پوچەڵ دەبێتەوە و مەسەلەکە بە هێمنی و لەیەك گەیشتن کۆتایی پێ هات، بۆیە ئەم جارە زۆر ئیبلیسانەتر هەنگاویان ناو ویستیان ئەو ئاشتەوایی یەی نێوان شارەکان و عوسمان تێك بدەن.

کاروانی میسریەکان بەرەو وڵاتی خۆیان کەوتنەوەڕێ بەڵام لە ڕێگە سوارێك هەر نزیك دەبویەوە لێیان و دوبارە دوور دەکەوتەوە وەك بڵێی بمگرن ، و ئەوانیش گومانیان تێ برد و چوون بۆی تا بزانن ئەمە چیە؟ هەر کە لێیان نزیك کەوتەوە و گرتیان و پێیان ووت: چیە ئەمە؟

ئەویش ووتی: من ئەمیری باوەڕداران ناردومی بۆ میسر و نامەم پێیە لە عوسمانەوە بۆ والی میسر، وئەوانیش نامەکەیان لێسەند، دەبینن بەدەمی عوسمانەوە نوسراوە ئەگەر ئەمانە گەیشتنەوە میسر یەکسەر هەموویان بکە بەدارا و بیانکوژە یان یەکی دەست و قاچێکیان ببڕە!! ئەوانیش ئەمەیان خوێندەوە یەکسەر گەڕانەوە بۆ مەدینە.[3]

و عوسمانیش ووتی ئەمە بە هیچ جۆرێك نامەی من نیە و من نەم نوسیوە، و خاڵ لە دوو شت بەدەر نیە : یەکەمیان ئەوەی دوو پیاوی موسڵمان شایەتی بدەن یان سوێند بخۆن کە من نوسیومە، ومنیش شتی وام نەنوسیوە و بە کەسیشم نەوتووە کە بینوسێت، دووەم: یان ئەم نامەیە

---

[1] فتنة مقتل عثمان ( ١/ ١٢٩) .

[2] هەمان سەرچاوە ( ١/ ٣٢٩)

[3] تاريخ الطبري ( ٥/ ٣٧٩)

ساختەیەویە ناوی من و مۆری منەوە نوسراوە، بەلاّم ئەوان باوەڕیان پێنەکرد.[1] کە ئەو پیاوێکی پاك و ڕاستگۆ بوو، بەلاّم دیار بوو لەبەر شتێکی دەروونی نـاو مێـشکیان باوەڕیـان پـێ نـەکرد .نامەکەش ساختە بوو لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە :

* عێراقیەکان چۆن زانیان بە مەسەلەی ئـەم نامەیـە خـۆ ئـەوان بـەرەو عێـراق گەڕابوونـەوە و ماوەیەکی زۆر لە میسریەکان دوور کەوتبونەوە کەچی لەیەك کاتدا گەڕانەوە، وەك بلێـی لەسـەر مەوعید بوون !!!

کە ئەمەش ناچێتە عەقلـەوە، بـەلکو هـەر ئەوانـەی ئـەو پیلانـە خوێناویـەیان داڕشـت بـۆ میسریەکان هەر ئەوانیش سوارێکیان نارد تا بگاتە عێراقیەکان و مەسەلەی نامەکەی عوسمـان و میسریەکانیان تێ بگەیەنێت و ئەمەش ئەم وتەی عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ)دەیسەلمێنێت کە پێی ووتن: ئەی خەلکی کوفە و ئەی خەلکی بەسرە ئایا چۆن بەم مەسەلەیەی میسرتان زانی کـە ئێوە چەندان قۆناغتان بڕیبوو وا پێکەوە گەیشتنەوە لامان .[2] بـەلکو عـەلی (ﷺ) ڕاسـتەوخۆ دەلێت " ئەمە کارێکە سوێند بەخوا هەر لەناو شاردا بوون نەخشەی بۆ کێشراوە.

لەگەلّ ئەم نامەیەشدا بەلکو بەدەم دایکی ئیمانداران و هاوەلّەکانی تریشەوە نامەیان ناردبوو بـۆ شارەکان و لەوانە بەناوی عائشەوە (ﷺ) نامەیان نووسیبوو بۆ شارەکان کە دژی عوسمان هەسـتن ئەویش ووتی: شتی وانیە سوێند بەو کەسەی باوەڕداران باوەڕیان پێیەتی و کافرانیش بـێ بـاوەڕن پێی تا ئەم ساتەی لێرەدا دانیشتووم و ڕەشاییم نەخستۆتە سەر سپیایی ـ کاغەز ـ ،[3] و ئەو جا ووتیان بە عەلی (ﷺ)تۆ نامەت بۆ ناردووین کە بگەڕێینەوە بۆ مەدینە و ئەویش ووتی: وەللاّهی من شتی وام بۆ کەس نەنوسیوە، هەر بەو شیوەیەش بەدەم طلحە و زوبێـرو هـاوەلانی تریـشەوە نوسیبویان کە گوایە وەرن بۆ مەدینـە چـونکە جیهـاد لـە مەدینـە خێرتـرە لـە جیهـاد لەسـەر سنورەکانی دەولەتی ئیسلامی، بەلاّم بەرِیوایاتی ـ صحیح ـ دەرکەوت کە هیچیان ڕاست نـەبوون بەلکو بە ساختە نوسراوە، با هەندێ لە نوسەرەکانی ئەم سەردەمەش لە خوا بترسن و نەوێرن ئەو مێژووە بەو جۆرە نقل بکەن کە پیلان چیان دایان ڕشت بۆ شەهیدکردنی عوسمانی کـوڕی عـەفان

---

[1] فتنه مقتل عثمان ( ٥/ ١٣٢) البداية والنهاية ( ٧/ ١٩١)
[2] تاريخ الطبری ( ٥/ ٣٥٩)
[3] تحقيق مراقف الصحابة ( ١/ ٣٢٤)

(ﷺ) بەلكو با بە بابەتیانەوە بكۆڵنەوە لەمەسەلەكە ئەو جا قەڵەم بخلێنن بـە وەرەقـەدا چـونكە لەسەر هەموو ووشەیەك كە دەی نوسن لێپرسینەوەی قورس هەیە بۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا.[1]

۲ ـ هەڵوێستی عەلی (ﷺ) لەكاتی گەمارۆدا :

گەمارۆیان لەسەر عوسمان توندكرد تا ڕادەیەك گەیشتە ئەوەی بۆ نوێژەكانیش نەیانهێـشت بێتـە دەرەوە، بەڵام زۆر خۆگر و ئاسایی و بەئارام بوو لەسەر ئەم ( بلوی) یەی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) هەواڵی پێدابوو كەدێتە ڕێ ی، و لەگەڵ باوەڕی پتەویدا بە قەزاو قەدەر هەر خەریكی ئەوەبوو كە موسڵمانان بە هۆش خۆیان بێنەوە بۆیە وتاری بۆ دەدان بە دەنگی بەرز و لەماڵەكـەی خۆیـەوە و باسی گەورەیی و تاوانی خوێنڕشتنی موسڵمانانی بۆ دەكردن و جارێكی تـر باسـی كـارە چـاك و جوانەكانی پێشتری خۆی بۆ دەكردن و باسی (۱۰) كەسەكەی (عشرة المبشرة) ی بۆ دەركـردن تـا بۆیان دەربكەوێت كەسی ئاوا دڵسۆزی پێغەمبەرو ئایینی خوا بێـت چـۆن بـۆ تـەماحی دنیـایی قیامەت لەدەست خۆی دەدات ئایا كەسێك لە خزمەت پێغەمبەری خوا پەروەردە بوبێت شـایانە ئاوا هەلسوكەوتی لەگەڵ دا بكرێت ؟!.

تا وای لێهات تەواو دەستیان گرت بەسەر شاری مەدینەدا و هـەر ئـەوانیش نوێـژیان بـۆ خـەڵك دەكرد، و ئا لەو كاتەدا هەمو هاوەڵە ئازیزەكان ـ خوایان لێ ڕازی بێت ـ بۆیان دەركەوت كارەكە لە دەست دەرچووە و زۆر لەوە گەورەترە كە بیریان لێدەكردەوە.[2]

بۆیان دەركەوت كە ئەمانە نیازیان گلاوە و بەتەمای كوشتنی ئـەمیری باوەڕدارانـە بۆیـە پێیـان ووت: بەسەر و بەماڵ بەرگریت لێ دەكەین و ئەم هەرچی و پەرچیانە لە شاری مەدینە دەردەكەین، بەڵام عوسمان (ﷺ) ڕازی نەبوو لەسەر ئەو خوێنی موسڵمان بڕژێت.[3]

بەڵام گەورە هاوەڵان بەبێ پرس بە عوسمان ـ كوڕەكانیان نارد بۆ پارێزگاری لە جێنشینی سێیەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەوانە " حسن ی كوڕی عەلی و عبدالله ی كوڕی زوبێر" كە ڕیوایەتەكان باسیان لەوە كردووە كە لەڕۆژی شەهید كردنی عوسماندا حەسەن بریندار بووە، هەروەها " عبدالله ی كوڕی زوبێر و محمدی كوڕی حاطـب و مروان ی كـوڕی حەكـەم و حوسـەین ی كـوڕی عـەلی و

---

[1] هەمان سەرچاوە ( ۱/ ۳۳۵)

[2] عثمان بن عفان ـ الخليفة الشاكر الصابرلا ۲۲۸ـ ۲۲۹.

[3] فتنة مقتل عثمان ( ۱/ ۱٦۷)

عبدالله ی کوڕی عمر "، و عەلی (ﷺ) لە هەموان زیاتر بەرگری لــە عوسمــان کـردووە هــەروەك مەروانی کوڕی حەکەم کە لەو ڕۆژەدا نزیکترین کەس بوو لە عوسمان شایەتی ئەمەی بۆ دەدات.

( ابن عساکر) لە جابری کوڕی عبدالله (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە عەلی جوابی نارد بۆ عوسمان و پێی وت : (٥٠٠) چەکدارم لەگەڵدایە ، ڕێگەم بدە تا نەهێڵم بێن بۆت چونکە تۆ هـیچ شـتێکی وات نەکردووە کە شایەنی کوشتن بیت) عوسمانیش پێی ووت : خوا پاداشتی خێرت بداتەوە، بەڵام من حەز ناکەم لەسەر من خوێنی هیچ موسڵمانێك بڕێژرێت .[١]

ڕیوایەتیش زۆرن کەمانای ئەوە دەگەیەنن عەلی (ﷺ) لە پشتی عوسمان بوو بە تەواوی لە ڕۆژی ئاژاوەکەدا لەوانە کاتێ کەشۆڕشگێڕە سەرکەشەکان گەمارۆی تـەواویان خـستە سـەر عوسمـان و تەنانەت نەیان هێشت ئاویشیان بۆ بڕوات و خەریك بـوو لـە تێنوانـدا مـاڵ و منـداڵی عوسمـان دەمردن، عەلی (ﷺ)(٣) گۆزە ئاوی بۆ ناردن و تاگەیشتە دەستیان ( ٣) کەس لە پیاوانی بـەنی هاشم و بنی ئومەییە بریندار بوون.[٢]

دواتر هەرچی و پەرچیەکان گەمارۆکەیان توندتر کرد و پاشتر چوونە ژورەوە بۆ عوسمان و ئەویش قورئانەکەی بە دەستەوە بوو دەپاڕایەوە کە وازبێنن و بڕۆنە دەرەوە بەڵام ئـەو نەگبەتانـە خۆیـان دوچاری ئەو خوێنە گەورەیە کرد و شەهیدیان کرد و خوێنی ئاڵیان ڕشت بەسەر قورئانەکەیدا...

و هەواڵەکە گەیشتە هاوەڵان و تێك چوون و شپرزە بوون، تاوای لێهات عەلی (ﷺ) توڕە بوو یەك زللەی بەتوندی دا لە حەسەنی کوڕی و بەهاوڕێکانی تریشی ووت: ئەی ئێوە چـیتان دەکـرد لـەو کاتەدا ؟؟ و بۆ کزێکیشی دا بە سنگی حوسەیندا و قسەی زۆریشی بە طللحە و ابن زوبـێر ووت و بە توڕەیی یەوە ڕۆیشتەوە بۆ ماڵ و دەیووت: هەمیشە لەناوناچن ، خوایە من بێ تاوانی خۆمـت بۆ دەردەبڕم لەسەر کوشتنی یان هاوکاری کردن لە کوشتنیدا .[٣] بەڵام پیلانەکە زۆر لەوە گەورەتر بوو کە چەند هاوەڵێك کە عەلیش یەکێك بوو بتوانن بەرگری لە عوسمان بکەن و عوسمانیش خۆی ڕێگەی بە هیچ موسڵمانێك نەدا کە لەسەر ئەو هەڵ بدات و عوسمانیش بەپلەی بـەرزی شـەهیدی گەیشت (ﷺ).

---

[1] تاریخ دمشق لا ٤٠٣.

[2] انساب الاشراف ـ بلا ذری ( ٥/ ٦٧)

[3] مصنف ابن ابی شیبە( ١٥/ ٢٠٩) اسنادە صحیح

٣ـ ژن و ژنخوازی نێوان خانەوادەی عوسمان و خانەوادەی عەلی :

هەردوو بنەماڵەی ( بنی أمیه ) و ( بنی هاشم ) دۆستایەتی و خۆشەویستی و تێکەڵی و برایەتی وایان لەناودابوو، بە جۆرێ کە ئەو مێژوونوس و قەڵەم بەدەستانەی کە ویستویانە دوژمنایەتی و ناحەزی لە نێوان ئەو دوو بنەماڵەیەدا دروست بکەن شکستیان هێناوە چونکە هەردوولا لەیەك باوکن و هاوڕێیەتی ئەبو سوفیان و عباس بە نمونە هێنرایەوە.[1]

ئەوەش پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر سێ کچە نازدارەکەی داوە بە چوار پیاو لەبنەماڵەی ( بنی امیه) کە ( ابی العاص بن الربیع و عثمان بن عفان ) کەکوڕی کچی پوری پێغەمبەریش بووە و هەروەها ئەبانی کوڕی عثمان ام کلپوم ی کچی عبداللە ی کوڕی جەعفەر ( الطیار) و کچی حوسەین (رضي الله عنه)سەکینە خێزانی زەیدی کوڕی عەمرِی کوڕی عوسمان بووە.

٤ ـ ئەمە عوسمانی کوڕی عەلیە :

ئەبی سەعید (الخُدری) دەڵێت : سەیری منداڵێکم کرد کە تازە پێ دەگەیشت و قژو پەلکەکانی بەسەر شانیدا هاتبونە خوارەوە ـ خوا دەیزانێت ـ گومانم هەبوو کوڕە یان کچ ، و دامان بەلایدا گەیشتم بە منداڵێکی تر زۆر لەو جوانتر بوو کە بەتەنیشتی عەلی کوڕی ئەبی طالبەوە دانیشتبوو،پێم ووت: خوا عەفوت کات ئەم کوڕە گەنجە کێ یە وا لەلاتدا دانیشتووە؟ عەلی ووتی: ئەمە عوسمانی کوڕمە ولە خۆشەویستی عوسمانی کوڕی عەفان ناوم ناوە و یەکێکیشم بەناوی عمری کوڕی خطابە وە ناوناوە و یەکێکیش بەناوی عباس وە مامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکێکیشم بەناوی سەرداری بونەوەران " محمد " ەوە ناوناوە .[2]

٥ ـ کافرکردنی هاوەڵان سەر بۆچی دەکێشێ ؟

ڕاو بۆ چونی ئیمامی یەکان کە ـ پەنا بەخوا ـ هاوەڵانی پێغەمبەرمان (ﷺ) بەبێ باوەڕلە قەڵەم دەدەن و ئەمەش مانای وایە کە عەلی کوڕی ئەبو طالبیش (رضي الله عنه) پەنا بەخوا ـ بە کافر بزانن

[1] الشیعة و اهل البیت لا ١٤١.

[2] مسندا احمد ( ٢ / ١١٥) ژمارە ٧٦٩ إسناده صحیح.

چونکە هەڵنەستا بە جێ بەجێکردنی فەرمانی خوا، بەتاڵ کردنەوەی یاسا و شەریعەتی ئیسلام بەوەی کە کۆمەڵی پاشگەز بوو بۆیان نەقل کردوین و دواتریش ڕەدکردنەوەی قورئان ی پیرۆز چونکە لە ڕیگەی ئەبو بەکرو عمر و عوسمان و باقی هاوەڵانەوە پێمان گەیشتووە، و مەبەستە سەرەکیەکەیان لەم ووتەیە هەر ئەو ئامانجەیە.

بۆیە ( ابو زرعە) دەڵێت : ئەگەر کەسێك بینی لە پلەو پایەی هاوەڵانی کەم دەکرێتەوە ئەوە ( زندیق ) ، واتە ـ بێ باوەڕە ـ چونکە قورئان ڕاستە و فەرموودەیش ڕاستە و ناتوانن توانجی تێبگرن بەڵام ئەم دوو ڕاستی یەمان لە ڕێگەی هاوەڵانی پێغەمبەرەوە پێمان گەیشتووە و ئەوان دەیانەوێت تانە و توانج لە شایەتەکانمان بدەن کە گەیەنەری قورئان و سوننەت بوون، ئەو تانە و توانج و بەتاڵ کردنەوەیەش چاکتر قورئان و سونە دەگرێتەوە بۆیە ئەوانە ـ زەنا دیقەن.[1]

بۆیە کتێبەکانی شیعەدان بەوەدا دەنێن کە ئەو ووتەی کە دەڵێت : عبداللە ی کوڕی سەبەئی یەهودی یەکەمین کەس بوو کە ئەو وتەیەی دروست کرد کە دەڵێت ( یەکەمین کەس بوو ـ عبداللە ـ کە تانە و توانجی گرتە ئەبوبەکرو عمر و عوسمان و هاوەڵان و خۆی بەری کردووە لێیان، وای بلاوکردەوە کە عەلی فەرمانی پێداوە کە هەستێ بەو کارە.[2]

## ٦ـ بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا لەسەر خۆشەویستی نێوان عەلی و جێ نشینە ڕاشیدەکان :

بەڵگەی روون و ئاشکرا و واقیعی هەیە لەسەر ئەوەی کە عەلی (ﷺ) پەیوەندی خۆشەویستی و دۆستانە و برایەتی تەواوی هەبووە لەگەڵ براکانیدا لە خەلیفەکانی پێش خۆی و باقی هاوەڵانی تر. وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد کەسێ کەسێکی زۆر خۆش نەوێت و بە ڕاستی نەزانێت هەرگیز کچی خۆی پێنادات، کە عەلی (ﷺ)(ام کلثوم ) ی کچی خۆی مارەکرد لە عمر (ﷺ)و ئەگەر لەلای هەندێ لە شیعەکان، پێیان وابێت کە عمر (ﷺ) لە ئیبلیس بێ باوەڕتر بوو ـ پەنا بەخوا ... دەی بۆ ناگەرێنەوە بۆلای عەقڵ و ژیری و سەرەنجامی ئەو تۆمەت بارکردنە ترسناکە زۆر خەتەرە، چونکە ئەگەر عمر بەو جۆرە کافر بوبێت ئەوە عەلیش (ﷺ) و پەنا بە خوا کافر بووە، یان

---

[1] الکفایة لا ٤٩.

[2] المقالات والفرق للقمي لا ( ٢٠)و لة ( اصول مذهب الشیعة ) (٢/ ٩٣٣) وەرگیراوە.

تاوانبار بووه بەوەی کە کچێکی خۆی مارەکردووە لە عمر ! و کچەکەی خۆی توشی زیناو بێ شەرعی کرد چونکە بەگوتەی ئەوان داویەتی بەبێ باوەڕ - پەنا بەخوا - .[1]

و هیچ شیعەیەکیش لەسەر بۆچونی خۆی نامێنێ و دەگەڕێتەوە ئەگەر ئاوا ڕاستیەك ببیستێت ، ئەوەتا کاتێ ئەم ڕاستیە باسکرا بۆ - معز الدولە - احمدی کوڕی بابویە کە شیعەیەکی توند ڕەوبووەو بەردەوام جنێو و قسەی سوکی بە هاوەڵانی پێغەمبەر وتووە، و پێیان ووت: کە عەلی (ﷺ) خەزوری عمر بووە و ( ام کلثوم ) ی کچی پێداوە و ترساوە ووازی لە دەم کوتان بۆ هاوەڵان هێناو ووتی: من بەم ڕاستیەم نەزانیوە و تەوبەی کرد و خێرو خێراتی زۆری دەکرد و بەندەکانی خۆی ئازاد دەکرد و گەردەنی خۆی بە خەڵکی ستەم لێکراو ئازاد دەکرد و بەجۆری دەستی کردە گریان لە هۆش خۆی چوو.[2]

بەڵام هەندێ لە شارەزاکانی ناو شیعە ویستیان کاریگەری ئەم بەڵگەیە هەڵوەشێننەوە بۆیە ئەو وتەیان بەناوی ئیمامەکانیانەوە دروست کرد کە دەیانوت : ئەوە داوێنێك بوو لێمان زەوت کرا!!کە ئەمەیان خراپترە چونکە عەلی (ﷺ) ئەوەندە - سوك نەبوو - تا ئەو زەلیلی و سەرشۆڕیە قبوڵ بکات " پەنا بەخوا " چونکە خوارترین کەسی عەرەبی لە پێناوی ناموسیدا خۆی دادەنێت چجای پیاوێکی هاشمی کە لەساداتی عەرەبە.[3]

و هەندێکی تریان ئەم بۆچونەی بەدڵ نەبوو، و ویستویەتی لەم بەڵگەیە خۆی ڕزگار بکات بە شتێکی زۆر غەریب و سەر سامکەر تر ودەڵێت : ام کلثوم کچی عەلی نەبووە بەڵکو جنۆکەیەکی ئافرەت بووە و لەشێوەی ئەو کچەدا بووە! و هەندێ کەسیش بەو شتە خورافاتە پڕو پوچە خەڵەتێنرا.[4]

---

[1] اصول مذهب الشيعة ( ٢ / ٩٣٢)

[2] المنتظم ( ٧/ ٣٨ـ ٣٩).

[3] مؤتمر النجف للسويدي لا ٨٦.

[4] الأنوار النعمانية ( ١/ ٨٣-٨٤) نقلاً عن اصول مذهب الشيعة ( ٢ / ٩٣٨).

پێنجەم / وەسفی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) لە قورئاندا :

خوای گەورە دەفەرموێت (( مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَاناً سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً )).سورة فتح " ٢٩ " .

جێگای خۆیەتی و زۆر گونجاوە ئەم بەشەی ئەم کتێبە بەم ئایەتە پیرۆزە کۆتایی پێ بێنم چونکە تیایدا پاش باسی بەرزی پلەی پێغەمبەر (ﷺ) دێتە سەر باسی هاوڕێ و هاودەمەکانی کە خەلیفە ڕاشیدەکان و سەرجەم هاوەڵە بەڕێزەکانی یەتی ـ خوایان لێ ڕازی بێت ـ و بەگشتی و بەبێ جیاکردنەوە دروست کردنی چینایەتی وەسفی چاکەی هەمویان دەکات و پێیان دەفەرموێت " لەناو یەکدا دڵنەرم و بە سۆزن بۆ یەکتری و بەرامبەر بێ باوەڕانیش توندوتیژن و ئاساری سوجدەو نوێژی زۆر بە تەوێڵیانەوە دیارە ئەو ئاسەوارەش وەك ـ مجاهد ـ دەفەرموێت (( ئاسەواری خواناسی لە دنیا ئەوەیە ناوی بە چاکە بڵاو دەبێتەوە.

لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت (( وألّف بين قلوبهم لو انفقت ما في الأرض جميعاً ما الفت بين قلوبهم و لكن الله الف بينهم إنه عزيز حكيم )) واتە: ئەو سۆز و برایەتی و خۆشەویستی یەی خوای گەورە لەناو هاوەڵاندا دروستی کردوە بەهۆی ئەم ئیسلامە عەزیزەوە و کەئەگەر عەرەبەکان یان هەموو مرۆڤەکان هەمو خێراتی سەر زەوی بخەنە کار بۆ ئەوەی ئەو ئولفەت و خۆشەویستی و پێکەوە ژیانە ناهێننە کایەوە کە خوای گەورە لەناو هاوەڵاندا هێنایە کایەوە.

ئەم ئایەتە پاڵ پشتی ئەو ڕیوایەتە صەحیحانەن کە ئەوە دەگەیەنن هاوەڵان زۆر یەکتریان خۆشویستووە و هەرگیز رقیان لە یەکتر نەبووە و پشتیان لە یەکتر نەکردووە و لە پشتی پەردەوە نەخشەیان دژی یەکتر دانەرشتووە، دژایەتی یەکتریان بە هیچ شێوەیەك نەکردووە و مافی یەکتریان زەوت نەکردووە و لەڕێزی کەس و کاری پێغەمبەریان کەم نەکردۆتەوە بەڵکو ئەوان جێگای تایبەتیان هەبووە لەناو دڵی باقی هاوەڵاندا هەر کەسێکیش بو بێت بە گەورەیان تووشی خۆشگوزەرانی نەبووە بەڵکو ژیانی گۆڕاوە بۆ چەرمە سەری و بەرپرسیارێتی گەورە.

## بەشی سێ یەم

## بەیعەت دان بە عەلی (ﷺ)و ڕەوشت و ژیانی ناو کۆمەڵگەی

### جۆ باسی یەکەم

### بەیعەت دان بە عەلی (ﷺ)

### یەکەم / چۆن بەیعەتی پێدرا ؟.

لەڕیگەی هەڵبژاردنەوە بەیعەت درا بە عەلی (ﷺ) ڕاستەوخۆ پاش شەهید کردنی جێنشینی سێیەم عوسمانی کوڕی عەفان (ﷺ) لەسەر دەستی کۆمەڵی نامۆی لە یاسا دەرچووی کەلە ناوچەکانەوە هاتبوون و لە کۆمەڵی هۆزەوە هاتبون کە پێشینەیەکی ناسراویان نەبوو و ناوێکی خێریان لە فەرهەنگی ئیسلامدا نەبینراوە، و پاش ئەوە بە شێوازێکی دوژمنکارانە و ستەمکارانە و بەبێ تاوان هەستان بە وکارە ترسناکەو قێزەونە لە ڕۆژی هەینی ( ١٨)ی (ذی الحجة) ی ساڵی ( ٣٥) ی کۆچی .[١]

و ئەو هاوەڵانەی کەمابونەوە لەشاری مەدینە کۆبوونەوە و خێرا بەیعەتی خیلافەتیان دا بە عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ)، چونکە یەکەم لەو باشتر نەمابوو لەو سەردەمەدا و دووەم خۆیشی حەزی لێ نەدەکرد و داوای نەدەکرد و هەوڵی بۆ نەداوە ، هەر هۆی ئەوەش بوو کەوەری نەدەگرد مەگەر پاش زۆر لێکردن و کۆڵنەدان لە پیدانی لەلایەن هاوەڵانەوە.

ئەو پیاوە مەزنە زۆر لەوە ترساوە کە ناحەزان قسەیەکی بۆ دروست بکەن و بڵێن دەستی هەیە لە کوشتنی عوسماندا ئەگینا بۆ ئەوەندە زوو خۆی کرد بە خەلیفە لە پاش عوسمان ؟! بەڵام ئەم زۆر دوور بوو لەو تاوانە نەگریسە و ئەبو بەکری خلال لە محمدی کوڕی حەنەفی یەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت : من لەگەڵ عەلیدا بووم (ﷺ) کاتێ عوسمان گەمارۆ درابوو، پیاوێک هات و ووتی: ئەمیری باوەڕداران وەختە بکوژرێت لەم کاتەدا ، و عەلیش (ﷺ) خێرا هەستاو منیش

---

[١] الطبقات لابن سعد ( ٣/ ٣١)

پشتوێنەکەم گرت و نەم هێشت بڕوات ـ ئەترسام شتێکی بەسەر بیهێنن ـ و ئەویش لای کردەوەو ووتی : بەرم دە بێ دایك " لا ام لك ".[1]

خۆی گەیاندە ماڵی عوسمان بەلاَم کار لەکار ترازابوو، عوسمان (ﷺ) شەهید کرابوو، و ئەویش لە داخاندا ڕۆیشتەوە بۆ ماڵ و دەرگای حەوشەی لەسەر خۆی داخست ، و خەڵکیش دەستە دەستە دەهاتن و لەدەرگایان دەدا و دەیان ووت: عوسمان شەهید کراو پێویستە خەڵکی ئەمیرێکیان هەبێت و کەسیش لە تۆ زیاتر شك نابەین شیاو بێت بۆ ئەو کارە ، و عەلیش (ﷺ) لەو دیوی دەرگاکەوە هاواری دەرکرد: منتان نەوێت چونکە من بۆ پاڵپشتی و وەزیری حاکم نەك بۆ ئەمیری و خیلافەت ! ، و خەڵکەکەش هاواریان دەرکرد: وەڵلاهی کەس بە شایانی نازانین جگە لەتۆ ، و ئەویش ووتی: ئەگەر هەر واز ناهێنن ئەوا دەبێت بەیعەت پێدانم بە ئاشکرا بێت و من دێم بۆ مزگەوت، و خەڵکیش لەوێ بەیعەتی خۆیان پێدا .[2]

و عەباس (ﷺ) دەڵێت: لە ترسی کرداری ئاژاوە گێڕان و تێکدانی بارەکە ترسام لە عەلی و پێم ووت : مەیە بۆ مزگەوت پێویست ناکات بەلاَم ئەو قبوڵی نەکرد و ئێمەش ڕازی بوین و هات بۆ مزگەوت و ئەنصار و موجاهدین بەیعەتیان پێدا.

هەندێ پەند و وانە لەم بەسەر هاتەوە:

١ ـ پشگیری کردن لە عوسمانی کوڕی عەفان ـ لە ڕۆژی ئاژاوە گێڕاندا ـ و لە هەموان زیاتر بەرگری لێکردوە و تەنانەت دواتر مەڕوانی کوڕی حەکەم ئەو شایەتیەی داوە ووتی : کەسێ لەناو موسڵمانانذا نەبوو لەو ڕۆژەدا کە زیاتر لە هاوڕێ کەی ئێمە ـ واتە عەلی ـ پاڵپشت و یارمەتی دەری هاوڕێکەتان بوبێت واتە عوسمان .[3]

٢ ـ زوهد و دنیانەویستی و خۆ بەدەرگرتنی عەلی (ﷺ) لە کورسی و پلە و پایە وحەز لێنەکردنی خیلافەت بەوەی کە ڕۆیشتە ماڵەکەی خۆی و دەرگای لەسەر خۆی داخست.

---

[1] ئەوە لەو کاتەدا وەك ووشەی ( هەتیو ) لای خۆمان وایە .
[2] كتاب السنة، ابی بكر الخلال لا ( ٤٥١)
[3] عهد الخلفاء الراشيدين لا ٤٠٦.

٣ ـ هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کە لەو کاتەدا بە ئەهلی شورا یان بە ئەهلی حەل و عەقد ناسرابوون ڕۆشتن و بەزۆر عەلیان ڕازی کرد کە ببێتە خەلیفە ، نەك وەك هەندێ ڕیوایەتی لاواز یان هەڵبەستراو دەڵێت گوایە ئاژاوە گێڕان چوون بۆ لای عەلی و کردویانە بە خەلیفە .

٤ ـ عەلی شایانترین کەس بوو بۆ جێنشینی چوارەم و ڕاشکاوانە هەموو ئەوەیان بەدەم دەربڕی .

٥ ـ گرنگی بوونی خەلیفە بۆ موسڵمانان و نەهێشتنەوەیان بەبێ سەرگەورە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت بۆیە هاوەڵان (ﷺ) ڕاستەوخۆ پاش شەهید کردنی عوسمان خۆیان گەیاندە عەلی و ئەویش ووتی: ئەگەر لەوە نەترسامایە ئایینی خوا دەکەوێتە مەترسیەوە قبوڵم نەدەکرد.[1]

٦ ـ ئەو گومانانەی دروست کراوە بۆ هەڵبژاردنی عەلی (ﷺ)کە گوایە ئەو ئاژاوە گێڕانەی ـ خوارج کە عوسمانیان شەهید کرد هەستاون بە دانانی عەلی بە خەلیفەو گلحە و زوبێر بەزۆر بەیعەتیان پێدرا بۆ عەلی ، ئەم وشانە قسەی مێژونوسەکانە هیچ بنەماو سەنەدێکی صحیحیان نیە .

بەڵکو هەندێ لەوەدا لێی تێك چووە کە هەڵبژاردنی عەلی لەلایەن هاوەڵانەوە و نەڕۆشتنی هاوەڵان لەگەڵیدا بۆ بەسرە تێکەڵ دەکەن ، بەڵام هەرگیز تێکەڵ نابن و یەکەم کەس بۆی نەبوو لێی دوابکەوێت،و واجب بوو لەسەریان ، بەڵام دەرچوون لەگەڵ عەلی بۆ بەسرە و بۆ ڕووبەڕووبونەوەی خوێناوی لەگەڵ موسڵمانە نەیارەکاندا مەسەلەیەکی ـ ئیجتهادی ـ بووە و پێیان باش نەبووە بەشداری بکەن لەگەڵیدا .[2]

٧ ـ دەبێت خوێنەری موسڵمان زۆر وریا بێت و ئاگای لەو ڕیوایەتانە بێت کە مێژونووسەکان لە خۆیانەوە یان لە سەرچاوەی لاوازەوە وەریان گرتووە کە گوایە مەدینە بۆ ماوەی ( ٥) ڕۆژ بێ ئەمیر مایەوە و غافەقی لەو ماوەیەدا ئەمیر بووە و کەس نەهاتووە بە دەمیانەوە و کەس ئەو کارەی وەرنەگرتووە .[3]

---

[1] فتح الباري ( ١٣/ ٧٥) اسناده صحيح .

[2] المدينة النبوية ـ محمد سراب ( ٢/ ٣١١).

[3] تاريخ الطبري ( ٤/ ٤٣٢).

٨ ـ ئەو ڕیوایەتە صحیحانەی کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی هاوەڵان بەیعەتیان داوە بە عەلی لەو ڕۆژەدا ( ١١) ڕیوایەتن و لەمەو لایش باسیان دەکەین.[1]

دووەم / عەلی (ﷺ) شایانی خیلافەت بووە :

لەدوای شەهیدکردنی خەلیفە ڕاشیدەکەوە ئیتر عەلی (ﷺ) شایانترین کەس بووە لەناو هاوەڵاندا کە ببێتە جێ نشینی چوارەمی پێغەمبەری خو (ﷺ) .

* فەرمودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێت (( خلافة النبوة ثلاثون سنة ثم يؤتى الله الملك من يشاء )).[2]

و خیلافەتی عەلیش (ﷺ) لە دواین ساڵەکانی سی ساڵە کەبوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی داوە و فەرمویەتی خەلیفایەتی پێغەمبەرانە ـ سی ساڵە ـ و پاشان خوا موڵکی خۆی دەبەخشێ بە هەر کەس خۆی مەبەستێتی.

( عبدالله ی کوڕی احمد ) دەڵێت : بە باوکم ووت هەندێ کەس عەلی بە خەلیفەی پێغەمبەری خوا نازانن! ئەویش ووتی : قسەیەکی قەڵب و هیچە، چونکە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێیان ووتوە ـ ئەمیری باوەڕداران ـ ئایا ئێمە ئەتوانین بەدرۆیان بخەینەوە و ئێ پاشان حەجی کردووە بە موسڵمانان و دەستی دزی بڕیوە و داوێنپیسانی بەرد باران کردووە و ئەمەش خەلیفە نەبێت کێ دەیکات.[3]

* احمد دەڵێت : هەر کەسێ دان نەنێت بە خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبو طالب دا (ﷺ) ئەوە لە گوێدرێژەکەی ماڵەوەی خۆیان گومڕاترە و نابێ ژنی پێ بدرێ و ژنی لێ بخوازێت .

* عەکریمە (ﷺ)بە عەلی کوڕی و عبدالله ی کوڕی عەباسی ووت : بڕۆن بۆ لای ئەبی سەعیدی خودری و فەرمودەی لێ ببیستن ، و ئێمەش چووین بۆ لای دەبینین خەریکی دیوارێکە ڕاستی دەکاتەوە ، و عەباکەی خۆی کۆکردەوەو هاتە پێشوازیمان و فەرمودەی زۆری بۆ گێڕاینەوە تا هاتە سەرباسی دروستکردنی مزگەوت و ووتی: ئێمە یەك یەك خشتمان هەڵدەگرت بەڵام عەمار (ﷺ)دوو دوو هەڵی دەگرت، کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ی بینی دەهات بۆ لای و تۆزی لێ

---

[1] بيعة علي بن ابي طالب لا ١٢٢.

[2] صحيح ابن حبان ژ ٦٦٥٧، سلسلة الاحاديث الصحيحة للالباني ( ١/ ٧٤٢ـ ٧٤٩).

[3] عقيدة اهل السنة و الجماعة ( ٢/ ٦٨٦)

ئەتەکاند و دەیفەرموو ( ویح عمار تقتله الفئة الباغیة یدعوهم الی الجنة و یدعونه الی النار).[1] واتە: وەیش بۆ عەممار کۆمەڵێکی سەرکەش دەیکوژن کە ئەو بۆ بەهەشت بانگیان دەکات و ئەوانیش ئەو بۆ دۆزەخ بانگ دەکەن، و عەماریش دەیگوت : پەنا دەگرم بەخوا لە ئاژاوە و فیتنە .

" ابن تیمیه " لەپاش ئەم فەرمودەیە وتویەتی: ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و دروستی خیلافەتی عەلی (ﷺ) و پێویستی گوێڕایەڵی کردنی ڕێگایە بەرەو بەهەشت و سەرپێچی کردنیشی ڕێگایە بەرەو دۆزەخ ئیتر با بیانووشی هەبێت ـ تأویل ـ ".

جارێکیان ( یحیی ی کوڕی معین ) ڕەخنەی لە شافعی گرت لەسەر ئەوەی کە لە باسی شەڕکردن لەگەڵ سەرکەشاندا ـ بغاه ـ بەڵگەی بە جەنگی عەلی لەگەڵ سەرکەشاندا هێنایەوە و پێی ووت: ئایا " طلحه و زوبێر " سەر کەش بوون بەڕای تۆ؟!!.

ئیمام احمدیش وەڵامی داوەتەوە و وتویەتی: بێ قەزا بی ئەی بەڵگەی بە کێ بهێنایەتەوە خۆ سێ خەلیفەکەی پێش ئەو شەڕیان لەگەڵ ـ سەرکەشاندا ـ تووش نەبوە و ناچارە بۆچونەکانی خەلیفە ڕاشیدی چوارەم کار پێبکات.

یان هەندێ دەڵێن بەڵێ عەممار (ﷺ)لەریزی سوپای عەلی دابوە دەبێ کۆمەڵێ هاوەڵی بەڕێزیش لەگەڵ موعاویەدا بون دەی چۆن دروستە پێیان بڵێن خەڵکی بۆ دۆزەخ بانگ دەکەن، و ئێمەش لە وەڵامیاندا دەڵێین ئەو هاوەڵە بەڕێزانە ـ خوایان لێ ڕازی بێت ـ گومانیان وابوو کە ئەو ڕێیە ڕاستەو نەیانزانیوەی بانگ کردنە بۆ ئاگری دۆزەخ و گوێڕایەڵی کردنی ئەمیری باوەڕداران واتە بانگ کردنە بۆ بەهەشت .

سێیەم / مەرجی عەلی (ﷺ) لە قبوڵ کردنی خیلافەتدا:

لە هەندێ لە ڕیوایەتەکاندا هاتووە کە : عەلی (ﷺ) لە کاتی بەیعەت دانی دا چەند مەرجێکی دانا بۆ قبولکردنی لەوانە : دەبێت بە ئاشکراو لەناو خەڵکیدا ئەو مەراسیمە ئەنجام بدرێت و نهێنی نەبێت، و لەمزگەوتیشدا بێت و بەڕەزامەندی هەموو موسڵمانان بێت و بەشێوەیەکیش کاروباریان بەرێوەبەرێت کە بەخۆی دەیەوێت ولەسەری پەروەردە بکات.

---

[1] البخاری ژمارە ٤٤٧.

هاوەڵانیش بەوە ڕازی بوون و لەڕۆژی داهاتوودا لە ڕۆژێکی گرنگ و یەکلاکەرەوە دا کاری پرۆسەی بەیعەت دان بە ئاسایی ئەنجام درا،[1]

عەلی کوڕی ئەبوطالبیش (ﷺ) بە جل و بەرگی جوان و ڕێك و پێکەوە چووە ناو موسڵمانەکان و وتارێکی بۆ دان و پاش سوپاس و سەنای خوای گەورە ویستی ئەو هەواڵانە باس بکات کە بۆ ڕازی کردنی درابوون و ووتی: (من پێم ناخۆش بوو ئەم کارەتان وەربگرم، بەڵام ئێوە هەر ویستتان من بکەن ـ بەخەلیفە ـ، بەڵام بەبێ ئێوە هیچ کارێك ناکەم و کلیلی خەزێنەی (بيت المال) بە منە بەڵام بەبێ پرسی ئێوە درهەمێکی لێ خەرج ناکەم)[2]، پاشان ووتی: ئەی خەڵکینە، ئەم کارە لەدەستی کەسدا نی یە بەڵکو بەدەست خۆتانە، و دوێنێ لەسەر کارێك ڕێك کەوتین ئەگەر ئەمڕۆ ئێوە پێتان باش نی یە ئەوا من دەڕۆمە دواوەو پاشان بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئایا پێم ڕازین؟ هەموو ووتیان ڕازین، ئەویش ووتی: (دەی خوایە تۆ بەشایەت بە، و خەڵکەکەش هەموو هاتن و دەستیان کرد بە بەیعەت پێدانی[3]، پاش تەواو بوونی پرۆسەکە عەلی (ﷺ) ڕووی کردە خەڵکەکەو ووتی: ئەی خەڵکینە ئێوە بەیعەتێکتان پێداوم کە هەر ئەو بەیعەتەشتان داوە بەهاوڕێکانی پێش خۆم و پاش ئەوەی بەیعەتتان پێدام ئیتر بەئارەزووی خۆتان نی یە بەگوێم بکەن یان نا، و لەسەر ئەمیرەکەشتانە واجبە ڕاوەستاو بێت لەسەر بەرنامەکەو لەسەر میللەتیشە گوێ ڕایەڵی بن، ئەمەش بەیعەتی گشتی بوو.[4]

کۆمەڵێ پەندو وانە لەم بەسەرهاتەوە:

١- یاسای ڕاوێژکاری ـ الشوری ـ :

لەگەڵ ئەو هەموو ڕوداوە ترسناك و گرنگانەی لەپێش هەڵبژاردنی عەلی (ﷺ)دا ڕوویدا، بەڵام هەر هەمان شێوازی شورایی پیادە کرا کە لەسێ خەلیفەکەی تردا ڕووی دا و هیچ شێوازێکی نائاسایی نەهاتە کایەوە وەك هەڵبژاردن لەسەر بنەمای خێڵایەتی یان بنەماڵەیی یان ئیدیعای وەسیەت کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ کەسێك و شتێ لەمانەدا ڕووی نەدا،

[1] تاریخ الطبری ( ٥/ ٤٤٨).
[2] تاریخ الطبری ( ٥/ ٤٤٩).
[3] هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.
[4] دراسات في عهد النبوة.

و ئەگەر لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) هیچ وەسیەتێکی بۆ جێ هایە، ئا بەو جۆرە خیلافـەتی ڕەد نەدەکردەوەو بەڵکو یەکەمین کەس دەبوو بەرگری لەو مافـەی خـۆی بکـات، و موسـڵمانەکانیش لەبەرئەوە نەبووکە سوور بوون لەسەر هەڵبژاردنی کە وەسیەتێك هەیە بۆی یان لەبەرئەوەی ئامۆزای پێغەمبەرە یان لەبەرئەوەی قورەیشی یە بەڵکو لەبەرئەوە بوو کە لە موسـڵمانە زۆر پێـشینەکان بوو، و یەکێك بوو لە دە کەسە موژدە پێدراوەکەی بەهەشت، لە عبـدالرحمن ی کـوڕی عـەوفیان پرسی (ﷺ) لەپاش شەهید کردنی عمر (ﷺ) تۆ جگە لە عوسمان کێت بەدڵە بۆ خیلافەت؟ ووتی: عەلی (ﷺ).[1]

٢- ئەهلی حەل و عـەقلو (ڕیش سپیانی) سەردەمی خیلافەتی عـەلی (ﷺ):

لەسـەردەمی خەلیفـە عەلیـدا (ﷺ) ئەنـصارو موهاجیرەکـانی ناوشـاری مەدینـەو ئەوانەشـی کەوتبوونە ناو شارەکانی ترەوە لەوانەی کە بەشداری بەدریان کردبوو، بەڵام وەك لە وتووێژی نێوان عەلی و حەسەنی کوڕیدا ڕووی دا کە وای دەگەیاند کە پێی دەگـوت بنکەکـەی فـراوان بکـات و شارەکانی تریش بگرێتەوە، و پێی وتبوو: زۆر شتم بۆ پێشنیار کردیت بەڵام تۆ بەقسەت نەکردم و زۆر ئەترسم لەجێ یەکی چۆڵدا بێ کەس کوژت بکـەن و کـەس نەگاتـە فریـات. عـەلیش (ﷺ) لەوەڵامدا پێی ووت: هێشتا هەر ئەنوزێنی وەك کچۆڵە، ئا دەی چیت پـێ ووتم و مـن بەقـسەم نەکردبیت؟ وتی: ئەو ڕۆژەی عسمان گەمارۆ درابوو پێم ووتی لە مەدینەدا مەمێنە کاتێ عوسمان دەکوژن، و پاش کوژرانیشی پێم وتی قبوڵی خیلافەت مەکە تا وەفدی شـارو هەرێمـەکان دێـن و هەموو ناوچەیەك بەیعەتی خۆیت پێ بدات.

عەلیش (ﷺ) لەوەڵامدا پێی ووت: بۆ ئەوەی کە شارەکانیش بەشدار بکـەم لـە بەیعەتەکەمـدا، حەزم نەکرد ئەم کارە لەناو مەدینەیی یەکان دەربچێت و پێم ناخۆش بوو ئەم فەخرەیان لەدەست دەربچێت.[2]

و لەم گفتوگۆیەشەوە ئەم پەندانەی لێ وەردەگرین:

١- ڕێزگرتن لە ڕای بەرامبەر لەلایەن هەردوولاوە.

[1] دراسات في عهد النبوة.

[2] البداية والنهاية (٧/٢٤٥).

٢- نەرم و نیانی لە هەڵس و کەوتی ئەمیری باوەڕداران لەگەڵ کوڕەکەیدا.
٣- قسەی پێ پەردەو ئاشکرای نێوان کوڕو باوك و دەربڕینی ڕای خۆیان بۆ یەکتری.
٤- جوان گوێگرتن بۆ کەسی بەرامبەر وەك چۆن عەلی (ﷺ)گوێ دەگرێت بۆ حەسەنی کوڕی لەگەڵ ئەو هەمو بەڵگانەدا.

٣- سوربوون لەسەر ئەوەی نابێ موسڵمانان بێ خەلیفە بن:
موهاجیرو ئەنصارەکان لە مەدینە هانایان بۆ عەلی برد تا بیکەنە خەلیفەو بەبێ ئەوەی خۆیشی حەزی لێ بکات ئەمەش بۆ ئەوەی فیا بکەون و ئەمەت گەندەڵ و پەرتەوازە نەبێت و تا ئەم کارەی گێرەشێوێنەکان تەشەنە نەکات و کار لەکار نەترازێت.
٤- یەکەم ووتاری عەلی (ﷺ):
یەکەم ووتاری ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ)لەپاش وەرگرتنی خیلافەت ئەمە بوو: خوای گەورە کتێبێکی ڕێنموونی کاری ناردووە، چاکەو خراپەی تیادا دیاری کردووە، خێرەکانی کار پێبکەن و خراپەکانی وازلێ بهێنن، فەرزەکانی خوا بەجێ بهێنن بەرەو بەهەشت دەتانبات، و خوا کۆمەڵێ شتی بەئاشکرا حەڕام کردووە و خوێنی مرۆڤی بەتەواوی حەڕام کردووە، موسڵمانانیشی بەدڵسۆزی و یەکتا پەرستی بەهێز کردووە، و موسڵمانی پاراستوە لەدەست و زمانی موسڵمانانی تر مەگەر بەهەقی خۆی و ئازاردانی موسڵمانان بەهیچ شێوەیەك دروست نی یە مەگەر بەپێی پێویست، و خەریکی بەڕێوەبردنی کاری گشتی بن ... خەڵکی ئێستا لەبەر دەستتاندان و سەبینێش قیامەتەو بەرامبەرتان دەوەستن و شتیان لەسەر سوك بکەن با شتیان لەسەرتان نەبێت، چونکە خەڵکی چاوەڕوانی قیامەت دەکەن بۆتان لەخوا بترسن و ئاگاتان لە وڵات و خەڵکەکەی بێت، ئێوە لەو ڕۆژەدا بەرپرسیارن تەنانەت لەهەموو ناوچەکان و هەموو ئاژەڵەکان، گوێڕایەڵی خوا بن و سەرپێچی مەکەن، و ئەگەر چاکەتان بینی وەری بگرن و ئەگەر خراپەشتان بینی وازی لێ بێنن، ((وَاذْكُرُوا إِذْ أَنْتُمْ قَلِيلٌ مُسْتَضْعَفُونَ فِي الأَرْضِ)) [1] "الأنفال/٢٦"

---

[1] تاريخ الطبري (٤٥٨/٥،٤٥٩).

٥- کامیان ڕاسته بلێین ـ رضي الله عنه ـ یان ـ علیه السلام ـ :

لەڕاستیدا بەکارهێنانی ووشەی ـ خوا لێ ی ڕازی بێت ـ ڕاسترە لە بەکارهێنانی ـ علیه السلام ـ یان (کرم الله وجهه) چونکە خوای گەورە لەهەموویان ڕازی بـووە بەئایـەتی ((رَضِـيَ اللَّـهُ عَـنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ))"التوبة/١٠٠" یان خوای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت ((لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَـنْ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ)) "الفتح/١٨" بۆیە ئەهلی سوننە بەگشتی زاراوەی ـ رضـي الله عنهم ـ یان داناوە لەکاتی ناوبردنی یەکێ لەهاوەڵانی پێغەمبەردا (ﷺ) نەبیستراوە شـتێکی تریان بەکارهێنابێت پێ بزانم ـ هەرچەندە (سەلام) سڵاوی ناو موسڵمانانە وەك قورئان دەفەرموێت ((فَإِذَا دَخَلْتُمْ بُيُوتاً فَسَلِّمُوا عَلَى أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِنْ عِنْدِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً)) "النور/٦١". بـەڵام خـوا لێ ی ڕازی بێـت لـە ـ سـەلامی لێ بێـت ـ باشـترە چـونکە ((وَرِضْـوَانٌ مِـنْ اللَّـهِ أَكْبَـرُ)) التوبة/٧٢".

هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) هەواڵی داوە کە خوای ـ عز وجل ـ بەخەڵکی بەهەشت دەفەرموێت ((أُحل عليكم رضواني فلا أسخط عليكم أبداً))[1]

و زانایانی ئیسلام ووشەی سەلامیان تایبەت کردووە بە پێغەمبەرانەوە (ﷺ) بە بەڵگەی ئایەتی ((وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ)) "الصافات/١٨١". یان باسی عیسی دەکات دەفەرموێت ((وَسَلامٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ)) "مريم/١٥". بەڵام ئەو لێتێکچوونەی کە هەندێ لە شیعەکان تێی کەوتووە بەتایبـەت ڕۆچوەکانیان (غلاە) کەدەڵێن علی ـ علیه السلام ـ گوایە حسابی ئاستی پێغەمبەرێکی بۆ دەکەن چونکە پێغمبەر (ﷺ) کاتێ فەرمووی ((أنت منّي بمنزلة هارون من موسى))[2] واتە تۆ بۆمن وەك هارون بۆ موسی وایت، خۆ لەڕاستیدا گومانی تێدا نـی یـە کـە عـەلی (رضي الله عنه) شـایانی ئـەو دوو پاشگرەیە ـ علیـە الـسلام، کـرم الله وجهـە ـ بـەڵام ئـەو دوو وەسـفە هـەموو هاوەڵـانی تـریش دەگرێتەوە.[3] و ئەم دوو ڕستەیەش ـ کـە هەنـدێ لـە زانایـانی سـوننەش بـەکاریان هێنـاوە ـ و خۆماناکەشی تەواوەو عەلی (رضي الله عنه)شایانیەتی بەڵام نـابێ بـەهیچ جۆرێـك لەهاوەڵـە بـەڕێزەکانی

---

[1] مشكاة المصابيح، البغوي (٨٨/٣).

[2] بخاري، ژ (٢٤٠٤).

[3] فتاوي في التوحيد، عبدالله بن جبرين، لا ٣٧.

پێغەمبەری خوا جیابکرێتەوەو جوانترو شایانترە بەویش بگوترێت - خوا لێ ی ڕازی بێت - و جیاوازی نەخرێتە نێوان هیچ کامیانەوە.[1]

[1] الناهية عن طعن أمير المؤمنين، مرعارية، لا ٢٦.

## جیٚ باسی دووەم

## هەندیٚ لە چاکییەکانی، گرنگترین ڕەوشتەکانی، بنەمای حکومەتەکەی:

ئیمام احمد و اسماعیل القاضی و ابوعلی النسابوری دەڵێن: ئەوەندەی سەندی باش و پلە بەرز دەربارەی عەلی (ﷺ) هاتووە بۆ هیچ هاوەڵێکی تر نەهاتووە .[1]

(ابن عمر ) هۆکاری ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو دوایین خەلیفەی ڕاشیدین بووە . و لە سەردەمی ئەودا شتی جۆرا و جۆر ڕوویدا و کۆمەڵێ کەس لە دژی هەڵستان و ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی هەرکەسێ هەرشتێکی دەربارەی بیستبێ بۆ خەلکی ڕوون دەکردەوە تا پشتی بەر نەدەن و سەرکەوێت بەسەر نەیارانیدا و ئەهلی سوننە پێویستیان بەوە بوو کە کە چاکی پیاوەتییەکانی بلاوبکەنەوە و لە بەر ئەم هۆیە ڕاوی و گێڕاوەکانی زۆر بوون، وە ئەگەر نا هیچ کام لە سێ خەلیفەکەی پێش ئەو کەمتر نەبوون لە چاکی و پیاوچاکیدا ئەگەر بە پێوانەیێکی دادپەروەرانە بیانکێشی .[2]

( ابن کثیر ) دەڵێت (( لە چاکیەکانی عەلی (ﷺ)ئەوەیە کە نزکترینی ئەو دە کەسە بوو لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە موژدەی بەهەشتیان پێدرا بوو)) [3]

* لە ئەبی زەڕەوە (ﷺ) دەگێرنەوەکە وتوویەتی (( عەلی (ﷺ) وتوویەتی: سوێند بەو کەسەی تۆو دەتەقێنی و (با هەڵدەکات) پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمەی پێووتم (( ان لا يحبني الا مؤمن و لا يبغضني الا منافق ))[4] واتە: کەس خۆشی ناوێم جگە لە باوەردار و ڕقی لێم نیە بێجگە لە دوو ڕوو .

* ئەبی ئیسحاق دەگێرێتەوە کە پیاوێك پرسیاری لە بەراو (ﷺ)کرد کە ئایا عەلی (ﷺ)بەشداری جەنگی بەدری کرد؟ بەراو ووتی: بەلکو شمشێربازی و خۆ بردنە پێشەوەیش .[5]

---

[1] فتح الباري (٧١/٧) .

[2] فتح الباري ( ٧١/٧) .

[3] البداية و النهاية ( ٢٩/١١) .

[4] الصحيح المسند في الفضائل الصاحبه لا (١١١) .

[5] الصحيح المسند لا (١١٢) .

* ( ام ساعه ) دەڵێت: لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیست کـه دەیفـەرموو((مـن سبَّ علیاً فقد سبني))[1] واتە: ئەوەی قسە بە علی بلێت قسەی بە من وتووە .
ئەمە هەندێکی زۆر کەمن لە چاکییەکانی، ئەمما ڕەوشتە بەرزەکانی ئەوەیە کە پیاو چاکێك بـووە ڕیانی و بۆ خوا ژیاو بووە و لەپێناو خودا و پێغەمبەر و قورئانەکەیدا چەندان قوربانی داوە لەوانە: بیرویاوەری دروست، زانستی شەرعی، متمانە بە خودا، پێشەنگی، ڕاستگۆی، شیاوی، خۆگری، دەروون بەرزی و ئیرادە بەهێزی، دادپەروەری، توانای زانست بەخشی و ئامادەکردنی سـەرکردە و کۆمەڵێ ڕەوشتی تر کە لە سەردەمی ژیانی مەکـە ئـەو کەڵـە پیـاوەدا بـەدی دەکرێـت و چ لـە سەردەمی مەککەو چ لەسەردەمی ژیانی مەدینەی پڕ نووردا . لەو ڕەوشتانە:

## یەکەم/ زانست و شارەزای لە ئاینیدا:

ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ)لە گەورە زاناکانی ناو هاوەڵان بوو، بـەوە جیادەکرایـەوە کـە زۆر هەوڵی فێربوونی دەدا، و زۆر لێدەکۆڵییەوە لـە وەرگـرتنی زانـستدا و پرسـیاری زۆری دەکـرد و هۆکارەکانی وەرگرتنی زانستی ئەو سەردەمەی بەکاردەهێنا، و بەردەوام لـە خزمـەت پێغەمبــەر دەژیا و، خۆی بۆمان دەگێرێتەوە دەڵێت
(( خەونەچۆتە چاوم و نەنووقاوە لە سەردەمی پێغەمبەر خـودا (ﷺ) تـا نـەم زانـیبێ ئـەو ڕۆژە جوبرەئیل چ ئایەتێکی هێناوەتە خوارەوە، لە حەڵاڵ و حەرام یان فەرمان بەکردن یان نەکردن ))[2]
زۆر هەوڵیداوە فەرموودەیکی لە دەست دەرنەچێت و ئەگەر هاوەڵێك فەرموودەیکی بگێڕایەتـەوە سوێندی دەدا پاشان لێی وەردەگرت وەکو خۆی دەڵێت: (( من کەسێك بووم فەرموودەیەکـەم لـە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ببیستایە سوودی باشم لێ وەردەگرت،بەڵام ئەگەر یەکێ لە هاوەڵان بۆیان بگێڕامایەتەوە سوێندم ئەدا و سوێندی بۆ بخواردمایە باوەڕم پێ دەکرد.
خۆی دەڵێت: ئەبوبەکر (ﷺ) فەرموودەیەکی بۆ گێرامەوە ووتی (( بیستم لـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) کە دەیفەرموو: (( ما من عبد یزنب ذنباً فیحسن الطهور، ثـم یقـوم فیـصلی رکعـتین، ثـم

---

[1] هەمان سەرچاوە لا ١٢٦ .
[2] مسند الامام زید لا ( ٣٤٣) .

يستغفرالله الاّ غفر له )) و ثم قرأ هذه الاية ((وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ )) "العمران:١٣٥"[1] واته((هەربەندەیەك گوناهێکی کرد بە دوایدا دەست نوێژێکی گرت دوو رکاتی نوێژیکرد و ووتی ((استغفرلله)) خوای گەورە لێی خۆش دەبێت )) عەلی (ﷺ)سوێندیدا، ئەویش سوێندی بۆ خوارد .

ئەمەش مانای ئەمە ئەوەیە عەلی (ﷺ) زۆر لێکۆڵینەتەوە لە فەرموودە و ئەو هاوەڵە ڕاستگۆ و خاوەن متمانانەی سوێندەدا ئەوجا فەرموودەکەی لیّ وەردەگرتن .

عەلی (ﷺ)دڵ و مێشکێکی زۆر چاکی هەبوو و هەمیشەش دەم بە پرسیار بووە، وەك خۆی دەڵێت (( ان ربي وهب لي قلباً عقولاً ولساناً سؤلاً ))[2] واتە: پەروەردگارم دڵێکی تێگەیشتوو و زمانێکی بەپسیاری پیّ بەخشیووم . عەلی (ﷺ) لەپێناوی وەرگرتنی زانستدا نەی هێشتووە شەرم ببێتە بەربەست و تەنانەت خۆی رووی نەهات پرسیارێکی شەرعی لە پێغەمبەر بکات.. پیاوێکی ڕاسپارد وەك خۆی بۆمان دەگێرێتەوە لەسەر زاری محمد کوری حەنەفیەوە کو ووتویەتی: مـن کەسێك بووم کە زۆر زوو ( مەزی ) م[3] هەبوو، بەمیقدادی کوری ئەسوەدم ووت پرسیارم بۆ بکات و ئەویش لیّ پرسی بوو لە وەلآمدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموو بووی ((فیه الوضوء ))[4] واتە: بەس دەست نوێژ بگرێتەوە.

لە شوێنێکی تردا دەڵێت (( لا یستحي احدکم اذا لم یعلم ان یتعلم ))[5] واتە: کەستان شەرم نەکەن لە فێربوونی شتێك کە نایزانن .

بە نووسەرەکەی خۆی دەگووت :لاپەرەکەت با جوان بێت با نـووکی قەڵەمەکـەت پانبێـت و دێـر بپەرێنە و پیتەکان لە یەك نزیك بکەرەوە .[6]

[1] صحیح سنن الترمذي (١/١٢٨) .

[2] الطبقات (٢/٣٣٨) .

[3] مذي: ئەو ئاوەیە لە ئەنجامی بیرکردنەوە یان بینینی ئافرەت .... دێتەدەرەوە .

[4] مسلم (١/٢٤٧) .

[5] مصنف ابن ابي شیبه (١٣/٢٨٤) .

[6] الجامع لاخلاق الراوي (١/٢٦٢)

( ابن حزم) له پله ی سێیمدا دایدەنێت له ناو زاناكانی ناو هەوەڵاندا له بارەی زۆر یفەتواكانیەوە و هانی خەڵكی دەدا بۆ لێكۆڵینەوەی زانستی و دەیفەرموو ((تزاوروا و تدارسو الحديث، ولا تتركوه يدرس))[1] واته: سەردانی یەكتری بكەن و فەرمووده تاوتۆی بكەن، و مەهێڵن لەناو بچێت )). یان دەڵێت: (( لاتشبع من طول صحبته، فانما هو كالنخلة تنتظر متى يسقط عليك منها شيء ))[2] واته: تێرمەبە له هاورێتی مامۆستاكەت، چونكه ئەو وەك دارخورما وایه و چاوەڕوان كـه كـەی بەروبوومی بووەرێت به سەرتدا )) .

و بانگێشه ئەوەی كردووه كه سوود له زانسته كەڵك دارەكان وەربگیرێت و كات لەگەڵ زانسته بێ سوودەكان بەفیڕۆ نەدرێت وەك دەڵێت: (( زانست زۆر لەوە زۆرتره كه بمانەوێت هەمووی فێـرین، بەڵام با زانسته جوان و بەكەڵكەكان وەربگرین ))[3] .

عەلی كوری ئەبوطالـب (ﷺ) له زنستدا گەیشتبووە ئاستێك كه بڵێت چی دەپرسن لێم بپرسـن، ئەم ئاستەش كەم كەس پێیدەگات . سەعیدی كوری موسەییب دەڵێت: (( هیچ كەس نەی ووتووە به خەڵك پرسیارم لێ بكەن، جگه له عەلی (ﷺ)[4] .

موعاویه (ﷺ) هەر شتێكی لێ بگۆڕایه نامەی دەنارد بـۆ عـەلی و: پرسـیاری لـێ دەكـرد لـەو بارەیەوە، بەڵام كاتێ هەواڵی شەهید بوونی بیست ووتی: به مردنی عەلی كوری ئەوطالب زانست و فیقهیش مردن .

---

[1] هەمان سەرچاوە (٢٣٦/١)

[2] تاريخ اليعقوبي (٥/٢) .

[3] الاستيعاب لا ١١٠٣ .

[4] هەمان سەرچاوە لا ١١٠٤ .

## هەندێ لە ڕێنمایەکانی عەلی (ﷺ) بۆ قوتابیان

### یەکەم :خوێندن لەبەر ڕەزامەندی خوا:

(حافظ ابو نعیم ) لە کومەیلی کوری زیادەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عـەلی کـوری ئـەبو طالیـب دەستی گرتم و بردمی بۆ بیابان، و کاتێ گەیشتینە ئەوێ دانیـشت و هەناسـەیەکی هەڵکێـشا و پاشان ووتی: ئەی کومەیل، دڵەکان دەفڕن و چاکترینیان ئەو دڵانەن زیاتر زانستیان لە خۆ گرتووە، ئەوەی پێت دەڵێم جوان لێم وەربگرە، خەڵکی سێ بەشن: یەکەم: زانایەکی خـوا ویـست-ڕێـانی، دووەم: فێرخوازێك لە پێناو ڕزگاریدا، سێیەم: هەرچـی و پەرچـی کـە شـوێن هـەموو جیقەیـەك دەکەون.[1]

ئەم ئامۆژگاریەش ئەم سوودانەی لە خۆگرتووە:

أ - زانا خوا ویستەکان: مەبەست لە زانای ڕەبانی ئەوزانایانەن کە فیقە و حیکمەت یەك بخات لە خۆیدا وەك ( ابن عباس ) (ﷺ)لە تەفسیری ئایەتی ((ولکن کونوا ربانین))دا دەڵێـت: ((حکمـاء فقهاء )) و فیقە و حیکمەت دەخەنـە کـار بـۆ پێگەیانـدن و ئامـادەکردنی ئومـەتی ئیـسلام و ئاراستەکردنی،[2] و فێرکردنی ڕێنماییە ئیسلامیەکان و پەروەردەکردنیان لەسەر تـەقوا و ڕوەشـتە بەرزەکان .

وە ئـەمیری بـاوەڕداران پێناسـەی ڕەبـانین دەکـات و دەفـەرمووێت: ( ئـەو کەسـانەن بـەردەوام بەحیکمەت و لێزانی و ژیرانە خواردنی دەروونی خەڵکی دەدەن و پەروەردەیان دەکەن .[3]

ب - خوازیارانی زانست ئەوانەن دڵسۆزانە و خۆیان یەکلایکردۆتەوە بۆ وەرگرتنی زانست: تابیێتە هۆی ڕزگار بوونیان لە بەرپرسیاریەتی بەردەم خوای گەورە، و ئەمیری باوەڕداران دەربارەی ئەم دەستەیە دەڵێت ((فێرخوازێك لەپێناو ڕزگاریدا، و ئەمەش تەنها ئەوانە ناگرێتەوە کە خۆیـان تەرخان کردووە بۆ زانیاری، بەڵکو هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە ژیانـدا دەیانـەوێت ئـەم دینە جێ بە جێ بکەن و مەبەستیانە لە دوا ڕۆژدا ڕزگاریان بێت، و لـە بارەیەشـەوە بـەردەوام و

[1] صفه الصفوة (٣٢٩/١) .

١التاريخ الاسلامي (٤٣٨/١٢/١١) .

[3] الفتاوى (٤٩/١) .

فەتوا لە زانا ڕەبانییەکان وەردەگرن، تا بەو جۆرە خوا ناسین بکات کە فەرمانی پێدراوە و لەسەر بەرنامەکی پەروەردگار مامەڵە لەگەڵ خەڵکی بکات .

ج- ئەوانەی زانستی ئاینیان بەجێ هێشتووە و پەیوەندیان بە زانا ڕەبانییەکانەوە پچڕاوە، و ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) بە هەرچی و پەرچی (همج رعاع ) ناویان دەبات کە لەگەڵ هەموو بایەکدا شەن دەکەن و بە نووری زانست دڵیان ڕووناك نەبۆتەوە و دەیەوێت ئوممەتی ئیسلام لەم جۆرە کەسانەی تێدا جێگای نەبێتەوە .

د- بەراورد لە نێوان زانست و سامان دا:

لە ئامۆژگارییەکانی ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) بۆ کومەیلی کوری زیاد، دەڵێت(( زانست لە سامان زۆر چاکترە، و زانست پاسەوایی تۆ دەکات بەڵام سامان تۆ پاسەوانی دەکەیت، و زانست بە کردار پێ کردن زیاد دەکات و بەڵام سامان بە خەرج کردن کەم دەکات، زانست فەرمانڕەوایە بەڵام سامان فەرمانی پێ کراوە، ڕێزداری سامان بێ ڕێزدەبێت ئەگەر سامانەکەیان نەما، و بەڵام خۆشەویستی زانا بە بەشێك لە ئاین داری دادەنرێت، و زانست دەبێتە هۆی ئەوەی دەوروبەر بەگوێ ی دەکەن لە ژیاندا و بە چاکەش باسی دەکەن پاش مردنی، پارەهەڵگران هەر بە زیندوویی مردوون، زانایان ناویان دەمێنێت تا ژیان بمێنێت، و لاشەکانیان لە ناو خەڵکیدا نەماون بەڵام وێنەیان لەناو دڵەکاندا ئامادەیە .[1]

هـ / ناوکرۆکی تێگەیشتن لە ئیسلام:

زانای تێگەیشتوو ئەوانەی بەتەواوی فەقیهن، هەرگیز خەڵکی بێ هیوا ناکەن لە ڕەحمەتی خوا و دڵنیاشیان ناکەن لە سزای سەختی خودا و ڕێگای گوناه کردنیان بۆ ئاسان ناکەن، و پشت لە قورئان هەڵناکەن بۆ هیچ شتێکی تر، و خێر و چاکەش لە بەندایەتی و خواناسییەکی بێ زانست دا

[1] حلية الاولياء(١/٧٥) .

نییە، و خێر و چاکەش لە زانستێکدا نییە کە لێ ی تێ نەگەیت، و خێرو چاکەش لە قورئان خوێندنێکدا نییە کە لێ وورد بوونەوەی لە گەڵدا نەیەت .[1]

**و: چەند فێنکە بۆ دڵ و دەروون:**

شەعەبی لە عەلی کوری ئەبو طالیب (ﷺ) وە دەگێرێتەوە کە چووە ناو خەڵکەکە و پێی وتن: چەند فێنك بەخشە بە دڵ و دەروون، و پێیانی ووت: چییە ئەو شتە؟ و ئەویش لە وەڵامدا ووتی: شتێك کە نایزانی بڵی خوا باشتری لێ دەزانێت .[2]

**ز/ فێرکردن:**

ئەمیری باوەرداران علی (ﷺ)دەڵێت (( خوای گەورە پێویستی نەکردووە لەسەر خەڵکانی عەوام و نەخوێندەوار کە فێربن، ئەوەندەی کە پێویستی کردووە لەسەر زانایان کە خەڵکی فێربکەن .[3]

**ح : خێر لە زۆر زانستدایە نەك لە سامان وملك و ماڵ:**

عەلی (ﷺ) دەڵێت: خێر لەوە دانییە پارە پۆل و منداڵت زۆر بێت، بەڵکو خێر لەوە دایە کە زانستت زیاد بکات، و نەرم ونیانیت زیاتر بێت، و بەسەر خەڵکییەوە بە خواناسیەکانت شانازی بکەیت، و ئەگەر چاکەت کرد سوپاسی خوا بکەیت و ئەگەر خرپەت کرد داوای لێ خۆشبوون بکەیت، خێر لە دونیادا نییە مەگەر لە دوو پیاودا نەبێت: یەکەمنیان پیاوێکە گوناهێك دەکات خێرا فریای خۆی دەکەوێت و تەوبە دەکات و دووەمیان پیاوێکە پێشبرکێ دەکات لە کاری چاکەدا، و هیچ کردەوەیەك بچووك نییە لەگەڵ بوونی تەقوادا، کەی بچوکە شتێك کە وەرگیراو بێت.[4]

---

[1] هەمان سەرچاوە لا ( ١ /٧٧) .

[2] جامع بيان العلم و فضله ( ٢/٦٦)

[3] فرائد الكلام لا ٣٦١ .

[4] حلية الاولياء لا ( ٧٥)

ط/ نێوان زانین و نەزانین:

عەلی (ﷺ)دەڵێت (( كفی بالعلم شرفاً ان یدعیه من لایحسنه و یفرح به اذا نسب الیه، و كفی بالجهل ضعة أن یتبرأ منه من هو فیه و یغضب اذا نسب إلیه )) [1] واتە بەسە شانازی بۆ زانست و زانین کە زۆری لە خەڵکی خۆی پێوە هەڵدەنێت و تیایشیانا نییە ، و خۆشحاڵ دەبێت کە ووشەی زانا بدرێتە پاڵی، و بەسە بۆ نەزانین نەنگی و عەیبە کە ئەوەشی تیایەتی خۆی لێ بە دوور دەگرێت و تورەش دەبێت ئەگەر ووشەی نەزان بدرێتە پاڵی .

ی - بۆچی خەڵکی نایانەوێ ببنە زانا:

ئەمیری باوەڕداران (ﷺ)دەڵێت: (( خەڵکی خۆیان نادەن لە ڕێبازی بە زانا بوون، لە بەر ئەوەیشە کە دەبینین ئەوانەی زانستیان وەرگرتووە کەڵکی لێ وەرناگرن )) [2] . کە ئەمەش ئاگادارییەکە بۆ زانایانی خراپ کە بەهۆی زانستیانەوە دژایەتی خوا دەکەن، و بانگی زانایان دەکات تا کار بە زایاریەکەیان بکەن و خەڵکی بۆ بانگ بکەن و لە پێناوی خوایشدا لەو ڕێگەیەشدا خۆگرو بەئارام بن)).

ك- زانست باشترە:

ئەمیری باوەڕداران دەڵێت: (( العلم أفضل من الصائم القائم المجاهد، و اذا مات العالم ثلم في الأسلم ثلمة لا یسدها الا خلف مثله )) . واتە: زانایان لە ڕۆژوگرێکی شەونوێژکەری موجاهد باشترە، و ئەگەر زانایەك بمرێت کەلێنێك دەکەوێتە ئیسلام کە هەرگیز پڕ نابێتەوە مەگەر کەسێکی وەکو خۆی هەڵکەوێتەوە .

ئەمەش لەبەر ئەوەیە نوێژ و ڕۆژو چرایە و تەنها بەر پێ خاوەنی روون دەکاتەوە بەڵام زانست و زانیاری کەڵکی بۆ هەموانە و گشت کەلەبەرێك ڕووناك دەکاتەوە .

---

[1] فرائد الكلام لا ٣٦٦ .

[2] ادب الدین والدنیا لا ٨٢- ٨٥.

## دووەم/ دنیا نەویستی ئەمیری باوەڕداران (ﷺ):

ئەمیری باوەڕداران بەهۆی ژیانی بەردەوامی لە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) و پاشتریش لەگەڵ هاوەڵندا لەوە تێگەیشت کە دنیا جێگای تاقیکردنەوەیە.. چونکە لەسەر ڕێرەوی قورئان پەروەدە بوو بوو و لەو ئایەتانە جوان تێگەیشتبوو کە دنیا بە سووك ناو دەبەن و بە لەناو چوو و قێزەوەن دەیخەنە بەر چاوی باوەڕداران یەکێ لەو ئایەتانە لە سورەتی (کهف ) دا خوای گەورە دەفەرموێت (( وَاضْرِبْ لَهُمْ مَثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيماً تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُقْتَدِراً * الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِنْدَ رَبِّكَ ثَوَاباً وَخَيْرٌ أَمَلاً ))

لەسەر دەستی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە گۆشەکراوە کە دەفەرموێت (( لو كانت الدنيا تعادل عندالله جناح بعوضه ماسقى منها كافراً شربة ماء ))[1] واتە : ئەگەر دنیا لای خودا نرخی باڵە مێشولەیێکی هەبووایە هەرگیز نەی دەهێشت بێ باوەڕ قومە ئاوێکی لێ بخواتەوە .

یان دەفەرموێت: (( الدنيا سجن المؤمن و جنة الكافر )) واتە: ژیانی دنیا وەك زیندان وایە بۆ مرۆڤی موسڵمان و وەك بەهەشتیش وایە بۆ مرۆڤی خوا نەناس و بێ باوەڕ .

### ١- ئەی زەرد و سوور خەڵکانی تر بخەڵەتێنە:

عەلی کوڕی ڕەبیعە (الوالبی) دەڵێت: (ابن النباح) ـ کە بەر پرسی (بيت المال) بوو ـ لە کوفە و هاتە خزمەت عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ)و پێ ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ( بيت المال ) پڕ بوو لە زەرد وسپی، ئەویش فەرمووی: ((الله أكبر)) وپاشان دەستی خستە سەر شانی (ابن نباح) و هەستا سەرپێ و بەرەو بيت المال ڕۆیشتن .

و پاشان ووتی: ئەی (ابن النباح) خەڵکی کوفەم بۆ بانگ بکە، ئەویش جاری دا و هەموو هاتن و چی پارە و ئالتوونی و ماڵاتی تێدا بوو دای پێیان و بە تەواوەتی خاڵی بوویەوە . وعەلیش (ﷺ)هاواری کرد- يا صفراء يا بيضاء غري غيري ـ هاها )) واتە: ئەی زەرد و سپی واتە ئاڵتون و زیو تۆ ناتوانیت من دەستخەرۆ بکەیت خەڵکی تر بخەڵتێنە ـ ها ـ ها .

---

١ مسلم ٢٨٥٦

تاوای لیٚ هات یەك دینار و یەك درەهەم لە خەزێنەدا نەما و چووە ناوی گسکی داو پاشـان دوو ڕکات نوێژی تێدا کرد تا لە قیامەتدا شایەتی بۆ بدات .

ئەمیری باوەڕداران لە سەرماندا دەلەرزێت:

لە نموونە بەرز و بـێ وێنـەکانی دنیـا نەویـستی عـەلی (ﷺ) هـارونی کـوری عەنتـەر بۆمـان دەگێڕێتەوە لە باوکییەوە کە دەڵێت: لە خورنەق[1] چوومە خزمەت عەلی کوری ئەبو طالیب (ﷺ)، دەبینم لە سەرماندا دەلەرزێت و لێفەیێکی کۆنی دابـو بـە خوێـدا، ومنـیش ووتم: ئـەی ئـەمیری باوەڕداران خوای گەورە بەشی تۆ و کەس و کار ـ ال بیت ـ ی لە بیت و ماڵ دا دیـاری کـردووە، کەچی تۆ بۆ ئاوا دەکەیت بەخۆت! و ئەویش لە وەڵامدا ووتی: وەڵاهی هیچم لەم (بیت المال) ەی ئێوە دەست نەکەوتووە و ئەم لێفەیەشم هەر ئەوەیـە کـە لـە مەدینـەوە لـە ماڵەکـەی خۆمـەوە هێناومە .[2]

با بپرسین: دەی ئایا چی وای کرد لە ئەمیری باوەڕداران کە ئەو سەرمایە قبووڵ بکات و بەوە ڕازی بێ کە وەك هەژار بژی، لە کاتێدا دەیتوانی جوانترین و گەرمترین جل و بەرگی سەر زەوی بکڕێت؟ ئەمەش نموونەی دنیا نەویستی ڕاستەقینەیە لەگەڵ ئەوەشدا کە دەستیـشی بیگـاتێ و بەڕاسـتی قوتابی قوتابخانەکەی پێغەمبەر بوو (ﷺ) کە تیایدا وانەی دنیـا نەویـستی ـ زهـد ـ فێردەبێـت لەپێناو خۆشییەکانی ڕۆژی دواییدا، کە پێغەمبەر (ﷺ) دەیتوانی خۆشترین ژیانی هەبێت کەچی ژیانی هەژارانەی هەڵدەبژارد و پێخۆش بوو .[3]

## ٣- من خۆم ڕازیمە پێی:

لە ئەبی تەری کوری عبـداالله ی جوهەنییـەوە دەگێڕنـەوە وتوویـەتی: جارێکیـان عـەلیم بـینی (ﷺ)دەم وچاوی هەڵبەستبوو و جلێکی سادەی لەبەرکرد بوو، و دارێکی گرتبووە بە دەستییەوە و خۆی بردبووە شێوازی عەرەبێکی دەشتەکی و خۆی کرد بە بازاڕی شاری کوفەدا و لەگەڵ یەکێ لە بازرگانەکاندا مامەڵەی کاڵایەکی کرد بەسێ درهەم، بەڵام بازرگانەکـە ناسـیەوە ئـەویش لـێ ی

[1] خورنەق: جێگەیێکە نزیك شاری کوفەیە.
[2] حلیة الاولیاء (٨٢/١ )
[3] التاریخ الاسلامي ( ٢٨٢/١٢ )

نەکڕی، و یەکی تری بینی بەڵام ئەویش ناسیەوە و ئەمیش دیسان هیچی لـیٚ نـەکڕی، و پاشـان منداڵێکی تازە پێگەیشتوو بینی کراسێکی بە دەستەوە بوو عەلی لێی کڕی بە سـیٚ درهـەم . و پاشان باوکی منداڵە کە گەڕابوویەوە و پرسی بوو دەربارەی کراسەکە و ئەویش پێـی ووت دام بـە سیٚ درهەم، باوکیشی ووتی: بایی دوو درهەم بوو، بۆیە بەپەلە پارەکەی بردەوە بـۆ عـەلی و پـیٚ ووت: ئـەو کراسـەی تـۆ کڕیـت بـای دوو درهـەم بـوو، و ئـەمیری بـاوەڕدارانیش فـەرمووی (( بەرەزامەندی خۆم پێی فرۆشتم و بەڕەزامەندی ئەو لێم کڕی . [1]

ئەمەیە ئەو پەڕی مانای زوهد و دنیـا نەویـستی کـە ئـەمیری بـاوەڕدارن بێـت، کەچـی بـڕوات کراسێکی هەرزان بای بکڕێت و بەجلی سادە و ساکارەوە بگـەڕێت و وەك عـەرەبێکی دەشـتەکی بچێتە ناو خەڵکییەوە و کەچی مافی خۆشی بوو لە بەرامبەر ئەو ئەرکە قورسەکەی سەر شانی کە خیلافەت بوو، لە ( بیت المال ) دا پارە دەربهێنێت و بیدات بەجل و بەرگێك کە شایەنی گەورەی وولات بێت .

و دەم و چاوی خۆی هەڵدەپێچێت لەبەر ئـەوەی نەیناسـنەوە ئـەمیری باوەڕدارانـە و پـارەی لـیٚ وەرنەگرن یان خاتری زۆری بگرن و پلە و پایەکەی بەکاربهێنێت بۆ بەرژەوەندی خۆی و بە هۆییەوە ڕێزی تایبەتی بگرن . [2]

## ٤-پینە بە جلەکانی ئەمیری باوەڕدارانەوە:

عمری کوری قەیس دەڵێت: لە ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبوطالیبیان پرسی: بۆچی جـل و بەرگەکانت پینە دەکەیت؟ لە وەڵامدا ووتی: خشوع دەخاتە ناو دڵەوەو بـاوەڕدارانیش چـاوی لـیٚ دەکەن . [3]

ئەم نموونەیە لەگەڵ ئەوەی کە زهد و دنیا نەویستی عەلی (ﷺ)دەدەخات، مانـای ئەوەشـی لـیٚ وەردەگیرێت کە ئەو پیاوە مەزنانە بەهەڵس و کەوتی خۆیان وستوویانە کۆمەڵگا پەروەردە بکـەن

[1] الزهد لا ( ١٣٠ )

[2] التاريخ الاسلامي ( ١٢/ ٤٢٩ ) حميدي .

[3] التاريخ الاسلامي عهد خلفاء الراشدين لا ( ٦٤٧) ذهبي .

لەسەر ژیانی سادە و دوور بکەونەوە لە پێشبڕکی کردن لە کڕینی جل و بەرگ و مۆدیلی نوێـدا و دنیا نەویستەکانیش ڕزگاریان ببێت لە لۆمە کردن لەسەر ئەو شێوازە زاهیدیەیان .

٥- دەبێ بزانم چی دەڕواتە گەدەمەوە:

ئەمیری باوەڕداران علی (ﷺ) هەموو جارێ لە پاش بەکارهێنانی ئارد، جوان سـەری کەنوەکـەی دەنایەوە و دەیووت: حەز ناکەم شتێك بچێتە ناو سکمەوە کـە سەرچـاوەکەی، نـەزانم و سـوفیان دەڵێت: عەلی (ﷺ) تا ژیا خشتێکی نەخستە سەر خشتێ و لە مەدینەشەوە لەناو گۆزەدا گەنم و جۆی بۆ دەرۆیشت .[١]

٦- زاهیدترین کەس:

حەسەنی کوری صالحی کوری حەی دەڵێت: باسی زاهیدەکانیان دەکرد لە خزمەت عمـری کـوری عبدالعزیز، ئەویش ووتی: زاهیدترین کەس لە دنیادا عەلی کوڕی ئەبوطالیب بووە .[٢]

(الذهبي ) دەگێڕێتەوە دەڵێ عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) سـواری گوێدرێـژك بـوو، بـەجۆرێك هەردوو قاچی کردووە بووە لایەك و دەیووت: من ئەو ئەو کەسەم دنیام بێ نرخ کرد ( کە مانـای وایە گرنگیم پێ نەداو خەفەتم بۆ نەخوارد و هەموو مەبەستێکم رووی کردە ئـەو دنیـا کـە رۆژی قیامەتە .[٣]

ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) لەگەڵ ژیانی زبر و زاهیدییەکەیدا، روگرژ و دەم وچاو تاڵ و ڕەق نەبوو، بەڵکو بەوە وەسفی دەکەن کە: (( حسن الوجه، ضحوك السّن ـ خفيف المشى على الارض )) واتە: دەم و چاو کراوە و جوان بووە و دەم بە پێکەنین بووە و لەسەر خۆش بووە لەرۆیشتندا .[٤]

---

[1] الكامل في التاريخ ( ٢/٤٤٣ ) .

[2] تاريخ الاسلام عهد خلف ألراشدين لا ٦٤٥ .

[3] تاريخ الاسلام ( الذهبي ) لا ٦٤٥

[4] علي ابن طالب ـ محمد رشيد رضا لا ٣٠٤ .

ئیمام عەلی (ﷺ) پێناسەی زوهدمان بۆ دەکات و دەڵێت: (( ایها الناس الزهادة قصر الأول والشکر عند النعم و التورع عن المحارم )) . واتە: ئەی خەڵکینە، هیوا کورتی و سوپاسگوزاری لەسەر بەخششەکان و خۆ دوور گرتن لە حەرامەکان .[1]

## سێ یەم/ تەواوزع و خۆ بەکەم زانین و بێ فیزی عەلی (ﷺ):

### ١- منم ئەو کەسەی دنیام بێ نرخ کرد:

صاڵحی کوڕی ئەبی اسود لەوانەوە دەگێڕێتەوە کە عەلیان دیوە سواری گوێدرێژ بووە و قاچەکانی کردوەتە یەکلا و وتوویەتی: (( منم ئەو کەسەی کە دنیام بێ نرخ کردوە .[2] جێگای خۆیەتی عەلی (ﷺ) ئاوا دڵخۆش بێت بەو سەرکەوتنەی بەسەر دنیا و بە دیمەنی کەسێکی زۆر سادەی ناو موسڵمانان خۆی پیشان بدات لە کاتێکدا خەلیفەی موسڵمانان بووە، کە بە پێچەوانەوە زۆر کەس خۆیان بەکەم زانیوە و بەڵام هەرکە بەپرسیارەتیان پێدراوە لە خۆیان گۆڕاون و فیزیان زل بووە و وەڵامی کەسیان نەداوەتەوە و کەسیش هەر نەیتوانیوە بیان بینێت!....

بەڵام دۆستانی خوا و هەڵگری ڕستەقینەی ڕێبازە بەرز و پیرۆزەکەی ئیسلام تا پلەیان بەرزتر ببێتەوە و خۆیان بە بچووك دەزانن و شانازی دەکەن بەوەوەی کە خۆیان بەیەکێ لە خەڵکە سادەکە بزانن و لوتی گەورەیی و خۆ بەزل زانی خۆیان بشکێنن .

### ٢- خاوەن ماڵ دەبێت خۆی شتی خۆی هەڵبگرێت:

دەگێڕنەوە لە عەلیەوە (ﷺ)کە هەندێ خورمای کڕیبوو خستبوویە گونییەکەوە و ویستی هەڵی بگرێت و بۆ ماڵەوەی بەرێتەوە، خەلکیش ووتیان: ئێمە بۆت هەڵدەگرین ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەویش نەیهێشت و ووتی: نەخێر خاوەن ماڵ دەبێت خۆی شتی خۆی هەڵبگرێت .[3]

( الله الکبر ) لەم بەرە قورئانی یە ناوازەیە!... چەند پێویستیمان بە سەرکردایەتیەکی ئا لەو جۆرەیە . شەرم نەکات و نەڵێت من بەرپرسێکی باڵام چۆن خۆم شتی خۆم دەکرم و چۆن

---

[1] رجال الفکر و الدعوە .( ١/ ١٠٥ ) .

[2] تاریخ الاسلام للحمیدی ( ٦٣/١٧ ) .

[3] الزهد للأمام احمد لا (١٣) .

هەڵیدەگرم! ئەی خزمەت کارم بۆچییە؟ ئەی ئەو هەموو ئەندامەم بۆچییە ئەگەر ئیشم بۆ نەکەن و خزمەتم نەکەن؟!!

### ٣-هەڵس و کەوتی لەگەڵ مامە عەباسیدا (ﷺ):

( صهیب ) خزمەتکارێکی عەباس بوو دەگێڕێتەوە وە دەڵێت: عەلیم بینی دەست و قاچی عەباسی ماچ دەکرد و پێی دەووت: ئەی مامە، لێم ڕازیبە .[1]

سەرکردەی ڕاستەقینە ئاوایە لەگەڵ خزم و کەس و کاریدا و لەبەردەمیاندا دەبێت خۆی بەکەم بزانێت و پۆز لێ نەدات بەسەریاندا و سەردانیان بکات و ئەملاولایان ماچ بکات و لەسەر بەڕەکەشیان دابنیشێت و نەترسێت لەوەی جلەکانی تۆزاوی ببێ یان ئوتووەکەی تێك بچێت! .

و ( صدار الطائي ) وەسفی عەلی (ﷺ) دەکات وە دەڵێت: (( حەزی کردووە جل و بەرگی کورت بێت و چێشت و خواردنی سادە بێت، و لەناوماندا بوو وەکو یەکێك بوو لە ئێمە، پرسیارمان لێ بکردایە وەڵامی دەدایەوە و هەواڵێکمان لێ بپرسیایە ئاگاداری دەکردین لێی بەڵام وەڵڵاهی لەگەڵ ئەوەی کە چەند تێکەڵ و نزیك بوو لێمانەوە نەماندەوێرا بیدوێنین و هەیبەتمان لێ دەکرد .[2]

هەموو سەرکردەکانی لای خۆمان وا دەزانن ئەگەر تێکەڵی خەڵکی نەکەن و نەچن بۆ بازار و لەناو ڕیزی دواوەی پرسە و بۆنەکاندا دانەنیشن ئەوا هەیبەت پەیدا دەکەن و کەسایەتیان گەورە دەبێت، بەڵام پێشەوایانی یەکەمی ئومەتەکەمان بەو خاڵانە چوونەتە دڵی خەڵکییەوە گەورە بوون لەبەر چاویان بۆیە ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) فورموویەتی: ((تواضع المرء یکرمە )) واتە: خۆ بەکەم زانینی مرۆڤ بەرز و بەڕێزی دەکات .

( یان زانا و خوێندەوار و خاوەن بڕوانامەکانی ئەمڕۆ زۆر بە بەرزی سەیری خۆیان دەکەن و زۆر بە نزمی سەیری خەڵکی تر دەکەن من خۆم کەسێك دەناسم تا وەك خۆم بڕوانامەی بەکالۆریۆسی هەبوو لە بازردا دەوەستا بە دەمەوە و بەگەرمی مەرحەبای و هەواڵ پرسی لێ دەکردم بەڵام هەرکە

---

[1] صاحب المحول ( ٢٢٤/١ ) السیرة للذهبي ( ٩٤/٢ ) اسناده صحیح .

[2] الاستیعاب ( ١١٠٨/٣ )

بوو بە خاوەنی ماستەر! لە دوورەوە دەستێکم بۆ بەرز دەکاتەوە!! ئەوە لەگەڵ من وایە! ئەی دەبێ لەگەڵ خەڵکی نەخوێندەوار چۆن بێت هەی یاران .) ( وەرگێڕ )

دەی بە پێچەوانەوە ئەمیری باوەڕداران (ﷺ)ڕوو دەکاتە خوێندەوار و بڕوانامـەدارەکان و دەڵێـت: ئەگەر بووی بە زانا سەیری نەخوێندەوارەکانی خوار خۆت مەکە ـ تا خۆتت لێ نەگۆڕێ ـ بـەڵکو سەیری زانایانی سەرووی خۆت بکە .[١]

## چوارەم/ بەخشندەیی و دەرماڵ داریەکانی:

بەخشندەیی و دەست کراوەیی ڕەوشـتێکی مـەزنی قورئانییـە و پێغەمبـەری سـەروەرمان (ﷺ) هاوەڵانی لەسەر گۆشە کردووە و خۆشی بەکردەوە نیشانی داون کە دەبێت مـرۆڤ پـارەو سـامانی بەس بۆ خۆی نەبێت و دەستگرۆیی نەداران و هەژاران و داماوانی پێ بکات ..

پیاوێك هات بۆ لای عەلی کوڕی ئەبوطالیـب (ﷺ)پێـی ووت: ئـەی ئـەمیری بـاوەڕداران، مـن پێویستیەکەم تێت کەوتووە و داوام لە خوای گەورە کردووە پێش ئەوەی لە تۆی دوا بکەم، ئەگەر بۆم بکەیت ئەوا حەمدی و سەنای خودا و سوپاسی تۆش دەکەم، بەڵام ئەگەر بۆشیم نەکەیت ئەوا هەر سوپاسی خودا دەکەم و بیانووش بۆ تۆ دەهێنمەوە، وە عەلی (ﷺ) پێی ووت: پێویستیەکەت بەدەم مەیڵێ بەڵکو لەسەر زەوییەکە بینووسە چونکە پێم ناخۆشە لەناو چاوتا ووشەی سواڵ کردن بەدی بکەم، پیاوەکەش لەسەر زەوییەکە نووسی، من بێ پارەم، عەلیش (ﷺ) داوای دەستێ جل و بەرگی جوانی کرد، و بۆیان هێنا و دای بەو پیاوە و لەبەری کرد و لە خۆشیاندا بەدەم خۆیـەوە شعری دەووت:

| | |
|---|---|
| كسوتني حلة تبلى محاسنها | فسوف اكسوك من حسن الثناحللا |
| ان الثنا يحي ذكر صاحبه | كالغيث يحيى نداه السهل والجبلاً |

عەلیش (ﷺ)فەرمووی: پارەکانم بۆ بهێنن، و (١٠٠) دیناریان بۆ هێنا و ئەویش دای بەو پیاوە.. (الضيغ) یش ووتی بە عەلی (ﷺ): ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەو جل و بەرگە و (١٠٠) دیناریش!!

[١] هدايه الراشدين لا ( ١٠٥ ) ـ علي محفوط .

عەلی (ﷺ)فەرمووی: بەڵێ، من لەپێغەمبەر بیستووە (ﷺ)کە فەرموویەتی (( أنزلوا الناس منازلهم )) دەی ئەمەش پلە و پایەی ئەم پیاوەیە لە لام .[1]

لە ئیمام عەلیان پرسی: سەخاوەت چییە؟ ئەویش فەرمووی: (( ماڵ ببەخشیت پێش ئەوەی داوات لێ بکەن، چونکە دوای داواکردن بیدەیتێ ئەوە لە شەرم و بەخشندەییەوەیە )) .[2]

ئیمام (ﷺ) زۆرحەزی کردووە میوان ڕووی تێ بکات و زۆر شادومان بووە بەبینینی هاوڕێ و براکانی لە ماڵی خۆیدا و ئەگەر هەفتە تێپەڕیایە و میوانی نەهاتبایە غەم دایدەگرت و دەیفەرموو(حەوت ڕۆژ تێپەڕیووە میوانم نە هاتووە زۆر دەترسم خوای گەورە بێ بایەخی کردبم) .[3]

خێر و خێراتی ئەوقافەکانی کە لەژیانی خۆیدا لە ڕێی خوادا وقفی کردبوو دەگەیشتە (٤٠٠٠ ) دینار کەچی لە برساندا ئازاری دەچەشت وەك خۆی دەڵێت: (( چەند جار دەتبینم کە لەبرساندا بەردم دەبەست بەسکمەوە لە کاتێکدا کە خێر و صەدەقەی ئەوقافەکانم (٤٠٠٠) دینار بووە)) .[4]

هەموو جارێك هانی موسڵمانانی دەدا کە ڕێز و حورمەتی شایستەی ببەخشن بە هۆزەکانی خۆیان و دەیووت: (( ڕێزی هۆزەکەت بگرە، چونکە ئەوان دوو باڵی تۆن لە کاتی فرینتدا، بەهۆی ئەوانەوە دێت و دەچێت و بەهۆی ئەوانیشە باڵت درێژ دەکەیت، ئەوان تێشوون بۆ تۆ لە کاتی ناڕەحەتیدا، بۆیە ڕێزی پیاو چاك و ناودارەکنیان بگرە و سەر لە نەخۆشەکانیان بدە و لەکارەکانت دا بەشداریان بکە و کاری هەژارەکانیان ئاسان بکە .[5]

## پێنجەم/ شەرمکردن لە خوای تەعالا:

شەرم کردن یەکێکە لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلام و بەڵگەیە لەسەر خاوێنی دڵ و دەروون و ویژدانی زیندویی و بوونی دینداری و چاودێری خوای ـ عز و جل ـ بەسەر مرۆڤەوە، خۆ ئەگەلا شەرم نەبوایە، ڕێزی میوان نەدەگیرا و هیچ بەڵێنێ نەدەبرا سەر و ڕاسپاردە نەدەپارێزرا بۆیە ـ شەرم ـ کراوە بەیەکێ لە بەشەکانی باوەڕ .

---

[1] البداية والنهاية ( ٩/٨ ) .

[2] تاريخ الخلفاء للسيوطي لا ٢٠٤ .

[3] موعظة المؤمنين ( ٢/ ٢٥٢) .

[4] اسد الغابة ( ٧/٤) .

[5] فرائد الكلام لا ٣٤٨ .

عەلی کوڕی ئـەبوطالیـب (ﷺ)پـەروەردەی بەردەسـتی پێغەمبـەری خـودا بـووە (ﷺ) هـەموو ڕەوشتەکانی ئەوەی هەڵگرتبووە یەکێ لەو ڕەوشتانە ـ شەرم کردنی بووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) لـە کچێك شەرمن تر بووە لە شەوی گوێزانەوەیـدا .[1] دەی ئـیتر چـۆن ئـەم شـەرمکردنە جوانـە لـە کەسێتی عەلیدا ڕەنگ نەداوەتەوە، و عـەلی (ﷺ)خۆی سەبارت بەم ڕەوشتەی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

(( پەنا دەگرم بەخوا لە تاوانی هیچ کەسێك لە لێبوردنم گەورەتر بێت، یان نەفامیەك لـە لەسـەر خۆیم مەزن تر بێت، یان بینینی عـەورەتێك نـەتوانم بیپۆشـم، و یـان پێداویـستی کەسـێك کـە بەخشندەییم جێ بە جێی نەکات ))[2]

دەبینین هەموو ڕەوشتەکانی خۆی بەستەوە بەشەرم کردن لە خوای توعالا .

## شەشەم/ بەندایەتی و ئارامی و دڵسۆزی عـەلی (ﷺ) بۆ خودای ـ عز و جل ـ :

عەلی (ﷺ) لە ژیانیدا بەشێوازێکی گشتی زاراوەی بەندایەتی جێ بە جێ کردبوو، بەشەو نوێژدا دیار بوو، بوو بە یەکێ لەو کەسانەی کە زۆر نوێژ و ( تهجد ) ی دەکرد کە خوای گەورە دەرباریان دەفەرمووێت: (( تتجافى جنوبهم عن المضاجع يـدعون ربهـم خوفـاً و طمعـاً )) واتـە: خـەو لـە چاوەکانیان تۆراوە و لەناو جێگەدا هەر خەویان لێ ناکەوێت و لە بـەر ترسـی و لەبـەر پاداشـت هاواری ئەی پەروەردگاریان دەکەن .

ضراری کوڕی ضـمرهي کەنانی لە بەردەم موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیاندا (ﷺ) وەسفی ئیمـامی عەلی دەکات و دەڵێت: لە دنیا و ڕازاوەیی یەکانی تۆقیبـوو، و دڵـی زۆر خـۆش بـوو بـە شـەو تاریکایی یەکەی، بۆ خوا شایەتی دەدەم کە لە هەندێ حاڵەتدا دیوومـەن، تاریکـای شـەو بـاڵی کێشا بوو ... ئەستێرەکان زریوەیان دەهات، و لەناو میحرابەکەدا شـانەکانی دەلەرانـدەوە و بـە هەردو دەستی ریشی خۆی گرتبوو، بـەم لاولادا لارە لاری دەکـرد وەك مـار گەسـتوو، و دەگریـا

---

[1] مسلم ژ . ٢٣٢٠.
[2] تاريخ دمشق ( ٥٢٧/٤٢) .

گریانی خەمگین، گویم لێ بوو ئەڵێی ئەم ساتەیە دەیووت: ئەی پەروەردگارمان .. ئەی پەروەردگارمان .. لێ ی دەپاڕایەوە ـ و پاشان بە دنیای دەووت: ئایا دوتەوێت بمخەڵەتێنێت یان خۆشت دەوێم؟ نایبینی .. نایبینی .. خەڵکی تر مەغرور بکە، من سێ بەسێ تەلاقم داویت، تەمەنت کورتە... و دانیشتنەکانت بێ نرخن... و پلە و پایەت کورت خایەنە...

ئای لە کەمی توێشوومان... دوور و درێژی سەفەرەکە... ترسناکی ڕێگایەکە.... فرمێسک لە چاوی موعاویە هاتە خوارەوە بەسەر ڕیشیدا و بۆی نە دەوەستایەوە و بەدەستەکانی دەیسڕی و خەڵکەکەش دەستیان کرد بەگریان، موعاویەش ووتی ( ئەبو الحسن ) هەر وابووە (ﷺ) ئەی تۆ چیت لەسەری هەیە ئەی چرار؟

ئەویش ووتی: من لە دوری ئەو وەك ئەو کەسەم کە ڕۆڵەکەی لە باوەشی فڕێنراوە و سەرِبراوە، و فرمێسکی ووشك ناکات و خەفەتی دانامرکێتەوە.. پاشان هەستاو ڕوویشت .[1]

( ئەم بەسەر هاتەش ئەوە دەردەخات کە ئەو ناکۆکییەی کەوتە نێوان عەلی و موعاویە ـ خوا لە هەر دووکیان رازی بێت ـ رقەبەرایەتی شەخسی نەبووە و لەبەر هەوا و ئارەزوو نەبووە، بەڵکو لەبەر بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان بووە هەریەکە لە نەزەرێکی خۆیەوە، ئەگینا موعاویە چۆن ڕێگای دەدا لە کۆڕ و دانیشتنەکانی خۆیدا باسی خواناسی و چاکی عەلی بکرێت!... یان چۆن گریانی دەهات یان چۆن شاهێدی چاکی و خواناسی بۆ ( ابو الحسن) دەدا ؟!)[2]

(ئوشتەری نەخەعی) شەوێکیان دەچێت بۆ لای عەلی (ﷺ) دەبینی خەریکی شەو نوێژە، و پێی دەڵێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران بە ڕۆژدا ڕۆژو و، بە شەویشدا نەخەوتن و خۆماندیکردنیش لەو نێواندا ؟! کاتێ عەلی (ﷺ) لە نوێژەکەی بوویەوەپێی ووت: ئاخیرەت ڕێگایکی زۆر دوور و درێژە، بۆ بڕینی پێویست بە شەو ڕەوی دەکات .[3]

لە شوێنێکی تردا دەڵێت: ئەی خەڵکینە ئەم چەند وشەیەم لێوەربگرن، ئەگەر سواری وولاخ بن و بۆی برۆن تا ئەسپەکەتان لە ڕۆیشتن دەکەوێت شتی واتان دەست ناکەوێت: هیچ بەندەیەك ئومێدی بەکەس نەبێت جگە لە خودا، و تەنها لە گوناهەکەنتان بترسن، و شەرم مەکەن کە نازانن فێربن و

---

[1] حلیة الأولیاء ( ١/٨٤-٨٥ ) الرقة البکاء لا ١٩٨ .

[2] وەرگێڕ بۆ سەر زمانی کوردی .

[3] أدب الدنیا والدین لا ١٢٣ .

شەرم مەکەن ـ کە نازانن بڵێن نازانین، و بزانن ئارامی و خۆگرتن لەناو (بیر و باوەڕدا ) وەك سەر وایە بۆ لەش و لەشیش چ سوودێکی هەیە ئەگەر سەری نەبێت .[1]

لەم ئامۆژگارییەدا دەرباری یەکتاپەرستی و پاشان ڕێنمونی زانستی دەدوێت، دەربارەی تێڕوانینی پلەی ( ترس و ئومێد ) ـ الخوف والرجاء ـ ، باوەڕدار دەدوێت هەر بە تەمای خودا بێت چونکە هەموو بەخششەکانی هەر لەوەوە دەبێت و ئەو خەڵکەی کە بەخششت پێ دەدەن ـ ئەوانە هۆکارێکن لە نێوان خوا و بەندەدا و خوا لەرێگای ئەواەنەوە ڕۆزی بەندەکان دەدات .

یان ئامۆژگاری هەڵگرانی زانست و زانیاری دەکات و هانیان دەدات تا شەرم ڕێگایان لێ نەگرێت لە فێربوون و ئەگەر بوون بە زاناش شەرم ڕێگایان لێ نەگرێت بڵێن نازانین لەو شتانەی کە نایزانن و پاشان دەڵێت:

(( ئای هەڵگرانی مەشخەڵی زانست، کار بە زانستەکانتان بکەن، چونکە زانا کاتێك زانایە کەکار بە زانستەکەی بکات، و کردەوە و زانستی یەك بگرنـەوە، و کەسـانێ دێـن لەمـەولا مەشـخەڵی زانست و زانیاری هەڵدەکەن بەڵام لە گەردەنیان تێ ناپەرێت، هەڵس و کەوتی نهێنیان پێچەوانەی ئاشکرایانە، و کردەوەکانیان پێچەوانەی زانستەکانیانە، و دادەنیـشن و هەڵقـە دەبەسـتن، یـەڵام هەندێکیان خۆیان بەسەر هەندێکی تریان هەڵدەنێن، و تەنانەت هەندێ لەوانە تـووڕە دەبـەن لـە قوتابییانیان ئەگەر بەشداری هەڵقەیێکی تـر بکـات و گـوێ بـۆ زانایـەکی تـر بگرێـت، و ئەوانـە کردەوەکانیان لەو دانیشتنانەیاندا زیاتر بەرز نابێتەوە بۆ لای خودای ـ عز و جل ـ .[2]

( الله اکبر ) بێ کەم و زیاد ئەو ئامۆژگاریانەی عەلی (ﷺ) ئەڵێی بـۆ بانگـەوزانی ئیـسلامی و زانستی شەرعی ئەمڕۆ وتراوە ... چەند گرنگە ئەگەر سەرچـاوەکان یـەك بخرێنـەوە و سـوود لـە هەموویان وەربگرێت و سانسور نەخرێتە سەر هیچ زانا و هـیچ قوتابخانەیـەکی زانـستی و کـەس ئەوەی خۆی بە نیگا نەزانێت و دان بەوانی تردا نەنێت .[3]

---

[1] حلیە الاولیاء ( ۷۵/۱)

[2] الجامع لاخلاق الراوي(۹۰/۱) .

[3] ووتەی وەرگێر

## حەوتەم/ سوپاس گوزاری خوای ـ عز و جل ـ.

سوپاس گوزاری پەروەردگار ئەوەیە کە هەرچی نیعمەت و بەخششێکت پێدراوە بەکاری بهێنێت لەپێناو ئەو مەبەستەی کە بە هۆیەوە دروست کراویت، واتە هەموو بەخششەکانی، ماڵ و گیان و شتەکانی تریش بەکاربهێنیت لەپێناو بەندایەتی پەروەردگاردا و بە هەموو ئەندامەکانی لەش، ئەگەر وات کرد ئەوە سوپاس گوزاریت بە باشترین شێوە ئەنجامداوە .[1]

سوپاسیش تەنها بە دەم نابێت و بەڵکو هەر نیعمەتێك سوپاسەکەی بەخۆیەوە بەندە بۆ نموونە سوپاسی دەم ـ شوکورکردنی پەروەردگار و گوناه پێ نەکردنییەتی و سوپاسی چاو گوناه نەکردنە پێی و بەکارهێنانییەتی لە شتی چاك و خێردا ...

کەواتە خوای ـ عز و جل ـ ئەم سوپاسەی داواکردووە لە قورئاندا نەك تەنها سوپاسی دەمی، وەك دەفەرمووێت (( فاذكروني اذكركم واشكروا لي ولا تكفرون )) واتە: یادم بکەن یادتان دەکەم و سوپاسم بۆ بکەن و بێ باوەڕ مەبن و نەیفەرموو ( فاشکرونی ) واتە سوپاسم بکەن، بەڵکو فەرمووی ((واشکروا لي ))،

پێغەمبەری خواش (ﷺ) خاوەنی ئاستێکی زۆر بەرز بووە لەلایەن سوپاس گوزارییەوە و کاتێ عائیشەی خێزانی پرسیاری لێ کرد: کە ئایا بۆچی ئەوەندە خۆت دەرەنجێنی و شەو نوێژ دەکەیت بەبەر دەوامی لەکاتێکدا خودا لە گوناهی پێشووت و داهاتووت خۆش بووە؟ ئەویش فەرمووی: (( افلا أكون عبداً شكوراً )) دەی ئایا بەندەیەکی بە ئەمەکی سوپاس گوزار نەبم؟![2]

عەلی کوری ئەبو طالیب (ﷺ) پەروەردەی دەستی پێغەمبەر بووە (ﷺ) بۆیە سوپاس گوزاری لە هەموو شتێکیدا ڕەنگی دابوویە و تەنانەت لەسەر ئاویش دەهاتە دەرەوە دەستی دەهێنا بەسەر سکیدا و دەیووت: ئای چەند بەخششێکی گەورەیە، ئەگەر بەندە سوپاس گوزاری تەواوی لەسەر بکات .[3]

---

[1] اخلاق النبي في القران و إالسنة لا ١٨٥ .

[2] وتەی وەرگێڕ

[3] عدە الصابرین لا ١٢٢ .

و جارێك بە پیاوێكی هەمەدانی فەموو: (( بەردەوامی نیعمەت و بەخشش پەیوەستە بە سوپاس گوزارییەوە و سوپاس گوزاریش بەندە بە بەردەوامی بەخششەوە، و ئەو دووانە پێكەوەن، و بەردەوامی و زیادكردنی نیعمەت لە بەندە نابڕێت لەلایەن خواوە تا واز لە شوكر و سوپاس نەهێنێ،[1] بۆ نموونە سوپاس گوزاری لەسەر ئازایی و لێهاتووی ئەوەیە بەرامبەرە دڕاوەكەت ببەخشیت كاتێ دەستت چوو بەسەریدا و لە بارەیەوە دەڵێت: ئەگەر دەست چوو بەسەر نەیارەكەتدا ئەوە لێبووردنی لەگەڵ بەكاربهێنە وەك سوپاسی خوا لەسەر ئەو توانا و دەسەڵاتەت )) .[2]

## هەشتەم/ پاڕانەوە لە خوا:

دووعا دەرگایێكی زۆر گەورەیە ئەگەر لەسەر بەندە واڵابێت ئەوە دەرگای خێر و چاكەی بەسەردا واڵادەبێت...

بۆیە، ئەمیری باوەڕداران عەلی كوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) بەردەوام لە خزمەت پێغەمبەردا ژیاوە و لەسەر دەستی ئەو گەورە بووە بێگومان بینیویەتی كە چۆن پێغەمبەرمان (ﷺ) هانا دەباتە لای خوا و داوای سەركەوتن و كۆمەكی لێ دەكات ... ئیمامیش (ﷺ) هەر بەو چەشنە كاری تێ كرابوو، زۆر سوور بوو لەسەر ئەو بەندایەتیە گەورە و گرنگە، و پڕوا و پڕ هەوڵی دەدا هەر ئەو شێوازە دوعا پاڕانەانە دووبارە بكاتەوە كە پێغەمبەر خوا (ﷺ) لە ژیانیدا دووبارەی كردوونەتەوە و هەرگیز لای نەداوە بۆ دوعا گەلێكی تر كە ووشەكانی ڕازاوە و ماناكای گەورە بوون بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) نەی فەرمووبوون.

كۆمەڵێ دوعای زۆ و زەبەندی بە درۆیان بێ ئاگای دراوەتە پاڵ ئیمامی عەلی (ﷺ) و لە ڕاستیدا ئەو لێی بەرییە، چونكە ئەو زۆر پابەند بووە بە سونەت و فەرموودەی صەحیحەوە لە كردا و گوفتاریدا، و لە ژیاندا خاوەنی گیرابوونی دوعا بووە، جارێك لە جاران پیاوێك ـ وەك ( ئەبی عمر ڕازان ) دەگێڕێتەوە كە فەرموودەیێكی بۆ عەلی باس دەكرد، و عەلیش (ﷺ) پێی ووت: هەرچی وورد دەبەوە درۆم لەگەڵ دەكەیت، و پیاوەكە ووتی: درۆ ناكەم، و ئەویش پێ ووت: ئەگەر درۆ

---

[1] الشكر ـ ابن ابي دنيا ( ٤٨١/٥ ) .

[2] الاعجاز والأيجار ـ الثعالبي ـ لا (٣٠)

بکەیت دوعات لێ دەکەم، ووتی دوعام لێ بکە، و دوعای لێ کرد و ئەویش ئەوەندەی پێ نەچوو کوێر بوو .[1]

و هەرکاتێ بە چاکە باسیان بکردبایە دەیفەرموو: ((اللهم اغفرلي مالایعلمون ولا تواخذني بما یقولون، و اجعلني خیراً مما یظنون ))[2] واتە: خوایە لەو شتانەی ئەوان نایزانن لێم خۆش ببە و لەو شتانەشی کە دەیڵێن لێم نەگریت و چاکترشم بکەیت لەوەی ئەوان گومانی پێدەبەن .

و ئەمیری باوەڕداران (ﷺ)کۆمەڵێ ئاداب و ڕەوشتی سەفەرکردن روون دەکاتەوە و لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر خوا (ﷺ) هەر کاتێ ویستبێتی بچێت بۆ سەفەرێك فەرموویەتی: (( اللهم بك اصول، وبك اجول وبك اسیر )) واتە: ئەی پەروەردگارم بەناوی تۆوە دەگەڕێم و جەولە دەکەم و دێم و دەچم .

و لە شوێنێکی تردا ئادابێکی تری سەفر ڕوون دەکاتەوە و هەرکاتێ ویستبێتی بڕوات بۆسەفەر و دەیویست سواری وڵاخەکەی ببێت دەیووت (( بسم الله )) و کاتی تەواو دەچووە سەر وڵاخەکەی دەیووت: (( الحمدالله )) و پاشان دەیووت: (( سبحان الذي سخرلنا هذا و ماکنا له مقرنین، وانا الی ربنا المنقلبون )) و پاشان (٣) جار (الحمدلله) و (٣) جار (الله اکبر )ی دەکرد و پاشان دەیووت: (( اللهم لااله الا انت ظلمتُ نفسي فاغفرلي، انه لا یغفر الذنوب الا انت )) پاشان پێ دەکەنی، و لێیان پرسی هۆی چییە پێ دەکەنی ئەی ئەمیری باوەڕداران؟

و ئەویش لە وەڵامدا دەیووت: پێغەمبەری خوام دیوە (ﷺ) بەم چەشنەی کردووە و بە شێوەی منی ووتوە و پاشان پێکەنیوە، و لێمان پرسی هۆی چی بوو پێکەنیت پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ ئەویش فەرمووی: (( خوای (عز وجل) دەفەرموێ: عجبت للعبد، اذا قال لا اله الاّ انت، ظلمت نفسي فاغفرلي انه لا یغفر الذنوب الاّ انت، یعلم انه لا یغفر الذنوب الا هو ))[3] واتە سەرم سوڕدەمینێ لە بەندە کاتێ دەڵێیت: هیچ خوایەك نیە جگە لە تۆ، ستمم لە خۆم کردووە لێم خۆش ببە کێ هەیە لێم خۆش ببێت جگە لەتۆ، دەزانێت کەس نیە جگە لە ئەو لێ خۆش ببێت .

---

[1] البدایة و النهایة ( ٨/ ٦ )

[2] موعظة المؤمنین ( ٢/ ٢٢٨ )

[3] مسند احمد ( ١٨٣/٢ ) اسناده صحیح ـ قاله احمد شاکر .

و هەردەم ڕێنموونی موسڵمانانی کردووە تا بەو جۆرەی سونتە دوعا بکەن بەتایبەتی لە کاتی ئیش و کار و سەفەر و خواردن و خەوتن... هتدا دا ... و (ابن اعبد ) دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبوطالیب پێی ووتم: ئەی کوڕی ئەعبەد، ئەزانی هەقی نان خواردن چییە؟ ووتم: هەقەکەی چییە ئەی کوڕی ئەبوطالیب؟ فەرمووی: ((دەڵێیت: ( بسم الله، اللهم بارك لنا فيما رزقتنا، ووتی: ئەی دەزانیت شوکرکردنەکەی چییە؟ ئەگەر لێبویتەوە؟ ووتم: چیە شوکرەکەی؟ فەرموو: (( الحمدلله الذي أطعمنا و سقانا )) [1]

و هەرکاتێ مانگی بدیایە دەیووت: (( اللهم اني اسألك خير هذا الشهر و فتحه و نصره و بركته و رزقه و نوره و طهوره و هواه، و اعوذبك من شر، و شر ما فيه و شر ما بعده ) [2]

## نۆیەم/ سەرچاوەی باڵای دەوڵەت لە سەردەمی عەلیدا (ﷺ)

عەلی کوڕی ئەبی طالیب (ﷺ)سەرچاوەی هەموو دادوەری و حوکم و فقهییەکی دەولەتەکەی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمەر (ﷺ) و شوێن پێ هەڵگرتنی دوو پیاوە مەزنەکەی پێش خۆی بووە .

### ١- سەرچاوەی یەکەم: (( قورئانی پیرۆز )) :

قورئان هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتۆتەوە و هەموو ئەو شتانەی ڕوون کردۆتە کە دەبێتە هۆی ئاسودەکردنی ژیان و خۆش گوزەرانی خەڵکی و هەروەها ئەو پایانەی جێگیر کردووە کە بەهۆیەوە موسڵمانان دەوڵەتی لەسەر بنیات بنێن و حوکمڕانی گەلی پێ بکەن، کە ئەمەش ڕەدێکە بۆ ئەو کەسانەی کە دوورن لە حەقیقەتی قورئان و شارەزانین لە مانا و مەبستە بەرزەکانی و نایشیانەوێ لێی تێ بگەن دەڵێن ئیسلام و حوکمڕانی دوو شتی جیان و ئیسلام لە مزگەوت دەبێت و حوکمیش بۆ خەڵکانی تر کە ئەمە پێچەوانەی ڕاستییە و ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە کە حوکمی وڵات و میللەت بکات .[3]

---

[1] مسند احمد (٢/٣٢٩) اسناده حسن .

[2] صحيح ابن ماجة ـ الالباني ( ٢/ ٣٠٣) .

[3] ووتەی وەرگێر

عەلی (ﷺ) دەڵێت: ((الزاموا دینکم، و واهدوا بهدی نبیکم، واتبعوا سنته ، واعرضوا مما اشکل علیکم علی القران، فإن عرفه القران فالزموه، و ما أنکره فردوه )) واته: دەست بگرن بە ئاینەکەتانەوە و شوێن ڕێنموونی پێغەمبەرەکەتان بکەون، و سوونەتەکانی جێ بە جێ بکەن، هەرشتێکتان لێ تێك چوو بگەڕێنەوە بۆ لای قورئان، ئەگەر قورئان بەجوانی زانی دەستی پێوەبگرن و ئەگەر پێی باش نەبوو ڕەدی بکەنەوە .

## ٢- سەرچاوەی دووەم/ سوننەتی خاوێن:

کردار و گوفتاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە سەرچاوەی دووەم دادەنرێت لە دارشتنی دەستووری ئیسلامیدا و لە ڕێگای ئەوەوە شێوازی جێ بە جێ کاری حوکمەکانی قورئانی کەریمان بۆ دەردەکەوێت .[1] و ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) دەڵێت: (( ڕێنموونیەکان پێغەمبەرەکەتان جێ بە جێ بکەن، چونکە بێگومان باشترین ڕێنموونی کەرە و سوننەتەکانی جێ بە جێ بکەن چونکە چونکە بێگومان باشترین سوننەت و ڕێڕەوە .[2]

## ٣- شوێن پێ هەڵگرتنی خەلیفەکانی پێش خۆی:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (( اقتدوا بالّذین من بعدي: أبي بکر و عمر ))[3] واته (( شوێن پێی ئەو دوو پیاوە هەڵگرن کە دوای خۆم دێن: ئەبوبکر و عمر )) و ڕایشی سەبارەت بە عثمان (ﷺ) زۆر جوان بووە، و هەمیشە دەم کوتی ئەوانەی کردووە کە جورئەتیان کردووە بەرامبەری و بێ حورمەتیان نواندوە، و بەو کەسانەی دەووت: ئەی خەڵکینە لەمەسەلەی عوسماندا بەهەڵەدا نەچن، و بە چاکە نەبێت باسی مەکەن، و سوێند بە خوا ئەو کارەی کردی ـ لە سووتاندنی نوسخەکانی تری قورئان ـ بە بەرچاو و بەڕەزامەندی هەموومانەوە کردی، و سوێند

---

1 فقه التمکین في القران الکریم ـ الصلابي لا ٤٣٢ .

2 البدایة والنهایة ( ٣١٩/٧ ) .

3 صحیح سنن الترمزي ( ٢٠٠/٣ )

بەخوا ئەگەر منیش ببومایە بە خەلیفە هەر وام دەکرد،[1] و هەردەم دەیووت: (( ما كنت لاحلّ عقدة شدها عمر ))[2] واتە: گرێ ناکەمەوە کە عمر توندی کردبێت .

## دەیەم/ مافی گەل لە چاودێری کردنی دەسەڵاتداراندا:

گەڵ بۆیە هەیە چاودێری هەنگاوەکانی بەر پرس و دەسەڵاتدارانی وڵات بکەن و لە ژێر ڕۆشنایی ئەو ئایەتەدا کە دفەرووێت ((وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ))[3] واتە: دەبێت لەناو ئێوە کەسانێك هەبن خەڵکی بەرەو چاکە بانگ بکەن و فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە بکەن و ئەوانەش سەرفرازانی ڕۆژی قیامەتن .

یەکەم ووشەیەك ئەمیری باوەڕداران ـ لە وتارەکەیدا دای کاتێ هەڵبژێررا بە خەلیفە ووتی: ئەم مەسەلەیە مافێکی ڕەوای خۆیاتانە و کەس بۆی نیە ببێت بە خەلیفە بە فەرمانی و ڕەزامەندی ئێوە نەبێت، و من هیچ قەسەیەکم نییە بەبێ ڕەزامەندی ئێوە .[4]

ئەبوبەکریش (ﷺ)کاتی خۆی هەمان ووتەیدا بە گوێی جەماوەری باوەڕداردا و پێی ووتن: ئەگەر باشم کرد هاوکارم بن و ئەگەر خراپەم کرد ڕاستم بکەنەوە .[5]

و عمریش (ﷺ) ووتوویەتی: (( احب الناس اليّ من رفع اليّ عيوبي ))[6]

و عوسمانیش (ﷺ) وتوویەتی: (( ان و جدتم في كتاب الله ان تضوا رجلي في القيد فضعوا رجلي في القيد ))[7] واتە: ئەگەر مەسەلەیەکیان لە قورئاندا بەدی کرد هەردوو قاچی من بکەنە کۆتییەوە و بمکەنە کۆتەوە، واتە بە زۆر وام لێبکەن پابەندم بە قورئانەوە .

و عەلیش (ﷺ) لەسەردەمی خیلافەتی خۆیدا ئەمەی زۆرجار دووپاتی کردۆتەوە و لە ووتاردا ووتوویەتی: ئەی خەڵکینە ئەوانەی پێش ئێمە بەوە لە ناوچوون کە دەستیان کرد بە گوناه کردن و

---

[1] فتح الباري ( ٨/٩ ) إسناد صحيح .
[2] أبن ابي شيبة المصنف ژ ١٢٠ .
[3] ال عمران ١٠٤ .
[4] تاريخ الطبري (٤٤٩/٢ ) .
[5] البداية والنهاية ( ٣٠٥/٦) .
[6] اشيخان ابوبكر و عمر لا ٢٣١ .
[7] مسند احمد ژ ٥٢٤ .

کەچی ئەحبار و قەشەکانیان بەرگریان لێ نەکردوون، و سزاش هەموویانی گرتەوە، بۆیە فەرمان بە چاکە بکەن و بەرگری لە خراپە بکەن و پێش ئەوەی ئەوەی بەسەر ئەوان هات بەسەر ئێوەش بێت، بیشیزانن فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە نە دەبێتە هۆی بڕینی ڕۆژی و نزیك كردنەوەی ئەجەلتان .[1]

## یانزیەم: (( شوری ))

لە بنەما سەرەکیەکانی دەولەتی ئیسلامی ئەوە زاراوەیەکە پێی دەڵێن ـ شوری ـ ڕاوێژکردن ـ واتە سەرکردە و ڕیش سپیانی وڵات پێکەوە ڕاوێژ دەکەن، و ئەمەش شتێکی سەربەستانە نییە کە ئەمیر بە ئارەزووی خۆی کەی حەزبکات ڕاوێژیان پێ بکات، بەڵکو فەرمانی خوایە و واجبە لەسەری وەك خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت ((و شاورهم في الأمر )) ال عمران، واتە: لە هەنگاوەکانتدا ڕاوێژ بە موسڵمانان بکە، و بەو شێوە دەردەکەوێت کە حوکمی شوری لە ئیسلامدا وەك حوکمی نوێژ و ڕۆژو واجبە .[2]

ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ)وەك سێ خەلیفەکەی پێش خۆی ئەم فەرمانەی خوای گەورەی جێ بە جێ دەکرد و ڕاوێژی بە موسڵمانان دەکرد و نموونەش بۆ ئەوە کاتێك مەعقەلی کوڕی قەیس ( الریاح ) کە ئەرکی جەنگی خستبووە سەری دژی ( خەریبی کوڕی ڕاشیدی خاریجی ) و ئەویش نامەی بۆ عەلی نارد کە چی بکەم و ئەویش هەموو هاوڕێکانی دەوروبەری کۆکردەوە و نامەکەی بۆ خوێندنەوە و داوای ڕاوێژی لێ کردن کەڕای خۆیان لەو بارەیەوە بنووسن، و ڕای گشتی یان هاتە سەر ئەوەی کە: بنووسە بۆ مەعقەلی کوڕی قەیس کە شوێن ئەو فاسقی لە سنوور دەرچووە بکەوێت و بیدۆزێتەوە و بیکوژێت یان دووری بخاتەوە، چونکە ئێمە دڵنیاین لێی کە خەڵکیت لێ هەڵنەگێڕێتەوە.[3]

---

[1] تفسير ابن كثير (٦٠٣/٢) .

[2] النظام السياسي في الاسلام لابي فارس لا (٩) .

[3] تاريخ الطبري ( ٣٩/٦) .

و دەربارەی ڕاوێژکردنیش دەڵێت: ( الاستشارة عين الهداية وقد خاطر من استغني عنه )[1] واتە: ڕاوێژکردن چاوی ڕێنموونییە، و هەرکەس نەیکات ئەوە خۆی دەدات بە قەڵبە یەکدا .

یەکی لە ئامۆژگارییەکانی بۆ ( مالك کوڕی حارث (ألاشتر) ) کاتێ ناردی بۆ میسر، هاندانی بوو لەسەر ڕاوێژکردن و ڕاوێژکاری، و پێی ووت: هەرگیز بەخیل و پیسکە مەخەرە ناو ڕاوێژکارەکانت چونکە ناهێڵێت خێر و چاکە بکەیت و لە هەژاری ئەترسێنێت، و ترسنۆکیش دامەنێ چونکە لاوازت دەکات لە هەنگاونان، و دنیا پەرستیش دامەنێ چونکە فێری هەڵپە هەڵپی ناڕەوات ئەکات، و بزانە کە ـ ئەو سێ ڕەوشتە ـ پیسکەیی و ترسنۆکی و دنیا ویستی ـ لە یەك ڕەوشتدا یەك دەگرنەوە ئەویش گومانی خراپ بردنە بە خودا .[2]

دیسان ئامۆژگاری مالیك بەوە دەکات ـ کاتێ کردی بە سەرداری میسر ـ جوان بڕوانە بۆ کاری ئەو کەسانەی بە کاریان دەهێنێت و دەیان کەیتە بەرپرس، با هەڵبژاردنت بە ئارەزووی خۆیان بێت و لەبەر خۆشەویستی و جیاوازی کردن نەبێت ـ چونکە خود کاری واتە ـ چەوساندنەوەیە بەبێ ڕاوێژکردن ـ هەڵبژاردنی بەرپرس لەبەر دۆستایەتی بێت ئەوە سەرچاوەی ستەم و خیانەتە لە خوای گەورە، و زیان گەیاندنە بە خەڵکی، و کاری میللەت و کاری والییەکان دروست نابێت، گەر بە جوان هەڵبژاردنی ئەوانەی دایان دەنێت بۆ بەرپرسیارەتی کارەکانی دەولەت، ئەو کەسانە هەڵبژێرە بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان کە ئەهلی خۆ لە گوناه پارێزن ، الورع ـ خاوەنی ـ عفە ـ و زانیاری و سیاسەت بن و پەنا ببە بەر ژیر و دنیا دیدە و شەرمنەکانی خێزانە صالحەکان و دیندار و خۆ پارێزەر لە گوناهان، چونکە ئەوان زۆر ڕەوشت بەرزن و زۆر مەبەستیانە سیرەت پاك و پیاو چاك و دوور بن لە زیادە ڕەووی لە تەماحکاریدا، و لە خەڵکانی تر زیاتر بیر لە ئەنجامی کارەکان دەکەنەوە، و دەی با ئەوانە هاوکار و کارمەندت بن.[3]

[1] الاداره العسكرية (٢٧٩/١)

[2] (٢٧٩/١) هەمان سەرچاوە

[3] الشورى بين الاصالح و المعاصرة لا ١٠٢ .

## دوانزەیەم/ داد و یەکسانی:

لە ئامانجەکانی حکومەتی ئیسلامی سوور بوونە لەسەر بەرپاکردنی ئەو بنەمایانەی نیزامی ئیسلامی بۆ بەرپاکردنی کۆمەڵگەی موسڵمان و لە گرنگترینی ئەو بنەمایانەیە ( داد و یەکسانی، و ئەمیری باوەڕداران دادپەوەری لەناو خەڵکدا بەرپاکرد . و هەر لەبەر هاتنەدی هەموو ئەو ڕەوشتانەی کە لە سەرکردە و قاچی موسڵماندا هەیە لە ئەمیری باوەڕداراندا، وای لیّ کرد بوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەلیبژارد و ناردی بۆ یەمەن و کردی بە قازی ئەویّ، و ئەم دوعایە مەزنەشی بۆ کرد و پێی فەرموو: (( اللهم ثبت لسانه واهد قلبه ))[1] واتە: (( ئەی پەروەردگارم زمان پارا و دڵ وریای کەیت )) . بۆیە ئاساییە کە عەلی دادپەروەر بێت، و ئیّ خۆ ئیسلام نەبوونی باشترە لە کۆمەڵگەیەکی موسڵماندا بێت و ستەم تابینە قاقا هاتبێت .

هەڵوێستە دادپەروەرییەکانی دڵ کەمەندکێش دەکەن بۆ لای ئیسلام و ژێرمەندەکان سەرسام دەکات .

لە ( شورەیح ) ەوە دەگێرنەوە کە کاتیّ ئەمێری باوەڕداران عەلی خوای لیّ ڕازی بیّ کەوتە ڕیّ بۆ تەمیّ کردنی سوپاکەی موعاوییە (ﷺ) و لە ڕێگا قەڵغانەکەی لیّ وون بوو، و کاتیّ جەنگ کۆتایی هات و گەڕایەوە بۆ کوفە، دەبینیّ قەڵغانەکەی بە دەست جولەکەیەکەوەیە و دەیەوێت بیفرۆشیت، وپیّ ووت: ئەی کاکی جوولەکە ئەمە قەڵغانەکەی منە و نە فرۆشتوومە نە بە خشیوومە، جولەکەش ووتی: قەڵغانی خۆمە وە لە دەستی خۆمدایە، عەلی (ﷺ)ووتی: با برۆین بۆ لای قازی، هەردووکیان چوون بۆ لای شورەیح، و ئەو لە پاڵ شورەیحدا دانیشت و جولەکەش لەبەردەمیدا، شورەیح ڕووی کردە عەلی و ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران قسەی خۆت بکە؟ و عەلی (ﷺ) ووتی: ئەم قەڵغانەی لای ئەم جولەکەیە هی منە نە فرۆشتوومە نە بەخشیوومە، و شورەحیش ـ رضی الله عنه ـ ووتی پێی شایەتت هەیە ، ووتی: بەڵیّ: قەمبەر و حەسەن و حوسێن شایەتی دەدەن ئەم قەڵغانە هی منە، شورەیح ووتی: شایەتی کوڕ بۆ باوك نابێت، و عەلی (ﷺ)

---

[1] نظام الحكم في العصر الراشدي ـ ١٤١ .

ووتی: پیاوێك لە ئەهلی بەهەشت بە شایەت ناگیرێت؟! کە لە پێغەمبەری خوام بیستووە (ﷺ) کە فەرموویەتی (( الحسن والحسين سيدا شباب أهل الجنة ))[1] .

جولەکەکەش ووتی: ئەمیری باوەڕداران ئەمبات بۆ لای قازی خۆی و قازیەکەشی حوکم بۆ من دەدات؟ شایەتی دەدەم ئەم بەرنامەیە ڕاستە (( اشهد ان لا اله الا الله و اشهد ان محمداً رسول الله )) و ئەو قەڵغانەش قەڵغانەکەی خۆتە و ئەو شەوە لێت کەوت کە چوویت بۆ (صفين) و من هەڵم گرتەوە . عەلی (ﷺ) فەرمووی: کە مادەم موسڵمان بوویت ئەو قەڵغانە و ئەسپەکەشم دیاری بێت بۆ تۆ، دەڵێ: بینم لە نەهرەوان دژی شەڕخوازەکان دەجەنگا لە خزمەت عەلیدا (ﷺ).[2]

نمونەیێکی تر لە دادپەروەری عەلی (ﷺ)... ناحیە القرشی ـ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە ئێمە کۆمەڵێك بووین لە بەر دەرگای قەسری خیلافەت راوەستا بووین و لە ناکاو عەلی (ﷺ)هاتە دەرەوە و کاتێ چاومان پێی کەوت لەبەر هەیبەتی بڵاوەمان لێ کرد و کاتێ دای بە لامانـدا شوێنی کەوتین و لە ڕێگا پیاوێك بەدەنگی بەرز هاواری کرد، بۆ خاتری خوا فریام کەون .

بینی وا دوو کەس پێکەوە شەڕ دەکەن و دای بەسینگی هەردووکیاندا و لەیەکی دوورخستنەوە و پاشان پێی ووتن: بڕۆنە دواوە .

یەکێکیان ووتی ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەم پیاوە مەڕێکی لە من کڕیوە و مەرجم لەسەری ئەوە بووە کە پارەی عەیبدار و ـ تزویر ـ م پێ نەدات، کەچی لەو پارەیەی بۆ هێناوم و کاتێ بۆم هێناوەتەوە زلەیەکی لێ داوم... و بەوی تری ووت:ئەی تۆ چی دەڵێیت؟ ووتی: ڕاست ئەکات ئەی ئەمیری باوەڕداران . عەلی (ﷺ) ووتی: دەی مەرجەکەی پێدەرەوە و پاشان پێی ووت: دانیشە، بە پیاوە زللە لێدراوەکەی ووت: تۆڵەی خۆتی لێبکەرەوە... ئەویش ووتی: ئەی ئەگەر لێ ی ببوورم ئەی ئەمیری باوەڕدارن، و عەلی (ﷺ) فەرمووی: ئارەزووی خۆتە، ووتی: کاتێ پیاوەکە ویستی بڕوات فەرمانی دەرکرد بیگرن و بیبەن و ئەوانیش گرتیان بە کۆلیانەوە وەك چۆن منداڵەکانی حوجرە هەڵدەگرێت و فەرمانی دەرکرد (١٥) داری لێ بدەن و فەرمووی: ئەمە تۆڵەی ئەو کەسەیە کە حورمەتی یەکێ تر دەشکێنێت و لە ڕیوایەتێکی تردا ووتوویەتی:ئەمەش مافی دەوڵەتە .

---

[1] مصنف ابن شيبه ١٢٢٢٥ ، لە زۆر رووەوە (صحيح ) ە .

[2] تاريخ الطبري ( ٧٣/٧٢/٦) .

ئەمەیە بەرپرسی دڵسۆز و دادپەروەر و ڕاستەقینە، و تێکەڵ بە میللەت و لە بازاردا و لە ناو کۆڵانەکاندا حوکمی نێوان ناکۆکیەکان دەکات و مافی ماف خوراو دەگێڕێتەوە .

یەکێ تر لە هەڵوێستە پڕ لە دادپەروەرییەکانی عەلی (ﷺ) ئەوەیە کە (عاصم) کوڕی کولەیب لە باوکییەوە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە ئەسفەهانەوە پارە و سامانێکی زۆر هات بۆ عەلی کوڕی ئەبوطالیب (ﷺ)و ئەویش کردی بە حەوت بەشەوە و لە ئاکامدا یەك نان بە تاك مایەوە و ئەو نانەش کردی بە حەوت پارچەوە هەر پارچەیێکی خستە سەر بەشێك و پاشان قورعەی کرد بۆ ئەوەی کێ یەکەم کەس یەکەم بەش دەبات .[1]

( ئەبو رافع ) بەرپرسی (بیت المال ) بوو لە سەردەمی عەلیدا (ﷺ) دەڵێت: ڕۆژێك عەلی (ﷺ) هات بە ژورا و دەبینی زەینەبی کچی ڕازانراوەتەوە بە خشڵێکی جوان کە وورد بوویەوە ناسیەوە کە لە ئالتونەکانی ـ بیت المال ـ و پرسیاری کرد: ئای ئەمەی لە کوێ بووە؟ لەبەر خاتری خوا لەسەرم پێویستە دەستی ببڕم، و دەڵێت: کاتێ بینیم وا خەریکە بەڕاستییەتی و سوێندەکەی دەباتە سەر، ووتم: سوێند بە خوا ئەی ئەمیری باوەڕداران ـ من لە( بیت المال ) بۆم هێنا و برازاکەمم پێ ڕازاندەوە، دەی ئەو چۆن دەتوانێت ئەو کارە بکات ـ دزی بکات ـ ئەگەر من پێم نەدایە .[2]

ڕۆژێك پارەی لە (بیت المال ) بەیەکسانی دابەش دەکرد لەنێن موسڵماناندا، دوو ژن یەکەمیان عەرەبی بوو، دووەمیان عەجەمی بوو، عەرەبیەکە ڕخنەی گرت ـ و ووتی: وەڵلاهی من ژنێکی عەرەبیم! و ئەمە عەجەمییە!! . عەلی (ﷺ) لە وەڵامدا پێی ووت: وەڵلاهی وا نازانم هیچ جیاوازییەك هەبێت لە نێوان نەوەی ئیسماعیل (ﷺ) و نەوەی ئیسحاق (ﷺ) .

یان جارێکیان عەمری کوڕی سەلەمە کە عەلی (ﷺ)کرد بووی بە بەرپرس لەوێ ـ هاتەوە بۆ کوفە بە کۆمەڵێ شت و مەکەوە کە تیایدا چەند گۆزەیەك هەنگووین و ڕۆن هەبوو، (ام کلثوم)ی کچی ئەمیری باوەڕداران جوابی نارد بۆ عەمر کە هەندێ لەو هەنگووینانەی بۆ بنێرێت و ئەویش بۆی نارد، و لە بەیانی ڕۆژی داهاتوودا عەلی (ﷺ) ویستی دابەشی بکات بەسەر موسڵماناندا دەبینێ دوو گۆزەی کەم کردووە، پرسیاری کرد بەڵام عەمر شاردییەوە و پێی نەوت ووتی خۆم

---

[1] الكامل في التاريخ ( ٤٤٢/٢ ) .

[2] تاريخ الطبري ( ٧٢/٦ ) .

دەیان هێنمەوە، و عەلی وازی نەهێنا و عەمر ناچار بوو پێی ووت، و عـەلیش (ﷺ) نـاردی بـە دوای دوو گۆزەکەدا لە ماڵی کچەکەی و هێنایانەوە. دەبێنێ لێیان کەم بـووە، نـاردی بـۆ بـازار دەبینێ بای (٣) درهەمی کەم کردووە، و پاش ئـەوەی پـڕی کردنـەوە دەسـتی کـرد بـە دابـەش کردنیان.[1]

سیانزیەم/ سەربەستییەکان

سەربەستی یەکێك بوو لەو بنەما سەرکییانەی کە حوکمـەتی ئیـسلامی لـە سـەردەمی خەلیفـە ڕاشیدیەکاندا لە سەری وەستا بوو، و بە پێی ئەم بنەمایە دەولەت سەربەستی تەواو زامن دەکات بۆ یەکە یەکەی ئەندامانی کۆمەڵگا، وە لە سەرووی هەموویانەوە ئەوەیە کە هـیچ کەسـێك یـان هۆز و نەژادێك بە زۆر موسڵمان ناکرێت و خۆی سەربەست دەکرێت لە هەڵبژاردنی ئاینداا .

ئیسلام لەو کاتەی کەهات شتێکی نوێ ی هێنا و هیچ کەسی ئەو سەردەمە زاراوەی سەربەسـتی بوونی نەبیستبوو بۆ نموونە ڕۆم و فارسەکان دوو ڕژێمی چەوسێنەری نەیارەکانیان بوون ئـیتر لـە بواری باوەڕدا یان لە بواری سیاسەتدا بەبێ جیاوازی و کەمایەتییـە ئاینییـەکانی ژێـر دەسـتیان بەردەوام دەیان ناڵاند بە دەستیانەوە .

و ئەمیری باوەڕدران عەلی (ﷺ) زۆر ووتەی هەیە لەسەر ئەو سەربەستییە کە مافێکی سـەرەتای هەموو مرۆڤێکە و کەس بۆی نییە پێشێلی بکات، لەو ووتانەی: ((بئس الزاد على المعاد، العدوان على العباد )) واتە: چ تێشوویەکی خراپە لە قیامەتدا، دەسـت درێـژی کردنـە سـەر بەنـدەکانی خودا))[2] و دیسان لێیەوە دەگێرنەوە کە ووتوویەتی: (( ليس من العدل القضاء على الثقة بالظن ))[3] واتە: ڕاست نییە متمانە بەگومان لەناو ببرێت .

پرۆگرامی سەربەستی زۆر بە جوانی و ڕوونی لە سەردەمی حوکمڕانی ئەمیری باوەڕداران عەلیـدا دەردەکەوێت، لەگەڵ بوونی ـ ئاشوب ـ پیلان ـ جەنگ ـ دا کە جێگای خۆی بوو یاسایەك پیـادە

---

[1] الكامل في التاريخ (٢/٤٤٢) .

[2] نظام الحكم في عهد الخلفاء الراشدين لا ١٦٥ .

[3] هەمان سەرچاوە .

بکات کە هات و چۆ و چالاکی هەندێ خەڵکی سنووردار بکات کە ئەمڕۆ پێ دەڵێن ڕاگەیاندنی باری ئاسایی ـ الطواري ـ .
بەڵام عەلی (ﷺ) سەرپەستی کەسی سنووردار نەکرد و یاسای باری نائاسای ڕانەگەیاند،ئیتر بالە تاقمی موعاویە بوایە یان لە تاقمی خۆی، و زۆری لە کەس نەکردوە کە بێنێتەوە یان بڕوات لە ژێر سنووری دەسەڵاتیدا، و تەنەنات زۆری لە کەسیش نەکردووە کە لەگەڵیدا بڕۆن بۆ جەنگ، و بەرگری لە هیچ یەکێك لەوانەش نەکردووە کە ویستوویانە خۆیان بگەیننە موعاویە (ﷺ).[1]
و هەروەك سەرپەستی هاوڕێکانی عبداللە کوڕی مەسعود (ﷺ) عبیدە السلمانی و الربیع بن خیثم، ی نەگرتەوە لەوەی کە بەزۆر بیانبات لەگەڵ سوپاکەیدا بۆ جەنگ کە خۆیان ڕەدیان دەکردەوە جەنگ لەگەڵ موسڵمانانی شامدا بکەن، بەڵکو ڕێگەشی پێدان بڕۆن بۆ خاڵەکانی سەر سنوور و لەوێ ژیان بەرنەسەر وەك خۆیان پێیان خۆشە .[2]
و کاتێك (خەوارج) ەکان لە دژی هەستان و سەر کەشیان ڕاگەیاند لە دوای جەنگی (صفین ) بەهۆی ئەوەی کەیاسای (تەحکیم) ی قبوڵ کرد، و ئەوان وازیان لێ هێنا و بەپێچەوانەوە دژی وەستان، بەڵام عەلی (ﷺ) هەرگیز زۆری لێ نەکردن لە ماڵەوە بمێننەوە ( الإقامة الجبرية ) بەڵکو بۆیان هەبوو بۆ هەر جێیەك کە خۆیان پێیان خۆش بێت، نەك هەر ئەوە بەڵکو بە والی و بەرپرسەکانی خۆی دەووت کەستان دەست نەدەنە ڕێگایان مەگەر وەختێك گەندەڵی لەسەر زەوی بەرپابێت یان دەست درێژی بکەنە سەر خەڵکی .[3]
و هەردەم بەو خەوارجانەی دەووت: لەلایەن ئێمەوە سێ شتان بۆ هەیە، بەرگریتان لێ ناکەین لە نوێژ لە مزگەوتدا، بێ بەشتان ناکەین لە فەیئو دەستکەوت مادەم لەگەڵماندا بوون لە کاتی دەست کەوتنیدا، و جەنگیشتان لەگەڵ ناکەین تا ئێوە جەنگمان لەگەڵ نەکەن .[4]

---

[1] هەمان سەرچاوە لا ١٥٩ .

[2] هەمان سەرچاوە لاپەرە .

[3] نظام الحكم في العهد الراشدي لا ١٦٠ .

[4] تاريخ الطبری (٥/٦٨٨) .

## جیٚ باسی سێیەم

## ژیان لەناو کۆمەڵگا و فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە :-

### یەکەم/ بانگەوازی یەکتاپەرستی و دژایەتی بتپەرستی:

ژیانی ئەمیری باوەڕداران علی (ﷺ) پڕیەتی لە بانگەواز بۆ خوا بەیەك ناسین و ناساندنی ماناکانی باوەڕ بەخەڵکی، وپشت بەستن بە خواو ترسان لە پەروەردگار، و پێناسە کردنی ئەو خودایە لە ڕێگای ناوە جوانەکانی و سیفاتە بەرزەکانییەوە، دژایەتی بتپەرستی کرد بە هەموو جۆرەکانیەوە:

١- عەلی (ﷺ)دەڵێت: (( لا یرجون عبد الاّ ربە و لایخافنّ الا ذنبە )) واتە: هیچ بەندەیك بەتەمای کەس نەبێت جگە لە پەروەردگار و لە هیچیش نەترسێت جگە لە تاوانەکانی، ئەمەش جوانترین ووتە کە بەتەما بوون ـ الرجاو ـ بۆ کاری خێر و ترسیش بۆ کاری خراپەیە . و شەیتانیش دەڵێت: من خەڵکم بە گوناه کردن لە ناو بردوە بەڵام ئەوانیش بە ( لا الە الاّ اللە ) و تەوبە کردن منیان لەناو بردووە .[1]

لەو ووتە بە نرخەی عەلیدا (ﷺ) ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە گوناه کردن سەرچاوەی هەموو نەهامەتی و نەگبەتی و بەڵایەکە، ئەگەر مرۆڤ بیەوێت لە هەرشتێکی خراپ یان کەسێکی زۆردار ڕزگاری ببێت با واز لە گوناه بێنێت و تەوبە بکات .

وەك لە ئەسەردا هاتووە: خوای گەورە دەفەرمووێت (( من ـ اللە ـ م، گەورەی هەموو دەسەلاتدار و پادشاکانم دڵی پاشاکان لەناو دەستی مندایە، هەرکەسێك گوێڕایەڵم بێت دڵیان پڕ دەکەم لە ڕەحم و بەزەیی بەرامبەری ، و هەر کەسێك سەرپێچی کارم بێت ئەوە دڵیان پڕ دەکەم لە خەشم و قین بەرامبەریان، و خۆتان خەریك مەکەن بە قسە ووتن بە پادشا و فەرمانڕەوایان بەڵکو گوێڕایەڵی من بکەن دڵیان پڕ دەکەم لە سۆز و بەزەیی بەرامبەرتان .

---

[1] مسند ابي يعلى (١٢٣/١) الفتاوى (١٠١/٨) .

## ٢- ناساندنی ناوه جوانەکانی خودا ـ بە خەڵکی:

خوای گەورە دەفەرموویت: ((فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ )) "محمد: ١٩" واتە: بزانە کە هیچ خوایەك نییە جگە لە خوا (الله) و داوای لێ خۆشبون بکە بۆ گوناهەکانت، و هەرکەسێك زیاتر خوا بناسێت، زیاتر لێی دەترسێت (( انما یخشی الله من عبادة العلماءُ ))

و لە فەرموودەی ـ صحیح ـ دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( ان لله تسعة و تسعین إسماً من احصاها دخل الجنة ))[1] واتە: خوای گەورە (٩٩) ناوی هەیە هەرکەسێك لە بەریان بکات و کاریان پێ بکات دەڕواتە بەهەشتەوە .

لەبەر گرنگی ئەم زانستە بوو ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) ووتوویەتی: (( یا طالب العلم، ان للعالم ثلاث علامات،: العلم بالله وبما یحب الله، و بما یکره الله ))[2] واتە: ئەی خوێندکاران، زانا سێ نیشانەی هەیە: یەکەم: خوا بناسێت، دووەم: بزانێت ئەو خوایە چی پێ خۆشە، سێیەم: و بزانێت چی پێناخۆشە .

و لە وەسف کردنی خوای ـ عز و جل ـ دا کاتێ جوولەکەیەك لێی پرسیبوو ـ خوای ـ عز و جل ـ کەی بووە؟ ئەویش ڕەنگی سوور هەڵدەگەرێت و دەڵێت ((لم یکن فکان، هو کان و لا کنیونه، کان بلا کیف ، کان لیس قبل، ولاغایة، انقطعت الغایات دونه فهو غایه کل غایه )) فاسلم الیهودی[3] .

واتە نەبووە و دوایی بێت، ئەو هەر بووە بەبێ بوون، بەبێ چۆنیەتی بوونەکەی، پێش ئەو هیچ نەبووە و لەبەر هیچ مەبەستێ نەبووە، و هەموو مەبەستەکان جگە لەو پچڕاون، و ئەو لەسەرووی هەموو مەبەستەکانەوەیە )) و جولەکەکەش موسڵمان بوو .

---

[1] البخاري کتاب الدعوات ژ ٦٤١٠ .

[2] تاریخ الیعقوبي (٢/٢٠٧) .

[3] تاریخ الخلفاء للسیوطی لا ٢٠٦ .

## ٣- ئەمیری باوەڕداران بەخششەکان دەخاتەوە یادی خەڵکی:

ئـەمیری بـاوەڕداران ـ عـەلی ـ باسـی خـوای ـ عـز و جـل ـ و بەخشـشەکانی دەکـات بەسـەر بەندەکانییەوە و دەڵێت: (( ئەی بەندەکانی خوا وەسیەتان پێ دەکەم لەو خوایە بترسن کە هەموو شتێکی بۆ روون کردوونەتەوە بە نموونە و ئەمسال ...، و بۆی دیاری کردوون کاتی ئەجەل، گوێی پێداون بۆ بیستنی ڕاستیەکان و چاوی پێداون بۆ بینینیان، و دڵـی پێـداون بـۆ تێگەیـشتنیان، و خوای ـ عز و جل ـ بێ هۆ دروستی نەکردوون و بۆ گاڵتە دەستوور یاسای بۆ نـەناردوون، بـەڵکو دای پۆشیوون بە جۆرها بەخـشش، و گـوزەرانی کـردوون بـە خۆشـترین گـوزەران و هـەمووتانی گرتۆتەوە و ژمادوونی، و پاراستنی کاتی خۆشی و ناخۆشی بۆ هەڵگرتوون، دەی لە خـوا بترسـن ئەی بەندەکانی خوا و بەدوای نانی حەڵاڵدا بگەڕێن، و زوو بکەن کردەوەی چاك بکەن پێش ئەوەی خۆشی بڕ و چێژ لەناوبەر ـ مردن ـ ڕێتان پێ بگرێت .

یان دەڵێت: ((ئەگەر ڕەغبەت و خوا پەرستیتان تێدا دروست بوو سوپاسی خوا بکەن و هەوڵ بدەن لە خوا ترسانیشی ـ رهبە ـ شی تێکەڵ بکەن، وە ئەگەر لە خوا ترسان و رەهبەتتان تێدا دروست بوو سوپاسی خوای لەسەر بکەن و ڕەغبەت و خۆشەویستی خوای تێکەڵ بکەن ))

## ٤- ئەمیری باوەڕداران و نەهێشتنی پاشماوەی نەفامی :

عەلی کوڕی ئەبو طالیـب (ﷺ) دەڵێـت: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) خـەریکی بـە خـاك سـپاردنی مردوویەك بوو، فەرمووی: (( ایکم ینطلق الی المدینة فلا یدع و ثناً الاّ کسره ولا قـبراً الا سـواه، ولا صورة الاّ لطخها ؟ )) واتە: کامتان دەڕواتەوە بۆ مەدینە هەربتێکی تێدایە بیشکێنێت و هەر قەبرێکی تێدایە تەختی بکات و هەر وێنەیێکی تێدایە بیشێوێنێت؟ عەلی (ﷺ) ووتی: من دەڕۆم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، فەرمووی: دەی بـڕۆ، و ڕۆیـشت و پاشـان گەڕایـەوە و ووتـی ئـەی پێغەمبەری خوا یەك بتم نەهێشت و قەبرەکانم تەخت کرد و وێنـەکانم شـێواند، و پێغەمبـەریش (ﷺ) فەرمووی: (( من عاد لصّنعة شيء من هذا فقد کفر بما انزل علـی محمـد ))[1] واتـە: هـەر کەسێ بگەڕێتەوە سەر یەکێ لەم شتانە، ئەوە بێ باوەڕ دەبێت بەوەی دابەزیوە بۆ سەر محمد )) .

---

[1] مسند احمد (٨٧/٢) ژ ٦٥٧ .

( کاتێ عەلی (ﷺ)بوو بە ئەمیری باوەڕداران ( ابو الهیاج الاسدی ) نارد و پێ ووت: ئەونێرم بۆ کارێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی نارد بۆی ئەویش ئەوەیە هیچ بتێك مەهێلە و بیشکێنە، و هەر گۆڕێکی بەرزت بینی تەختی بکە ) [1].

زۆر جار ئەمیری باوەڕداران سەردانی گۆرستانی دەکرد و ئامۆژکاری باشی لێوە فێر دەبوو، و دەچووە لای گۆڕەکان و پێ دەوتن: ئەی خەڵکی گۆرستان هەواڵی خۆتانمان بۆ باس بکەن؟ بەلاّم هەواڵی دوای خۆتان پێ دەڵێم کە ژنەکانتان مارەکراون و پارەکانتان دبەش کراون، خانووەکانتان ئێستا خەلکانی تری تێدا دەژی، و پاشان دەیووت: وەللاهی ئەگەر بیانتوانیایە قسە بکەن دەیان ووت: هیچ شتێك سوودی بۆمان نەبوون جگە تەقوا و لە خوا ترسان )) [2].

عەلی (ﷺ) زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی کە هۆکارەکانی بتپەرستی بنەبڕ بکات و خەڵکی لەوە ئاگادار دەکردەوە کە گۆڕی هیچ کەسێك مەکەن بە مزگەوت، چونکە مرۆڤ بەرەو مردوو پەرستی دەبات دەڵێت: (( شرار الناس من یتخذ القبور مساجد )) واتە: (( خراپترین کەس ئەو کەسانەن کە گۆڕەکان دەکەن بە مزگەوت )) [3].

سەردانی گۆستان لە ئیسلامدا دروستە بە مەبەستی سوود گەیاندن بە مردووەکە وەك دوعا کردن بۆی و داوای لێ خۆشبوون و دەرەجەی عالی کردن و سوود وەرگرتنیش لە بیرکردنەوە لە مردن بەلاّم بە مەبەستی سوود وەرگرتن لە مردوو یان داوای شتی لێ بکات ـ پەنا بە خوا ـ ئەوە حەرامە و بیدعەیە [4].

ئەوە هەڵوێستی عەلییە (ﷺ) دەربارەی ئەوانەی کە قەبری پیاو چاك و صالحین دەکەن بە مزگەوت و بە مەبەستی پیرۆزی و سوود لێ وەرگرتن دەچنە دیاری، ئەی ئەگەر بیزانیایە پاشان گۆڕی خۆی و کوڕ و نەوەکانی دەکەن بە مزگەوت!! و سەردانی ملیۆنی دەکرێت چی دەگووت؟

---

[1] مسلم کتاب الجنائز (٢/٦٦٦) .

[2] الاستذکار (١/٢٣٤) .

[3] کنز العمال (٢٢٥٢٢) .

[4] الفتح الباري (٣/٦٥) .

أ- سەردانی (دروستی) گۆڕستانەکان: ( الزيارة الشرعية للقبور ) .

سەردانی گۆڕستان سوونەتێکی گەورە و پڕ سوودە بەڵام لەم ڕۆژانەدا فەرامۆش کراوە، یان سەردانەکان هەموو تێکەڵ بە بیدعە و ناشرعی بووە و هەندێ کاتیش پەنا بە خوا - سەر بۆ شریك و هاوەڵ بۆ خودا پەیدا کردن دەکوتێت .

سەردانی گۆڕستان زۆر پێویستە هەر بەینە نابەینێ مرۆڤ بڕوات بۆ ناو خوشك و براکانی و بیر لە شوێنی خۆشی بکاتەوە و لەم گۆڕستانەدا ڕۆژی دێت و ئەم دنیا ڕووناك و جوانە بەجێ دەهێڵێت و دەڕواتە ناو ئەو گۆڕە تەنگ و تاریکەوە و بێ ماڵ و حاڵ بە تەنها خۆی کردەوەکانی دەمێنێتەوە، و شێوە شەرعییەکەشی ئەوەیە سڵاویان لێ بکەیت و دوعای خێریان بۆ بکەیت و خۆشت دابنێی بۆ ئەو سەفەرە پڕ لە وەحشەت و ترسناکە .

( و دەبێت تۆ دوعای خێر بۆ مردووەکان بکەیت نەك - پەنا بەخوا - تۆ داوای خێر و چاکە لەوان بکەیت کە لە دەستی نە ئەوان و نەکەسێ تردا نییە جگە لە خوای گەورە، جارێکیان من ڕۆیشتم بۆ کەربەلا بۆ سەردانی گۆری - حوسەینی کوری عەلی (ﷺ) و پاشان گەڕامەوە بۆ بەغداد کە لەوێ لە کۆلیژی شەریعە دەمخوێند پیاوێکی شییعە مەزهەب کە هاوڕێم بوو زۆر خۆش حاڵ بوو کە زانی سوونی مەزهەب سەردانی ئیمامێکی ئەوان دەکات ووتی: ها چیت داوا لێ کرد!!! منیش زۆر ناڕەحەت بووم و موم گرژ بوو پێم ووت: ڕۆیشتم وەك پێغەمبەری خوا چۆن سەردانی گۆڕستانی کردووە - دوعای خێر و مەقامی بەرزم بۆ کرد و کابراش چاوی ئەبلەق بوو چونکە شتی وای بۆ باس نەکرابوو پێش تر بۆیە بە سەر سوڕمانەوە دەیووت: تۆ دوعات بۆ ئیمام حسێن کرد؟!! و ئیمام حوسەین دوعای تۆی بۆچی یە؟![1]..

ب- ئاهەنگ و ساڵانە سەردانی مەرقەدەکان لە کەیەوە دەستی پێ کردووە؟ :

دەگێڕنەوە یەکەمین جار ئەم سەردان و پێکوتانە ساڵانەیەی کە ئێستادا هاتووە لە ناو جەماوەری شیعەکاندا (فاطمە) یەکان لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا دایان هێنا لە میسر، وەك ( المقریزی) احمد کوڕی عەلی دەڵێت: شەش بۆنەی لە دایك بوونیان داهێنا، لە دایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ)،

---

[1] ووتەی وەرگێ بۆ سەر زمانی کوردی .

عەلی، حەسەن ، حسێن، فاطمە ، خوایان لێ رازیبێ ، و لە دایک بوونی خەلیفە، و لەپاڵ قەبرەکەی حسێن دا حوشتر و مەڕ و بزنیان سەردەبری .[1]

و لە سێ سەدەی پێشتردا خەڵکی بە هیچ شێوەیەك گومەزی و مەزارگەیان دروست نەدەکرد و ئاهەنگیان بۆ نەدەگێڕان و گەورەترین بەڵگەش لەسەر ئەوە مردنی ئەو هەموو هاوەڵە بەڕێزانەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کەهەریەکەیان لە شوێنێ وەفاتیان کردووە لە نێوان وڵاتانی وەك شام و عێراق و میسردا، و کەچی بە تەواوی گۆڕەکانیان نازانرێت لە کوێدایە و مێژوو نوسان جیاوازیان هەیە لە شوێنی مردنەکانیاندا وەی ئەگەر گومەزی و مەزارگە و ئاهەنگ و سەردانیان بکرایە چۆن گۆڕەکانیان بە نەزانراوی دەمایەوە؟

و کاری دوای ئەو بەرە قورئانییە پاکە، نابێتە بەڵگە و نا شەرعێنرێت، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرگری کردووە لەوەی کە دوای خۆی گۆڕەکەی بکەن بە جەژنگە .[2] و هەرکەسێ ئەو کارە بکاتناشەرعی و پێچەوانەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) کردووە ((لا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ )) " الحجرات:١" .

## ج- گرنگی دان بە مەزارگەکان لە دوای نەمانی نەفامی و دواکەوتوییەوە هات:

ئەو هەمووە گومەزی و کۆشك و تەلارانەی بە سەر گۆڕی ئەو پیاو چاکانەوە دروست کراوە پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە فەرمانی بە عەلی دا (ﷺ) کە بڕواتەوە بۆ مەدینە و گۆڕە بەرزەکان تەخت بکاتن کەچی پاش خۆی گۆڕەکەی بەرز دەکرێتەوە! .

نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ملوێنەها دینار سەرف دەکرێت کە لە پێناو ئەو قەبرانە و گومەزی و دەرگای ساجی گران و بە بەها و چەندان کەس کاسبییەکانیان لە پاسەوانی و سەرپەرشتی و ئەو مەزارانە دایە و قاسەی پۆلایان تیادا دەنێن بۆ کۆکردنەوەی پارە ئەو خەڵکە بەستەزمانەی کە بە مەبەستی سەردان و زیارەت دەچن بۆ ئەوێ و ئەو کەسانە چەندان کەرامەتیان بۆ خاوەنی ئەو گۆڕانە دروست کردووە کە تیادا هەڕەشەی گەورە لەو کەسانە دەکات کە گومانی هەبێت لەوەی ڕوودەدات و کردوویانە بۆ ئەو گۆڕانە .

---

[1] الغلوفي الدين الغرياني لا ١٠٣ .

[2] الغلوفي الدين، الغرياني (١٠٥) .

ئەمەش دوای شکستی و دواکەوتوویی موسڵمانان داهات کە موسڵمانان لە بڵاوکردنەوەی بانگەوازی و نووری مەحەمەدی وەستان و ئیتر ئەو پەیامە گەورە جیهانییەیان بچووك کردەوە لە دوو توێی سستی و بێ کاری و ژیان لەناو خەیاڵاتدا .

دەی ئایا پرسیارێك لەو کەسانە نەکەین کە ئایا لە هەموو سەر زەویدا لە گۆری پێغەمبەر مبارك تر و گەورەتر هەیە؟ دەی هاوەڵان ئەوەیان بۆ کرد و قەبروکەیان کرد بە مەزارگە؟ بێگومان نەخێر، کەواتە ئەوەی ئەمڕۆ دەکرێت هیچی پەیوەندییەکی بە دینداررییەوە نیە و هیچ مانایەکی عیبادەت و خوا پەرستی تێدانیە . بەڵکو نموونەیەکی شێوازی دواکەوتووی و نەفامی و بێ ئاڕاستەی و دورکووتنەوەیە لە ڕێنموونییەکانی پێغەمبەرخوا و هەموو هاوەڵە بەڕێزەکان لە سەرویانەوە عەلی کوری ئەبو طالیب (ﷺ).

## د- هەوڵی داگیر کەران و دروست کردنی مەزارگە:

هەواڵی داگیرکەرە ڕۆژئاوایەکان لەم بوارەدا هاندانی موسڵمانان بوو بۆ گرنگی دان بە شێخ و پیاو چاك و هاوەڵانی پێغەمبەر بدەن، تا بەم کارە لە جەوهەر و کرۆکی ئاین دووربکەونەوە.

ڕۆژنامەی (تایمز) ی ئینگلیزی وتەی یەکێك لە پیاوانی داگیرکەری بەریتانی هێناوە کە هانی خەڵکی دەدات بۆ بڵاوکردنەوەی کاری بیدعە و داهێنراو و خورافیات لەناو موسڵماندا دەڵێت: (( چونکە ئەوە زامنی ئەوەیە کە لە ئیسلام دووریان بخاتەوە .

شێخ احمد باقوری دەڵێت: یەکێ لە گەورە ڕۆژهەڵات ناسەکان بۆی باس کردم دەربارەی هەندێ لە شێوازەکانی داگیرکەران لە ناوچەکانی ئاسیا،کە زۆر گرنگ بوو، ئەوەش دەهاتن ئەو هەموو قافلە و کاروانی یە گەورانەی لە هیندستانەوە بەرەو بەغداد دەهاتن، بەجۆری لە هەموو ئەو ناوچە دوورانەوە ڕووگەیان بگۆڕن بۆ ئارستەیێکی تر کە لە خۆیانەوە نزیك بێت، ئەمەش مەبەستیان هەبووە تیایدا .

بۆ ئەو کارە هیچ هۆکارێکمان نە دۆزییەوە تا لە ئاکامدا ڕامان هاتە سەر ئەوەی کە کۆمەڵێ نەزەرگە و مەزارگە دروست بکەین و گومەزی گەورەیان بۆ بکەین لە نزیك یەکترییەوە، و پاشان هەر ئەوەندەت زانی خەڵکی باسی گەورەیی و خاوەن کەرامەتی ئەو ئەولیایانەیان بڵاودەکردەوە کە

لەناو ئەو مەزارگانەدان!! و گوایە کەرامەتی زۆریان لێبینراوە، و تا وای لێ هات ئـەو ڕێگایانـە قەرەباڵغ بوون و خەڵکی دەستە دەستە ڕوویان تێ دەکردن .[1]

و هەروەها لە میسریش حکومەتی بـەریتانی گرنگـی بـەو حاڵەتـە ئاینییـە دەدا کـە دەیزانـی شیوعیەت لە بڵاوبونەوە دایە، و لەوە دڵنیا بوو کە میسریەکان ئاینـدارن و نـابن بـە شـیوعی، نزیکەی (٣) ملیۆن موسڵمان لە ماوەی (یەك) ساڵدا سەردانی مەزاری (احمد البدوی) یان کرد لە (طنطـا) . و یەکێ لەو زانا ئاینیانەی کـە وەزارەتـی ئـەوقاف نـاردبوونی لەگـەڵیان بـۆ وەعـزو ئامۆژگاری دەڵێت: شتی وام لەو موسڵمانانە دەدی کە شایەنی ئەوە بوو دارکـاری بکـرێن نـەك ئامۆژگار و قسەی دەم، کە لە کاتێکدا ئەگەر بانگ بکرانایە بۆ بەجێ هێنانی ئەرکێکی دروستی ئاینەکەیان ئا بەو شێوەیە نە دەهاتن بەپیر بانگ کردنەکەوە، و بەسە ئەوەندەیان دەربارە بزانیـت کە ئەوان هاتبوونە سەر ئەو شەخسە بە مەبەستی قوربانی سەرپڕین و دوعا کـردن و هـاوار تـێ کردنی .[2]

## هـ- ئایا ئەو مەزارگە و نەزەرگانە داهێنراون لە ئایندا:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد، کە بەڕێزترین و لە خواترس ترین و تەقوادارترین کەس بووە لە سەر زەویدا، و هاوەڵانیش خوایان لێ ڕازیبێت ـ شاراوە نیە لای هیچ کەسی لە هەموو کەس زیاتر خۆشیان ویستووە وخۆشەویسیان بۆی بێ سنوور بووە، و کێ گۆری پیرۆزیشی لە ماڵەکەی خۆیدایە و هەموو کەس شوێنەکەی دەزانێت و قەبرەکەشی باشترین گۆڕی دنیایە، کەچی هیچ گومـەزی و بینایەکی گەورەیان بەسەرەوە نەکرد و خەلیفە راشیدەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بـە دەوریـدا سـاڵانە کۆنەدەبوونەوە نە گۆڕی ئەو و نە پاشتریش گۆڕی خەلیفە ڕاشیدەکان نەکرانە مەزارگە و نەزەرگە و لەپاڵ ئەواندا دوعا و پاڕانەوە و خواپەرستی و نوێژکردن نەدەکرا.

بەڵکو چۆن خوای گەورە ئەمری پێ کردون هەر کاتێ بیاندایە بە لای گۆڕەکەیدا سڵاواتیان لەسەر دەدا، و گوێ ڕایەڵی هەموو فەرمانەکانی بوون و جێ بە جێ کاری هەموو سوننەتەکانی بـوون و ڕێنموونییەکانی ئەویان بە ڕێنموونی کاری خۆیان دەزانی چ لە کاتی ژیاندا و چ لە کاتی مردنیدا،

---

[1] ليس من الاسلام، محمد غزالي ـ لا٢٢٤ .

[2] الفلوقي الدين لا ١٠٥ .

چونکە خوای گەورە پێ فەرموو بوون: (( وما اتاکم الرسول فخذوه و مانهاکم عنه فانتهوا ))
واتە: هەرچی پێغەمبەر فەرمانتان پێ دەدات جێ بە جێی بکەن هەرچیشتان لێ قەدەغە دەکات قەدەغەی بکەن لەسەر خۆتان .

هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیاندا زۆر لەوە دەترسا کە پاش خۆی قەبرەکەی بکەن بە نەزەرگە و جەژن و قەرەباڵغی لە پاڵدا بکەن، بۆیە هەرچی فەرموودە صەحیحەکانییەتی لەو بارەیە باسی قەبری خۆی دەکات و هەرگیز باسی قەبری تری نەکردووە لەبەر دوو هۆ یەکەم:

١- هەستی دەکرد هاوەڵان خوایان لی ڕازیبێ زۆریان خۆش دەویست، بۆیە دەترسا ئەو خۆشەویستیەیان لە پاش مردنی بەرەو نەفامی و گومڕای بیانبات و قەبرەکەی بڕازێننەوە و خۆڵەکەی ماچ بکەن و داواکاری گەورەی لێ بکەن و بیبنە ڕێز پەروەردگارەوە ـ پەنا بە خوا ـ

٢- ئەوەی بە باش زانیوە لە گۆڕی خۆیەوە دەست پێ بکات و قەدەغەی بکات بیکەن بەمەزارگە و مەرقەد و ساڵانە و ڕۆژانە سەردانی بکەن بەمەبەستی جۆرا و جۆری ناڕەوا ـ وەك شیفای نەخۆش و منداڵ پێدان و شتی تر . و ئەگەر گۆڕی ئەو دروست نەبێت بکرێتە مەزارگە ئەوە موسڵمانان بۆیان دەردەکەوێت کە قەبری کەسی تر لە قەبری ئەو بەڕێزتر نییە .

٣- خەیاڵی بۆئەوە نەچووە کە موسڵمانان بگەڕێنەوە سەردەمی نەفامی و تەعزیم و گەورەی بدەن بە مەلاو شێخ و پیاو چاکەکانیان و مەزارگەیان بۆ دروست بکەن و بەهەزاران کەس وەك چۆن بۆ ماڵی خوا ـ کەعبە ـ دەچن ئاوا بۆ ئەویش بڕۆن و بگرە زیاتریش، ئەگینا ئەگەر ئەو گومانەی ببردایە بە موسڵمانان ئەوا دەیفەرموو ( نەگۆری من و نەگۆری هیچ کە سێکی تر مەکەن بە جەژنگە ) بەڵام ئەو بە خۆی فەرمووە ( ولا تجعلوا قبري عيداً ) .[1]

ئەمەش ئەو پەڕی بیدعە و داهێنراوێکی ترسناکە و لە پاش (( خير القرون )) داهێنراوە، ئیمام مالیکیش ـ (ﷺ) ـ دەڵێت: هەر کەسێ شتێکی تازە بهێنێتە ناو ئەو ئاینەوە کە پێشتر نەبوبێت، ئەوە وا دەر دەخات کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خیانەت و ناپاکی بەم ئاینە کردووە ـ حاشا للّه ـ چونکە خوای گەورە دەفەرموێت ((اَلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمْ

[1] ووتەی وەرگێر .

الإِسْلاَمَ دِيناً )) [1] واتە: ((ئەمڕۆ ئیتر ئاینەکەتان بە تەواوی( کامل ) بوو، بەخششی خۆم بەسەردا تەواوکردن و ڕازی بووم ئاینی ئیسلام بکەنە ئاینی خۆتان )) . و ئەوەی دوێنێ بەشێ نەبووە لە ئاین ئەمڕۆ بەشێك لە ئاین .[2]

و: عەلی (ﷺ)باوەڕ بە بورجەکان پووچەڵ دەکاتەوە :

کاتێك ئەمیری باوەڕداران ویستی سەفەر بکات بۆ جەنگ لەگەڵ خەوارجەکاندا، یەکێ لە ئەستێرەناسەکان پێی ووت: ئەمیری باوەڕاران سەفەرمەکە چونکە مانگ لە بوورجی دوو پشکدایە و ئەگەر لەم کاتەدا سەفەر بکەیت لەو جەنگەدا دەشکێیت، و عەلیش (ﷺ) پێی ووت:بەڵکو ئەم سەفەرە دەکەم پشت بەخوا و متمانە بە پەروەردگار و بەدرۆخستنەوەش بێت بۆ تۆ، سەفەرەکەی کرد و سەرکەوتن و پیرۆزی بە دەست هێنا و زۆرێ لە (خەوارجەکان) ی لەناو برد .[3]

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە کاتێ بەسەرکەوتوویی لەجەنگی نەهرەوان بوویەوە، سوپاسی خودای کرد و پاشان ووتی (ئەگەر لەو کاتەدا هێرشەکەمان بکردایە کە ئەستێرەناسەکە ووتی و سەریکەوتنایە، ئەوا نەفام و سادەکان دەیان ووت: لەبەر ئەوە سەرکەوت کە لەو کاتەدا ڕۆیشت کە بۆی دیاری کرد)[4].

ئەوەتا ئەمیری باوەڕداران زۆر خەمی ئەوەی بووە کە بیروباوەڕی موسڵمانان وەك سەرچاوە ساف و زوڵاڵەکەی بمێنێتەوە و خورافاتی تێکەڵ نەبێت و کەس نەکرێتە هاوبەشی خودا لە ئیش و کارەکانیدا..

( بەڵام ئەمڕۆ موسڵمانان بە جۆرێك لە بیر و باوەڕی ئیسلام دورکەوتوونەتەوە ـ پەنا بە خوا ـ بە ئاشکرا لە تەلەفزیون و کەناڵە ئاسمانیەکانەوە بورجی خەڵکی دەخوێننەوە و ناهێڵن خەڵکی خۆیان بدەنە دەستی پەروەردگاریان و ئیش و کاریان پەك نەخەن).[5]

---

[1] المائدة (٣) .

[2] الاعتصام للشاطي (٢/٢٣) .

[3] مجموع الفتاوي (٣٥/١٧٩) .

[4] البداية والنهاية (٧/٢٨٨) .

[5] ووتەی وەرگێڕ .

## ز- هەندێك عەلی کوڕی ئەبو طالبیان بە خوا دەزانی!! :

عبداللە کوری شەریك (العامری ) لە باوکییەوە دەگێرێتەوە و دەڵێت: بە عەلی ووترا: کۆمەڵێ کەس لە بەر دەرگای مزگەوتدا وەستاون وا دادەنێن تۆ خوا بیت! و ئەویش بانگی کردن و پێی ووتن ها چی دەڵێن؟ ووتیان: تۆ خوامانیت و دروست کەر و ڕۆزی دەرمانیت! و عەلیش ووتی: دەك لە ناوبچن من هەر وەك ئێوە بەندەیەکم، وەك ئێوە خواردن دەخۆم و خواردنەوە دەخۆم، و ئەگەر بە قسەی خوا بکەم پاداشتی خێرم دەداتەوە (انشاء اللە) و ئەگەر بە قسەی نەکەم ئەترسم سزای سەختم بدات، دەی لە خوا بترسن و پەشیمان ببنەوە، بەڵام ئەوان هەر سوور بوون لەسەر بیر و ڕای خۆیان، عەلیش (ﷺ) دوای خستن بۆ ڕۆژی داهاتوو .

لە ڕۆژی داهاتووە (قەنبەر) هات بۆ لای عەلی و پێی ووت: هەر سوورن لەسەر قسەکەی دوێنێیان . و عەلیش (ﷺ) وووتی: بانگیان بکەرە ژوورەوە و کەچی هەمان قسەیان دووبارە کردەوو، و لە ڕۆژی سێیەمدا بانگی کردن و پێی ووتن: ئەگەر هەمان قسە بکەن بە پیسترین شێوە ئەتانکوژم، بەڵام ئەوان هەر سوور بوون لە سەر بۆ چوونی لاری خۆیان، و عەلیش (ﷺ)لە نێوان کۆشکی خەلیفە و مزگەوتدا ئاگرێکی گەورەی کردەوە و پێی ووتن: ئەگەر نەگەرێنەوە لەو قسەیەتنان ئەتان خەمە ناو ئەو ئاگرەوە، و ئەوان هەر سوور بوون ئەویش هەموویانی خستە ناوییەوە سوتاندنی،[1] و ووتی:

إني اذا رأيت الامر امراً منكراً        اوقدت ناري و دعوت قنبراً .

هەموو هاوەڵان ڕازی بوون بەو کارە بەڵام ( ابن عباس ) (ﷺ)ڕازی بوو بو کوشتنیان بەڵام لەگەڵ سوتاندنیاندا نەبوو بۆیە هەرکە هەواڵەکەی بیست ووتی: ئەگەر من بوومایە دەمکوشتن و نەمدەسوتاندن چونکە پێغەمبەری خوا ـ (ﷺ) فەرموویەتی: (( لا تعذبوا بعذاب اللە )) واتە: بە سزای خوا سزای کەس مەدەن .[2]

---

[1] فتح الباري (١٢/٢٧٠) سنده حسن .

[2] البخاري كتاب المرتدين (٤/٢٧٩) .

(ابن تیمه ) ـ (ﷺ) ـ دەڵێت: ئەوە ئاشکرایە کە زۆرێ لە ئیمامی یەکانی سوتاند چونکە باوەڕیان وابوو کە عەلی خودایە.[1]

## ح- باوەڕ ڕەنگی دڵ چی لێ دەکات؟ عەلی چۆن پێناسەی تەقوا دەکات؟

ئەمیری باوەڕداران (ﷺ)دەڵێت: ئیمان لەسەرەتاوە وەك نوختەیەکی سپی وایە لەسەر دڵ، و هەتا باوەڕی بەهێزتر و زیاتر بێت ئەو سپییایە زیاد دەکات و بەڵام بەندە هەرکاتێ دوو ڕوویی زیادی کرد بێتێدا دڵی ڕەش هەڵدەگەڕێت و هەر کاتێ بەتەواوی بوو بە دوو ڕوو، دڵی بە تەواوی ڕەش دەبێتەوە، و سوێند دەخۆم بەخوا ئەگەر دڵی موسڵمان شەقق بکەیت، دەبینیت سپییە و ئەگەر دڵی دوو ڕوو لەت بکەیت دەبینیت ڕەشە )[2] .

دەربارەی تەقوا دەڵێت: (( ترك الاصرار على المعصية، وترك ألاغترار بالطاعة ))[3] واتە: بەردەوام نەبوون لەسەر گوناه و خەڕۆ نەبوونیش بە گوێ ڕایەلی .

یان دەڵێت: (( التقوى هي الخوف من الجليل والعمل بالتنزيل، والقناعة بالقليل والاستعداد ليوم الرحيل ))[4] واتە: تەقوا واتە ترسان لە خوای جەلیل و کارکردن بە قورئانی تەنزیل و ڕازی بوون بەکەم و قەلیل و خۆ ئامادەکردن بۆ ڕۆژی مردن و ڕەحیل .

## ط: قەزا و قەدەر لە لای ئەمیری باوەڕدەران:

ئەمیری باوەڕدەران عەلی (ﷺ) دەڵێت: هیچ شتێك لەسەر زەوی ڕوونادات تا لە ئاسمان ئەنجام نەدرابێت، و هیچ کەسێك نییە کە دوو فریشتە لەگەڵیدا نەبێت بۆ پارێزگاری لێی، تا قەدەری دێت، ئەو کاتە ئەو دوانە وازی لێ دەهێنن، ومن لە لاین خواوە قەڵغان و پارێزەری بە توانام هەیە بەڵام کاتێ ئەجەلم هات وازم لێ دەهێنن، و هەرگیز تام و چێژی باوەڕ نا چێژێت ئەو کەسە

[1] الفتاوي، (٢٧/٤٧٤).
[2] هەمان سەرچاوە لا (١٩١/٧) .
[3] تفير الرازي (٢١/٢) .
[4] فرائد الكلام لا ٣٣٤ .

وانەزانێت کە ئەوەی بەسەری هاتووە بە ناڕەوا و هەڵە نەبووە و ئەوەی بەسەری نەهاتووە ئەوە نەی پێکاوە .[1]

ی- چۆن خوا ئەو هەموو خەڵکە لێپرسینەوە دەکات؟:

بە ئەمیری باوەڕدارانیان ووت: چۆن خوای - عز و جل - لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو هەموو خەڵکە دەکات لەگەڵ زۆرییاندا؟ ئەویش لەوەڵامدا ووتی: (( کما یرزقهم علی کثرة عددهم )) [2] واتە: وەك چۆن ڕۆزیان دەدات لەگەڵ زۆری ژمارەیاندا.

[1] حیاة الصحابة کاند هلوی (ب٣) لا ٣٠٥ .

[2] ادب الدنیا و الدین لا ٢٦ .

## دووەم/ عەلی ئەبو طالیب و هەندێ لە شیعرەکانی:

### ١- دەربارەی ئارامی و خۆگرتن:

| | |
|---|---|
| الا فاصبر على الحدث الجلـيل | وداو جواك بالصـبر الجليـل |
| ولاتجزع فان اعســـرت يوماً | فقد ايرت في الدهـر الطويـل |
| ولا تظنن بربك ظن ســوء | فان الله اولى بالجـميل |
| فان العـسريتبعه يـســار | و قول الله اصدق كل قيل |
| فلو أن العـــقول تـجر رزقاً | لكان الرزق عند ذوي العقولِ |
| فكـم من مؤمن قدجاع يومـاً | سيروى من رحيق السلســبيل [١] |

### ٢- دەربارەی هاوڕێیەتی:

| | |
|---|---|
| فلا تصاحب أخا الجهـل | فـإياك واياه |
| فكم من جاهل اردى | حليماً حين اخـاه |
| يقاس المرء بالمـــرء | اذا ما هو ماشاه |
| وللشيء من الشيء | مقايس واشباه |
| قياس النمل بالنمل | اذا ما هو حاذاه |
| وللقلب على القلب | دليل حين يلقاه [٢] |

### ٣- دەربارەی خۆ بەکەم زانی و قەناعەت کردن:

| | |
|---|---|
| حقيق بالتواضع من يموت | ويكفى المرء من دنياه قوت |
| فما للمرء يصبح ذا هموم | و حرص ليس تدركه النعوت |
| صنيــع مليـكنا حسن جميل | وما أرزقه عنا تفوت |

---

[1] البداية و النهاية (١١/٨) .

[2] هەمان سەرچاوە .

[illegible] ... حوت .[1]

ولا تفشِ سـرك الاّ إليك | فان لكل نصحيح نصيحاً
فاني رأيت غواة الرجـال | لايتركون اديماً صـحيحاً .[2]

سێیەم/ هەندێ لە ووتە بەنرخەکانی ئەمیری باوەڕداران:

١- دەڵێت: (( صلاة الليل بهاء في النهار )) واتە: شەونوێژ دەبێتە هۆی ڕووناکی دەم و چـاو لـە ڕۆژدا .

٢- (( صلاح الدين من الورع وفساده من الطمع ))
واتە: خۆپاراستن لە گوناه ئاینی مرۆڤ چاك دەکات و هەڵپەهەڵپی دنیاش خراپی دەکات .

٣- ((الفرصة تمرّ مرَّ السحاب )) واتە: هەل زوو ڕوودەدات وەك هەوری خێرا .

٤- (( طوبى لمن عمل بعلمه )) واتە: خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی کار بەزانستەکەی دەکات .

٥- (( جمال الخُلق ابهى من جمال الخَلق )) واتە: جوانی ڕەوشت ڕازاوەترە لە جوانی لەش و لار .

٦- (( المعرف لا يتم الاّ بثلاث خصال: تصغيره وستره تعجيله ))
واتە: چاکە تەواوی تێدا نینە تا شتێ شتی تێدا نەیەتەدی: بچوکردنەوەی، شاردنەوەی، پەلەکردنی .

٧- (( لا راحة للحسود )) واتە: مرۆڤی حەسود حەوانەوەی نیە.

٨- (( الحاسد فغتاظ على من لا ذنب له )) واتە: مرۆڤی حەسود ڕقابەرێتی کەسێکی بێ گونـاه دەکات .

٩- (( ويل للباغين من احكم الحـاكمين )) واتە: وەیل بۆ ستەم کـاران لەبـەردەمی حـاکم تـرینی حاکمان .

---

[1] هەمان سەرچاوە .
[2] عيون الاخبار ابن قتيبة (١/٩٧) .

١٠- (( اخفاء الشدائد من المروءة )) واتە: شارینەوەی نارەحەتیەکان نیشانەی پیاوەتیە .

١١- (( احسن الى المسیء تسده )) واتە: چاك بە لەگەڵ خراپەکار چاکی دەکەیتەوە .

١٢- (( من عذب لسانه كثر اخوانه )) واتەئەوەی زمانی شیرین بێت هاورێ زۆر دەبێت .

١٣- ((صاحب الاخیار تأمن الاشرار )) واتە: هاورێیەتی پیاو چاکان بکە، دڵنیا دەبێت لەپیاو خراپ .

١٤- (( جلیس الخیر غنیمه )) واتە: دانشتنی خێر دەستکەوت و غەنیمە .

١٥- (( لا تنظر الى من قال وانظرالى ما قال ))واتە: مەپرسە کێ دەڵیت، بپرسە چی دەڵێت .

١٦- (( قیمه كل امری مایحسنه )) واتە: نرخی مرۆڤ بەپێ ئەو شتانەیە دەیزانێت .

١٧- (( احذر صولة الكریم اذا جاع و صولة اللئیم اذا شبع )) واتە: خۆت بپارێزە لە کاردانەوەی مرۆڤی چاك ئەگەر برسی بوو، و کاردانەوەی مرۆڤی بێ نرخ ئەگەر تێر بوو .

١٨- (( الناس نیام اذا ماتوا انتبهوا )) واتە: خەڵکی نووستوون کاتێ مردن بەخەبەر دێن .

١٩- (( الناس اعداء ماجهلوا )) واتە: خەڵکی رقیان لەو شتانەیە کە نایزان .

٢٠- (( الفقر یخرس الفطن عن حجته ـ والمقل غریب في بلده )) واتە: هەژاری ژیرمەند لاڵ دەکات لە بەرگری لەخۆی و کەم دەست غەریبە لە وڵاتی خۆیدا .

٢١- (( بشاشة الوجه عطیه ثانیه )) واتە: رووخۆشی بەهرەیەکی ترە .

٢٢- (( العفو عند المقدرة شكر للمقدرة )) واتە: لێبووردەیی لەکاتی دەست رۆشتندا ئەوە سوپاسی ئەو بە خششەیە .

٢٣- (( اعادة الاعتذار تذكیر للذنب )) واتە: دووبارە داوای لێبووردن کردن، بیرخستنەوەی تاوانە.

## چوارەم/ ئەمیری باوەڕداران لە چەند شتێك دەدوێت:

### ١- ڕەوشتەکانی چاکترین بەندەکان:

لە ئەمیری باوەڕدارانیان پرسی دەربارەی ڕەوشتی چاکترین بەندەکانی خوا، ئەویش لە وەڵامدا ووتی:

(( ئەوانەی هەر کاتێ چاکە بکەن خۆشحال دەبن، و خراپە بکەن تەوبە و پەشیمانی دەردەبڕن، و هەر کاتێ بەڵایەکیان بەسەردا بێت ئارام دەگرن، و هەر کاتێ تووڕە بن لێبوردە دەبن )) [1].

یان دەڵێن: خوای ـ عز و جل ـ کۆمەڵێ بەندەی وای هەیە، ئەڵێ بە چاوی خۆیان بەهەشتیەکان دەبینن نەمرن لەناو بەهەشتدا و دۆزەخیەکانیش دەبینن لەناو سزادان، خەڵك لە خراپەیان بێ خەمە، دڵیان پڕ لە غەمە، دەروونیان خاوێنە، پێداویستیان کەمە، ڕۆژانێکی کەم خۆگرن بۆ ڕۆژانێکی درێژ خایەن، لە شەودا بیانبینیت قاچەکانیان ڕێك وەستاوە و فرمێسکەکانیان کوڵمیاندا دێتە خوارەوە و داوا لە خوا دەکەن گەردنیان لە ئاگر بپارێزێت، و لە ڕۆژیشدا پیاو چاکن، نەرم ونیان، لە خوا ترسن وەك پەرداخ ساف و جوان،کەیەکێ سەیریان دەکات دەڵێ نەخۆشن و بەڵام نەخۆشیش نین، تێکەڵی ی خەڵکی دەکەن، و شتێکی هەرزانیش تێکەڵ بە خەڵکی دەبێت [2].

یان دەڵێت: پێویستە لەسەر موسڵمان ـ سەیرکردنی پەند بێت و بێدەنگییەکەی بیرکردنەوە بێت و قسەکانی ژیرانە بێت )) . [3]

### ٢- عەلی (ﷺ) وەسفی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات:

کاتێ عەلی کوڕی ئەبوطالیب(ﷺ) هەستی کرد هاوڕێکانی کەمێ سستی و تەمەڵیان پێوەدیارە و بێ ئاگایی خەریکە زاڵ دەبێت بەسەر خوا پەرستی و گوێ ڕایەڵیدا، بۆیە هەستا بە یاد خستنەوەی هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە (أبو أراكة) دەڵێت:

---

[1] مروج الذهب (٢/٤٣١) .

[2] البداية و النهاية (٦/٨) .

[3] مروج الذهب (٢/٤٣٤) .

نوێژی بەیانیم کرد لەگەڵ عەلیدا (ﷺ) و پاش سەلامدانەوە، سەیرێکی لای ڕاستی خۆی کـرد و بێ تاقەتی پێوە دیاربوو، مایەوە مایەوە تا خۆر دای لە بن میچی دیواری مزگەوت و هەستا دوو ڕکات کرد و دەستەکانی دابەیەکدا و ووتی:

(( سوێند بە خوا هاوەڵانی پێغەمبەری خوام بەجۆرێك بینیوە کە بەیانی زوو بە قژی بژ و ڕەنگی زەردەوە وەك کەسێك لەسەفەر گەڕابێتەوە، و شەوەکەیان بە کڕنووش و شـەونوێژ بـە سـەردەبردو قورئانەکەی پەروەردگاریان دەخوێندەوە، و یان قاچەکانیان لەسەر زەوی بوو یـان ناوچـەوانیان، و هەرکە بانگی بەیانی دەدا خۆیان دەکردەوە خۆیان بـەم دیودیـودا لار دەکـردەوە لەسـەر شـێوەی درەختێك بوون کە ڕەشەبا دەیهێنی و دەیبا، چاوەکانیان ئەوەندە فرمێسکی پێدا دەهاتە خوارەوە تا جل و بەرگەکەیانی تەڕدەکرد، بەڵام وەڵلاهی وا ئەزانم ئەم خەڵکە ئەم شەویان بەبێ ئاگـایی و لەناو غەفلەتدا بەسەر بردووە، پاشان هەستا و ڕۆیی و دوای ئەوە کەس نەیبینیوە پێبکەنێت تـا ئەو دوژمنی خوایە (ابن ملجم ) شەهیدی کرد .[1]

٣- سەردانی نەخۆش و بیماران:

(ثویری کوڕی ابی فاختە) لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عەلی دەستی گرتم ووتی: بـابڕۆین سەرێك لە حەسەن بدەین ـ نەخۆش بووە ـ کاتێ ڕۆیشتشن دەبینین (ابو موسی) لەوێیە، ئـەمیری باوەڕداران لێ پرسی: ئەی (ئەبا موسی) سەردانی بەئاسایی هاتووی یان بۆ لای نەخۆش؟ ووتـی: بەڵکو بۆلای نەخۆش هـاتووم، و عـەلیش (ﷺ) ووتـی: لـە پێغەمبـەری خـوام بیـستووە کـەوا فەرموویەتی: ((مامن مسلم یعود مسلماً عنوة الأصلی علییه سبعون الف ملـك، حتـی یـسي، وان عادە عشیة صلی علیه سبعون الف ملك حتی یصبح ))[2] واتە: هەر کەسێ بەیانیەك سەردانی نەخۆشێك بکات (٧٠) هەزار فریشتە تا ئێوارە سڵاواتی لەسەر دەدەن و ئەگـەر شـەو سـەردانی بکات ئەوا (٧٠) فریشتە تا بەیانی سەڵاواتی لە سەر دەدەن .

[1] حلیة الاولیاء (٧٦/١) .

[2] صحیح سنن الترمذي للالباني (٢٨٦/١) .

٤- عەلی (ﷺ) هانی حەسەن دەدات لەسەر ووتاردان:

ڕۆژێك عەلی (ﷺ) بە حەسەنی کوڕی دەڵێت: کوڕی خۆم ووتارێك بدە با گوێت لێبگرم، حەسەنیش ووتی: من شەرم دەکەم تۆم لەلابێت ووتار بخوێنم، عەلیش (ﷺ) بە جۆرێ دوورکەوتەوە کە حەسەن نەیدەبینی، و پاشان حەسەن (ﷺ) لەناو خەڵکەکەدا هەستایە سەر پێ و ووتارێکیدا زۆر جوان و بەهێز و ڕەوان بێژبوو و کاتێ لێبوویەوە و ڕۆیشت، عەلی بە دەم خۆیەوە دەیووت (( زرية بعضها من بعض والله سميع عليم ))[1] واتە: وەچەیەکن هەموویان لە یەك دەکەن، ( واتە وەك خۆم ووتار دەدات، چەند شایانە باوکان ئابەو جۆرە کوڕەکانیان ڕابهێنن و ئامادەیان بکەن بۆ ڕۆژانی داهاتوو جێگەی خۆیەتی بە جواترین شێوە بگرنەوە ئای کە چەند زانامان بینی مردن ـ بە بەهەشت شاد بن ـ بەڵام نەیانتوانی بە منداڵی وەچەکانیان لەسەر پرۆگرامی پیرۆزی خۆیان پەروەردەبکەن و گەورەیان بکەن وا ئێستا بە پلەی (١٨٠) پێچەوانەی مەنهەج و پرۆگرامی باوکیانن[2] ـ پەنا بە خوا ـ .

٥- ناڕەحەت ترین کار:

ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی طالیب (ﷺ)دەڵێت : (( أشد الاعمال ثلاثا، إعطاء الحق من نفسك، و ذكر الله على كل حال، و مواساة الأخ في المال ))[3] واتە: سێ کردەوە بە قورسترین کار دەژمێردرێن: لە مافی خۆت بپچڕێت، و یادی خوا بکەین بە بەردەوامی، دڵخۆش کردنی برایانت بە پارە پێدانیان .

---

[1] البداية والنهاية (٧٣/٨) .

[2] ووتەی وەرگێر .

[3] حلية الاولياء (٨٥/١) .

## پێنجەم/ لە هەندێ نەخۆشی ترسناك ئاگادارمان دەكاتەوە:

### ١- پاداشتی گوناه :

ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ)دەڵێت: پاداشتی گوناه كردن، مرۆڤ سست دەكات لەخوا ناسی، و ژیان سەخت و ناخۆش دەكات، و چێژیش نابینێ، ووتیان: یانی چێژ نابینێت؟ ووتی: هەر حەڵاڵێكی دەست كەوێت شتێكی بۆ پەیدا دەبێت لێ تێك بدات .[1]

وەهەروەها هانی خەڵكی دەدات بۆ چاكە و دەڵێت: (( هەر كەسێك بەبێ خزم و كەس سەربەرزی بوێت و نەوەی زۆری بەبێ منداڵ و دەوڵەمەندی بەبێ پارە، دەی با لە سەر شۆری گوناه كردن بگوێزێتەوە بۆ سەربەرزی چاكەكردن .[2]

### ٢- هیوا درێژی و ئارەزوو پەرستی:

ڕۆژێك ئەمیری باوڕداران لەسەر مینبەر لە كوفە ووتاری دەدا و پاش سوپاس و ستایشی پەروەردگار ووتی: ئەی خەڵكینە ئەوەی زۆر لێی دەترسم دوو شتە: هیوا درێژی ـ طول الامل ـ ئارەزوو پەرستی، هیوا درێژی قیامەتت لەبیر دەباتەوە و ئارەزوو پەرستیش لە هەق و ڕاستی لات دەدات، كورە دنیا ڕۆی پشتی هەڵكرد، وا قیامەت بەرەو ڕوومان دێت، هەر لایەك كوڕی خۆی هەیە، دەی كوڕی قیامەت بن و كوڕی دنیا مەبن، وا ئەمڕۆ كردەوە كردنە و لێپرسینەوە نیە و سبەینێ لێپرسینەوە و كردەوە كردن نامێنێت .[3]

### ٣- ڕووپامایی و ڕیاكاری:

ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) دەڵێت(( لا تعمل شیئاً من الخیر ریاء ولاتتركه حیاءً ))[4] واتە: هیچ كردەوەیەك مەكە لەبەر ڕیا و ڕووپامایی و وازیش لە چاكە مەهێنە لەبەر شەرمكردن .

---

[1] تاریخ الخلفاء سید طی لا ٢٠٤ .

[2] تاریخ الیعقوبی (٢٠٠٦/٢) .

[3] منهج علي في الدعوة الى الله لا ٣٠٧ .

[4] ادب الدین و الدنیا لا١١٠ .

یان دەڵێت: (( بۆ ڕیا کار کۆمەڵێ نیشانە هەیە: یەکێ لەو نیشانانە ئەوەیە هەرکاتێ لەناو خەڵکیدا بوو گورج و گۆڵ و ئیش کەرە و بەڵام هەرکاتێ هەر خۆی بوو تەمەڵ و تەوەزەلە و زیاتر ئیش دەکات کە باسی چاکەی بکەیت و واز لەئیش دێنێت کاتێ سەرزەنشتی بکەیت .[1]

٤- لە خۆبای بوون (العجب):

ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ)دەڵێت: (الاعجاب آفة الالباب)[2] واتە: لە خۆبای بوون لەناو بەری ژیرمەندەکانە . و عبدالله کوڕی موبارەك دەڵێت: (( لە خۆبای بوون ئەوەی کە شتێ لە خۆتدا ببینی و لە خەڵکی تردا نەیبینی .[3]

## شەشەم/گرنگیدانی عەلی (ﷺ) بە ڕێکخستنی بازارەکان:

ئەمیری باوەڕداران زۆر بە پەرۆشەوە بووە گرنگی بدات بە بازاڕ و ڕێکخستنی نرخەکان و هاندانی بازرگان و فرۆشیارەکان بۆ لە خوا ترسان و گزی نەکردن لە فرۆشیاری بێ ئاگا .

(الحر) ی کوڕی (حرموز المراوي) لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عەلیم بینی (ﷺ) لە کۆشکی خیلافەت هاتە دەرەوە و بەرەو بازاڕ دەکەوتە ڕێ کە بوردەیەکی لە بەردابوو کورت ببوو لە سەرووی ڕەقەلەی قاچییەوە بوو، دارێکی بەدەستەوە بوو لە بازاڕدا دەگەڕا و فەرمانی بە دوکان دار و دەست گێڕەکان دەکرد بە لە خوا ترسان و جوان شت فرۆشتن و دەیووت: ((اوفوا الکیل والمیزان و لا تنفتحوا اللحم ))[4] واتە: کێشان و تەرازووتان با لا قورس بێت و گۆشت ڕووت مەکەنەوە لە ئێسقان .

(أبي مطر) دەڵێت: لە مزگەوت چوومە دەرەوە، دەبینم پیاوێك لە دواوە بانگم دەکات، و دەڵێت: جل و بەرگت لە خوارەوە کورت کەرەوە چونکە خاوێن تر دەبێت و خوایش پێی خۆشە و سەرت

[1] الکبائر (ذهبي) لا ١٤٥ .

[2] جامع بين العلم و فضلة (٥٧١/١) .

[3] سير اعلام النبلاء (٤٠٧/٨) .

[4] فضائل الصحابه (٦٨٨/٢) اسناد صحيح .

کەمێ کورت کەرەوە ئەگەر موسڵمانیت، ومنیش لەدوایەوە کەوتمە رێ عەبایکی لەبەر کرد بوو دەم و چاوی هەڵبەست بوو ، خۆی خستبووە شێوەی عەرەبی دەشتەکی ووتم: ئەمە کێیە؟ پیاوێك لە تەنیشتمەوە ووتی ئەڵێ غەریبی لەم شارە، ووتم: بەڵێ، خەڵکی شاری بەسرەم .و ووتی: ئەمە عەلی کوڕی ئەبوطالیبە و ئەمیری باوەڕدارانە.

بەردەوام ڕۆیشت تا گەیشتە لای ماڵی (إبن معیط) و پێی ووت: شت بفرۆشن بەڵام سوێندی تێدا مەخۆن، چونکە سوێند شت و مەك سەرف دکات بەڵام بەرەکەت نلهێڵێت، و پاشان دای بە لای خورما فرۆشەکاندا، و دەبینی کەنیزەکێك دەگری، لێی پری: بۆچی دەگریت؟ ئەویش ووتی: ئەم پیاوە بایی یەك درهەم خورمای پێ فرۆشتم بەڵام گەورەم لەماڵەوە بە دڵی نەبوو پێی ناردمەتەوە و ئەویش وەری ناگرێتەوە، عەلیش (ﷺ)بە دوکاندارەکەی ووت: خورماکەی لێ وەرگرەوە و درهەمەکەی پێ بدەرەوە چونکە ئەم داماوە هیچی بە دەست نیە، و ئەویش لێی وەرگرتەوە و لێم پرسی: ئەم پیاوە دەناسیت؟ ووتی: نەخێر، ووتم: ئەمە ئەمیری باوەڕدارانە عەلی کوڕی ئەبو طالیبة (ﷺ)... کابراش شەرم گرتی و ووتی: حەزدەکەم لێم ڕازیبیت ئەی ئەمیری باوەڕداران، و عەلیش (ﷺ) پێی ووت: ڕەزامەندی منت بۆ چییە ئەگەر بە جوانی مامەڵە لەگەڵ کڕیارەکاندا بکەیت .

پاشان دای بەلای خورما فرۆشاندا و پێ ووتن: بەشی برسی و نەدارانی لێ بدەن بەرەکەت دەکەوێتە ناو کاسبیەکانتان .

پاشان دای بە لای ماسی فرۆشاندا و پێی ووتن: لەم بازاڕەی ئێمەدا نابێ ماسی سەر ئاو کەوتوو بفرۆشێت.[1]

زازان دەڵێت: عەلی (ﷺ) بە تەنها خۆی دەگایندە بازاڕ و ڕێگەی بە نەشارەزایان پیشان دەدا و یارمەتی لاوازەکانی دەدا و دەیدا بەلای سەوزە و میوە فرۆشاندا و ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە بە سەریاندا: ((تِلْكَ الدَّارُ الآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لا يُرِيدُونَ عُلُواً فِي الأَرْضِ وَلا فَسَاداً )) واتە:

[1] البداية و النهاية (٣٩/٨ ـ ٣٩) .

بەهەشتی خوا لە قیامەتدا بۆ ئەو کەسانەیە کە نایانەوێت لە سەر زەویدا بەرز رابگیرێت و خراپە بڵاویکەنەوە .[1]

(( ابو الحصاء)) دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبوطالیبم بینی (ﷺ) لەناو بازاڕدا دەگەڕا و لە نرخی کاڵا و شت و مەکەکانی دەپرسی .

## هەندێ ئامۆژگاری و بەرگری لە گوناه و خراپەکان :

### ١- ناڕازی بووە ئافرت بچێتە بازاڕی قەرەباڵغ و شان بە شانێن کردن:

بۆیە زۆر سەرزنشتی ئەو پیاوانەی دەکرد کە بەرگری ناکەن لە ژن و کچەکانیان کە نەڕۆن بۆ بازاڕەکان بە تایبەت بازاڕی پڕ لە نا شەرعی یان کافران و دەیووت: پێم گەیشتووە کە ئافرەتانتان دەردەچن و لە بازاڕەکاندا شان شانێن دەکەن لەگەڵ علوجەکان .[2]

### ٢- بازرگانەکان دەترسێنێ لە نەشارەزایی لە شەرعدا:

ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) دەلێت: ئەو کەسەی لە ئسلام و ئەحکامەکانی نەگەیشتبێتێ ئەگەر ببێتە بازرگان، ئەو دەکەوێتە ناو سوو خواردنەوە، دەکەوێتەناو سوو خواردنەوە، و دەکەوێتە ناو سوو خواردنەوە،[3] وە بە دارەکەی دەستیشی دەیەیدا لەو فرۆشیارانەی کە ناشارەزا بوون لە ئەحکامی شەرعیدا و دەیووت: خۆتان فێرکەن پاشان وەرنە ئەم بازاڕەمانەوە.[4]

(ئەمرۆ حوکمەتی ئسلامی دەتوانێت مەرج دابنێت لە کاتی مۆلەت پێدانیان و پرسیاری جۆراوجۆریان لە سەر بەشەکانی کڕین و فرۆشتن و سوو خواردن وو شتە پەیوەندارەکانی تریش یان لێ بکات و چەندان خولی زانستیان لەو بوارەدا بۆ بکاتەوە و تیایاندا بنەماکانی دڵ نەرمی و

---

[1] الدر المنثور ، سیوطی (٦/٤٤٤) .
[2] مسند احمد (٢/٢٥٤-٢٥٥) صحیح الاسناد .
[3] بستان العارفین لا (٣٥٠) .
[4] نظام الحکومة الإسلامیة - الکتاني (١٧/٢).

بەزەیی هاتنەوە بەکڕیاری هەژار و نەداردا و سوێند نە خواردن و قازانجی زۆر ناشیا و دانەنان لەسەر کەل وپەل و ڕاستگۆیی لە مامەڵەدا و هتد ...)[1] .

٣- لە سەردەمی عەلیدا (ﷺ)کەس بۆی نەبوو لە بازاڕدا شوێن داگیربکات و بڵێت هەموو ڕۆژێ ئەم شوێنە هی خۆمە و کاتێ دەنگە دەنگێك لە شاری کوفە دروست بوو لەسەر ئەوە، عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ)هەستا و چوو بۆ ناو بازاڕدا و پێی ووتن:کەس بۆی نیەکاری وا بکات چونکە بازاڕی موسڵمانان وەك ڕیزەکانی نوێژی مزکەوت وایە و هەر کەسێ ئەوەندە مافی هەیە تیایدا کە لەوێ بێنیێتەوە و هەر کاتێ بەجێی هێششت مافی بەسەرییەوە نامێنێت .

بەڵام پاشان لە سەردەمی (موغیرەی کوڕی شوعبە) دا (ﷺ) هەرکەسە شوێنێکی خۆی پێ درا[2] وەك ئەمڕۆ حوکمەتەکان چاو لە فیکری ئیسلامی دەکەن و گەڕەکی بازرگانی دروست دەکەن و خاوەن پیشەکانی بۆ دەردەکەن لە شارەکاندا ...

ئەم کارە مەزنەی ئمام عەلی کردی (ﷺ) ئەمڕۆش بەردەم دوکانەکان دەگرێتەوە بۆ دەستگێرەکان و هیچ دوکاندارێك ناتوانێت بەردەمی دوکانەکەی بکات بە هی خۆی و بیدات بە کرێ .[3]

٤- لادێ یەکی سوتاند:

ئەمیری باوڕداران عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) زۆر نارەحەت و نیگەران دەبوو لە یەکێك کە ئارەقی بفرۆشتایە، و فەرمانی سووتاندنی ئەو ناوچەی دەردەکرد .

(الإمام ابو عبیده القاسم کوڕی سلام) دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکیان عەلی کوڕی ئەبوطالیب (ﷺ) سەیری گەڕەکێکی شاری کوفەی کردو پرسیاری کرد: ئەم دێیە کوێیە؟ وتیان: زرارەی پێ دەڵێن و خەڵکی رووی تێ دەکەن و ئارەقی تێدا دەفرۆشرێت، و ئەویش کەوتە ڕێ تا گەیشتە ئەوێ و ووتی: ئاگرم بۆ بکەنەوە، و ئاگریان تێ بەردەن، چونکە باپیسەکان یەکتری بۆن، و (راوی) دەڵێت تا ئەو پەری سوتا و ئاگرەکە گەیشتە باغەکەی خواستای کوڕی جەبرونا .[4]

---

[1] ووتەی وەرگێر .

[2] الاموال لابي عبيد لا ١٢٣ .

[3] ووتەی وەرگێر

[4] الاموال لا ٩٧، ٩٨ .

**٥- خراپەکارانی زیندانی دەکرد:**

قازی یوسف کوڕی عبدالمالکی کوڕی عومەیر دەڵێت: (( عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) هەر کاتێ بیبینیایە لەناو گەرەکێك یان هۆزێك دا خراپەکارێك یان بەد ڕەوشتێکی تێدایە، یەکسەر فرمانی گرتنی دەردەکرد و ئەگەر دەوڵەمەند بوایە لە پارەی خۆی مەسرەفی زیندانەکەی پێدەکێشا و ئەگەر هەژاریش بووایە لە (بیت المال) مەسروفی بۆ دەکرد و هەمیشە دەیفەرموو: لە شەڕ و خراپەی بێوەی دەبن و لە بەرامبەردا لە (بیت المال)ەکەی خۆیان خواردنی پێدەدرێت .[1]

**٦- ڕقی لە بەخیلەکان بووە:**

ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) دەڵێت: (( مژدە بدەن بە پارە و سامانی بەخیل کە یان لە رووداودا خەرجی دەکات یان بۆ وەرەسەکەی )) .[2]

و دیسان دەڵێت: (( البخيل مستعجل الفقر ، يعيش في الدنيا عيش الفقراء و يحاسب في العقبي حساب الاغنياء )) . واتە: بەخیل پەلەی هەژاریەتی، لە دنیا ژیانی هەژاری بە سەردەبات کەچی لە قیامەتدا حیسابی دەوڵەمەندی بۆ دەکرێت ـ پەنا بە خوا ـ .

٧- هاواری دەکرد خەڵکینە نوێژەکانتان:

ئەمیری باوەڕداران زۆر گرنگی دەدا بە نوێژ و کاتێ دەچوو بۆ مزگەوت: بەرێوە بە دەنگی بەرز دەیووت: نوێژ، نوێژ، و بەو کارەی خوڵکی بە خەبەر دەهێنا بۆ نوێژی بەیانی .[3]

٨- گرنگی دان بە شارەوانی:

ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) فەرکانی دەدا بە ڕاکێشانی ئاو و دامەزراندنی ئاوەڕۆ لە جادە گشتیەکاندا .

---

[1] الخراج لابي يوسف لا ١٥٠ .

[2] نثر اللالىء لا ١٨٣ .

[3] منهج علي في الدعوة

## حەوتەم/ لە سەردەمی عەلی (ﷺ) پۆلیس دەست بەکار بووە:

زۆر لە سەرچاوەکان ئاماژە بە رۆڵی گرنگی ـ شورتە ـ پۆلیس ـ دەکەن لە سەردەمی خەلیفە عەلیدا (ﷺ)

(أصبغ کوڕی نباتە) دەڵێت: گەنجێك هات و سکاڵای خۆی بەرزکردەوە بۆ لای عەلی (ﷺ) ووتی: باوکم لەگەڵ کۆمەڵێك کەسدا چووە بۆ سەفەرێك، کەچی هەموویان هاتوونەتەوە باوکم نەبێت، کاتێ لێم پرسین ووتیان: مردوە ووتم ئەی پارەکانی؟ ووتیان هیچی پێ نەبوو، و شکاتم برد بۆ لای شورەیح و سوێندی دان وبەرەڵای کردن .

و عەلیش پۆلیس بانگ کرد و هەریەك تاوانبار و دووپۆلیسی بۆ دانا، وپێی ووتن با لە یەکتر نزیك نەبنەوە و جیایان کەنەوە لەیەك، وتیشی کەس قسەیان لەگەڵ نەکات .

کاتبەکەی خۆی بانگ کرد و لەگەڵ یەکێك لە تاوانبارەکان و پێ ووت: باسی باوکی ئەو لاوەم بۆ بکە، چ رۆژێك لەگەڵتاندا کەوتە رێ؟ لە کوێ لاتان دا؟ چۆن دەرۆیشتن؟ بە چ دەردێك ئەو پیاوە مرد؟ و ئەی ماڵەکەی چی بەسەر هات؟ و تەنانەت پرسیاریش لێ کرد دەربارەی ئەوەی کێ شۆردی؟ و کێ نوێژی لە سەر کرد؟ و لە کوێ نێژرا؟ نووسەرەکەش هەموو وەڵامەکانی دەنووسی خەڵکەکەش (الله اکبر) یان دەکرد، وتاوانبارەکانی تر نەیان دەزانی کە ئیفاد لەدەمی هاورێکەیان وەرگیراوە و پاشان یەکێکی تری بە تەنها بانگ دەکرد و هەمان پرسیارپرسیارەکانی پێشووی لێ کردەوە و ئا بەو جۆرە لە هەموویان پرسی و لە ئاکامدا هەریەکەو بەجۆرێك وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە کە پێچەوانەی یەکتری بوون، و پاشان یەکەمی بانگ کرد و پێ ووت: ئەی دوژمنی خوا، درۆ و دەلەسەکانتمان بۆ دەرکەوت و هیچ شتێك لە سزا دەربازت ناکات جگە لە راست گۆیی و پاشان کریەوە زیندان، تاوانبارەکانی تر گومانی ئەوەیان نەبرد کە هاورێکەیان دانی بە راستیدا ناوە، بۆیە دوەم کەسانی بانگ کرد و هەرەشەی لێ کرد و ئەویش ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من هەر لە سەرەتاوە پێم ناخۆش بوو ئەو کارەی کردیان و ئەوانی تریشی بانگ کرد و بەو شێوەیە دانیان بە ڕاستی دانا، پاشان یەکەم کەسی لە زیندان دەرهێنا و پێی ووت: هاورێکانت دانیان بە

هەموو شتێك داناوە و تۆش جگە لە ڕاستی گووتن هیچ شتێك فریات ناکەوێت، و ئەویش دانای بە تاوانەکەدا دانا و هەموو پارەکانی پیاوەکەی پێ بژاردن و تۆڵەشی لە بکوژەکەی کردەوە .[1]

[1] الطرق الحكمية لا ٤٩ .

# بەشی چوارەم

# دەزگای دارایی و دادوەری لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبو طالیب و لەگەڵ هەندێ لە بۆچونە فیقهی یەکانیدا :

## جێ باسی یەکەم

## دەزگای دارایی :

لە سەردەمی ئەمیری باوەڕداراندا بەو شێوەیە گۆڕان بەسەر ئەم دەزگایەدا نەهات ، بەڵام ئەبوو ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) گەڕایەوە سەریاساکانی سەردەمی خەلیفە ئەبو بەکر الصدیق (ﷺ) کە موچەو بەخشینەکانی یەکسان کردەوە لە نێوان هەمواندا بەبێ جیاوازی لە نێوان بەندەو گەورەکاندا[1] .

لە هەندێ لە ویلایەتەکاندا بەرپرسەکان خۆیان سەرپشك بوون لە خەرج کردنی داهاتەکاندا، و هەروەك چۆن کاتێك " الاشتر النخعی " نارد بۆ میسر بە ناونیشانی والی ئەوێ ، پێی ڕاگەیاند کە لەگەڵ بەرپرسیارێتی گشتی یەکەیدا دەبێت بەرپرسیارێتی دەزگای دارایی بگرێتە ئەستۆ و بەو شێوەیەی بەرژەوەندی گشتی تێدایە خەرج بکات.

ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) مەسەلەی داهاتی بە سەرچاوەیەکی بنەڕەتی دادەناو زۆر بەوردی چاودێری دەخستە سەر ئەو لایەنەو کەسی تایبەتی بە نهێنی دا دەنا بۆ ئەوەی چاودێری کارمەند و والی یەکانی بکات و بزانێت چۆن و بە چ شێوازێك داهات و سامانی وڵات خەرج دەکەن[2] .

بەڵام بەهۆی ئەو جیاوازی و بەربەرێکانی یە ناوخۆیی یەی لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا ڕویدا بەتایبەتی کاریگەری خراپی هەبوو لەسەر هەردوو دەزگای دارایی و سەربازیەوە و پاشتریش بوو بەهۆی کۆتایی هێنان بە زێڕین ترین سەردەم کە سەردەمی خیلافەتی راشیدین بوو کە لەمەو دوا ـ انشاء الله ـ بە درێژی لێوەی دەدوێین

---

[1] الاستیعاب ( ١١/٣).

[2] الولایة علی البلدان ( ٢/ ٩٨).

## جێ باسی دووەم

## دەزگای دادوەری :

سەردەمی هەڵبژاردنی عەلی (رضي الله عنه) بۆ خیلافەتی ئیسلامی هاوکات بوو لەگەڵ ڕووداوی ترسناکی شەهید کردنی خەلیفەی سێیەمی ئیسلام عثمان (رضي الله عنه) و دوا بەدوای ئەویشدا کۆمەڵێ پشێوی و ئاژاوە گێڕی ڕوویدا کە ڕیزی موسڵمانەکانی پەرتەوازە کرد و یەکبوونی لەناو بردن.

ئەمیری باوەڕدارانیش (رضي الله عنه) لەگەڵ ئەو هەموو سەرقاڵیەیدا لایەنی دادوەری و حوکمڕانی دروستی پشت گوێ نەدەخست .

ئەوەتا کاتێك ( مالیك الاشتر) والی میسر دەبێت ، عەلی (رضي الله عنه) نامەیەکی بۆ دەنێرێت کە جێگای خۆیەتی هەموو دادوەرێکی موسڵمان و پارێزەرەکان لەبەریان بێت، ئەمەش دەقی نامەکەیە :

" ئەو کەسانە هەڵبژێرە بۆ دادوەری کە لەکاتی ڕوداوەکاندا ، دنیای لێ نایەتە یەك و دوژمن و نەیاری کار لە بڕیارەکانی ناکات، و بەردەوام نابێت لەسەر چەوتی، و خێرا بۆلای حەق دێتەوە هەر کە بۆی ڕۆیشن بویەوە ، و تەماح و ستەمی نابێت ، بە حاڵی بوونی کەم ڕازی نابێت ، بەڵکو ئەو پەڕی تێ گەیشتنی دەوێت ، لە هەموان زیاتر خۆی لە کارە ـ شبهە ـ دارەکان دەپارێزێت ، لە هەموان زیاتر شەیدای بەڵگەیە ، و لەهەموان کەمتر بێ تاقەت بێت بە شکات کردنەکان ، لە هەموان زیاتر بە ئارام بێت لە روون کردنەوەی مەسەلەکاندا ، و لەهەموان زیاتر سور بێت لەسەر روون کردنەوەی حوکمەکە ، لەو کەسانەی کە نەلەبوون و خۆشگوزەرانیدا لە حەق لادەدەن و نەکەسیش دەتوانێت دەمیان چەور بکات ، و ئەو کەسانەش زۆر کەمن .

ئەگەر ئەو کەسانەت دۆزیەوە پێویستی یەکانیان جێ بەجێ بکە ، تەواو بواری بدە و خەرجی تەواوی بدە با نەبوونی پێوە دیار نەبێت و موحتاجی پارەی کەس نەبێت، تۆ ئەوەندە لە خۆتی نزیك بکەرەوە و پلەی بدەرێ تا نەوەك وەزیر و دەست وپێوەندەکانت بەرەو خۆیان بیبەن ، و بەو کارەشت پیاوان لەوە دڵنیا دەبن کە تۆ لەناویان نابەیت و دوریان ناخەیتەوە "[1].

[1] شرح نهج البلاغة له (نظام الحكم ) ی قاسمی وەرگیراوە (١/٣٧٩).

لە نامەیەکی تریدا دەڵێت " بە ویژدان و دادپەروەر بە لەبەر خاتری خوا و لەناو خەڵکدا دادپەروەر بە ئەگەر زیانی بۆ خۆیشت یان کەسێکی نزیکت هەبوو، لەگەڵ ئەوانەشدا دادپەروەر بە کە ناکۆکیت هەیە لەگەڵیاندا، و ئەگەر وانەکەیت زوڵم و ستەم دەکەیت ، و ئەو کەسەیش ستەم لە بەندەکانی خودا بکات ، ئەوە خوای ـ عز وجل ـ لە جیاتی ئەوان شکات کەری دەبێت ، و ئەو کەسەیش خودا شکات کاری بێت بەڵگەی پێنایەت و بەردەوام لەگەڵ ئەودا لە جەنگدایە تا واز دەهێنێت یان تەوبە دەکات ،

و هیچ شتێکیش ئەوەندە کاریگەر نیە بۆ نەهێشتنی بە خشش و نیعمەتەکانی، وەك بەرپا کردنی زوڵم و ستەم ، و خوایش بیسەری هاواری ستەم لێکراوانە ،و بۆ ستەم کارانیش هەردەم لە کەمیندایە "[1].

یەکەم/ شێوازی دادوەری عەلی (ﷺ) :

١ ـ دەستی نەبرد بۆ گۆڕینی شێوازی دادوەری :

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) ویستی شێوازی دادوەری بگۆڕێت بە شێوازێك لەگەڵ ئەو پێشکەوتن و گۆڕانکاریانەی بەسەر کۆمەڵگەی ئیسلامی داهاتبوو بگونجێت ، بەڵام ئەو کارەی دواخست و وازی لێهێنا بۆ ئەو کاتەی ئارامی و هێوری ڕوو دەکاتەوە کۆمەڵگە ، و لێوەی دەگێڕنەوە کە وتویەتی " دادوەری بەڕێوەبەرن هەروەك جاران دەبێت تا ئەو کاتەی یەکبوون دەبێت و کۆدەبینەوە ، چونکە من زۆر دەترسم لە جیاوازی و پەرتە وازەیی "[2].

٢ـ دادوەری یەکێکە لەو بەرپرسیاریانەی کە ئیش و کاری خەڵکی ڕادەپەڕێنن و دەبێت مەرجەکانی موسڵمانەتی و ژیری و پێگەیشتوویی تێدا بێت و هەروەها دەبێت هیچ لە خەڵکی وەرنەگرێت وەك بەرتیل و دیاری و هتد...، و زۆر نەرم و نیان بێت و بەڕەق ترین قسەی خەڵك تێك نەچێت و تۆڕە نەبێت ، و زانا بێت بە شەریعەت بە هەموو وردەکاریەکانیەوە .

[1] هەمان سەرچاوە ( ٢/ ٥٥٩).

[2] مصنف عبدالرزاق (١١/ ٣٢٩).

جارێکیان بە دادوەرێکی ووت " ئایا ـ ناسخ و مەنسوخ ـ دەزانیت ؟ ووتی : نەء ، و ئەویش پێی ووت: خۆیشت و خەڵکیشت لەناو بردووە ، و هەروەك دەبێت ئاگای لە حوکم و دادوەریەکانی قازیەکانی پێش خۆی بێت تا هەر کەسەو بەجۆرێ حوکم دەر نەکات ، و دەبێت زۆر خۆ بەکەم زان بێت و پێی عەیب نەبێت پرسیار لە زاناو داناو ژیرمەندەکان بکات و ئەو کاتە زۆر کەم دەکەوێتە هەڵەوە، و دەبێت حوکمی ڕاستی بدات و بوێر بێت و نەترسێت لە دەسەلاَت داران.

ئەم شێوازانە لە وتەیەکی عەلیدا (ﷺ) بە جوانی کۆکراوەتەوە کە دەڵێت " دادوەر بە دادوەر دانانرێت تا ( ٥) شتی تێدا نەیەتەدی: عەفیف بێت ( واتە هیچ شتێك لەکەس وەرنەگرێت) ، نەرم و نیان و لەسەرخۆ بێت ، زانا بێت بەدادوەرەکانی پێش خۆی، و ڕاوێژ بکات بە ژیرمەندانو لەبەر خاتری خوا لەلۆمەی لۆمە کاران نەترسێت)[1] .

٣ ـ دەبێت دادوەر بێ بەرامبەر کار بکات :

بەوەی کە بەرپاکردنی دادوەری ئەرکی سەرەکی دەوڵەتی ئیسلامیە وفیقهی ئیسلامیش لەم بوارەدا زۆر مەبەستیەتی کە حەقەکە ڕۆشن بێتەوە و ستەم لێکراو مافی خۆی وەربگرێتەوە ، بۆیە هیچ یەکێك لە شکات کەرەکان نابێت پارە بدەن بە دادوەر کە بۆ ئەوەی نمەك گیر نەبێت ، بەڵکو حکومەتی ئیسلامی موچەی تەواوی پێ دەدات و عەلیش (ﷺ) موچەی بە ( شورەیح ) دەدا لەبەرامبەر کارە دادوەریەکەیدا لە کوفەو مانگانە (٥٠٠) درهەمی بۆ بڕیبوویەوە[2] .

٤ ـ سەرەتای کاری پارێزەری :

سەرەتای کاری پارێزەری ( محامات ) دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب (ﷺ) کە عەقیلی برای دانا بوو بۆ ئاسان کاری کارە ناکۆکیەکان ـ الخصومات ـ ، و کاتێ عقیل بەساڵدا چوو عبداللە ی کوڕی جەعفەری لە جیاتی ئەودا داناو هەردەم دەیوت " ما قضی لوکیلی فلي ، وما قضی علی وکیلی فعلیّ " واتە : چ مافێك بدرێت بە وەکیلەکەم ئەوە بۆ منە و چ مافێکیش لە وەکیلەکەم بسەنرێت ئەوە لەسەر منە[3] .

[1] المغنی (٩/ ٤٣).

[2] موسوعة فقه علي بن ابی طالب لا ٥٦ .

[3] اصول الحاکمات الشرعیة لا ٧٠.

دووەم / ئەو کارانەی لەسەر دادوەر پێویستە :

١ـ لێکۆڵینەوە بە وردی لە کێشەکان : نابێت بە پەلە حوکم دەربکات پێش وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە و دڵنیا بوون لە حوکمەکە بۆیە قازی شورەیح دەڵێت" لسانك عبدك مالم تتكلم ، فإذا تكلمت فإنت عبده ، فانظر ما تقضي ، و فيم تقضي ؟ و كيف تقضي ؟ " واتە : زمانت بەندەی تۆیە تا قسە نەکەیت و ئەگەر قسەت کرد تۆی دەبیتە بەندەی ئەو، جا بەوردی بڕوانە چ حوکمێ دەدەیت ؟ لە چیدا حوکم دەدەیت؟ و چۆن حوکم دەدەیت؟

٢ـ یەکسانی لەنێوان دوولای ناکۆکدا :

جارێکیان عەلی (ﷺ) میوانێکی هات و چەند ڕۆژێك لەلای مایەوە و پاشان لەسکاڵایەکدا هاتە بەردەم عەلی، و ئەویش پێی ووت : تۆ لایەنێکی ناکۆکیت ـ الخصم ؟ وتی : بەڵێ ، ووتی پێی : بڕۆ ئەم ماڵە بەجێ بهێڵە چونکە ئێمە بەرگریمان لێکراوە کە لایەنێکی ناکۆك بە تەنها میوانداری بکەین مەگەر لەگەڵ لایەنەکەی تریدا[1] .

٣ـ دەنگ بەرز کردنەوە بەسەر دوو لای ناکۆکدا:

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) ـ ابو الاسود الدؤلي ـ کرد بە والی شاری بەسرە بەلاّم پاش ماوەیەك لای برد،

و ئەویش پێی ووت : ئەوە بۆچی لات بردم خۆ من نە ناپاکیم نواندووە و نەتاوانبارم؟ ووتی : نا بەڵکو لەسەر ئەوەی کە خۆم بە چاوی خۆم تۆم بینی هاوار و قیڕەت دەکرد بەسەر دوولای ناکۆکدا[2] .

٤ـ بوار نەدان بە نەفس کە کاری لێبکات :

ئیتر ئەو کاریگەریە خزمایەتی یە، ئارەیەکی زۆرە، ئان ڕق و ناکۆکی پیشتر، جەعدەی کوڕی هەبیرە هات بۆ لای عەلی (ﷺ) و پێی ووت : ئەگەر دوو کەس هاتنە لات بۆ شکات و

---

[1] كنز العمال ژمارە ١٤٤٢٩.

[2] المغني ( ٩/ ١٠٤).

یەکەمیان تۆ خۆشەویست ترین کەسی بیت و دووەمیان بۆی بکرێت سەرت ببڕێت سەرت دەبڕێت، ئایا هەق دەدەیت بە لایەنی یەکەم و دووەم بێ بەش دەکەیت ؟
عەلیش (ﷺ) بە خێسەکەیەوە سەیری کرد و پێی ووت: ئەگەر دادوەریم بۆ خۆم بکردایە بەڵێ، بەلام بۆ خوایە[1].

٥ ـ ڕاوێژ کردن :

لەسەر قازی پێویستە ڕاوێژ بکات بە زانا و خاوەن بۆ چوونە جوانەکان تا هەقی لە دەست دە رنەچێت ،و عەلی خۆی یەکێك بووە لەو کەسانەی خەلیفەکانی پێش خۆی ڕاوێژیان پێکردووە لە کاتی ڕووداو و کێشەکاندا، (خصاف) لە ( ادب القاضی ) دا دەڵێت : هەر کاتێك عثمانی کوڕی عەفان (ﷺ) دوو کەسی سکالاکەر بهاتنایە بۆ لای یەکسەر دەیووت : عەلیم بۆ بانگ بکەن، بەیەکێ تریشی دەووت: طلحە و زوبیر و کەسانێکە تریشم لە هاوەڵانی پێغەمبەر بۆ بانگ بکەن ، و کاتێ دەهاتن بەو دوو کەسەی دەووت: ئادەی قسەی خۆتان بکەن ، و کاتێ قسەیان تەواو دەکرد، ڕووی دەکردە بانگ کراوان و پێی دەوتن لەم بارەیەوە چی دەڵێن؟ ئەگەر ڕاکانیان لە ڕایەکەی خۆیەوە نزیك بوایە حوکمی دەدان و ئەگەر ڕاکەیان جیاواز بوایە لەگەڵ ڕایەکەی خۆی ئەوا دوای دەخستن بۆ کاتێکی تر[2].

---

[1] فقه علي بن ابی طالب ـ قلعه جی ـ لا ٥٠٨.

[2] شرح ادب القاضی الخصاف (١/ ٣٠٥).

## جێ باسی سێیەم

## فیقهی ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رضي الله عنه) :

**یەکەم / عیبادات و پەرستشەکان :**

زۆر ناڕەحەت نەبوو لە سەر ئەمیری باوەڕداران هەستان بە ڕوون کردنەوەی مەسەلە فیقهی یەکان بۆ خەڵکی چونکە خاوەنی زانیایەکی لەسنور بەدەر بوو، ئەگەر بمانەوێت بینوسینەوە لە چەندان بەرگدا جێگای نابێتەوە، ئێمە لێرەدا ئاماژە بۆ هەندێکی دەکەین :

١ـ عبدالرزاق بە سەنەدی خۆی لە ( مصنف ) دا دەڵێت عەلی (رضي الله عنه) ابن مسعود (رضي الله عنه) و شەعبی دەربارەی ئەو کەسەی بە دانیشتنەوە خەوی لێبکەوێت ئایا دەست نوێژەکەی دەشکێت؟ ئەو سیانە دەڵێن : دەستنوێژ هەڵگرتنەوەی لەسەر نیە[١] .

٢ـ قورئان خوێندن بەبێ دەست نوێژ واتە لەبەر:

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رضي الله عنه) دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەهەموو حاڵەتێکدا قورئانی بۆ دەخوێندینەوە جگە لە کاتی لەش قورسی[٢] .

عامیری شەعبی دەڵێت : لە ( ئەبی غەریفی هەمەدانیم ) بیستووە دەیووت : عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رضي الله عنه) چووە سەر ئاو کاتێ هاتە دەرەوە ووتی : هەموو کاتێك قورئان بخوێنن مەگەر کاتێ نەبێ لە شتان قورس بێت ـ جنب ـ ئەگەر وابوون یەك پیتیش مەخوێنن[٣] .

---

[1] المصنف (١/ ١٣١).

[2] مسند احمد (٢/٥١) اسناده صحيح .

[3] مصنف عبدالرزاق (١/٣٣٩).

٣ـ چونه لای خێزان لەکاتی سوڕی مانگانەیدا:

عمری کوڕی خطـاب (ﷺ) له عەلی پرسی دەربارەی کەسێك بڕواته لای خێزانەکەی لەکاتی حەیزدا؟ و ئەویش لەوەڵامدا ووتی: هیچ کەفارەتێکی لەسەر نیە تـەنها ئـەوە نـەبێت کـە دەبێـت تەوبە بکات[1].

أ ـ دەربارەی نوێژ:

١ـ لە کڕنوش و سوجدەدا قورئان ناخوێندرێت:

لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە کە ووتویەتی : پێغەمبەری خوا(ﷺ) بـەرگری لێکردم کە لەکاتی ( رکوع و سجود ) دا قورئان بخوێنم[2].

## ٢ـ نوێژ نەکەر کافرو بێباوەڕە :

لە ئەمیری باوەڕدارانیان پرسی دەربارەی ئافرەتێك نوێژ ناکات؟ لە وەڵامدا ووتـی: هـەر کەسـێك نوێژ نەکات کافرە[3].

و عبدالله ی کوڕی شەفیق دەڵێت : هاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) هـیچ کردەوەیـەکیان نـەدەبینی کـە خاوەنەکەی بێ باوەڕ و کافر بکاتەوە جگە لە نوێژ نەکردن[4].

ئەمە بۆ کەسێکە باوەڕی پێی نەبێت ، بەڵام ئەو موسڵمانەی لەبەر تەمبەڵی و تەوەزەلی وازی لێ دێنێ ئیمامی شافعی و مالیك دەڵێن : ( کافر) نابێت بـەڵکو ( فاسـق ) دەبێـت و دەبێـت داوای تەوبەی لێ بکرێت و ئەگەر هەر نەیکرد ئەوا بە شمشێر دەکوژرێت وەك حەدەکانی تر.

بەڵام ئیمامی ( المزنی ) کە لەگەورە زانایانی شـافعی مەزهەبـە دەڵێـت : ناکوژرێـت و کـافریش نابێت بەڵکو زیندانی دەکرێت و لێدانی دەکرێت ـ تعزیر[5].

---

[1] مصنف ابن ابی شیبه (١/ ٥٩).

[2] مسلـم (١/ ٣٤٩) .

[3] مصنف ابن ابی شیبه (١١/٤٧).

[4] المغنی (٢/ ٤٤).

[5] شرح صحیح مسلم (٢/٧٠).

### ٣ـ دووباره کردنەوەی نوێژ لە وەختی خۆیدا:

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) دەربارەی ئەو کەسەی کە نوێژی کردووە و بەلاّم دەبینێ وا موسڵمانان بە کۆمەڵ نوێژ دەکەن وتی : با لەگەڵیاندا نوێژ دابەستێت چونکە دووەمیانی بە سوننەت بۆ دەنوسرێت و یەکەمیان بە فەرز[١].

هۆی ئەم فەتوایەش لەو فەرموودەیەوە هاتووە کە ئەبو زەڕ (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرمووم " کیف انت إذا کانت علیك امراء یمیتون الصلاة او یؤخرون الصلاة عن وقتها ، فإن ادرکتها معهم وفصلّ فأنها لك نافلة "[٢].

### ٤ـ نوێژی تەراویح بە جەماعەت :

لە ( ابی عبدالرحمن السلمی ) دەڵێت : عەلی (ﷺ) لە ڕەمەزاندا نوێژی تەراویحی بۆ دەرکردن[٣].

ئیسماعیلی کوڕی زیادیش دەڵێت: عەلی (ﷺ) دای بەلای هەندی لە مزگەوتدا ـ لە پاش نوێژی عیشا واتە لەکاتی تەراویح دا ـ دەبینی چراکانی داگیرساون و ڕوناکن وتی : خوای گەورە گۆڕەکەی عومەر پڕ بکات لە نور وا مزگەوتەکانی ڕوناك کردینەوە[٤].

### ٥ـ نوێژی جەژن لە مزگەوتەکاندا:

نوێژی جەژن دەبێت لە دەشتدا بکرێت ، بەلاّم لە سەردەمی عەلیدا (ﷺ) لە شاری کوفە خەڵکەکە زۆر زۆر بوون و تیایاندا هەبوو نەخۆش و ناتوانا و پیرو پەککەوتە بوو نەیاندەتوانی بڕۆن بۆ دەرەوەی شار بۆ نوێژ، عەلی (ﷺ) پیاوێکی دانا کە لە مزگەوتدا نوێژ بۆ ئەو کەسانە بکات و ئەمەش بوو بە سوننەت چونکە پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت " علیکم بسنتی و سنة الخلفاء الراشیدین من بعدي "[٥].

---

[1] مصنف ابن ابی شیبه (٢/٢٧٦).

[2] مسلم کتاب المساجد ذ ٢٤٠.

[3] المغنی ( ٢/ ١٦٩).

[4] المغني ( ١٦٩/٢).

[5] سنن ترمذی حسن الصحیح ٢٦٧٦.

٥ ـ شۆرینی شەهید :

لەلای عەلی (رضي الله عنه) شەهید بە هیچ جۆرێك نابێت بشۆرێت ، و دەگێرنەوە کە هیچ کام لەو کەسانەی کە لەگەڵیدا شەهید دەبوون بەدەستی خەوارج یان نەیارەکانی و کفنیشی نەدەکردن وەك چۆن عەمماری ناشت (رضي الله عنه).

## ب ـ دەربارەی زەکات:

١ ـ ئەو شتانەی زەکاتیان دەکەوێت:

لەلای ئەمیری باوەڕداران عەلی (رضي الله عنه) لەم شتانەدا زەکات واجبە : گەنم و جۆ وخورماو مێووژ و ابن حزمیش لەسەر ئەمەیە[1].

٢ـ سەوزە و میوە و هەنگوین : ئەمیری باوەڕداران (رضي الله عنه) دەڵێت " سەوزەوات زەکاتی تێدا نیە"[2]. لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت " سەوزە و پاقلەوات زەکاتی نییە"[3]. ئەمە ڕای جمهوری زانایانە و بەڵگەشیان ئەوەیە کە ئەم شتانە کاتین و نامێننەوە، و هەروەها عەلی (رضي الله عنه) دەربارەی زەکاتی هەنگوین دەڵێت " هەنگوین زەکاتی ناکەوێت "[4].

٣ـ زەکات بەکێ بدرێت ؟ دروستە زەکاتەکە هەمووی بەیەك جۆر کەس بدرێت لە هەشت جۆرەکەی هەژاران ، یان دروستی بەیەك کەس بدرێت و دەوڵەمەندی بکات لەلای عەلی (رضي الله عنه) و دەڵێت : هیچی تێدا نیە ئەگەر زەکات بەیەك جۆر (لە هەشت جۆرەکە) بدرێت یان جارێکیان زەکاتی بۆ هات وهەمووی نارد بۆ یەك خێزان[5].

---

[1] فقه الامام علي (١/ ٣٤٦).

[2] مصنف عبدالرزاق ( ٧١٨٨).

[3] فقه الامام علي (١/٣٤٧).

[4] هەمان سەرچاوە ( ١/ ٣٤٥).

[5] فقه الامام علي ( ١/ ٣٥٢).

٤ ـ زەکات دان بە باوك ودایك یان کوڕو کچ :

ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) دەڵێت: نەکوڕ نەباوك زەکاتیان بۆیەك ناشێت و ئەگەر هەرکەسێك باوکی هەبیّ یان کوڕی هەبێت و دەستگرۆیی نەکات ئەوە لە خراپەکاران دادەنرێت لەگەڵیاندا ( العقوق)[1] .

(چونکە نابێت کوڕ بهێڵی باوك و دایکی ئەوەندە هەژار بکەون کە زەکاتیان پیّ بشێت و یان باوك بهێڵی کوڕەکەی زەکاتی پیّ بشێت.)[2]

## ج ـ دەربارەی ڕۆژوو:

١ ـ ڕۆژووی لەش قورس ـ لەش پیس ـ :

دروستە مرۆڤ بەڕۆژوو بێت لە کاتێکدا کە لەشی قورس بێت و بەو شێوەیەشەوە ڕۆژوو بکاتەوە لە پاشان خۆی بشوات و نوێژەکەی بکات و ڕۆژوەکەی دروستە لەلای عەلی (ﷺ).

٢ـ پیر نابێت بە ڕۆژوو بێت:

ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) لە تەفسیری ئایەتی ( ١٨٤)ی سورەتی البقرە دا ( وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ) دا دەڵێت: ئەو پیرانەی ناتوانن بەڕۆژووبن با نەیگرن و لەباتی هەر ڕۆژێك نانی هەژارێك بدات[3].

## د ـ دەربارەی ئیعتیکاف:

( ئیعتیکاف ) سوننەتێکی موئەکەدە و موسڵمان بۆ شەحن کردنەوەی باوەڕ و بەندایەتە یەکانی، لە مزگەوتدا دەمێنێتەوە بەڵام لەو ماوەیەدا نابێت (ئیعتکاف ) بشکێنیّ و بڕواتە دەرەوە مەگەر لەبەرکارێکی زۆر پێوست بەڵام لەلای ئەمیری باوەڕداران دەتوانێت بڕوات بۆ نوێژی جومعەو

---

[1] فقه الامام علي ( ١/ ٣٥٢).

[2] ووتەی وەرگێڕ.

[3] تفسیر الطبري (١١/٢).

سەردانی نەخۆش و شوێن جەنازە کەوتن و سەردانی کردنی ماڵەوە و دەرکردنی پێداویستیەکانی بەڵام نابێت دابنیشێت و دەبێت بە پێوە بێت[1].

* دەربارەی سەرو ڕیشی سپی:

دروستە مرۆڤ کە چوو بەساڵدا و سەر و ڕیشی سپی کرد ، دەستی بۆ نەبات بە هیچ ڕەنگێك ڕەنگی نەکات هەرچەندە بەخەنە دروستە بەڵام وەك شەعبی دەڵێت: عەلیم بینی بە شێوەیەك سەرو ڕیشی سپی بوو هاتبوون بەسەر شانەکانیدا[2].

ابن اسحاق دەڵێت : عەلیم بینی سەری ڕوتابویەوە ـ اصلع ـ و سەرو ڕیشی سپی کردبوو[3].

* یاری کردن بە تاوڵە:

لەلای عەلی (ﷺ) تاوڵە حەرامە و لە بارەیەوە دەڵێت: سکڵی سور بگرم بە دەستمەوە پێم خۆشترە لەوەی کە زاری تاوڵە بگرم بە دەستمەوە[4]. و هەرگیز سەلامی لەو کەسانە نەکردووە کە خەریکی تاوڵە بوون[5]. و بەڵکو ڕووی تێ کردوون و پێی وتون " وەڵلاهی ئێوە بۆ ئەمە دروست نەکراون و وەڵلاهی ئەگەر لەوە نەترسامایە کە دەبێتە سوننەت لەدوای خۆم ئەوە بەو تاوڵەیە دەهاتم پێدانداو دەم و چاوم دەشکاندن[6].

* سیغە کردن یان ژن هێنان بۆ لەزەت:

ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) دەڵێت : ڕەمەزان هەموو ڕۆژویەکی تری لابرد ، و زەواجی موتعەیش تەلاق و عیدە و میرات هەڵدەوەشێنتەوە، بەڵگەیشی ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرگری کردووە لە ژنهێنانی لەزەت (سیغە) و خواردنی گوێ درێژی ماڵی کاتێ لە خەیبەر بوو[7].

---

1 مصنف ابن أبي شيبة (٨٧/٣).

2 فقه الامام علي ( ١/ ٤٩٥).

3 مصنف ابن أبي شيبة (٤٢٧/٩).

4 هەمان سەرچاوە (٧٣٨/٨).

5 اعلاء السنن للتهانوي (٤٦٤/١٧).

6 سنن البيهقي، فقه الامام علي (٥٠٢/١).

7 مسلم، كتاب النكاح (١٠٢٧/٢).

### * چوونە لای خێزان لە دواوە:

لەلای ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) چوونە لای ژن بەشێوەی نادروست و لەدواوە واتە - لِواطة - حەرامە،

( ابن قدامە) ئەمەی نەقلّ کردووە لە ( ابی المعتمر) و دەگێڕنەوە کە عەلی(ﷺ) لەسەر مینبەرەکەیەوە هاواری کرد : پرسیارم لێبکەن، و پیاوێکیش ووتی: ئایا دروستە پیاو لەدواوە بچێتە لای خێزانی خۆی ؟ عەلیش (ﷺ) پێی ووت: هەی نەزانی خوا نەزان کردوو، ئەی ئایەتی پەروەردگارت نەخوێندۆتەوە کە دەفەرموێت (( انکم لتأتون الفاحشه ما سبقکم بها من احد من العالمین )) العنکبوت ٢٨. واتە : ئێوە گوناهێك دەکەن کە هیچ کەس پێش ئێوە شتی وای نەکردووە؟.

### * دەستکەوتی کافران نافرۆشێتەوە بە خۆیان :

لە ( ام موسی ) و دەڵێت : لەناو ئەو غەنیمانەدا کە بۆ عەلیان هێنا قاپێکی لە ئاڵتون دروستکراوی تێدا بوو کە ڕەمزی فارسەکانی پێوە بوو، ویستی پارچە پارچەی بکات و دابەشی بکات بەسەر موسڵماناندا و هەندێ کەس لە ( دەهقانەکان) کە لەوان غەنیمە کرابوو، ووتیان : ئەگەر ئەم دەفرە بشکێنی بەهاکەی دەشکێت و بەساغی پارەی زۆر دەکات و بەو شێوەیە پێمان بدەرەوە و چەند قات پارەی دەدەین ، عەلی (ﷺ) لە وەلآمدا ووتی : نەخێر ماڵێك خوای گەورە لە ئێوەی سەندوە بۆ ئێمە، من هەرگیز پێتان نادەمەوە، و لەت و پەتی کرد و دابەشی کرد بەسەر موسڵماناندا[1] .

### * حوکمی زینای ناچاری:

ئەگەر کەسێك ناچار بوو بۆ ئەوەی خۆی لە مردن ڕزگار بکات - زینا - بکات، ئەوەش سزای حەدی لەسەر نیە لەلای عەلی (ﷺ)[2].

---

1 فقه الامام علي بن ابي طالب (٢/٧٥٢).

2 هەمان سەرچاوە (٢/٧٨٨).

دەگێڕنەوە ئافرەتێك هات بۆلای عمر(ﷺ) ووتی : من زینام کردووە وبەلکو بەرد بارانم - رجم - بکەیت، و عمریش وتی : برۆ تا چوار شایەتی نەدەیت لێت قبولٚ ناکەین ، و ئەویش چوار جار شایەتی دا و عمریش فەرمانی دەرکرد ڕەجم بکرێت.

عەلی(ﷺ) ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ، بیگەڕێنەوە و پرسیاری لێبکە هۆی چی بووە وا زینای کردووە بەلکو لەوانەیە بیانویەکی - عذر- هەبێت؟

عمریش بانگی کردەوە و پێی ووت : بۆچی زینات کرد؟ و ئافرەتەکەش ووتی : کۆمەلێ ووشترمان هەبوو چووم بیانهێنمەوە و شەریکێکیشمان هەبوو ئەویش بەدوامانداا هات و من ئاوی زۆرم پێ نەبوو، ووشترەکانشم شیریان تێدا نەبوو، بەلاٚم ووشترەکانی ئەو شیردار بوون ، و لەوبیابانە من ئاوم لێبڕا و تینووم بوو، داوای ئاوم لێکرد و ئەویش نەیدامێ و ووتی: تا خۆت نەدەیت بە دەستەوە و منیش خۆم نەدا بەدەستەوە ، بەلاٚم دواتر خەریك بوو لەتینویدا گیانم دەردەچوو، بۆیە خۆم دا بەدەستەوە.

لێرەدا عەلی (ﷺ) هاواری کرد: ( الله اکبر )" فمن اظطر غیر باغ ولا عادِ فلا إثم عَلیه ، أری لها عذراً )[1].

واتە: هەر کەسێك ناچار بکرێت بۆ گوناهێك و دەستی خۆی تیا نەبێت ئەوە تاوانبار نابێت، ئەم ئافرەتانەش بیانووی خۆی پێ یە.

* عەرەق خواردن لە ڕەمەزاندا:

( عطاء ) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە عەلی (ﷺ) (٨٠) داری حەدی دا لە شاعیرێك بە ناوی النجاشی الحارث و زیندانیشی کرد و (٢٠) داریشی لە ڕۆژی داهاتودت لێدا. و پێی ووت: (٨٠)دار بۆ عەرەق خواردنەکەت و (٢٠) کەیش بۆ ئەوەی کە بوێری بەرامبەر خوا و لە ڕەمەزاندا عەرەقت خواردەوە[2].

---

[1] المغني (١٨٧/٨).

[2] كنز العمال ١٣٦٨٧.

* دەستی دز بڕین و هەڵواسینی بە بەرۆكیدا

سوننەتە بە داو و دەرمان بە زوترین كات شوێن برینەكەی دەستی دزەكە خۆش بكرێتەوە و پاشان دەستە قرتاوەكە بكرێت بە ملی و خەڵكی ببینن و عەلی (ﷺ) دەچوو بۆلای دزەكان لە زیندان و پێی دەووتن: دەستتان بەرز بكەنەوە بۆ لای خوای گەورە و ئەوانیش بەرزیان دەكردەوە و ئەویش پێی دەوتن : كێ دەستی بڕیونەتەوە؟

ئەوانیش دەیانوت: عەلی ، و ئەویش دەی پرسی لێیان : لەسەر چی؟ و ئەوانیش دەیان ووت: دزیمان كردووە و عەلیش دەیووت " اللهم اشهد اللهم اشهد" خوایە تۆ بەشایەت بە وفەرمانی دەركرد خێرا چارەسەری برینەكەیان بكەن با پیسی نەكات لێی .

* كەسێ بە خزمەتكارەكەی دەڵێت : فلاَن كەسم بۆ بكوژە :

لەلای عەلی (ﷺ) هەر كەسێك فەرمان دەربكات بۆ خزمەتكار و بەندەكانی كە فلاَن پیاوی بۆ بكوژن و ئەوانیش كوشتیان ، پیاوەكە دەكوژرێتەوە و بەندەكەش زیندانی دەكرێت.

خەلاس لە عەلیەوە دەگێڕێتەوە دەربارەی كەسێك فەرمان بدات بە خزمەتكارەكەی كە كەسێكی بۆبكوژێت ووتویەتی: دەبێت گەورەكەی بكوژرێت چونكە ئەو بەندەیە وەك قامچی یان شمشێری ئەو كابرایە وایە و ئەو بەندەیەی تەنها زیندانی دەكرێت[1].

* كەسێك لە قەرەباڵەغیدا بپلیشێتەوە:

ئەگەر كەسێك لەكاتی قەرەباڵەغی و كێشمە كێشمدا بوو بەژێرەوە و مرد، خوێنەكەی لەسەر( بيت المال ) ی موسڵمانانە لەلای عەلی ، یەزیدی كوڕی مەزكوڕی هەمەدانی دەڵێت : پیاوێك لە ڕۆژی جومعەدا و لەكاتی قەرەباڵەغی چوونە دەرەوە دا بووبەژێرەوە و خنكا ، و عەلی (ﷺ) لە ( بيت المال ) خوێنەكەی دا[2].

---

[1] فقه الامام علي بن أبي طالب (٢/٨٣٦).

[2] الخلافة الراشدة، لا ٥٠٢.

* ئەسپ سوار یان ئۆتۆمبێل خەڵکی بکەن بە ژێرەوە:

عەلی (ﷺ) لە ڕیوایەتێکدا دەربارەی ئەو شوفێرە یان ئەو سوارەی کە کەسێك دەکات بە ژێرەوە دەڵێت: ئەگەر جادەکە تەسك بوو ئەوە تاوانبارە دەبێت خوێنەکەی بدات ، بەلآم ئەگەر جادەکە فراوان بوو ـ واتە شۆستەی هەبوو ـ یان شۆستەیشی نەبێت بەلآم زۆر پان بێت ئەوە ـ کەمتەرخەمی پیادەکەیە و شوفێر هیچی لەسەر نییە، چونکە لەم حاڵەتەدا کەسە لێدراوەکە تاوانبارەو کەمتەرخەمی کردووە[1].

* حوکمی کەسێك کە بڵێ فلانم کوشتوە و نەشی کوشتبێ :

لەسەردەمی عەلیدا(ﷺ) پۆلیس ـ عەسەس ـ پیاوێکیان هێنا بۆ لای ئەمیری باوەڕداران کە قەمەیەکی بەدەستەوەبوو، جلەکانیشی هەر خوێن بوو لەگەڵ پیاوێکی کوژراوی لەخوێن گەوزاودا، و لێی پرسی و ئەویش ووتی : من کوشتومە ، عەلیش (ﷺ) فەرمانی دەرکرد کە بیکوژنەوە ، و کاتێ بردیان پیاوێك بەپەلە هات و ووتی ئەی گەورەی باوەڕداران مـن کوشتوومە و ئەو پیاوە بێتاوانە بانگ کەنەوە ، عەلیش بە پیاوی یەکەمی ووت: چی وای لێکردی بڵێیت من کوشتومە و نەیشت کوشتووە؟ ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران دەی چ چارەیەکی ترم هەبوو، پۆلیسەکانت لەپاڵ پیاوێکدا گرتمیان کە لەخوێندا گەوزاوە و منیش بە چەقۆیەکی خوێناویەوە بەڕاسەریەوە وەستاوم و لەناو کەلاوەکەدا بووم و ترسام کەس باوەڕم پێنەکات ، بۆیە دانم نا بەو کارەداو داوای پاداشتەکەیم لە خوای خۆم کرد. عەلیش (ﷺ) ووتی : کارێکی خراپت کرد ، تێم گەیەنە چۆن چویت بۆ ئەوێ ؟ ئەویش ووتی : مـن پیاوێکی قەسابم و بەیانی زوو هاتم بۆ دوکانەکەم و مانگایەکم سەربڕی و گوریم لەو کاتەدا ، میز زۆری بۆ هێنام و هەر بەقەمەکەی دەستمەوە چووم بۆ کەلاوەکەی نزیك دوکانەکەم بۆسەر ئاو کاتێ ویستم بگەڕێمەوە دەبینم پیاوێك کوژراوە و لەخوێنی خۆیدا گەوزێنراوە و منیش حەپەسام و سەیرم دەکرد، لەناکاو پۆلیس هاتن و منیان بەو حاڵەوە بینی ووتیان تۆ بکوژیت و گرتمیان و منیش لەو دڵنیا بووم کە تۆ باوەڕ بەوان دەکەیت و باوەڕ بەمن ناکەیت .

---

[1] فقه الإمام علي (٢/٨٤٢).

و پاشان عەلی (رضي الله عنه) ڕووی کردە پیاوی دووەم و پێی ووت: ئەی تۆ بۆچی ئەم پیاوەت کوشت؟ کابرایش ووتی: ڕاستی یەکەی لەبەر تەماحی پارە و پولەکانی بردمە ئەو کەلاوەیە و کوشتم کە گوێم لە چرپەی پێی ئەم کابرایە بوو خێرا بەدزیەوە ڕام کرد، بەڵام زانیم خەریکە ئەو کابرایە بەبێ تاوان دەکوژن ، ووتم خوێنێکم ڕشتووە با دوو خوێن نەیەتە سەرم .

عەلی (رضي الله عنه) ووتی بە حەسەنی کوڕی : ئەی تۆ چی دەڵێیت لەم بارەیەوە ؟ ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ، ئەگەر کەسێکی کوشتبێ وا کەسێکی تریشی لە مردن ڕزگار کردو خوایش دەفەرموێت ((وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً)) المائدە ٣٢. و عەلیش (رضي الله عنه) لە هەردووکیان خۆش بوو ، لە ( بيت المال ) یش خوێنەکەی دا[1] .

[1] القضاء في الإسلام، ل٦٤٥١.

## بەشی پێنجەم

# دامەزراندنی ویلایەتەکان لە سەردەمی عەلی دا (رضي الله عنه) :

## جێ باسی یەکەم

# هەرێمەکانی دەوڵەتی ئیسلامی

### یەکەم/ شاری مەککەی پیرۆز:

کاتێ عثمان ی کوڕی عەفان (رضي الله عنه) شەهید کرا ، خالیدی کوڕی سەعیدی کـوڕی عـاص والی شاری مەککە بوو، بەلاّم کاتێ عەلی (رضي الله عنه) بوو بە خەلیفەی چوارەم یەکێ لە بڕیارەکانی لابردنی خالید بوو، و ( ئەبا قەتادەی ئەنصاری ) لە جێگەی داناو ویلایەتی ئەبا قەتادەیش لە دوو مانگ زیاتر نەبو، ئەوە بوو کە عەلی (رضي الله عنه) ویستی بڕوات بۆ عێراق حەزی کرد و قثم ی کوڕی عەباسی بخاتە شوێنی ئەو، و سەرچـاوەکان بـاس لـەوە دەکـەن کـە (قـثم) حـوکمی مەککـە و طـائیف و شوێنەکانی چواردەوری کردوە لەیەك کاتدا. و مەککەیش لەو سـەردەمەدا بـاس و ڕۆڵێکـی وای نەبوو جگە لە وەرزی ( حج) نەبێت ، هەرچەندە ئەمیری بـاوەڕداران عـەلی (رضي الله عنه) بەبۆنـەی ئـەو هەمووە شەڕو ئاژاوە و ئاشوبانەی دووچاری خەلیفە بـوون نەیـەرژایـە سـەر مەککـە و تەنانـەت حەجیشی پێ نەدەکرا و ئەرکی سەرۆکایەتی کردنی حەجیشی دابوو بەسەر قثم ی کوڕی عەباسدا،

ئیتر پاش ماوەیەك شاری مەککـە لـەنێوان هـەردوو سـەرگەورەدا (عـەلی و موعاویـە (رضي الله عنه)) لـە کێشمەکێـشمەدا بـوو هـەر ماوەیـەك یـەکێکیان حوکمیـان دەکـرد و، موعاویـەش سوپایەکی گەورەی بەسەرکردایەتی (بسر کوڕی ارطأة) نارد بۆ شاری مەککەو بە یەکجاری شـاری مەککە لە ژێر دەستەلاّتی ئەمیری باوەڕداراندا نەماو (قـثم) ناچار بوو هەلّبێت و عـەلیش (رضي الله عنه) تاوتوێی ڕزگارکردنەوەی شاری مەککەی کردبوو لەلای هاوڕێکانی بەلاّم شەهید بوونی بوو بـەهۆی سەرنەگرتنی ئە کارە[١] .

---

[١] الولاية على البلدان (٢/٤).

## دووەم / شارەکەی پێغەمبەر (ﷺ) :

شاری مەدینە بە درێژایی سەردەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هەر سێ خەلیفە ڕاشیدەکەی دوای خۆی پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی بووە ، و خەلیفە خۆی لەوێ نیشتەجێ بووە و لەوێ وە حوکمی هەموو ناوچەکانی تری کردووە و مەگەر لەبەر سەفەرێك بۆ حەج یان بۆ جیهاد لە دەدینە دەرچووبن و جێگرێکیان لە شوێنی خۆیان دانابێت.

بەلاّم لەسەردەمی خەلیفەی چوارەمدا بارو زروفەکە گۆڕا و لەپاش شەهیدبوونی عثمان (ﷺ) ناچار بوو شاری مەدینەی پایتەخت بەجێ بهێڵێت و بەرەو عێراق بەڕێ بکەوێت بەتایبەت لەپاش دەرچوونی طلحە و زوبێر و عائشە(ﷺ) بۆ عێراق لە پێش دەست پێکردنی جەنگی جەمەل[1].

و سەهلی کوڕی حنیف ی کرد بەوالی شاری مەدینە لە باتی خۆی دانیا، وماوەی حوکمەکەشی بەسەر مەدینە لە ساڵێك زیاتر بووە، و لەپاش لابردنی ئەو ( تمام ی کوڕی عەباسی ) کرد بەوالی ئەوێ، و لەپاش ئەویش ئەبو ئەیوبی ئەنصاری (ﷺ) کرد بەوالی و بەردەوام بوو تا ساڵی ٤٠ی کۆچی.پاش ئەوەی کە (موعاویە) سوپایەکی گەورەی لەشامەوە بەڕێ کرد و شاری مەدینەی خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و ئەبو ئەیوبیش ناچار بوو بەرەو شاری کوفە بۆی دەرچوو خۆی گەیاندە ئەمیری باوەڕداران عەلی(ﷺ) .

ئیتر مەدینەی پڕ لەنور لەو ماوەیەدا کە موعاویە دەستی گرتبوو بەسەریدا باسێکی وای نەما لەناو ڕووداوە هەنوکەیی و گرنگەکاندا[2].

## سێیەم / بەحرەین و عومان :

بەحرەین لە کاتێکدا ـ عثمان ـ شەهید بوو بەشێك بوو لە ویلایەتی بەسرە، و (ابن عامر) بەرپرسی بۆ دادەنا، و لەسەردەمی عەلیدا(ﷺ) کۆمەڵی ئەمیری بەسەریەوە دانـاوە و ناسراوترینیان ( عمر کوڕی ابی سلمە)[3]. و لەگەڵ عەلیدا ڕۆیشت بۆ عێراق و پاشان کردی بەوالی

---

[1] تاريخ خليفة بن خياط، لا ١٨١.

[2] الولاية على البلدان (٣٥٧/٢).

[3] تهذيب التهذيب (٤٥٦/٧).

بەحرەین و پاش ماوەیەك هێنایەوە بۆ هاوڕیەتی خۆی . و ( عومانیش) هەندێ شۆڕش و ئاژاوەی تێ کەوت و عەلیش دوو کەسی نارد بە سوپایەکەوە بۆ ئـەوەی یەکـەمیان وەك والی و دووەمیـان وەك سەرکردەی سوپاکە و لەوێشەوە ( یەمامە) بەشێك بوو لە ئیدارەی بەحرەین.

## چوارەم / یەمەن :

کاتێ عثمـان(رضي الله عنه) بە غەدر شەهید کراو بەیعەت درا بەعەلی(رضي الله عنه) و بوو بە خەلیفـەی نـوێی موسڵمانان ، و عبیداللە ی کوڕی عەباس (رضي الله عنه) ی دانا بەوالی یەمەن ، چـونکە لـەپاش شـەهید کردنی عثمان ، والی یەکانی ئەو ناوچەیەیان بەجێ هێشت و خۆیان گەیاندە سوپای (جمل) لەگـەڵ (طلحە و زوبێر و عائشە) و ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە ئامادەسازی سوپای جەمەلدا[1] .

و کوژرانی عثمان زۆر کاریگەری کردبووە سەر دەروونی یەمەنیەکان و ڕق و کینەیان دەخواردەوە بۆ بکوژانی و هەندێ لە یەمەنیەکان هەر بەیعەتیشیان بەعەلی نەدابوو و حـەزیان دەکـرد پێـشتر تۆڵەی عثمان بکرێتەوە ئەوجا خەلیفە دیاری بکرێت، و بـەلاّم هەرکـە ئـەم مەسـەلەیە دواکـەوت نامەیان نارد بۆ موعاویە لە پاش (تەحکیم)، و ئەویش بەهاوکاری ئەوان سوپاکەی (بسر) ی نـارد بۆ یەمەن و دەستیان گرت بەسەر وڵاتی یەمەندا و بەلاّم پاش ماوەیەکی کەم عەلی (رضي الله عنه) تـوانی بیگێڕێتەوە ژێر دەستەڵاتی خۆی و(عبیداللە ی کوڕی عەباسی ) کـردەوە بـەوالی و بـەردەوام بـوو لەسەر کارەکەی تا شەهیدکردنی ئەمیری باوەڕداران (رضي الله عنه)[2].

## پێنجەم/ ویلایەتی شام :

موعاویە (رضي الله عنه) لەسەردەمی عمر و عثمان دا (رضي الله عنهما) والی ویلایەتی شام بـوو، و کـاتێ عـەلی (رضي الله عنه) بوو بەخەلیفە ویستی عەزلی بکات و لە جێگایدا ( عبداللە ی کوڕی عمر ) بخاتە شوێنی، و بەلاّم ئەو داوای لێبوردنی کرد و باسی ئەوەی کـرد کـە خزمایـەتی و ژن و ژنخـوازی هەیـە لـە نێوانیاندا[3].

---

[1] مروج الذهب للمسعودي (٢/٣٥٧).
[2] تاريخ الطبري (٦/ ٨٠-٨١).
[3] الانتصار للصحب والآل، لا (٥٠٧).

لەپاش ئەوەی کە (ابن عمر) (ﷺ) داوای لێبووردنی کرد لە وەرگرتنی ئەم کارە و قبوڵ کردنی ویلایەتی شام، ئەمیری باوەڕداران لەباتی ئەو (سەهلی کوڕی حەنیف ) ی هەڵبژارد و ناردی، بەلاّم هەرکە لەشام نزیك بوویەوە سوارەکانی موعاویە گرتیان و پێیان ووت : ئەگەر عثمان ناردوویتی یا خوا بەخێر بێیت و ئەگەر یەکێکی تر ناردویتی بەزووترین کات بگەڕێرەوە[1]. لەو کاتەدا ولاّتی شام خۆیان دەخواردەوە بۆ تۆڵە لە بکوژانی عثمان بە تایبەت کراسە خوێناویەکەی لەگەڵ پەنجەکانی ( نائلە ) ی خێزانی کە بۆ بەرگری لە هاوسەرەکەی ژیانی بەکاری هێنان و ئەو دوور لەخوایانە بەقرتاندیان بە شمشێر! ، و هەروەك هەواڵی دەست گرتنی ئاژاوەگێڕەکان بەسەر شاری مەدینەدا و هەڵهاتنی بەنی ئومەیە لێی بەرەو شاری مەککە، و ئەمەو چەندان هۆکاری تر بوونە هۆی کاریگەری لەسەر شامی یەکان و لەسەرویانەوە موعاویە (ﷺ)وە هەبوو کە خۆی بە تۆڵەسێنی شەرعی عثمان دەزانی و ئەو خاوەنی خوێنەکەی بوو. لەبەرئەوە موعاویە هەستا بە کۆکردنەوەی خەلکی و ووتاری بۆدان دەربارەی کوشتنی عوسمان بەبێ تاوان بەدەستی کۆمەڵێ دووڕوی ئاژاوەگێر، کە حورمەتی خوێنی موسڵمانیان نەگرت، لە مانگی حەڕامدا خوێنیان ڕشت ولەکوێ؟ لە ( بيت الحرام ) یشدا!!. خەلکەکە هەڵچوون و هاواریان لێ بەرز بوویەوە کە ژمارەیەك لە هاوەڵانی پێغەمبەریان لەناو دابوو(ﷺ) کە یەکێکیان ( مره بن كعب) بوو ووتی : ئەگەر لەزاری پێغەمبەرەوە نەمبیستایە هەر باسیشم نەدەکرد، باسی فیتنە و ئاژاوەی کرد کە نزیك بۆتەوە، و پیاوێك کە دەم و چاوی هەڵبەستبوو لەوێ وە تێپەڕی و پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ( هذا يومئذٍ على الهدى ) واتە: لەو ڕۆژەدا ئەم پیاوە لەسەر هیدایەت و ڕێبازی خوایە، و منیش هەستام و چووم بۆلای دەبینم عثمانی کوڕی عەفانە، و دەم و چاویم لاداو پێم ووت ئەو پیاوەیە ، فەرمووی بەڵێ[2].

فەرموودەیەکی تریش جگە لەمەی باسمان کرد، کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر سووربون لەسەر بەرنامەی عثمان و خۆسازدان بۆ تۆڵە سەندنەوە لە بکوژانی کە نوعمانی کوڕی بەشیر(ﷺ) لە عائشەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناردی بەدوای عثمان ی کوڕی عەفاندا و

[1] صحيح سنن ابن ماجه (٢٤/١).

[2] مسند أحمد ژ (٢٤٠٤٥) حديث صحيح.

ئەویش خێرا هات بۆلای پێغەمبەریش(ﷺ) چوو بەرەو ڕووی و دەستی دا بەهەردوو شانیدا فەرمووی " یا عثمان ان الله عسى ان يلبسكَ قميصاً فأن أرادك المنافقون على خلعه فلا تخلعه حتى تلقاني " سێ جار دووبارەی کردەوە، واتە: ئەی عوسمان لەوانەیە خوای گەورە کراسێك بکاتە بەرت، ئەگەر دووڕوەکان بیانەوێت لەبەرت دایبکەنن تۆ هەردای نەکەنیت تا دەگەیتە من، و منیش پێم ووت ئەی دایکی باوەڕداران تۆ ئەم فەرمودەیەت لەلایە؟ عائشەش (رضي الله عنها) ووتی: بیرم چۆتەوە وەڵلاهی نایەتەوە بیرم ، و دەڵێ بۆ موعاویەم باس کرد بەلاّم بەوەش ڕازی نەبوو، تا نامەی نووسی بۆ دایکی باوەڕداران کە ئەو بەنوسین بۆم بنێرێت و ئەویش بۆی نووسی[1].

سوربوون لەسەر جێ بەجێکردنی حوکمی قورئان بەسەر بکوژانی عثماندا هۆی سەرەکی بوو بۆ قبوڵ نەکردنی خەڵکی شام بە بەیعەت دان بە علي (رضي الله عنه) ، و لەبەر ئەوە نەبوو، کە موعاویە حەز بە کورسی دەستەلاّت بکات و لەو پێناوەدا خوێنی موسڵمانان بڕێژێت ، و هەرگیز خۆی بەشیاوی ئەو مەقامە نەزانیوە و لەو دڵنیابووە کە عەلی(رضي الله عنه) یەکێکە لە و(٦) کەسەی کە ئەهلی شوڕا بوون بە درێژایی حوکمی ئیسلام لە سەردەمی پێغەمبەرەوە تا خەلیفەکەی پێش خۆی[2].

ئەبی مسلم الخولانی ووتی بە موعاویە: تۆ کێبەرکێ لەگەڵ عەلیدا دەکەیت، یان تۆ خۆت بەئاستی ئەو دەزانیت؟ ووتی : نەبەخوا، من چاك دەزانم ئەو لەمن باشترە، و لەمن شایان ترە، بەلاّم ئایا نازانن عثمان بەستەم کوژرا، و منیش ئامۆزایم و خاوەنی خوێنەکەیم، و بڕۆنە لای و پێی بڵێن: با بکوژانی عوسمانم بداتە دەست و منیش خۆم دەدەمە دەستی ئەو، و قسەیان لەگەڵ عەلیدا کرد و قبوڵی نەبوو، وتی: جاری با بەیعەت بدەن و مەحکەمەیان لەسەر منە و موعاویەش بەمە ڕازی نەبوو[3].

بەلاّم جێگەی داخە کە هەندێ لە نوسەرەکان بە هەوانتە دەمیان لەم مەسەلە ترسناکە کوتاوە و موعاویەیان بەوە تاوانبار کردووە کە کێ بڕکێی هاشمی یەکانی کردووە و نەریتی سەردەمی

---

[1] فتح الباري (٩٢/١٣).

[2] خلافة علي بن ابى طالب لا ١١٢.

[3] ولاة مصر للكندي، ص ٤٢-٤٣.

نەفامی زیندوو کردۆتەوە و ئومەوی و هاشمی زینـدوو کردۆتـەوە وەك عبـاس محمـود عقـاد لـە ( عبقریە علي) دا و نوسەرانی تریش باسیان کردووە[1].

## شەشەم/ ویلایەتی جەزیرە:

دورگەی عەرەبی بە درێژایی خیلافەتی عثمان بەشێك بـووە لـە ویلایـەتی شـام و لـەپاش شەهید کردنی عثمان (ﷺ) و شام لە ژێر دەستی موعاویەدا بووە وعێراقیش بەدەستی عەلیـەوە بووە، نیمچە دورگەیش لەو نێوانەدا پێ گیرابوو هەر جارە ولایەکیان دەستیان دەگرت بەسـەریدا و لەو کاتەی عەلی (ﷺ) دەستی بەسەریدا ڕۆیشت ( الاشتر) ی کرد بەوالی بەسەریەوە.
ئەو ناوچەیەبوو بو بە جێگای ئەو هاوەڵانەی خۆیان دوور دەگـرت لـە جـەنگی براکـوژی و لـەوێ گۆشەگیر بوون.

## حەوتەم / ویلایەتی میسر:

کاتێ عثمـانی کوڕی عەفان (ﷺ) شەهید کرا، والی میسر" محمدی کوڕی ابی حوزەیفـە" بـوو کە بەزۆری خۆی سەپاندبوو بەسەر ئەو ناوچـەیەداو عثمـان ڕازی نـەبوو پێـی، و لـەپاش مردنـی عثمان، عەلی بوو بە خەلیفە و تاماوەیەکی کورت لەو پۆستەدا هێشتیەوە ، موعاویە سـوپایەکی بەرەو میسر برد و توانیان محمدی کوڕی ابی حەزیفە بگرن و بیکەنە زیندانەوەو پاشتریش کوژرا[2].
عەلی (ﷺ) ئەو محمدەی دانەنابوو بەوالی بەلاَم لەبەر هەر هۆیەك بوو هێشتی یەوە تا ماوەیەك ، بەلاَم پاش لەناو چوونی بەدەستی سوپای موعاویە، عـەلی (ﷺ) هەسـتا بـەدیاری کردنـی والی نوێ بۆ ولایەتی میسر(قەیسی کوڕی سەعدی ئەنصاری) نارد بۆ ئەوێ و پێی ووت:
بڕۆ بۆ میسر، من تۆم کرد بە والی ئەوێ، و بڕۆ خۆت بخە ڕێ و متمانەت بە کێ هەیـە لەگـەڵ خۆت بیبە بۆ ئەوێ، و لەگەڵ سەربازەکاندا، چونکە ئەمە زۆر گرنگـە بـۆ ترسـاندنی دوژمنـان و

---

[1] الکامل في التاریخ ( ٢/ ٣٥٤).
[2] ولاة مصر، ص ٤٤.

دڵخۆش کردنی دۆستانت، ئەگەر ـ انشاء الله ـ بەبێ وەی گەیشتیتە ئەوێ لەگەڵ چاکەکاراندا چاك بەو توندیش بە لەگەڵ گومان لێکراواندا و نەرم بە لەگەڵ میللەتەکەدا، چونکە نەرمی بەرەکەتە[1].

سەعدیش بە شێوەیەکی لێزانانە و حەکیمانە چووە ناو میسرەوە لەبەر دەرگای شاردا هاتنە رێگای پێیان ووت: تۆ کێیت و چۆن هاتویت؟ ووتی: سەعدی کوری قەیسم و یەکێکم لە هەڵهاتوانی عثمانی غەدر لێکراو! ئیتر ئەوانیش بە خێر هاتنیان کردو کردیانە ژوورەوە. پاش ئەوەی گەیشتە میسر و لە ( فسطاط) چووە سەر مینبەر و ووتارێکی بۆ دان وتیایدا نامەی ئەمیری باوەڕدارانی بۆ خوێندنەوە و ناردنی خۆی وەك والی پێ ڕاگەیاندن و خەلکەکەش بوون بە دووبەشەوە نیوەیان قبولّیان کرد و بەیعەتیان دا بە عەلی و نیوەشیان هەر داوای خوێنی عثمانیان دەکرد و چوونە ماڵی خۆیان.و قەیس زۆر حەکیمانە جولاّیەوە لەگەڵ نەیارەکانیدا و زۆری لێ نەکردن بۆ بەیعەت دان بە عەلی و نەك هەر ئەوەندە بەلکو یارمەتی و سالاّنەکەی بۆ دەناردنە ماڵەکانی خۆیان و هەندێ کەسیشی تەرخان کردبوو کە ڕێزیان بگرێت و چاك بێت لەگەڵیاندا[2].

ئەو هەڵسوکەوتە جوان و نەرم ونیانەی قەیس بوو بە هۆی ئەوەی کە لەمیسردا نەیاری نەماو ئارامی و خۆشی ڕووی کردە ولاّتی میسر، و پیاوانی ئیداری دانا و پۆلیسی تاعین کرد و دەستەلاّتی بەهێزو گەورە بوو تاوای لێهات موعاویە هەیبەتی دەکرد لە هێزی سەربازی قەیس ی کوڕی سەعد و نامە گۆڕینەوە لەنێوانیاندا هەبوو، تا وای لێهاتبوو لەگەڵ موعاویەو ئیدارەکەیدا دۆستانی عەلی گومانی ئەوەیان لێدەکرد کە گۆڕابێت و بوبێت بە لایەنگری ئەوان، و داوایان لە ئەمیری باوەڕداران دەکرد کە لایبات و بیگۆڕێت و ئەویش دەیووت: بێ قەزا بن شتی وای نەکردووە وازم لێبێنن، هەر وازیان لێ نەهێنا تا بەقسەی کردن و نامەی بۆ ناردو بۆی نووسی: من پێویستیم پیتە لای خۆم و کەسێك دابنێ لە شوێنی خۆت و خۆیشت خێرا وەرەوە بۆلای خۆم[3].

(مالیك الاشتر) ی لە جیاتیدا داناو بەلاّم ئەو پیاوە گەیشتە دەریای سور و لەوێ گیانی سپارد و داخ لەدلاّن ئەو مردنە پاکەیان داوەتە پاڵ موعاویە(ﷺ) کە گوایە ئەو دەستی هەبووە لە دەمان خوارد کردنیدا!

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] ولاة مصر لا (٤٥- ٤٦) رجاله ثقات.

[3] ولاة مصر لا ٥٠.

بەلاّم ابن كثير و ابن خلدون و كەسانى تريش ئەم هەواڵە زۆر بــە دوور دەزانــن كــە موعاويــە كــە هاوەڵێكى دڵسۆزى پێغەمبەرى خوا بووە (ﷺ) . پاشتر عەلى (رضي الله عنه) محمدە كورى ئــەبو بــەكرى صديق ديارى دەكات وەك والى ميسر وكاتێ دەڕوات بۆ ئەوێ قەيس لەوێ بوو، بۆيە محمدى دانــاو كۆمەڵێ ئامۆژگارى دۆستانە و برايانە كرد دەربارەى چۆنيەتى هــەڵس و كــەوتى دروســت لەگــەڵ گەلى ميسردا.

و پێى ووت: هەر چەندە من لابراوم بۆ تۆ، بەلاّم ئەمە ڕێم لێناگرێت كۆمەڵێ ئامۆژگارى برايانەت بكەم ، يەكێك لەوانە واز لەو كەسانە بێنە كە داواى خوێنى عثمان دەكەن و بەيعــەت بــە عــەلى نادەن و لەگەڵيان باش بە ئەگەر هاتنە لات ڕێزيان بگرەو ئەگەر نەشــهاتن مــەنێرە بەدوايانــدا، و ئەگەر پێت كرا لەگەڵ مردووى موسڵمانانىدا بڕۆ بۆسەر قەبران و سەردانى نەخۆش بكــە، چــونكە تۆ بەمە لێت كەم نابێتەوە[1]. ئەوە بوو تا ماوەيەك بەو جۆرەى دەكرد و ژيان لە ميسردا ئاســايى بوو بەلاّم وردە وردە ئامۆژگاريەكانى قەيسى پشت گوێ خست، و دەستى كرد بە ناڕەحەت كردنى ئەو كەسانەى كە بەيعەتيان بە علي نەدابوو، داواى بەيعــەتى لێــدەكردن و كۆمــەڵێ چەكداريــشى نارد و ماڵەكانى سوتاندن و هەندێكيانى زيندانى كرد و ئەوانيش دەستيان دايە دژايەتى كردنى[2].

پاشتر هەل بۆ موعاويە هەڵكەوت و پەيوەندى خۆى توند كرد لەگەڵ ئەو كەســانەدا كــە نــەيارى محمد بوون، و بە سوپايەكى گەورەوە دايا بەسەر ميسردا بەسەركردايەتى ـ عــەمرى كــوڕى عــاص (رضي الله عنه) ـ و پاش كۆمەڵى جەنگى گەورە و خوێناوى توانيان دەست بگرن بەسەر ميسردا و ( محمد) بگرن و شەهيدى بكەن و بەو جۆرە ميسريش لە دەســتى ئيمــام عــەلى(رضي الله عنه) دەرچــوو وبــوو بــە ويلايەتێكى سەر بە حوكمى شام و موعاويە سەرپەرشتى دەكرد ئەمە لــە ســاڵى (٣٨)ى كۆچــيدا بوو.

---

[1] الكامل في التاريخ ( / ).

[2] خلافة علي بن ابي طالب، ص ١٠٧.

## هەشتەم / ویلایەتی بەسرە:

ئەمیری باوەڕداران عەلی(ﷺ) عثمـانی کوڕی حەنیف الانصاری دیاری کرد بۆ والی بەسـرە پاش ئەوەی کە والیەکەی پێش ئەو ( عبـدالله ی کـوڕی عاصـیر) دەسـتی لـە کـار کـشاندەوە و گەڕایەوە شاری مەککەی پیرۆز، ئەم عثمانە پیاوێکی زۆر شارەزا بوو لە ئیش و کـار و وردەکـاری ی ئەو ناوچەیە چونکە پیشتر عمر (ﷺ) داینا بوو بەسەر(خەراج) و دیاری کردنی ڕوبەری عیراق، و عثمان بە شێوەیەکی جوان ڕۆشتە ناو بەسرەوە، بەلاّم خـەلکی بەسـرە بـوون بـە سـێ بەشـەوە، بەشێکیان بەیعەتیان دا بە عەلی و هاتنە ناو کۆمەلّەوە و کۆمەلّێکیش دوورەپەرێز بـوون و سـەر بەهیچ لایەك نەبوون، و کۆمەلّێکی تر بەیعەتیان نەدا..[1]

ماوەیەکی کەم لەوێ والی بوو، ئیتر طلحـە و زوبێر و عائشە بەرەو بەسرە هاتن لە پێش ڕودانی جەنگی جەمەل و داوای تۆلّەی عثمانیان دەکرد(ﷺ) و کارەکە لەدەست دەرچوو گەیـشتە شـەڕو کوشتار، و ماوەیەکی کەم پێش دەست پێکردنی جەنگی (جەمەل) عثمانی کوڕی حەنیف بەسـرەی بەجێ هێشت و بەرەو کوفە کەوتە ڕێ و لەڕیگادا گەیشتە عەلی (ﷺ) .

لە پاش جەنگی جەمــەل و سـەرکەوتنی ئـەمیری بـاوەڕداران ، و مانـەوەی لـەناو شـاری بەسرەدا بۆ ماوەیەك و لەپاش ئەوە عبدالله ی کوڕی عەباسی کرد بەوالی ئـەوێ و (زیـادی کـوڕی ابیە) یشی کرد بە بەرپرسی خەراج (دارایی ).

و پاشان بە (ابن عباس) ی ووت: سوود لە شارەزایی و عەقلّ و سیاسەتی ووردی زیاد وەربگـرە[2].

و هەندێ ئامۆژگاری پێشکەش کردو پێی ووت:

" أوصیك بتقوی الله ـ عز وجل ـ و العدل مع ولاك الله امـره ، اتـسع للنـاس بوجهـك و علمـك و حکمك و اياك و الإحن فإنها تميت القلب و الحق، و اعلم انما قريك من الله بعدك مـن النـار، ومـا قريك من النار بعدك من الله، وأذكر الله ولاتكن من الغافلين"[3].

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٥٨٠).

[2] وقفة الصفين للنقدي، لا ١٠٥.

[3] سیرة اعلام النبلاء (٣٥١/٣).

واتە: ئامۆژگاریت دەکەم لە خوای ـ عز وجل ـ بترسە و دادپەروەر بـە لەگـەڵ ئەوکەسـانەی خـوا کردوونی بەژێر دەستەت، دەخیلت بم ڕقاوی و کینە لەدڵ مەبە چـونکە دڵ و حـەق دەمرێنێـت، و بزانە ئەوەی لە خوا نزیکت بکاتەوە لە ئاگر دورت دەخاتەوە و ئەوەی لە ئاگر نزیکت بکاتـەوە لـە خوا دورت دەخاتەوە، و یادی خوا زۆر بکەو لە غافڵ و بێ ئاگایان مەبە."

هەندێ لەنوسەرە بەناو موسـلمانەکان وەك ( طـه حسين ) لـە ( علـی و نبـوة) دا هەنـدێ ناماقوڵی دەربارەی هەڵوێستی (ابن عباس) باس دەکات سەبارەت بە عەلی، کـە پیـاوێکی دوڕاو ناتوانێت پیاوێکی مەزنی وەك " ابن عبـاس " بپێوێت کە ( اعمش) دەگێڕێتەوە دەڵێت ساڵێکیان ( ابن عبـاس) ئەمیری حەج بوو و وتارێکی وای بۆ داین کە خۆم پێنەگیرا ووتم تـا ئێـستا ووتـاری وام نەبیستووە و ئەگەر فارس و ڕۆم و تورکەکان بیانبیستایە موسڵمان دەبوون[1].

## نۆیەم/ ویلایەتی کوفە:

ویلایەتی کوفە لەسەردەمی عثمانـدا (ﷺ) ( ابـو موسـی الاشـعری) (ﷺ) والی بـووە بەسەریەوە کە هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەری خوا بووە و ڕاوی زۆرێك لـە فـەرمودەکانی بـووە، و لەپاش شەهید کردنی عثمان (ﷺ) عەلی کوڕی ئەبو طالیـب لە هەمان پلەو مەقامدا هێشتیەوە و ئەویش بەیعەتی لە خەڵکەکە وەرگرت بۆ عەلی و لەو بارەیەوە نامەیەکی بـۆ نووسـی و تیایـدا پێی ڕاگەیاند کە زۆربەی خەڵکی کوفە قبوڵی بەیعەتدانیان کردووە بۆی[2].

کاتێ ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) لە مەدینە بەرەو عێـراق دەرچـوو دەربـارەی ئـەبو موسـی پرسیاری کرد و لەڕێگا پیاوێکی پێ گەیشت و عەلی (ﷺ) هـەمان پرسـیاری لێکـرد و ئـەویش وتی: ئەگەر بۆ ئاشتەوایی و صوڵح هاتویت ، ئەوە ئەبو موسا ئەهلی صوڵح و ئاشتی یـە، و بـەڵام ئەگەر بەنیازی شەڕو کوشتار هاتویت ئەوە ئەو لەگـەڵ شـەڕکردندا نیـە، و عـەلیش فـەرمووی " وەڵلاهی جگە لە صوڵح و ئاشتەوایی هیچ مەبەستێکم نیە تا وە لاّمان دەداتەوە[3].

---

[1] تاريخ الطبری (٥/ ٤٦٧).

[2] هەمان سەرچاوە (٥/ ٥١١).

[3] هەمان سەرچاوە ( ٥/ ٥١٧- ٥١٩).

بەلاّم كاتێ ئیمامی عەلی (ﷺ) عماری كوڕی یاسرو محمدی كوڕی ئەبو بەكر و حەسەنی كوڕی خۆی نارد بۆ كوفە تا لەگەڵیاندا بن لە جەنگیان دژی بەیعەت نەدەران لە ( جەمەل) دا، و خەلكی كوفەیش لە ئەبو موسایان پرسی و ئەویش ووتی: خۆتان دەزانن، بەلاّم ئەگەر قیامەتی خۆتان دەوێت مەڕۆن بۆ شەڕ، و ئەگەر دنیاشتان دەوێت بڕۆن ئیتر خۆتان سەرپشك بن .

بەلاّم پاش ماوەیەك زۆرێك لە خەلكی كوفە ڕازی بوون لەگەڵ (حسن)دا بن و بجەنگن لەگەڵ نەیارانی خیلافەتدا، و نزیكەی (٩) هەزار چەكداریان خستە ڕێ لەگەلیانداو ئیتر لەو كاتە بەدوا ئەبو موسا والی كوفە نەبوو بەلكو ڕۆشتەوە بۆ شاری مەدینە و لەو ئاژاوەیە بەدوور بوو.

## دەیەم / ویلایەتەكانی ڕۆژهەلاّت:

### ١ـ فارس:

سەرچاوەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) سەهلی كوڕی حەنیفی ئەنصاری (ﷺ) كرد بەوالی ئەو ناوچەیە، و پاشان لە سالّی ٣٧ ك فارسەكان هەلّیان تۆڕاند و دەستیان دایە ئاژاوە و عەلیش (ﷺ) پەیوەندی كرد بە (ابن عباس) ەوە كە لەو كاتەدا والی بەسرە بوو پێی ووت: چارەسەری كێشەی فارس بكە و ئەویش پاش تاوتوێ كردن و لێكۆلّینەوە هەستا بە ناردنی یارمەتی دەرەكەی خۆی (زیادی كوڕی ابیە) نارد بۆ ناویان بە (٤) هەزار موجاهیدەوە و ئەو ئاژاوە و هەلّتۆڕاندنەی دامركاندەوە و وەزعەكەی ئاسایی كردەوە و تا كۆتایی حوكمی عەلی (ﷺ) بەوالی فارس مایەوە[1].

### ٢ـ خوراسان :

خوراسان ویلایەتێكی زۆر فراوان بوو، و ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ ویلایەتی بەسرەدا هەبووە بە درێژایی سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەكان، و یەكەم والی كە عەلی (ﷺ) پاش بەیعەت پێدانی داینا بەسەریەوە (عبدالرحمن ی كوڕی ئەجزی).

[1] الولاية على البلدان (١٢/٢).

سجستانیش له خوراسانەوه نزیك بوو، پەیوەندی بەوالی بەسرەوه هەبوو، لەپاش رووداووی نەخوازراوی (جەمەل) لات و لوت (صعلوك)ە کانی عەرەب شۆڕشیان نایەوەو خراپەکارانیان لەو ناوەدا بەرپاکرد، تا عەلی (رضي الله عنه) جوابی نارد بۆ (ابن عباس) کە ئەمیرێك بنێرێت بە سوپایەکەوه و چارەسەری ئەو ئاژاوەیە بکات و ئەویش (رەبعی کوری کەئسی عەنبەری) نارد بۆ ئەوێ و سەعلوکەکانی عەرەبی لابرد و ئارامی و ئاسایشی بۆ ئەو ولاتە گێڕایەوه[1].

ئا بەم شێوەیەی پێشوو بۆمان دەردەکەوێت کە ئەمیری باوەڕداران چەند هەوڵی لە رادەبەدەر و نارەحەتی و سەرئێشەی تووش بووه تا ئەو هەموو کێشانەی ناو ئەو هەرێمانەی چارەسەر کردووه و هەرێم بە هەرێم چارەسەری ناکۆکی و ئاژاوه ناوخۆیی یەکانی کردووه.

ئەمەش سەرەڕای ئەوەی کە موعاویەی برای لەشامدا گەورەترین کێشەی بۆ دروست کردبوو و هەروەك زۆرێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گۆشەگیر بوون و پشتی خەلیفەی چوارەمیان بەردابوو کردبوویان بە پاروویەکی نەرم و ئاسان بۆ نەیارەکانی .

هەروەك دروست بوونی خەواریجەکان لە دواساتەکانی ژیانیدا ئەرك و ئاگاو خەریك بوونێکی زیاتری بۆ دروست بوو، کە بەجۆرەها شێوه دژایەتیان دەکرد و شەڕیان دەکرد.

بەڵام لێرەدا جێگەی خۆیەتی ئاماژه بۆ ئەوه بکەم کە موعاویە (رضي الله عنه) بەدرێژایی سەردەمی خیلافەتی عەلی (رضي الله عنه) داوای خیلافەتی نەکردووه و داوای بەیعەتی لەموسڵمانانی شام نەکردووه، بەڵکو هەر پێی ووتراوه (أمیر) و بە عەلیش ووتراوه (امیر المؤمنین) و لەپاش شەهیدکردنی عەلی (رضي الله عنه) لە ساڵی (٤٠)ی کۆچیدا ئیتر موعاویە بەرامبەری نەماو کێشەکە بۆ ئەو یەکلابوویەوه[2].

---

[1] الأخبار الطوال، ص (١٥٣).

[2] وتەی وەرگێڕ.

# جێباسی دووەم
# دیاری کردنی (والی) یەکان لەسەردەمی عەلیدا (﵁):

عەلی (﵁) لە کاتێکدا هەڵبژێردرا بە خەلیفە، وڵاتی گەورەی ئیسلامی پڕبوو بوو لە پشێوی و ئاژاوەگێڕی و کەس بەکەسەوە نەبوو و تەنانەت ئەم ئاژاوەگێڕیە پایتەختی ئیسلامیشی گرتەوە کە مەدینە بوو، بۆیە دڵسۆزان هەستیان بە ترسناکی ئەو بارودۆخەکرد و هەریەکەو بەجۆرێ ئامۆژگارییان پێشکەش بە خەلیفەی نوێ دەکرد(﵁) بەتایبەت لەلایەنی دانان و لابردنی (والی ) هەرێمەکان[1].

## یەکەم/ هەڵوێستی خودی عەلی لە والیەکانی عثمان:

١ـ هەڵوێستی عەلی (﵁) لە والیەکانی عوسمان.

ئەمیری باوەڕداران (﵁) باش هەستی بەوە دەکرد کە هۆی سەرەکی ئاژاوەکان ، ئەوەبوو کە کۆمەڵێ لە خەڵکی لە والیەکانی عوسمان(﵁) ڕازی نەبوون، و ئەوەش بەهانەیەکی باش بوو بەدەستی ئاژاوە گێڕانەوە بۆ دژایەتی کردنی عثمان . (ابن عباس)(﵁ ) دەڵێت: عثمان پێش ئەوەی شەهید ببێت منی کرد بە ئەمیری حەج و کاتێ گەڕامەوە خۆی شەهید کرابوو، بەیعەتیش بە عەلی درابوو، چووم بۆلای بۆ ماڵەکەی خۆی و دەبینم ( موغیرەی کوڕی شوعبە) ی بەتەنها لەلایەو منیان لەدەرەوە دانا تا ئەو هاتە دەرەوە ، پاشان چووم بۆلای عەلی و پێم ووت: ئەمەی ڕۆشتە دەرەوە چی پێ وتیت؟ پێش ئەم جارە پێی ووتم : جواب بنێرە بۆ عبداللە ی کوڕی عامیر و موعاویە و باقی والیەکانی عثمان، کە هەمویان لە پلە و مەقامی خۆیان بێننەوە و ئەوانیش بەیعەتت لە خەڵکی بۆ وەردەگرن و وڵات ئارام و سەقامگیر دەکەن،

منیش سەرم بادا و ووتم : وەڵڵاهی ئەگەر یەك سەعاتیش خەلیفە بم هەوڵ دەدەم ڕای خۆم جێ بەجێ بکەم و ئەو کەسانە لە دەستەڵات دوور بخەمەوە. ئەو جارە بەجێی هێشتم و خۆیشی

---

[1] الولاية على البلدان (٢/٢٧).

دەیزای کەلەسەر هەڵەیە، وا ئێستا گەڕاوەتەوە لام و پێم دەڵێت: من ئەو جار شتێکم پێ وتیت بەلاّم بەقسەت نەکردم ، و من دوای ئەوە ڕایەکی ترم بۆ هاتووە، وە دەڵێم هەر وابکە کە خۆت پێت خۆشە و هەموویان لاببەو کۆمەڵێ والی خاوەن متمانە دابنێ، چونکە خوا بێوەی کردین و ئەوانەش لە دەرهێنانی دڕکێك ئاسان ترن.

(ابن عباس) دەڵێت: منیش پێم ووت: یەکەم جار ئامۆژگاری کەرت بوو، بەلاّم دووەم جار غەشی لێکردیت عەلی (ﷺ) ووتی : ئامۆژگاری چی کردووم؟ (ابن عباس) ووتی : تۆ چاك دەزانیت موعاویە کەمی حەزی دنیایی تێدایە ئەگەر لە شوێنی خۆی دات بنایەتەوە گرنگ نەبوو لەلای کێ ئەمیری باوەڕداران دەبێت، بەلاّم هەرکە لات برد ووتی: عەلی ئەم خیلافەتەی بەبێ ڕاویژی هەموو موسڵمانان وەرگرتووە و بەبەرچاویەوە هاوڕێکەمان کوژراوە، و خەڵکت لێ هان دەدات[1] .

ئەم ڕیوایەتەی سەرەوە زۆر لاوازە و ڕووداوە مێژوویەکان بەدرۆی دەخەنەوە چونکە هاوەڵانی نازداری پێغەمبەر (ﷺ) وەك موعاویە بەدنیاویست و موغیرەیش بە غەشکەر دادەنێت!! کە حاشا لەو پیاوانەی خودا، ئێ پاشان پیاوانی وەك موعاویە ئەگەر شایستەی ئەمیری نەبوایە ، نەیدەتوانی (٢٠) ساڵ والی بێت و ئێ عبدالله ی کوڕی عامیر لە فتوحاتەکانی ئیسلامدا دەستێکی بالاّی هەبوو توانی ئیسلام بگەیەنێتە چیاکانی کابل لە ئەفغانستان! بەلاّم تانەدان لە والیەکانی عثمان (ﷺ) کاری ئاژاوەگێڕەکان بوو، عەلیش (ﷺ) ویستی بەدڵی ئەوان بکات تا واز لە گێرە شێوێنی بهێنن و ئارامی و سەقامگیری بۆ دەوڵەتی ئیسلام بگێڕنەوە[2] .

## ٢ـ هەڵوێستی عەلی (ﷺ) لە دانانی عثمان (ﷺ) هەندێ لە خزمەکانی بە والی هەرێمەکان :

هەندێ لەنوسەرەکان ئاماژە بۆ مەسەلەی دیاری کردن و دانانی والی هەریمەکان دەکەن کە گوایە عثمان و عەلی (ﷺ) خزمەکانی خۆیانیان داناوە کە هەرچەندە وردیش بینەوە دەبینین ، لە (١٨) والی عثمان (ﷺ) تەنها (٥) کەسیان خزمی خۆی بوو کە ئەمانە بوون : موعاویە و

[1] تاريخ الطبري (٥/ ٤٦١- ٤٦٣).

[2] ووتەی وەرگێر.

عبدالله بن سعد و عبدالله ی کوڕی عامیر وکە پێش ئەوەی شەهیدیش بکرێت دوانیانی عەزل کرد کە وەلیدی کوڕی عەقبە و سەعیدی کوڕی عاص و لە کوفەیش عەزلی کردن کە عادەتیان وابوو لەهیچ والیەك ڕازی نەبوون و هەموویان بە بیانو بوون[1].

و هەموو ئەو خزمانەشی کە داینابوون لەبەر لێهاتوویی و لێوەشاوەیی خۆیان بوو نەك لەبەر ئەوەی کە تەنها خزمی خۆی بوون ، کە توانیان عەدل و دادپەروەری و ئارامیش سەقامگیر بکەن لە هەرێمەکانیاندا، ئەمیری باوەڕدارانیش عەلی (ﷺ) لەسەر پرۆگرام و بەرنامەی عثمان بەردەوام بوو، هەستا بە دانانی کەسانی لێهاتوو، خوانـاس لەناو خزمەکانیدا و کردنی بەوالی هەرێمەکان کە پشتی بەست بە ئامۆزاکانی کە کوڕانی عەباسی کوڕی عبدالمطلب بوون، و هەموو لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەسەلمێنن کە هەریەکە لە عثمان و عەلی(ﷺ) لەبەر لێهاتووی و بەتوانایی نەفەریان هەڵبژاردووە بۆ بەرپرسیارێتی ئیتر ئەو کەسە خزم بوبێت یان بێگانە بەلایانەوە گرنگ نەبووە، بەڵکو گرنگ ئەوە بووە کە دڵسۆز بن بۆ ئیسلام و بەوەفا بووبن بۆ خەلیفەی موسڵمانان و لەناو هەرێمەکانیشدا دادپەروەر و چاك بووبن .

هەر چەندە ئیمامی عەلی (ﷺ) ( ٣٦) والی هەبووە کە (١١) کەسیان لە ئەنصارەکان بوون و (٧) حەوتیان لە قورەیش و چواریان لەنەوەکانی عەباس بوون[2].

دووەم / چاودێری کردن و ئاڕاستە کردنی بەرپرسەکان لەلایەن ئەمیری باوەڕدارانەوە :

ئەمیری باوەڕداران واخوی پێوە گرتبوو بەردەوام چاودێری والی و کاربەدەستەکانی دەکرد و لەبارەیانەوە پرسیاری دەکرد و بۆ ئەو کارەیش کۆمەڵێ هۆکاری بەکاردەهێنا ، لەوانە:

پشکنەر و چاودێری دەنارد و پرسیاریان لە خەڵکە ژێر دەستەکەیان دەکرد و هەندێ کاتیش لەکاربەدەستێك هەواڵی کاربەدەستەکانی تری دەپرسی، و نامەی نارد بۆ کەعبی کوڕی مالیك : کەکەسێك لەجێگەی خۆی دابنێ و چەند کەسێك لەگەڵ خۆتدا بەرەو تا دەگەیتە ناو زەوی ـ کورە

[1] حقبة من التاريخ لا ٧٥.

[2] عصر الخلافة الراشدة لا ١٢٩.

ـ و لەوێ دەربارەی کاربەدەستانم پرسیار لە خەڵکی ناوچەکە بکـە و هـەواڵی هـەڵس و کـەوت و ڕەوشتیان بپرسە بۆم[1].

هەندێ کات چاودێرەکانی حکومەتی ئیسلامی بـەڕەسمی دای دەنـان و ناسـراو بـوون و هەنـدێ کـاتیش وا پێویـستی دەکـرد کـە کەسـانی نەناسـراو بـن و جێگـەی گومـان نـەبن و والی و کاربەدەستەکان نەیان ناسن و نەشزانن بۆچی هاتوون[2].

جاری وا دەبوون خـەڵکی هـەمان ویلایـەت بـوون، جـاری وایـش هـەبوو دەچـوون بـۆ چـاودێری ویلایەتەکانی تر بۆ ڕاپەڕاندنی کاری چاودێری کردنەکە.

و هەندێ کاتیش راشکاوانە دەرگای دەخستە سـەر پـشت بۆیەکـە بەیەکـەی دانیـشتوانی ئـەو هەرێمە کەچی ڕەخنە و گلەیی و گازندەیەکیان هەیە یان بەئاشکرا بیگەیەنن بە خەلیفە یان ئەگەر نایشوێرن باوەك ڕاپۆرتێکی نهێنی بینووسن و بیگەیەننە ئەمیری باوەڕداران .

و هەر کاتێ لەو سکاڵایانەدا ستەم و ناعەدالەتی ئـەو والیانـەی تێـدا دەرخرابێـت عـەلی (ﷺ) فەرموویەتی

" اللهم انی لم أمرهم ان يظلموا خلقك او يتركـوا حقـك " واتـە : ئـەی خـوای پـەروەردگارم مـن فەرمانم پێ نەداون کە زوڵم و ستەم لە دروستکراوەکانی تۆ بکەن یان مافێکی تۆ پشت گوێ بخەن.

و هەندێ کاتیش لەسەر ئەو ڕاپۆرتانە کاری جدی دەکرد و ئەو والیانەی زیندانی دەکرد و بەداریش دارکاری دەکردن ئەگەر تۆمەتەکە بەسەریاندا بسەپایە. یان بەردەوام خەریکی ئامۆژگـاری کردنـی والی و کاربەدەستەکانی بووە و هەموو کاتێك ڕێڕەوی ڕاستی لە ڕێگـەی ئامۆژگاریـەوە بـۆ ڕوون دەکردنەوە و ئاڕاستەی دەکردن بۆ کاری جوان و گەل ڕازی کردن.

جارێکیان هەندێ لە دەهقانە ـ فارسەکان ـ سکاڵای کاربەدەستێکیان کردلەلای عـەلی (ﷺ) و ئەویش بۆی نووسی " پاشان... ئەوا دەهقانەکانی وڵاتەکەت سکاڵای توندڕەوی و شـێوازی ڕەقـت لێدەکەن و تۆش کەوای نەرم و نیانی لەبەر کە لەگەڵ هەندێ لەتوندی و ڕەقیدا، بەزەیی و تـوڕەیی پێکەوە گرێ بدە، جار بەجار نزیکیان بکەرەوە و جار بەجاریش دووریان بخەرەوە ( انشاء الله )[3].

---

[1] الولاية على البلدان (٢/ ٣٣).

[2] نهج البلاغة ( ٢/ ١٥٥).

[3] تاريخ بن خياط لا ٢٠٠.

## سێ یەم/ سنوری دەستەڵاتی والیەکانی عەلی (ﷺ) :

ئەمیری باوەڕداران هەرگیز ڕێگەی بەوە نەداوە کە هەرهەموو ئیش و کارەکان لە دەستی یەك کەسدا کۆببێتەوە بەڵکو کارەکانی دابەش کردووە و دەستەڵاتی لەت کردووە لە نێوان دوو تا سێ کەسدا وەك لەبەسرە ئەنجامی دا، بەجۆرێك (ابن عباس) ڕادەسپێرێ بۆ ئەوەی کاری (والی) ئەنجام بدات ـ بەزاراوەی ئەمڕۆ سەرۆکی هەرێمەکە ـ و لەهەمان کاتدا (زیاد بن أبیە ) دەکاتە بەرپرسی دارایی و کۆکردنەوەی خەراج، و داواش لە (ابن عباس) دەکات کە گوێ بگرێت بۆ ڕاو بۆچوونی زیاد لە چوارچێوەی کارەکەیدا و بەهەمان شێوەیەش زیاد گوێ لە مشتی والی ولاّت بێت ، و بەلاّم کاری یاسایی و دادوەری تایبەت کرد بە (ابو الاسود الدؤلی).

*** والی ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام دەدات:**

**١ـ دانانی وەزیر:**

دانانی وەزیر لە دەستەڵاتی والی دایە و بۆکەس نیە جگە لە خەلیفەی موسڵمانان وەزیری بەسەردا بسەپێنێ چونکە وەزیر دانراوە بۆ هاوکاری والی و دەبێت خۆی هاوکاری چاك و دڵسۆز دەست نیشان بکات.

و دەبێت کاری بۆ دیاری بکات و لەسنوری خۆی زیاتر پێ ڕانەکێشێت، و دەبێت پێشتر وەزیر نەبوبێت لە حکومەتی والیەکدا کە گەندەڵ و ستەم کار بوبێت، و لەو بارەیەوە ئامۆژگاری مالیك ی کوڕی الاشتر دەکات و دەڵێت : خراپترین وەزیرت ئەو وەزیرانەن کە پێشتر وەزیری والی یەکی خراپ بوون، و ئەوانەی لە گوناهدا بەشداریان بوون با نەبنە هاوکاری تۆ، و تۆ لەخەڵکانی تر جگە لەوانە پیاوی دڵسۆزو خزمەتگوزار دەدۆزیتەوە کە هەرگیز پشگیری زاڵمیان نەکردووە، و ئەوانە بۆتۆ چاکن و زیاتر بەسۆزن و کەمتر دەبنە سۆزداری کەسانی تر.

و ژمارەی وەزیرەکانیش پێداویستی ولاّت دروستی دەکات و والی خۆی دەزانێت چەند وەزیر و هاوکاری پێویستە بۆیە عەلی (ﷺ) ژمارەکەی دیاری نەکردن بۆ مالیك .

## ٢ـ دامەزراندنی ئەنجومەنی ڕاوێژکاری :

ئەمەش بە پشت بەستن بە زاناو دانا و ژیرمەندان و ئەهلی حەل و عەقد و پسپۆڕ و شارەزایان و ئەمانەش لەم ئامۆژگاریانەی ئەمیری باوەڕدارانـدا بـەڕوونی دەردەکـەوێت کـە دەڵێـت: لەگـەڵ زاناکاندا تاوتوێی زانستەکان بکە و لەگەڵ ئاقڵ و ژیرمەندەکانـدا گفتوگـۆ و لێکۆڵینـەوە بکـە ، لەهەموو ئەو مەسەلانەدا کەلە چاکسازی وڵاتەکەتـدا بەسـوودن ، و بـەردەوامی دەبەخـشن بـەو کارانەی کە حکومەتەکانی پێش تۆ هێناویانەتە کایەوە[1].

چۆن سورد لەو هەموو کەسە جیاجیاکان ببینیٚ ئەگەر لەژێر قوبەیەکدا کۆیان نەکاتەوە و پێکەوە ڕاگۆڕینەوە نەکەن؟.

## ٣ـ دامەزراندنی سوپا و پێداویستی یەکانی :

ئەمیری باوەڕداران بە مالیك ی (الاشتر النخعی) دەڵێت: بەرزترین پلەو مەقام و ڕێزببەخشە بەسـەربازەکانت، و بەئەوەشـی کۆمـەکیان پێـشکەش دەکـات، و ئەوەنـدە پارمـەتیان بـدە کـە پێداویستی خۆیشیان و ماڵ و منداڵیان دەربکات ، تـا هـەموو خەفـەتێکیان جهـاد و کوشـتاری دوژمنان بێت، و بەسۆز و بەزەیی بیت لەگەڵیاندا ئەوانیش سۆز و بەزەیی خۆیانت پیٚ دەبەخشن[2].

لەم ووتە بەنرخەی عەلی یەوە (ﷺ) ئەم خالاٌنەی لیٚ وەردەگیرێت:

١ـ دەبێت هێزێکی سەربازی هەبێت بـەرگری لەهەرێمەکـە بکـات و سـەنەدی سـوپای بێـت لـە فتوحاتی وڵاتەکاندا.

٢ـ دروست کردنی ئەم دەزگایە ئەرکی سەر شانی (والی)یە و دەبێت لە (بیت المال) یـش خـەرجی سوپاکە و موچەی سەربازەکانی دابین بکرێت.

٣ـ هەڵبژاردنی سەرکردە بۆ سوپاکانی هەرێمەکە لە دەستەڵاتی (والی)یە و دەبێت گرنگی تایبەتی بە خۆیان و ماڵ و منداڵیان بدات کەوایان لیٚ بکات جگە لە جیهاد و گیانبازی لە پێنـاوی خـواو پاراستنی وڵات هیچ خەمێکی تریان نەبێت.

---

[1] نهج البلاغة شرح محمد عبده لا ٦١٠.

[2] نهج البلاغة شرح محمد عبده لا ٦١٣.

## ٤ـ دیاری کردنی سیاسەتی دەرەوە لە جەنگ و ئاشتی :

ئەمیری باوەڕداران لە ئامۆژگاریەکانی بۆ (مالیك الاشتر) ووتی: صولّح و ئاشتی ڕەدمەکەرەوە ئەگەر دوژمنەکەت خستی یە بەردەستت و ڕەزامەندی خوای تێدابوو، چونکە ئاشتی حەوانەوەیە بۆ سەربازەکانت و خەم وخەفەتت ناهێڵێ و ئاسایش بۆ ولاتەکەت دەستەبەر دەکات، و بەلاّم بەتەواوی وریابە لە دوژمنەکەت لەدوای صولّح چونکە لەوانەیە خۆی نزیك کردۆتەوە تا لەناکاودا پەنێکت پێدادەدات، و زۆر توندو تۆڵبە، و لەو کارەشدا گومانی چاکەش بە خراپ بزانە، و ئەگەر لەگەڵ دوژمنەکانتدا پەیمان و ڕێکەوتنت ئیمزا کرد، ئەو پەڕی بەوەفابە و پەیمانی خۆت بەپاکی بەرەسەر، و لەو پێناوەشدا گیانی خۆیشت داناوە گوێ مەدەرێ بۆ ئەوەی بەڵێنەکەت بەریتە سەر، و خەڵکی هیچ فەرزێك لەوە گەورەتر سەیر ناکەن ئەوەندەی پارێزگاری لەوەعد و پەیمان دەکەن ، وتەنانەت کافرو بێ باوەڕانیش عەهد و پەیمان دەبەنە سەر چونکە لەناو چوونی خۆیان لە غەدرو ناپاکیدا دەبینیەوە،و ناپاکی نەکەیت لە بەڵێنەکانتدا و فێڵ و فڕ نەکەیت لە ڕێککەوتنەکانتدا[١].

## ٥ـ پارێزگاری لە ئاسایشی ناوخۆ:

ئەمەش بە گرتنەوەی سیاسەتی ئاشتی خوازانە لەگەڵ میللەتەکەی خۆیدا، وەك ئەمیری باوەڕداران نامەی نارد بۆ هەندێ لە کاربەدەستەکانی و پێی ووتبوو:" هەندێ لە دەهقانەکانی ولاتەکەت سکالاّی ئەوەت دەکەن کە تۆ لەگەڵیاندا توندوتیژ و ڕەقیت و وشکیت و بەسوکیش سەیریان دەکەیت، ....دەی کەوای نەرم ونیانی بکەرە بەریان لەگەڵ کەمی توندو تیژی، لەنێوان هەڵسوکەوتی ڕەق و نەرمدا بژی لەگەڵیان ، و نزیك بوونەوە و نزیك کردنەوەیان تێکەڵ بکە لەگەڵ دوورکەوتنەوە و دور خستنەوەیان"[٢].

ئەو سیاسەتەش بەوە دێت هەر کاتێ ئاسایشی ناوخۆ کەوتە لەرزەو کەسانێکی ناوخۆ دەستیان دایە سەرپێچی و ئاژاوەنانەوە دەبێت بەشێوەیەکی ئاشتیانە بەرەو ڕووی کێشەکە بڕوات و بەنەرمی چارەسەری ئەو ئاژاوەیە بکات و هێزی بەکارنەهێنێت و زەبرو زەنگ نەنوێنێت بەرامبەر

---

[1] نهج البلاغة شرح محمد عبده ل٦٢٧.

[2] الولاية على البلدان (٢/ ٣٧)

میللەتەکەی ، وبە (مالك الاشتر) دەڵێت: هێزو دەستەلاتی خۆت بەهێز مەکە بە کوشتن و بڕین و خوێنی حەرام ، چونکە ئەوە لاوازی دەکات و لەناوی دەبات و نایهێڵێت[1].

٦ـ دامەزراندنی دەزگای دادوەری لە هەرێمەکاندا:

ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) دەڵێت:" پاشان کەسانێك هەڵبژێرە بۆ حوکمڕانی و دادوەری کەلەلای خۆت باشترین کەسی میللەتەکەت بن، لەو کەسانەی کە گەورەیی مەسەلەکان نایانترسێنێت و ڕقەبەرایەتی کەس وای لێ ناکات کەلەسەر ڕای خۆی سوور بێت، و لەناو هەڵەدا بەردەوام نابێت، و خاوەخاو ناکات لەگەڕانەوە بۆلای حەق کاتێ بۆی دەرکەوێت، بۆ تەماح و دەستکەوتی دنیا نەڕوانێت، بەئەو پەڕی چارەسەر ڕازی بێت نەك بەکەم، و لەهەموویان زیاتر لەکارە گوماناویەکان خۆی بەدوور بگرێت(الشبهات) ، و لەهەموو کەس زیاتر دوای بەڵگە بکەوێت، کەمتر نیگەران بێت لە زۆری شکات کەران، لە هەمویان زیاتر بەئارام بێت لە پێناو ڕوونکردنەوەی مەسەلەکاندا، و لەهەمووان زیاتر سووربێت لەسەر دەربڕینی حوکمی کۆتایی، ولەو کەسانە بێت کە ناترسێت لە مەدحی مەدح کەران و هیچ دەستکەوتێکی دنیایی لەدەربڕینی حوکمی ڕاست و دروست لای نەدات، و ئەوەندە پارەو هاوکاری بدەرێ کە پێویستی بە خەڵکی نەبێت، تا بەو کارە دڵنیای بکەیت لەوەی لەلای تۆ پیاو لەناو ناچێت، و بەقوڵی بۆ ئەو مەسەلەیە بڕوانە"[2].

لەم دەقەی بە نرخەی ئەمیری باوەڕدارانە ئەم خاڵانەمان بۆ دەردەکەوێت:

١ـ دیاری کردنی قازی و دادوەر لە کارو ئەرکی (والی) ولاتە.

٢ـ لەسەر والی پێویستە مەرجی توندو تۆڵی هەبێت لە هەڵبژاردنی قازیەکانیدا.

٣ـ لەسەر والی پێویستە ئەوەندە چاودێری و کۆمەکی قازیەکان بکات تاوایان لێبکات پێویستیان بە یارمەتی و پارەو پوڵی خەڵك نەبێت[3].

---

[1] نهج البلاغة شرح محمد عبده ل٦٢٧.

[2] شرح نهج البلاغة ل ٦١٥.

[3] الادارة و النظام الاداري ل ٢٥٨.

## ٧ـ خەرج كردنى پارەو سامان:

سەرچاوە دارایی یەكانی ویلایەتەكانی ولاّتی ئیسلام : زەكـات ، خێـرو خێـرات، دەسـتكەوتی غەنیمەكان، ئەو سامانانەی بەبێ شەڕ دەست دەكەوێت ( الفيئ) و دەستكەوتی زەوی و زارەكان و شتی تر، كە دەخرێتە (بيت المـال)ی موسـڵمانان كـە بـەرزترین خەزێنەیـە ودارایـی ولاّتـی تێـدا هەڵدەگرێت، فەرمانبەری هەیە كەهەر سامانێكی بۆ بڕوات خێرا تۆماری دەكـات و هەرچـیش ی لێ دەربچێت تۆماری دەكات. و (بيت المال) كارێكی زۆر گرنگی هەیە لە هەرێمە فیدڕالییەكاندا ـ اللامركزيـة ـ و ئەو پارەوسامانانەی كە لە سەرچاوە جیاجیا كانەوە دێتە خەزێنـەی موسـڵمانان لەو هەرێمانەدا هەموی خەرج دەكرێتەوە لە ئیش و كارو پێداویستی یەكانی هەرێمەكـەو موچـەی فەرمانبەر و دادوەر و سەربازەكانی لێ دەدرێت و ئەوەی لەو پێداویستی یانە زیـاترە دەكرێـت بـە چاكسازی و بیناسازی و پردو نەخۆشخانەكان ، و ئەگـەر لـەوەش زیـاتر بـوو ڕەوانـەی پایتـەخت دەكرێت و دەنێردرێت بۆ خەلیفەی موسڵمانان.

لەو بارەیەوە عەلی (ﷺ) دەڵێت" الناس كلهم عيال على الخراج و اهلـه " واتە خـەڵكی هـەموو بەتـەمای دەسـتكەوتەكانی زەوی و خەڵكـەكانی یـەتی . و هـەروەها هـانی موسـڵمانان دەدات كەبەتەنیا پشت بە (خراج) نەبەستن و بەڵكو خەراجیان بۆ ئاوەدان كردنەوەی ولاّت بوێت و جـوابی نارد بۆ (قرضە ی كوڕی كەعبی أنصاری) و پێی ووت: هەندێ لە ئەهلی ـ ذمـة ـ باسـی ئـەوەیان كردووە كە كانیەكی گەورە هەبووە لەو ناوچەیەدا و بەلاّم پاشـتر پڕبۆتـەوەو داپۆشـراوە، دەی مـن دەمەوێت مەسروف لە پاككردنەوە و دەرخستنەوەیدا بكەیت چونكە خوا ئاگادارە ئاوەدان كردنەوە و پێشخستنی ولاّتم پێخۆشترە لەوەی پارەو سامانی خەراجم بۆبێتەوە والسلام "[1].

## ٨ـ دانانی فەرمانبەر و بەرپرسەكان لەلایەن (والی)یەكانەوە:

ئەمیری باوەڕداران عەلی(ﷺ) زۆر جار (والی) یەكانی خۆی ئاگاداركردۆتەوە كـە بـەرپرس و فەرمانبەرەكانیان لەسەر بنەمای خۆشویستن و خزمایەتی و نزیكی هەڵنەبـژێرن بـەڵكو شـیاوی و بەتوانایی لەپاش تاقیكردنەوەی ورد.

---

[1] الولاية على البلدان (٢/ ٣٧).

و دەڵێت" زۆر بەوردی سەیری هەلسوکەوتی فەرمانبەرەکانت بکەو تاقیان بکەرەوە، ونەکەی لەبەر خۆشەویستی و نزیکی ئەو کارە بکەیت چونکە ئەوە سەرتۆپەی ستەمکاری و ناپاکی یە، ئەوانەیان هەڵبژێرە کە خاوەن ئەزموونن و بەشەرمن، و لەبنەماڵەی پیاوچاکانن و مێژوویان هەبێت لە موسڵمانەتیدا، و ئەوانە ڕەوشتیان بەرزتر و مەبەستیان پاکترە و خۆیان زۆر بەرزدەگرت لە پارە خواردن و تەماح کاری، و زیاتر لە پاشەڕۆژی کارەکانیان دەترسن، و پاشان ڕزق و پارەی چاکیان بخەرە دەست بۆ ئەوەی پێداویستی خۆیانی بەباشی پێ تەواو بکەن لەلایەك، و لەلایەکی تریشەوە هەرگیز بیر لەوە ناکەنەوە دەست بەرن بۆ ئەو پارانەی لەبەردەستیاندایە، و قسەو بەڵگەیان پێ نایەڵێت کاتێ بیانەوێت ناپاکیت لەگەڵ بکەن و پارەبدزن.

پاشان ئیش و کاریان بەسەر بکەرەوە و چاودێریان بەسەرەوە دابنێ ـ بە نهێنی ـ لەو کەسانەی کە ڕاستگۆن و بەوەفان.

و پاشان سزایش دیاری دەکات بۆ ئەوانەی ناپاکی دەکەن لەگەڵ ئەو هەمووە گرنگی دان و موچەی باش و ڕێزی تەواو دا دزی و ناپاکیان کرد لێیان قبوڵ نەکەیت بەڵکو وەك پێیان دەڵێت:

" ئەگەر یەکێك لەو فەرمانبەرانەت دەستی درێژ کرد بۆ دزی و ناپاکی و چاودێرە ڕاستگۆکانیشت ڕاپۆرتیان لەسەر بەرزکردنەوە بۆت و تەواو ڕاستی مەسەلەکەت بۆ دەرکەوت، لێدان و سزای گیانی دابەزێنە بۆی و ئەو بەرپرسیارێتی یەی کەپێت داوە و لێی بسەنرەوە و پاشان لە پلەو مەقامێکی زۆر سوك و سەلیم دا دای بنێ تا حەیای بچێت"[1].

ولە شوێنێکی تردا ڕودەکاتە والیەکانی و پێیان دەڵێت : باچاکە کارو دەستپاکەکان لەگەڵ خراپەکار و ناپاکەکان وەك یەك و بەیەك چاو سەیریان مەکە، چونکە ئەو کارە دەبێتە هۆی ئەوەی ئیتر ئەهلی چاکە لە چاکەکردن سارد ببنەوەو ئەهلی خراپەش بەردەوام بن لەسەر خراپەکاری خۆیان و هەریەکەیان چی شایستەیە لەگەڵیدا بیکە.

[1] شرح نهج البلاغة لا ٦١٦.

## بەشی شەشەم

# هەردوو جەنگی (جەمەل) و (صفین) و مەسەلەی تەحکیم:

خوای گەورە دەفەرمویت ((وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)) سورة الحجرات ٩ـ ١٠.

واتە: هەرکاتێ دوو کۆمەڵ لە باوەڕداران بوو بەشەڕیان، ئێوە صوڵحیان بکەن، ئەگەر لایەکیان زوڵمی لەلاکەی ترکرد، ئێوەش شەڕ لەگەڵ ئەو لایەدا بکەن کە زوڵم دەکات تا دەیانگەڕێننەوە بۆلای ڕێبازی خوا، و ئەگەر گەڕایەوە ئێوەش دادپەروەرانە صوڵحیان بکەن چونکە خوای گەورە ئاشتی خوازانی خۆش دەوێت.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە (أنس ی کوڕی مالك) دەگێڕێتەوە کە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووترا: چۆنە سەردانێکی عبداللە ی کوڕی ئوبەی بکەیت؟ فەرمووی : بابڕۆین بۆلای ، موسڵمانەکانیش لەگەڵیدا ڕۆیشتن و دایان بەلای زەویەکی کرێن و وشکەڵاندا و پێغەمبەرمان (ﷺ) بەسواری گوێدرێژێکەوە ، کاتێ گەیشتە لای ووتی : کەمێ لێم دووربکەرەوە بۆنی گوێدرێژەکەت ئازاری دام و ناڕەحەتی کردم!.

پیاوێکی ئەنصاریش زۆری پێ ناخۆش بوو پێی ووت : وەڵلاهی بۆنی گوێدرێژی پێغەمبەری خوا لە بۆنی جەنابتان خۆشترە، و پیاوێکی خزمی (عبداللە)یش ئەو قسەیەی پێ ناخۆش بوو، چەند پیاوێکی خزمی ئەنصاریەکەش پێیان ناخۆش بوو هاتنە وەڵام و دەستیان کرد بەشەڕو پێکدادان و بەنەعل و بۆکز و پالەدارخورما هاتن بەیەکدا، و وامان بۆ باس کراوە کە ئەو ئایەتەی سەرەوە لەسەر ئەم تێك ئالآن و شەڕە هاتە خوارەوە[1].

ئایەتی ((وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا)) واتە: هەر کاتێ دوو کۆمەڵ کە موسڵمانان بوو بە جەنگ و هەرایان پێویستە لەسەر دەستەڵاتداران بەهێز بچنە نێوانیان و

---

[1] البخاری (٢٦٩١) ،مسلم ١٧٩٩.

نەهێڵن یەکتری قات و قڕبکەن، و هەروەك لەسەر پیاو ماقوڵ و پیاوچاکان و ئەهلی عیلم و دەستەی ئامۆژگار و بانگەوازکارانی ڕێگەی خوا،لە ڕێگەی ئامۆژگاری کردن و قسەی خێرو ڕەوانەوەی گومانەکان و یەك خستنەوەی ڕاو بۆچونەکانەوە ئاشتیان بکەنەوە...

هەرلەم ئایەتەشدا ئاماژەیەکی ناڕاستەوخۆی تێدایە کەلەوانەیە جەنگ و هەرا بکەوێتە ناو موسڵمانانەوە بەلاّم ئەگەر ڕووی دا ئەوە دەگمەنە و کەمە و ئەسڵ ئەوەیە کە موسڵمانان برایەتی و خۆشەویستی دەچڕن بۆیەکتری و فەرموودەکان ئاماژەی ئەوە دەکەن کە موسڵمانان دەبێت بۆ یەکتری وەك یەك لاشەوابن وبە ئازاری یەکەوە ئازار بچەژن.

و لە (صحیح)ی (البخاری)دا هاتووە لە (ابی بکرە) وە(ﷺ) دەڵێت:پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتاری بۆدەداین ولەو کاتەدا حەسەنی کوڕی عەلی (ﷺ) لەگەڵیدا بووە، و جارێ سەیری ئەوی دەکرد و جارێکی تری سەیری خەلکەکەی دەکرد و دەیفەرموو (( ان ابنی هذا سید، ولعل الله تعالی أن یصلح بە بین فیئتین عظیمتین من المسلمین))[1].

واتە: ئەم کوڕەم سەید و گەورەیە، و لەوانەیە خوای گەورە بیکاتە هۆی ئاشتبونەوەی دوو کۆمەڵی گەورەی ناو موسڵمانان، و (سبحان الله) هەروایش بوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی دا و حەسەن (ﷺ) بوو بە هۆی ئاشت بوونەوەی ئەهلی شام بە سەرۆکایەتی موعاویە و ئەهلی عێراق بەسەرۆکایەتی خەلیفە موسڵمانان، دوای ئەو جەنگە خوێناویانەی کەوتە نێوانیان، و گرنگ ئەوەیە خوای تەعالا صیفەتی باوەڕی لە هیچ لایەکیان نەکردۆتەوە و هەردولا بە باوەڕدار ناو دەبات و ئەمەش پێچەوانەی ڕای خەواریجەکانە کە خەلکی بە گوناهە گەورەکان کافر دەکەن و لە میللەتی موسڵمان دەیان کەنە دەرەوە.

ئەمیری باوەڕداران عەلی(ﷺ) ناوکرۆکی ئەم ئایەتەی جێ بەجێ کرد لەگەڵ گەورە هاوەلانی وەك ـ طلحە و زوبێر(ﷺ) هاتن بەدەم هەنگاوە پڕلەئاشتی یەکەی عەلی، بەلاّم ـ ئەفسوس ـ تاقمەکەی (عبدالله ی کوڕی سەبەء) ئاگری شەڕەکەیان خۆش کرد لە نێوان هەردوولادا و لەشوێنی خۆیدا بەوردی باسی دەکەین (انشاء الله).

---

[1] البخاری ژ ٧١٠.

و عەلی(ﷺ) زۆر بەپەرۆشەوە بوو کە ئەو جەنگە نەخوازراوە لەنێوان ئەو و خەڵکی شامدا ڕوونەدات، و بۆ ئەو مەبەستەیش شمشێرەکەی لە خۆی کردەوە و تا دەستی بگات فڕێ ی دا، تا کار بکاتە سەر دڵی موعاویە(ﷺ) بێتەوە ژێر گوێڕایەڵی و ڕێگەی ئاشتی هەڵبژێرێت و یەکڕیزی خیلافەتی ئیسلامی بپارێزێت...بەڵام داخەکەم ـ موعاویە ـ لە ئیجتهادەکەیدا نەپێکاو بەهەڵەدا چوو بەوەی بەردەوام داوای بکوژانی عثمانی کوڕی عەفانی دەکرد(ﷺ) و هەقیش لەلای ئەمیری باوەڕداران بوو، بۆیە جەنگ لە نێوانیاندا دەستی پێکرد.

وە ئایەتی (إنما المؤمنون أخوة) واتە تەنها موسڵمانان برای ڕاستەقینەی یەکترن و ئەم ئایەتە ـ بناغەی پەیوەندیەکانە ـ بەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سیفەتی (باغی) واتە ستەم کاری دایە پاڵی ئەوانەی کە عەممارى کوڕی یاسر(ﷺ) شەهید دەکەن وەك فەرموویەتی " تقتل عماراً الفئة الباغية" و جەنگیش دژی هەڵگەڕاوە ـ باغی ـ فەرزی کیفایەیە و ئەگەر کەسانێك پێ ی هەستان لەسەر کەسانی تر دەکەوێت و لەسەر ئەو بنەمایە بوو کە هەندێ لە گەورە هاوەڵان وەك ـ ابن عمر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس و محمدی کوڕی مەسلەمە ـ(ﷺ) خۆیان بەدوور گرت لەو جەنگەو بەشداری هیچ لایەکیان نەکردو پاشتریش هەریەکەیان بیانوویەکیان بۆ عەلی هێنایەوە و ئەویش قبوڵی کرد لێیان.

لە ئاکامیشدا جەنگەکە کۆمەڵی ئەحکامی شەرعی نوێ ی لێکەوتەوە وەك (تەحکیم)و(جەنگ دژی موسڵمانە باغی یەکان) و پاشانیش لەسەرکردنی تاجی ئاشت بوونەوە کە لەسەردەستی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالیب(ﷺ) هاتە کایەوە.

## جێ باسی یەکەم

# ڕووداوەکانی پێش جەنگی "جەمەل"

ئاژاوەی کوشتنی عوسماان (ﷺ) بوو بەهۆی هێنانی کۆمەڵێ ئاژاوەی تر بەدوای خۆیدا، و باڵی کێشا بوو بەسەر ڕووداوەکانی دواتر داو زۆر هۆکار بوونە فاکتەری شەهیدکردنی عوسماانی کوڕی عەفان (ﷺ) لەوانە: ئەو خۆش گوزەرانی یەی ڕووی کردبووە کۆمەڵگەی ئیسلامی، و گۆڕانکاری یە کۆمەڵایەتی یەکانی ئەو سەردەمە و هاتنی عثمان ـ بەدوای عومەری کوڕی خطاب ـ دا، و بەجێ هێشتنی شاری مەدینە لەلایەن گەورە هاوەڵانەوە، و دەمارگیری سەردەمی نەفامی، و وەستانی بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکان ـ الفتوحات ـ و تەماحی تەماح بازان، و پیلانی کینە بازان، و داڕێژانی نەخشەی ورد بۆ تاوانبارکردنی عثمان (ﷺ) و بەکارهێنانی هۆکاری بزوێنەری دڵی خەڵکی، و ڕۆڵی (عبداللە ی کوڕی سەبەء) لەو ئاژاوەیەدا،

خەڵکی زۆر زۆر عوسمانیان خۆش دەویست، لەبەر سیاسەتە جوانەکانی و پلەو مەقامی لەدڵی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) فەرموودەی زۆر لەسەر چاکی یەکانی و پێدانی دوو کچی خۆی پێ ی و کە بەو بۆنەوە ناوی نرا ـ ذی النورین ـ و یەکێکە لەو گەورە هاوەڵانەی کە مـوژدەی بەهەشتیان پێ درا لەماوەی ژیانی خۆیداو لەسەردەمی خیلافەتیدا زۆر زوڵم و ناهەقی پێ کراوە لەلایەن هەندێ لە گێرەشێوێنانەوە، و خۆ لەتواناشیدا هەبوو هەموویان لەناو بەرێت بەڵام دەستی بۆ نەبردن چونکە زۆر لەوە دەترسا کە یەکەم کەس بێت ببێتە هۆی ڕشتنی خوێنی ڕۆڵەکانی ئوممەتی محمد المصطفی (ﷺ) و سیاسەت و هەڵس و کەوتی عثمان (ﷺ) لەبەرامبەر گێرەشێوێنان و ئاژاوەکەدا بریتی بووە لە نەرم و نیانی و دادپەروەری و لەسەرخۆیی، و بەرگریشی لە هاوەڵان دەکرد کە دژی ئاژاوەگێڕان بجەنگن، و حەزی کردووە خۆی بکاتە قوربانی هەموو موسڵمانان، و بۆیە شەهیدکردنیشی بوو بەهۆی هێنانی کۆمەڵێ فیتنەو ئاژاوە بەدوای خۆیدا،

بەڕاستی شەهیدکردنی عثمان (ﷺ) زۆر گەورەو گران بوو لەسەر دڵی موسڵمانان و کۆمەڵگەی ئیسلامی بەگشتی هەژاند، و خەڵکەکەی کرد بە دوو بەشەوە، و گەورەترین بەڵگە لەسەر بێ

تاوانی و بەرائەتی عثمان هەڵوێستی هەموو هاوەڵان لەسەر بێ تاوانی و بێ گوناهی یەکەیەتی و هەموو لەسەر ئەوەن بەڵام هەریەکەو بەجۆرێك...

بەکورتی تیشك دەخەینە سەر ڕۆڵی (عبدالله ی کوڕی سبأ) لە هەڵگیرساندنی ئاژاوەکە بەگشتی:

## یەکەم/ ئاسەواری سەبەئی لە هەڵگیرساندنی ئاژاوەکاندا:

### ١- سەبەئی یەکان ڕاستین یان خەیاڵین؟ ڕاستی عبدالله ی کوڕی سەبەء؟

هەمو زاناو نووسەرانی کۆن لەسەر ئەوەن و بێگومانن لەبوونی ئەم پیاوە جولەکەیە کە ناوی (عبدالله ی کوڕی سەبەء) بوو کە تۆوی فیتنەو ئاژاوەی لەناو موسڵماناندا چاند لەلایەکەوەو لەلایەکی ترەوە ویستی بدات لە کەسایەتی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرمان (ﷺ) کە نموونەی پاکی و ڕەوشت بەرزی و بەوەفایی و غیرەت بوون ـ و بەوە تاوانباریان بکات کە ئەوان بوون هۆکاری ئاژاوەکەو بەوەش لە پلەو مەقام و پاکی و وێنەی پڕشنگداری یان کەم بکاتەوە. هەموو کتێبە بڕواپێکراوەکانی لای ئەهلی سوننە و ئەهلی شیعە ناوی ئەم پیاوە خراپەکارە براوە، و هەندێ کەسی وەك زانای بەناوبانگ (الشعبی) دەربارەی (عبداللە) دەڵێت: عبدالله ی کوڕی سەبەء کەسێکی درۆزنە.

(إبن تیمیە) دەڵێت: بنەمای (رافزە) پیاوێکی زەندیق ـ بێ باوەڕ ـ ی وەك عبدالله ی کوڕی سەبەء دروست کرد.[1] (إبن حجر)یش دەڵێت: (عبدالله ی کوڕی سەبەء) لە زیادەڕەوەکانی (زنادقە)یە ... شوێن کەوتەیشی هەبووە پێیان ووتوون (سەبەئی یەکان) و پەنا بەخوا — دیعایەی خوایەتی عەلی کوڕی ئەبو طالیبیان کردووە ... و عەلی لەسەردەمی خۆیدا بەئاگر سووتاندوونی[2].

(موقریزی) کە لەساڵی ٨٤٥ کۆچیدا ژیاوە دەڵێت (عبدالله ی کوڕی سەبەء) لەسەردەمی عەلیدا سێ شتی دەدا بەگوێی شوێن کەوتوانیدا کە ئەو سیانەش: پێغەمبەر وەسیەتی بۆ عەلی کردووە ببێتە جێ نشینی!، گەڕانەوەی ڕۆح بۆ دونیا!، تەناسوخ!.[3]

---

[1] مجموع الفتاوی (٤٨٣/٢٨).

[2] لسان المیزان، إبن حجر (٣٦٠/٣).

[3] المواعظ والاعتبار، مقریزی (٩/ ٢٥٦-٢٥٧) .

ئەگەر چاوێکیش بگێڕین بەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی شیعەدا باسی (إبن سبأ) زۆر کراوە لەوانە: (الکشی) لە محمدی مەولەویەوە دەڵێت: سەعدی کوڕی عبداللە پێ ی ووتم: یعقوب ی کوڕە یەزید و محمدی کوڕی عیسی و علي کوڕی مهزیار لە فضالی کوڕی ئەیوبی ئەزدی یەوە، ئەویش لە (أنان) ی کوڕی (عثمان) ەوە دەڵێت: ((گوێم لێ بوو (أبا عبداللە) دەیووت: لەعنەتی خوا لە عبداللە ی کوڕی سەبەء بێت، ئەو بوو بانگەشەی خوایەتی ئەمیری باوەڕدارانی دەکرد، و ئەمیری باوەڕدارانیش بەندەیەکی گوێ ڕایەڵ بووە، وەیل و لەناوچوون بۆ ئەو کەسەی درۆمان بەدەمەوە هەڵدەبەستێت، و هەندێ کەس هەندێ شتمان دەدەنە پاڵ کە ئێمە نایدەینە پاڵی خۆمان و بە خوا ئێمە بەریئو دوورین لەو شتانەوە))[1]

و ئەم ڕیوایەتە لەلای شیعەکان لەلایەن سەنەدەوە (صحیح)ە.[2] و خاوەنی کتێبی (الخصال) دا (القمی) هەمان هەواڵی سەرەوەی هێناوە بەڵام بەسەنەدی خۆیەوە، و خاوەنی (روضات الجنات) لەسەر زمانی (الصادق المصدوق) باسی (إبن سبأ) ی کردووە ووتوویەتی: خوا لەعنەتی لە (إبن سبأ) کردووە لەسەر ئەوەی کە درۆو ساختە (تزویر) و ئاشکراکردنی نهێنی یەکان و تەئویلاتی کردووە[3].

و یەکەمین کەس کە گومانی دروست کرد لەبوونی (عبداللە ی کوڕی سبأ) دا ڕۆژهەڵاتناسە داخ لەدڵەکان بوون و هەندێکی کەمیان هەستان بە بڵاوکردنەوەی باسی نەبوونی عبداللە و ئیتر لەو ڕۆژە بەدوا شیعەکانی هاوچەرخیش باوەڕیان پێ کردن و دەستیان دایە گومان بڵاوکردنەوە دەربارەی بوونی (عبداللە) و لەئاکامدا هەندێکیان چوونە سەر ئەو بۆچوونە، بەڵام ئەوانە هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و دروستی مێژوویان لەبەر دەستا نی یەوهەموو بەڵگەکانیان لەسەر بنەمای گومان دروست کردووە[4].

---

[1] رجال الكشى (٣٢٤/١).

[2] عبدالله بن سبا الحقيقة المجهولة/ للشيعي محمد بن على المعلم، لا ٣٠.

[3] عبدالله بن سبأ، سليمان العودة، لا ٦٢.

[4] تحقيق مواقف الصحابة (٣١٢/١).

## ٢- ڕۆڵی عبدالله ی کوڕی سەبەء لە جوڵاندنی ئاژاوەکەدا:

لەکۆتایی ساڵەکانی سەردەمی حەکمڕانی عوسمانی کوڕی عەفاندا (ﷺ) هەندێ تێکچوون و پشێوی ڕووی کردە کۆمەڵگەی ئیسلامی لەبەر ئەو هۆکارانەی کە پێشتر باسی هەندێکیمان کرد، و لەم کەش و هەوا ـ لێڵەدا ـ جولەکەکان ویستیان جوڵەیەك بکەن و جۆرە دەرکەوتنێکی ژێر بەژێریان هەبێت، بۆیە ئەو ئاژاوەیەیان بەهەل زانی کە ڕوی کردبووە پایتەختی ئیسلام و بەڕواڵەت موسڵمان بووبوون و بۆ پاراستنی گیانیان، یەکێ لەو کەسانە (عبدالله ی کوڕی سەبەء) بوو کە پێیان دەووت (إبن السوداء).

ئەم پیاوە لەڕاستیدا نابێت زۆر گەورە بکرێت و وەك دێوە زمە سەیری بکرێت وەك هەندێ زیادەڕەو ـ غالی ـ گەورەی دەکەن و باسی دەکەن، هەروەها ناشبێت بچووك بکرێتەوە و هەوڵی ئەوە بدرێت کە گومان دروست بکرێت لە بوونیدا یان ئەو ڕۆڵە قێزەونەی ئەو پێی هەستا بچووك بکرێتەوە، بەڵکو ئەو ڕۆڵەی ئەو بینی ترسناك ترین و زیانیەخش ترینیان بوو.

ئەم پیاوە زۆر فێڵبازو لێزان بووە لە لادانی ماناکانی قورئان لە مانا ڕاستەکانی یەوە بۆ تەئویلاتی نادروست کە قورئان لێیان بەری یە، بۆ نموونە دەڵێت: زۆر سەرسام دەبم لەو کەسانەی کە دان بەگەڕانەوەی عیسا دادەنێن جارێکی تر بۆ سەر زەوی کەچی باوەڕیان بەگەڕانەوەی پێغەمبەر محمد (ﷺ) نی یە جارێکی تر بۆ سەر زەوی! کەچی خوای گەورە دەفەرموێت ((إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَى مَعَادٍ))"القصص/٨٥" و کەواتە محمد (ﷺ) لە عیسا شایانترە کە بگەڕێتەوە[1].

هەروەها ڕێگایەکی تری فێڵبازانەی گرتەبەر تا ئەوە بخاتە دڵی خەڵکی سادە و ساکارەوە کە عەلی ـ وەصی پێغەمبەری خوا بووە!! و بۆ سەلماندنی ئەو درۆیەی خۆی دەڵێت: هەموو پێغەمبەرێك خۆشەویستێکی هەبووە، و هەموو پێغەمبەرێکیش جێنشین و وەصی یەکی بۆ دوای مردنی دیاری کردووە، و عەلیش (ﷺ) وەصی پێغەمبەری خوا بووە، و کەواتە: محمد خاتەمی پێغەمبەرانەو عەلیش خاتەمی وەصی یەکانە[2].

---

[1] تاريخ الطبري (٣٤٧/٥).

[2] هەمان سەرچاوە.

کاتێ ئەو شتانەی ئاخنی یە مێشکی شوێنکەوتوانی، ئیتر چوو بۆ قۆناغی دووەم لەو نەخشەیەی کە کێشابووی، کە ئەویش یاخی بوونی خەڵکی بوو لەدژی عثمان (ﷺ) و ئەوەش یەکی دەگرتەوە لەگەڵ حەزو ئارەزووی هەندێ کەسدا و پێی ووتن: کێ لەوە ستەمکارترە کە وەسیەتی پێغەمبەر جێ بەجێ نەکات و عەلی کە وەصی پێغەمبەر بووە لای داوەو خۆی چۆتە شوێنی خەلیفە؟!.. وپاشان پێی ووتن: عثمان بەناهەق خیلافەتی بۆخۆی بچڕیوە و ئەمەش عەلی (ﷺ) کە وەصی پێغەمبەری خوایەو هەستن بیجوڵێنن .. و بەتانەو تەشەر لەئەمیرەکانتانەوە دەست پێ بکەن و لەشێوازی فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپەدا پیشانی خەڵکی بدەن و دڵی خەڵکی بۆ ئەم کارە ڕابکێشن و بانگیان بکەن بۆ ئەم کارە.

بۆ ئەم مەبەستە نەفەرەکانی خۆی بڵاوکردەوە بەناو شارەکانداو نامەی دەنارد بۆ ئەو کەسانەی لەسەر ئەو بۆچوونە بوون و ئەوانیش نامەیان بۆ ناردەوەو فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپەیان دەردەخست لە ڕواڵەتدا، و پاشان نامەی دەنووسی بۆیان و تیایدا ناتەواوی و ستەمکاری و ناشیاوی والی و ئەمیرەکانی خۆیانی بۆ ڕون دەکردنەوە و ئەوانیش لەوێوە نامەیان بەهەمان جۆر دەناردەوە بۆ هاوڕێکانی تریان[1].

ئا بەو جۆرە خەڵکی هەر شارەو نامەیان دەنارد بۆ شارەکانی ترو تیایدا هەموویان دژی شاری مەدینە دەجوڵانەوەو هەموو سەرزەوی یان پڕکرد لەو قسانەو لەڕواڵەتدا بەنیازێکەوەو لەژێریشەوە نیازێکی تر، و خەڵکی شارەکان دەیان ووت: ئێمە زۆر باشترین لەوەی شارەکانی تر پێوەی دەناڵێنن..[2]

لەم دەقانەی سەرەوەدا شێوازی عبداللە ی کوڕی سەبەء بەجوانی ڕوون و ئاشکرایە، کە دەیویست دوو هاوەڵی مەزنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە بەرچاوی خەڵکەوە بدات بەگژی یەکدا، بەشێوەیەك یەکەمیانی کرد بە ماف خوراو و ستەم لێکراو کە عەلی بوو، دووەمیشیان کردبوو بە ستەمکارو پێشێلکەری ماف کە عثمان بوو!

---

[1] هەمان سەرچاوە (٣٤٨/٥).

[2] تحقیق مواقف الصحابة (٣٢٧/١).

پاشان هەوڵیدا خەڵکەکە لە ئەمیرەکانیان هەڵگەڕێنێتەوە و لەژێر پەردەی فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپەدا بەرامبەری بوەستن، بەتایبەتی لەشاری کەفەدا - تا وایان لێ هاتبوو لەبەر بچوکترین کێشە دەستیان دەدایە شۆڕش و یاخی بوون لەگەڵ والی یەکانیان،

سەرەتا لەلایەن دوو چینی کۆمەڵەوە ژەهری خۆی کردە ناو لەشی وڵاتی گەورەی ئیسلام، یەکەمیان: چینی عەرەبە دەشتەکی یەکان کە زۆر سادەو سینە ساف بوون و خۆش بڕوا بوون و مادەیەکی خاو بوون بۆ جێ بەجێ کردنی پیلانەکەی.

دووەمیان: قورئان خوێنەکان - القراء - ئەوانەشی بەوە هەڵخەڵەتاند کە گوایە ئەم کارانەی ئەم پێیان دەڵێت بەشێکە لە فەرمان بەچاکەو بەرگری لە خراپە، و خەڵکانی تریش لەو کەسانەی ویست و ئاوات و مەبەستی تایبەتی خۆیان هەبوو، و دڵ و مێشکی پڕکردن لە پڕوپاگەندەی درۆ بەدەم خەلیفەی سێ یەمەوە (ﷺ)، بۆ نموونە گوایە عثمان (ﷺ) پارەو سامانی ڕشتووە بەسەر خزمەکانی خۆیدا لە (بيت المال) ی موسڵمانان و گوایە قەدەغەو شتی بۆ خۆی تەرخان کردووە و ئەمەو چەندان تانەی تر کە دڵ و دەروونی گێرەشێوێنانی پڕکرد دژی عثمان (ﷺ)ی بەری و بێ تاوان، و پاشان داوای دەکرد لەخەڵکی هەر هەرێمێك کە بەنامەو نوسراو کۆمەڵێ هەواڵ و ڕووداوی ناخۆش و دڵتەزێن بنێرن بۆ هەرێمەکانی تر، تا وای لێهات ئەهلی هەر هەرێمێك وای دەزانی حاڵەکە ئەمەنە خراپ بووە کە ئیتر لەوە خراپتر نابێت،

سودمەندی سەرەکی لەو بارو زروفە تەنها سەبەئی یەکان بووە، چونکە بەو قسە هەڵەق و بەلەقانەوە لەلایەن خەڵکە گشتی یەکەوە سودی باش دەگەیەنێت بە زیاتر گەرم کردنی بازاڕی گێرەشێوێنان و تێك دانی کۆمەڵگەی ئیسلامی[1].

عثمان ی کوڕی عەفان (ﷺ) هەستی کردبوو کە داوو تەڵەکە نانەوە لەناو هەرێمەکاندا سەری هەڵداوەو ئوممەت لەبەردەم نیازێکی خراپدایە، دەیووت: ((وەڵڵاهی ئاشی ئاژاوە گێڕان لەکاردایە، دەی خۆشبەختی بۆ خۆمان ئەگەر کەسێك بمرێت پێش ئەوەی بیجولێنێت))[2].

[1] تاريخ الطبري (٥/٠ ٢٥).

[2] هەمان سەرچاوە (٥/٣٤٨).

ئەو شوێنەی کە زەویەکی لەبار بوو بۆ کارەکەی (عبدالله ی کوڕی سەبەء) میسری هەڵبـژاردبوو، و لەوێوە هەواڵەکانی خستە گەڕ دژی خەلیفە عثمان و هانی خەڵکی دەدا کـە بـڕۆن بـەرەو شـاری مەدینە و ئاژاوە هەڵگیرسێنن بە بیانووی ئەوەی کە عثمان بە ناڕەوا و بەناهەق خیلافەتی بۆخـۆی زەوت کردووە، و عەلی (ﷺ) جێ گەی وەسیەتی پێغەمبەری خوا بووە و ئەو شایانترە[1]،

هەندێ قسەو ووتەی بەناوی هەندێ لە گەورە هاوەڵانەوە نووسی و بەناو عەرەبە دەشتەکی یەکاندا بڵاوی کردەوە و کاتێ هاتن بۆ مەدینە و لەگـەڵ ئـەو هاوەڵانـەدا دانیـشتن دەبیـنین شـتی وایـان نەووتووە و بەڵکو خۆیشیان لەو ووتانە بەری دەکرد[2].

و بینیشیان وا عثمان هـەموو مافـەکانی داوەو دیـاری کـردووە بـۆ هاوەڵـان، و بـەڵکو لەگەڵیان دانیشت و گفتوگۆی کردو درۆو بوختانی ئەو ووتانەی ئەوانی بۆ ڕوون کردنـەوەو هـەموو کارەکانی خۆی بۆ باس کردن کە لەبەر چ حیکمەتێك کردوویەتی.

تەنانەت یەکێ لە سەرکردەکانیان ـ مالك الأشتر ـ ووتـی: دەی لەوانەیـە ئەمـە فێـڵ و فـڕەو لـە خەلیفەو لە ئێوەش کرابێت.

هەموو مێژوونووسان و زانایان و فەرموودەناسان لەسەر ئەوەن کە پیاوێك بەناوی (إبن سبأ) وە دەرکەوتووەو کۆمەڵێ بۆچوون و بیرو باوەڕی چەوتی هێناوە لەناو موسڵمانانندا بڵاوی کردۆتەوە، تا ناکۆکی و جیاوازی بخاتە نێوان موسڵمانان و فەرمانڕەواو سەرکردەکانیان و لە ئاینەکەشیان دوریان بخاتەوە و کۆمـەڵێ فیتنەچی و گێرەشێوێنی دۆزیەوە و پێکـەوە کۆمـەڵـەی (سـەبەئی) یـەکانی لێ پێك هێنان و بوونە یەکێ لە هۆکارە سەرەکی یەکانی شەهید کردنی عثمان (ﷺ).

## دووەم/ جیاوازی هاوەڵان لە شێوازی داواکردنی تۆڵەی عثمان (ﷺ):

ئەو ناکۆکیانەی کەوتە نێوان عەلی و طلحە و زبێر و عائشە و نێـوان عـەلی و موعاویـە هۆکارەکەی ئەوە نەبوو کە عەلی شایستەی خیلافەت نی یەو یان هەقی خۆی نەبووە یان گلـەییان

---

[1] هەمان سەرچاوە (٦).

[2] أحداث وأحاديث الفتنة المهرج، ل ١٥٨.

هەبێت لە بەڕێوەبردنی کارەکانیدا، بەڵکو ئەمە لەلایەن هەموو لایەکەوە سەلمێنرابوو کە کەسی لەو باشتر لەناو هاوەڵاندا نەمابوون دوای سێ خەلیفە ڕاشیدەکەی پێش خۆی.

بەڵکو جیاوازیان لەشێوازی تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی عثمان (ﷺ) و عەلیش (ﷺ) وەك ئەوان سور بوو لەسەر تۆڵەسەندن لە ئەو گێرەشێوانەی هەستان بەتاوانی شەهیدکردنی عثمان و بڵاوکردنەوەی ئاژاوە لەناو هەرێمەکاندا..

بەڵکو عەلی (ﷺ) ئەوەندە جیاوازی هەموو لەنێوان ئەو و ئەواندا ئەوەبوو کە ئەوان دەیان ووت دەبێت بەزووترین کات و یەکەمین ئیشیش بێت لە ئیشەکانی خەلیفەی چوارەم کە هەستێت بەتۆڵە سەندنەوە لەو کەسانەی عثمانیان بەناڕەوا بەسەر قورئانەکەیدا شەهید کرد،

بەڵام عەلی (ﷺ) دەیفەرموو: پەلە مەکەن با بارو زروفەکە ئاسایی بکەینەوە و ئاشتی و ئارامی بگێڕینەوە بۆ هەرێمەکان و پاش ئەو کارانە یەك یەك دادگاییان دەکەین و تۆڵەیان لێ دەستەنینەوە.

سێ یەم/ زوبێرو طلحە و عائشە (ﷺ) بەرەو بەسرە دەڕۆن:

طلحە و زبیر (ﷺ) چوون بۆ مەککەو لەگەڵ دایکی باوەڕداران عائشەدا (رضي الله عنها) کۆبوونەوە، ئەم کۆبوونەوەیەش پاش چوار مانگ لە شەهیدکردنی عثمان (ﷺ) کرا، واتە لە ساڵی ٣٦ ی کۆچی، و لەگەڵ عائشەدا ڕێك کەوتن کە دەرچن، چونکە پاڵەپەستۆیەکی دەروونی زۆر ناڕەحەت کاریگەری زۆری کردبووە سەر ئەوانەی کە بەبەر چاویانەوە خەلیفەی موسڵمانان بە شتەمکارترین شێوە شەهید کرا لە ماڵەکەی خۆیدا، و هەستیان بەوە دەکرد کە تاوانێکی گەورەیان کردوەو خۆشبوونیشیان نی یە بەوە نەبێت کە هەموو هەوڵیان بخەنە کار بۆ تۆڵە سەندنەوەی لە بکوژانی.

هەرچەندە ئەوان لەبەر قسە نەشکاندنی عثمان بەرگریان لێ نەکرد کە خۆی دا بەکوشت لەپێناو ئەوەی کەس خوێنی خۆی لەسەر نەڕژێنێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا عائشە دەیووت: عثمان بەستەم و ناڕەوا کوژراوەو وەڵڵاهی داوای خوێنەکەی دەکەم[1].

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٤٨٥).

طلحەیش دەیووت: ((من بەرامبەر عثمان قەرزار بارم و تەوبەو پەشیمانیم بەوە دەبێت لەپێناو سەندنەوەی خوێنی عثمان دا خوێنی خۆم برژێنم))[1]

و زبێریش ووتی: (با خەڵکی ڕاپەڕێنین بۆ سەندنەوەی ئەم خوێنە تا نەفەوتێت و بەفەوتانی ئەو خوێنە دەستەڵاتی خوا لەناوماندا بێ نرخ دەبێت، و ئەگەر خەڵکی وێنەی ئەو کەسانە دەرس دانەدەن پێشەوایەك نامێنێت کە کوشتن نەیگرێتەوە)[2].

بەڵێ لەمکاڵ دەرچوون و نەیاندەزانی چ ئاکامێکی نادیار چاوەڕوانیان دەکات، و هەریەکەیان لەماڵ دەرچوو نەیدەزانی ئایا دەگەڕێتەوە یان نا؟ و خێزان و منداڵەکانیان بەگریان و شیوەنەوە ماڵئاواییان لێ کردن و شاری مەککە هیچ ڕۆژێکی وا گریاناوی بەسەردا نەهاتبوو کە خەڵکی هەموو بۆ ئیسلام و ئەو ڕۆژەی هاتۆتە پێش بۆی.

## بۆچی لەمەککەوە دەستیان کرد بەدەرچوون؟

کۆمەڵێ هۆکار وای لێکردن کە لە مەککەوە بیر لەهۆکاری هاتنەدی ئەو داواکاری یەیان بکەنەوە، لەوانە: (بني أمية) لە مەدینەوە هەڵهاتن و لە مەککە گیرسانەوە، و لەوانە: عبداللە ی کوڕی عامر کە ئەمیری عثمان بوو بەسەر بەسرەوەو لەپاش گرتنی بەسرە لەلایەن سوپای موعاویەوە هەڵهات بۆ مەککەو هانی خەڵکی دەدا بۆ سەندنی تۆڵەی عثمان و ئامادەیی خۆیشی پیشان دەدا بەهەموو هاوکاریەکی مادی و مەعنەوی.

لەوانە (يعلى) ی کوڕی (أمينه) پێش شەهیدبوونی عثمان لە یەمەنەوە بەسوپاکەیەوە هات بۆ هاوکاری خەلیفە، بەڵام کاتێ گەیشتە مەککە بیستبووی کە گێرەشێوێنان عثمانیان شەهید کردووە و ئەو ئیتر لەوێ مایەوە کە چەك و وڵاخ و پێداویستی چاکی پێبوو،

پاش ئەم هۆکارانە هەموو لایەك ئامادە بوو بۆ دەرچوون بەڵام بەرەو کوێ دەرچن؟ ئەوە پرسیارێك بوو هەریەکەیان بەجۆرێك وەڵامی دایەوە، و عائشە (رضي الله عنها) ووتی: دەبێت لەشاری مەدینەوە دەست پێ بکەین، و بۆچونێکی تر دەیووت: نا، با بەرەو شام بڕۆین و لەگەڵ سوپاکەی موعاویەدا یەکبگرینەوە و پێکەوە بکوژانی عثمان بگرین و بیانکوژینەوە، و بەڵام پاش

---

[1] سير أعلام النبلاء (٣٤١/١).

[2] تاريخ الطبراني (٤٨٧/٥).

مشت و مرێکی زۆر ڕایان هاتە سەر شاری بەسرە، چونکە بەسرە شارێکی زۆر گەورەیە و ئەوانەش کەمن و پێیان ناوێرن و هەروەك شام مسۆگەر بوو لەبەر بوونی موعاویە، و پاشان بەسرە دەستەڵاتی خەلیفەی بەسەرەوە لاوازبوو لەچاو شارەکانی تردا و دەتوانن لەوێ ئاواتەکانیان بهێننە دی[1].

مەبەستیشیان لەم دەرچوونە ڕوون و ئاشکرابوو، کە ئەویش تۆڵە سەندنەوە لە بکوژانی عثمان (ﷺ) و چاکسازی و دەرخستنی نالەباری ئەو کارەی گێرەشێوێنان کردیان بە عوسمان و خیلافەت، و هەروەها فەرمان بەچاکەو بەرگری لە خراپە بوو[2]،

و ئەمەش داواکردنی جێ بەجێ کردنی حەدێك بوو لە حدودەکانی خوا چونکە ئەگەر ئەوانە نەکوژرێنەوە ئیتر هەر کەسێك دوای ئەوان خیلافەتی بەدڵ نەبێت دێنە سەر پایتەخت و خەلیفە دەکوژن.

ئامانجیشیان لەدوای بەسرە چوونە ناو کوفە بوو کە لەو کاتەدا پایتەختی خیلافەت بوو، لەوێ بەئاسانی بکوژان کە لەناو سوپای عەلیدا (ﷺ) خۆیان حەشار دابوو بگیرێن و بکوژرێنەوە بەکەمترین قوربانی[3].

دەرچوون بەرەو بەسرە، ئامادەکردنی شاری بەسرە بۆ بەرەنگاری و تۆڵە سەندن و ئەو تورە بوونە جەماوەری یەی کە هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەری جوڵاند بۆ تۆڵە سەندن لە بکوژانی عثمان (ﷺ). شتێکی وا ئاسان نەبوو، وەك بڵێ ی کەسێکی ئاسایی کوژرابێت، بەڵکو سوپای بێ شومار کەوتە ڕێ بۆ تۆڵە سەندن و جێ بەجێ کردنی حەدێك لە حدودەکانی خوا کە کوشتنەوەی بکوژە، ئێ عثمان (ﷺ) خاوەنی پلەو مەقامێکی گەورە بوو لە دڵی موسڵماناندا، یەکێك بوو لە هاوەڵە گیان لەسەر دەستەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) کوشتنی ئا بەوجۆرە و بەدەستی هەندێ هەرچی و پەرچی (أوباش) و گێرەشێوێن ـ غوغاء ـ شتێکی ئاسایی نەبوو.

---

[1] دراسات في عهد النبوة، لا (٤١٨).
[2] هەمان سەرچاوە، لا (٤١٩).
[3] مقدمة إبن خلدون، لا ١٩١.

ئێ تیرۆرکردنی (عثمان) مانایەکی زۆر گەورەی هەبو کە ئەویش تیرۆرکردنی خیلافەتی ئیسلامی بوو کە لە ئیسلامدا خاوەنی شەرعی خوایە لە پارێزگاری لەئاین و کاروباری وولات[1].

زوبێرو طلحەو عائشە (ﷺ) بۆ شەڕ دەرنەچوون، بەلکو بۆ ئەوە دەرچوون کە ڕایەکی گشتی شەقامی ئیسلامی کۆبکەنەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەو لەگەڵ تاقمەکەی سەبەئی یەکان کە بەهێز بوو بوون و گاڵتەیان پێ نەدەکرا، ئەمەش بە ڕوونکردنەوەو باس کردنی ئەو کارە نامرۆڤانەی کە گێرەشێوێنان کردیان،

ئیتر لای هاوەڵان ڕوون و ئاشکرابوو کە ئەو کەسانە هەستاون بەو کارە ناشایستەیە لەناو سوپاکەی عەلیدا و لە پلەو مەقامی بەرزدا خۆیان حەشارداوە و عەلیش (ﷺ) کە لەوان زیاتر حەزدەکات تۆڵە بۆ عثمان بسەنێت و حدودی خوا جێ بەجێ بکرێت بەلاّم دەیزانی ناتوانێت هەڵسێت بەوکارە لەگەڵ ئەو کەسانەداو ئێ پاشان زۆر دەترسا لەوەی بدەنەوە بەسەر مەدینەدا و قات و قڕی بکەن،دەیان ویست تەنانەت سوپاکەی عەلی (ﷺ) جگە لەگێرەشێوێنەکانی ناوی - هەموو بێنە سەر ئەو قەناعەتەی کە ئەمان بۆ مەبەستێکی پیرۆز و جێ بەجێ کردنی حدودی خوا - هاتوون و مەبەستیان شەڕ نی یە و نیازیان بە دژایەتی کردنی عەلی نیە (ﷺ)[2].

کاتێ عائشە (رضي الله عنها) گەیشتە شاری بەسرە، والی بەسرە لێ ی پرسی لەهۆی هاتنی بۆ ئەم شارە و لەوەلاّمدا عائشە (رضـی الله عنهـا) ووتـی: وەڵڵاهی کەسێکی وەك من بەنیەتێکی شاراوە وە نایەت، و نیازو هەواڵی خۆی لەکوڕەکانی ناشارێتەوە، گێرەشێوێنان لەهەرێمەکانەوە و لەهەرچی و پەرچی لەهۆزەکانەوە هاتن و دایان بەسەر حەرەمی پێغەمبەری خوادا و ئەوەی کردیان کردیان و نەفرەتی خوایان بەسەرخۆیاندا هێنا بەکوشتنی پێشەوای موسڵمانان بەبێ بەڵگەو بەبێ بەهانە، و خوێنی حەرامیان حەڵاڵ کرد، و دەی ئێمە بۆ ئەم مەبەستە بانگتان دەکەین کە لەسەر نێرو مێ و گەورەو بچووکی ئیسلام پێویستە فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپە بکەن[3].

---

[1] دور المراة السياسي، لا ٣٩٤.

[2] تاريخ الطبري (٤٨٩/٥).

[3] الثقات لإبن حبان (٢٨٢/٢).

و عائیشه (رضي الله عنها) نامەی نارد بۆوالی کوفه که ـ أبو موسی الأشعري ـ بوو، لەوکاتەدا و عەلی (ﷺ) داینابوو، بۆی نوسی: دەربارەی کوشتنی عثمان ـ بەناڕەوا ـ زانیاریت پێ گەیشتووە، و منیش لەبەر بەرژەوەندی خەڵکی لەماڵ دەرچووم، و تۆیش فەرمان بدە هەموو سەربازانت بچنە ماڵەکانی خۆیان و بێ وەیی هەڵبژێرن تا ئەوکاتەی هەواڵی خۆشی چاك کردنەوەی کاروباری موسڵمانانیان پێ دەگات[1].

چەند مەسەلەیەکی گرنگ لەدەرچوونەکەی عائشەدا (رضي الله عنها):

١- ئایا لەم دەرچوونەیدا کەس زۆری لێ کردووە؟

یەعقوبی کە خاوەنی کتێبی (تأریخ الیعقوبي) یە وا گومان دەبات کە زوبێری کوڕی عەوام (ﷺ) زۆری کردووە لە عائشە کە هەستێت بەم سەفەرە، و (الذهبي) یش ئاماژەیەکی وای هەیە گوایە عبدالله ی کوڕی زوبێر زۆری لێ کردبێت، بەڵام ئەگەر بەوردی بەدوای ڕاستیدا بگەڕێیت، بۆت ڕوون دەبێتەوە ئەم قسانە هیچ کامیان ڕاست نین، چونکە ئەمان دوای (٤) مانگ دێن بۆ مەککەو مەسەلەکە دەخەنە بەردەستی عائشة (رضي الله عنها) بەڵام عائشە هەر لەیەکەم ساتی کارەساتەکەوە داوای خوێنی عثمانی کردووە و دەگێڕنەوە یەکسەر لەگەڵ ڕووداوەکەدا مەدینەی بەجێ هێشتووە و چووە بۆ مەککە، و لەوێ یەکسەر عبدالله ی کوڕی عامیر حضرمی پێگەیشتووە و پێ ی ووتووە: چی تۆی هێناوەتەوە (بۆ مەککە) ئەی دایکی باوەڕداران؟ ئەویش لەوەڵامدا ووتی: بۆیە گەڕامەوە چونکە عثمان بە ستەم لێکراوی کوژراوە و هەرگیز وەزع ئاسایی نابێتەوە تا ئەم گێرەشێوێنانە مابن، بۆیە ئیسلام سەربەرز بکەن بە سەندنی تۆڵە لە بکوژی عثمان، و عبدالله یەکەمین کەس بوو کە هات بەدەم داواکاریەکەیەوە[2].

کەواتە طلحە و زوبێر لە مەدینە دەرنەچوون مەگەر دوای چوار مانگ لە تێپەڕبوونی کارەساتەکە[3].

---

[1] تاریخ الطبري، لا (٤٧٥).

[2] دور المرأة السیاسي، لا ٣٨٤.

[3] هەمان سەرچاوە، لا ٣٨٤.

## ٢- ئایا عائشە ـ کێ ی لەگەڵدا بوو؟

ئەوانەی لەگەڵی دەرچوون کومەڵێك لە هاوەڵان بوون[1]، و عائشە لەو ئافرەتانە نەبووە کە بەزۆر و بەروگیری خەلکی بداتە بەر و بیانیات بۆ بەسرە و هەموو ریوایەتەکان لەسەر ئەوەن کە سەرجەم دایکانی باوەڕداران پشتگیری بوون لەم هەنگاوەیدا و هەموو کەسێك بەکاملی سەربەستی خۆیەوە لەهەوڵە چاکسازیەکەیدا لەگەڵی بوون و ئەم ژمارەیەش کەم نەبوون و وەك طلحە و زوبێر دەڵێن: پیاو چاك و نەجیب زادکانی خەلکی بەسرە دوای عائشە کەوتن[2].

تەنانەت ئەگەر کەسانی بەڕێز و موسڵمان و پیاو چاك نەبوونایە، ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) لەدوای جەنگی جەمەل لەسەر شەهیدەکانیان نەدەوەستاو دوعای لێخۆشبوونیان بۆ بکات و بەچاکە ناویان بەرێت[3]،

## ٣- ئایا دایکانی باوەڕدارانی لەگەڵدا بووە لەم کارەیدا؟

لەو ساڵەدا کە ئەو کارەساتە دڵتەزێنە ڕووی دا دایکانی باوەڕداران لە حەج بوون، و هەرکە خەبەرەکەیان بیست لەوێ مانەوە و نەگەڕانەوە، و چاوەڕوانیان دەکرد بزانن خەلکی چی دەکەن و مەسەلەکە بەرەو کوێ دەڕوات

پاش ئەوەی بەیعەت درا بە ئەمیری باوەڕداران لە مەدینە، دەنگە دەنگی گێرەشێوێنی لە هەرێمەکانەوە لە سەرهەڵداندا بوو، ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵان شاری مەدینەی منەوەریان بەجێ هێشت و بەرەو مەکە گەڕانەوە، کەواتە مەککە کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر و دایکانی باوەڕدارانی لێ بوو[4].

سەرجەم دایکانی باوەڕداران ڕازی بوون لەگەڵ عائشەدا بگەڕێنەوە بۆ مەدینەی پڕ نووە بەڵام هەرکە ڕای عائشە و هاوەڵانی لە مەدینەوە گۆڕدرا بۆ بەسرە، سەرجەم دایکان ووتیان: ئێمە جگە لە مەدینە بۆ هیچ کوێ ناڕۆین[5].

---

[1] تاريخ الطبري، دور المرأة السياسي، لا ٣٨٥.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] البداية والنهاية (٢٤١/٧).

[4] هەمان سەرچاوە.

[5] تاريخ الطبري (٤٨٧/٥).

کەواتە ڕازی بوون بەکارەکەی و دەستخۆشیان لێ دکرد بەڵام لەوەدا جیاواز بوون کە ئەوان حەزیان دەکرد لە مەدینەوە ئەو کارە بکرێت و نەڕۆن بۆ عێراق. تەنانەت: دایکی باوەڕداران (حفصەی کچی عمر) ووتی من لەگەڵت دێم بەڵام عبداللە ی برای سوێندی لێ خوارد کە نابێت بڕۆیت و ئەویش داوای لێبوردنی کرد لە عائشە کە عبداللە ی برام ناهێڵێت بێم لەگەڵتدا[1].

## ٤- ڕای زانایان دەربارەی عائشە (رضي الله عنها):

هەموو زانایانی ئیسلام لەسەرئەوەن کە عائشە لەناو دایکانی باوەڕداراندا زاناترینیان بووە لەڕووی تەفسیر و شەرع و ڕیوایەتی فەرموودەوە[2].

عورەی کوڕی زوبێر دەڵێت: عائشە وای لێ هاتبوو کە کەسم نەدیوە وەك ئەو زانا بێت لە قورئانداو لە فەرزەکان و لەسوننەتدا و لەشیعردا و لەڕووداوەکانی عەرەب، و نەژادناسی .... دادپەروەری و پزیشکی دا)[3]

(شەعبی) بەسەرسوڕمانەوە باسی زانست و فیقهی عائشەی کردووە و پاشان ووتوویەتی: گومانی چی دەبەن بە پەروەردەکراوی دەستی پێغەمبەر؟!

و (عطاء) دەیووت: عائشە فیقهزانترین کەس بووە و لە ڕووداوە گشتی یەکانیشدا جوانترین ڕای هەبووە[4].

ئەحنەفی کوڕی قەیس کە یەکێکە لە ڕەوانبێژەکانی عەرەب دەڵێت: (گوێم گرتووە لە ووتاری ئەبو بەکر و عمر و عثمان و علي و خەلیفەکانی تریش، بەڵام نەمدیوە کەس وەك عائشە ووتار بدات و ووتە دەربڕێت)[5]

---

[1] سير أعلام النبلاء (١٨٣/٢).

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] سير أعلام النبلاء (١٨٥/٢).

[4] هەمان سەرچاوە (١٨٣/٢).

[5] مسند أحمد (٩٧/٦).

٥- تێپەڕبوونی عائشە (رضي الله عنها) بەلای ئاوی (حەوئەب) دا:

لە ڕیوایەتی صحیح دا هاتووە کە عائشە (رضي الله عنها) داویەتی بەلای ئاوی (الحوأب) دا، قەیسی کوڕی حازم دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەخێزانەکانی فەرموو: ((کیف بأحداكنّ تنبح عليها كلاب الحوأب))[1]

لەڕێگەی (شوعبە) وە ئەویش لە (أصيل)ەوە کە ووشەکان هی شوعبەن دەڵێت: (عائشە کاتێک تێپەڕی بەلای ئاوی (حەوئەب) دا گوێ ی لە وەڕەی سەگ بوو، ووتی: وا ئەزانم بگەڕێمەوە باشە، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ ی فەرمووین: ((ايتكن تنبح عليها كلاب الحوأب)) واتە: کامتانن کە سەگی حەوئەب لێ ی دەوەڕێت؟، زوبێریش پێ ی ووت: ئایا دەگەڕێیتەوە؟ نا بەڵکو خوای گەورە بەبۆنەی تۆوە ئاشتی بخاتە نێوان موسڵمانان)[2].

٦- ئەو کارانە چی بوون لە بەسرە کردیان؟

هەرکە ئەو سێ کەسە کە - زوبێر و طلحە و عائشە - (ﷺ) گەیشتنە بەسرە لەناوچەی (خريبە) نیشتەجێ بوون، و لەوێوە جوابیان نارد بۆ پیاو ماقول و ناودارو سەرۆک هۆزەکان و داوای هاوکارییان لێ دەکردن لە مەسەلەی سەندنەوەی تۆڵە لە بکوژانی عثمان (ﷺ)، و زۆرێک لەخەڵکی بەسرە و شارەکانی تریش حەزیان دەکرد لەوەی تۆڵە بۆ خەلیفەی موسڵمانان بکرێتەوە، بەڵام هەندێ لەوانە وایان بەچاك دەزانی ئەو کارە بدرێتە دەستی خەلیفە و ئەو بەو کارە گرانە هەستێت، و سەربەخۆ هەستان بە ئاوا کارێکی ترسناك بەبێ ڕەزامەندێ خەلیفە بەسەرپێچی دادەنرێت،

بەڵام لەلایەکی ترەوە خەڵکەکە دەیانبینی کە کۆمەڵێ هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای ئەو کارە دەکەن کە موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە و ئەندامانی شوران و دایکی باوڕداران خاتوو عائشەیان لەگەڵە - خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، و تێگەیشتوو و زاناترین

[1] خلافة علي بن أبي طالب، ل ١٣٣.
[2] طبقات إبن سعد (٥/٤٥٦).

ئافرەتی هاوەڵان، و لەلایەکی تریشەوە داواکاریەکەیان شتێکی جوان و ڕۆشنەو یەك کەس لە هاوەڵان لارییان لیٚ ی نی یە.

و زوبیر (ﷺ) نامەی نارد بۆ (أحنف) ی کوڕی (قیس) التمیمی کە سەرۆك هۆزی تەمیم بوو، هەموویان لەقسەی دەرنەچوون و داوای لیٚ کرد پشتیان بگرێت لە داواکردنی خوێنی عثمان و تۆڵە سەندنەوە لە بکوژانی، و ئەحنەف خۆی باسی ئەو کاتە ناخۆشەمان بۆ دەکات و دەڵێت: ترسناکترین داواکاری بوو تا ئەو ساتە وەختە لەمن کرابێت، : پشت هەڵکردن لەو کەسانەی کە دایکی باوەڕداران عائشە و خۆشەویستەکەی پێغەمبەرمان (ﷺ) یان لەگەڵدایە زۆر ناڕەحەت و ئەستەمە[1]،

بەڵام لەبەرئەوەی جورئەتی نەکرد خوێنی موسڵمان بەدەستی موسڵمان بڕژێنێت، بۆیە وای بەباش زانی نەچێتە سەر هیچ لایەك و خۆی و (٦) هەزار لە هۆزەکەی دوورەپەرێز بوون لەو جەنگە، بەڵام کۆمەڵە کەسانێکی زۆر لە هۆزەکەی بەگوێیان نەکرد و ڕۆیشتنە ناو سوپاکەی عائشەوە[2].

تا وای لیٚ هات وەك زوهەری دەڵێت: (زۆرینەی خەڵکی بەسرە چوون بەدەم داواکاریەکانیانەوە)

## ٧- کوژرانی (حەکیم ی کوڕی جەبەلە) و گێرەشێوێنانی هاوڕیٚ ی:

دوای ئەوەی عائشە (رضي الله عنها) وتارێکی دا بۆ خەڵکی بەسرە، حەکیم ی کوڕی جەبەلە دەستی دایە شمشێرو دەستی کرد بەشەڕ لەگەڵ هاوڕێکانی طلحە و زوبیر و عائشە (ﷺ) و ئەوانیش دەستیان دایە ڕمەکانیان بەڵام نەیان دەوەشاند،

بەڵام حەکیم و تاقمەکەی هەر وازیان نەهێناو بەردەوام ئەسپەکانیان تاو دەدا و شەریان پیٚ دەفرۆشتن و طلحە و عائشەیش دەستیان نەدەچوو شەڕکردن مەگەر زۆر ناچاربوون و بەرگریان لە گیانی خۆیان کرد[3]،

---

[1] مصنف عبدالرزاق (٥/٤٥٦).

[2] تاريخ الطبري (٥/٤٩٤).

[3] هەمان سەرچاوە (٥/٤٩٥).

و حەکیم ی ـ نەگبەت ـ هەر ورزنگی دەدا لە ئەسپەکەی و بەرەو پێش هێرشی دەبرد بۆیان، و لەگەڵ ئەوەشدا عائشە لەجێ ی خۆی وەستابوو ـ خەڵکی هاندەدا لەسەر شەڕنەکردن و دەست نەکردنەوە، و داوای لە هاوڕێکانی دەکرد کە دوور کەونەوە لێیان و مەچنە ڕێگەیان و ئا بەم شێوەیە مانەوە تا شەو داهات و لەیەك دووركەوتنەوە.

لەبەیانی ڕۆژی داهاتوودا دیسان حەکیم هاتەوە و ڕمێکی درێژی بەدەستەوە بوو بەدەم خۆیەوە قسەی بە عائشە دەووت و بەرەو عائشە دەڕۆیشت و هەرکەسێ، هەر ژنێك یان پیاوێك پێ ی بگوتایە قسە بە عائشە مەڵێ، هەڵدەگەڕایەوە بۆی و دەیکوشت[1].

ئیتر لەوێدا خۆیان بۆ پێنەگیرا و ووتیان بە حەکیم: ئەرێ تۆ چیت؟ دوێنێ ئەوەی كردت و كەس وەڵامی نەدایتەوە، كەچی ئەمڕۆ خراپتر لەدوێنێ هاتوویتەوە، دەی وەڵڵاهی وازت لێ ناهێنین تا خوا تۆڵەت لێ دەکاتەوە. بەڵام گەڕانەوەو وازیان لێ هێناو دەستیان نەچووە خوێنی.

بۆیە حەکیم لەگەڵ تاقمەگێرەشێوێنەکەیدا کە کاتی خۆی دایان بەسەر مەدینە داو عثمانیان بەناڕەوا و زوڵم شەهید کردبوو کۆبوونەوە و بۆیان دەرکەوت کە کەشف بوون و مانەوەیان لەبەسرەدا نەماوە و بۆی دەرچوون لە ڕێگا گەیشتن بە هاوڕێکانی عائشە، و شەڕێکی قورسیان پێکەوە کرد[2].

بانگەواز کەری عائشەیش بانگی لێوە دەکردن و دەیوت: دەست هەڵگرن لە جەنگ بەڵام ئەو گێرە شێوێنانە گوێیان نەدەدا بە بانگەکە و بەردەوام بوون.

تا بهاتایە زیاتر شەڕەکەیان گەرم دەکرد و عائشە ( رضی الله عنها) هاواری کرد: شەڕنەکەن لەگەڵ کەس تا شەڕتان لەگەڵدا نەکرێت...

بەڵام طلحە و زوبێر(ﷺ) بۆیان دەرکەوت کەئەم تاقمە بێ شەرمانە شمشێر لەبرای موسڵمانی خۆیان هەڵدەکێشن و خۆیان لەکەس لانادەن و خوێنی موسڵمان ڕشتن لەلایان حورمەتی نییە!.. و ئامانجیان هەڵگیرساندنی جەنگەو بەس.

---

[1] تاريخ الطبري (٥/ ٤٩٩).

[2] تاريخ الطبري (٥/ ٤٩٩).

بۆیە هەردووکیان بەیەکدەنگ ووتیان: سوپاس بۆ ئەو خوایەی گەیاندنی بە بکوژانی عثمان کە خەڵکی بەسرەن و خوایە گیان دنکیان بە زیندوویی دەرنەکەوێت، و ئەمڕۆ تۆڵەی عثمانیان لێ بکەیتەوە، دەستیان کرد بەجەنگ لەگەڵیان و ئەو نەگبەتانە زۆر بەڕاستیان بوو، پیس دەجەنگان!

بۆیە بانگیان کردن : ئەوەی لە بکوژانی عثمان نی یە باواز لە شەڕ بهێنی لەگەڵمان، چونکە ئێمە تەنها مەبەستمان ئەو کەسانەن خوێنی عثمانیان بەناهەق ڕشت، و ئێمە لەگەڵ کەستان دەست پێشخەری ناکەین، بەڵام ئەوان زۆر ترسناکانە دەجەنگان لەگەڵیان![1]

ولەئاکامدا هەموویان کوژران و تەنها یەك کەسیان نەبێت کە هەڵهات و بەو شێوەیە بەسرە پاك کرایەوە لە گێرە شێوێنان و بکوژانی خەلیفەی سێ یەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) .

طلحە و زوبێر پێکەوە هاواریان کرد: کێ ی ترتان لە هۆزەکان لەناو ئەو تاقمەدا بوون کە هاتن و دایان بەسەر شارەکەی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) با بێتە پێشەوە[2]. ئەو گێرە شێوێن و نەفامانەی ـ وەك عائشە وەسفیان دەکات ـ کە هیچ چارێکیان نەمابوو جگە لە تۆڵە لێ سەندنەوەیان بەیانیەکی زوو ویستیان بدەن بەسەر چادرەکەی عائشەدا و تیرۆری بکەن بەڵام خوای گەورە بەکۆمەڵی لە موسڵمانان کە بەچوار دەوریدا پارێزگاریان دەکرد پاراستی، هەرچەندە ئەوەندە نزیك بوونەوە تا گەیشتنە بەردەرگای چادرەکەی و شەڕ دەستی پێکرد و هەموویان کوژران و تاقیان دەرنەچوون.[3]

لەئاکامدا سوپاکەی عائشە (رضی الله عنها) خواردن و پێداویستی یان لێبڕا ـ چونکە لەمیوانداری کەسدا نەبوون ـ بۆیە هێرشیان برد بۆ خانووی حوکم کەوالی لەوێ (ولاتەوانی) دەکرد و دەستیان گرت بەسەریدا و والیان گرت و دەستیشیان گرت بەسەر (بیت المال)داو بەتەواوەتی بەسرەیان بۆیەکلایی بویەوە و نزیکەی (٧٠) کەس لەوانەیان کوشت کە دابویان بەسەر مەدینەدا و بەناڕەوا عثمانیان شەهید کرد بوو بەسەرۆکایەتی سەرگەورەکەیان (حەکیم ی کوڕی جەبەلە) و

---

[1] هەمان سەرچاوە (٥/١٠٥).

[2] هەمان سەرچاوە (٥/ ١٠٥).

[3] انساب الاشراف ( ٩٣/٢) بسند حسن .

هەموو خەڵکی بەیعەتیان دا بەزوبێر کە ببێتە ئەمیر و سەرکردەی سوپاو کاری جەنگ بەرێت بەڕێوە[1].

**٨ـ نامەی عائشە (رضی الله عنها) بۆ هەموو هەرێمەکان:**

بۆئەوەی کەس بەهەڵە تێنەگات و ڕای گشتی دروست نەبێت دژی عائشە و ئەم جەنگەی بەسرە، دەستی کرد بەناردنی نامە بۆ شام و کوفە و یەمامە و مەدینەو تیایدا مەسەلەکەی بۆ ڕۆشن دەکردنەوە کە بەچ شێوەیەك شەڕ دروست بووە و کە خواستی ئەوانی لەسەر نەبووە: بۆ شامی یەکانی نووسی " ئێمە لەماڵ دەرچووین تا شەڕ بنەبڕبکەین قورئانەکەی خوای ـ عزو جل ـ ئیش پێ بکەین ئەو فەرمانەی خوا ـ قصاص ـ جێ بەجێ بکرێت بەسەر هەمواندا گەورە و بچوك و زۆرکەم و نزم و بەرز، تا خوای گەورە خۆی حوکمیان بکات،

بۆ ئەو مەسەلە لە هەموو پیاو چاك و نەجیب زادەکانی بەسرە بەیعتیان پێ داین، کەچی پیاو خراپ و تاوانبارەکانی ناو شار بەرامبەرمان وەستان و شمشێریان لێ هەڵکێشاین ، و دەیان ووت: دایکی باوەڕداران دەگرین و دەیکەینە بارمتە ئەگەر هەوڵ بدات هەق ڕۆشن ببێتەوە! ، و خوای گەورەیش بواری پێدان و موسڵمانان جار لەدوای جار هەر خۆیان لێ لادەدان ، تا هەر کۆڵیان نەدا و هەر بەزۆر هێنایینیانە شەڕ لە ئاکامدا بکوژانی عثمان لە خەڵکی بەسرە هەموویان کوژران جگە لە (حورقوس) نەبێت کە خوای (عزوجل) تۆڵەیش لەو دەکاتەوە[2].

**چوارەم/ ئەمیری باوەڕداران پایتەخت دەگوێزێتەوە بۆ کوفە:**

مەدینەی پڕ نوور جۆرە هەیبەتێکی خۆی هەبوو لە دڵی باوەڕداراندا و هەموو هەرێمەکانی تر، بە چاوێکی قورسەوە دەیانڕوانی یە ئەو شارە لەبەرئەوەی کە دروست بوونی یەکەمین دەوڵەتی ئیسلامی و بوونی قەبری پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوێ .

---

[1] تاريخ الطبري (٥/ ٥٠١).

[2] الثقات لابن حبان (٢/ ٢٨٣).

بەلاَم ئەميری باوەڕداران (ﷺ) گوێ بە ئامۆژگاری و لالاَنـەوەی هـاوەلاَنی پێغەمبـەری خـوا نەدا کە ڕجايان لێکرد مەدينە بەجێ نەهێڵێت و نەڕوات بۆ جێ يەکی تر، بەلاَم ئـەو بەپێويـستی زانی لەبەر هەندێ هۆکار لەوانە، تا لەنزيکەوە موعاويـە(ﷺ) ببينێـت و بزانێـت چـی دەوێـت و دەيەوێت چی بکات[١].

هەروەك وای دەبينی کەچی تر مەدينەی پايتەخت ئـەو جـۆرە توانايـەی نـەماوە کەهەنـدێ لـە هەرێمەکان هەيانە لەوانە بوونی سامانێکی زۆر و جەنگاوەرێکی بێ شومار لە عێراقدا هـەبوون[٢]. هەرچەندە عەلی کوڕی ئەبو طاليب(ﷺ) کەسێکی کەللە ڕەق نەبوو کە قسە هەر قسەی خۆی بێت و گوێ بـۆ ئامۆژگـاری دۆسـتانەی کـەس نـەبێت، ئـەوە ((ئـەبوو ئـەيوبی ئەنـصاری يـە(ﷺ)) ئامۆژگاری عەلی دەکات کە لەمەدينە دەرنەچێت و چونکە مەدينە کۆچگای پێغەمبەری خوايە و قەبرەکەی لەوێ يەو مادەی خاوی ئيسلام عـەلی يـە، و خـۆت لێرەبـە و بـاوالی و بەرپرسـەکانت هەرێمەکان بەرن بەڕێوە، و ئەو کاتە هەر کەسێك دژايەتيت بکات بەو هەرێمانـە جـەنگی لەگـەڵ دەکەيت و ئەگەر ناچاری دەرچونيش بـووت ئـەوا بيـانووت هەيـە و کـەس لێـت دواناکـەوێت، و خەليفەی باوەڕدارانيش (ﷺ) ماوەيەك بە قسەی ئەم هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەری خوای کرد[٣].

بەلاَم دواتر هەندێ ڕووداوی نوێ هاتنە ئاراوە وايان لەعەلی کرد خۆی کۆبکاتەوە و بـەرەو عێراق بکەوێتە ڕێ و بڕياری دا بەرەو کوفە بچێت تا لەشامەوە نزيك بێت و داوای کرد لە خەڵکی مەدينە کە هەموويان لەگەڵی بچن بەلاَم ئەوان خۆيان دواخست و سستيان نواند و ووتيان نـەخێر، وەڵلاهی هێـشتا ڕۆشـن نـی يـە دەبێـت چـی بکـەين و دەبێـت خۆمـان بگـرين چـونکە ئـاژاوە هەربەردەوامە و ماوەتەوە.

زۆری لە هاوەلاَن (ﷺ) چوونە ماڵەکانی خۆيان و دەرگايـان داخـست کـە زۆربـەيان بەشـدارانی جەنگی بەدر بوون لە ماڵ نەهاتنە دەرەوە مەگەر بۆ گۆڕەکەيان[٤].

---

[1] الانصار في العصر الراشدي لا(١٦١).

[2] هەمان سەرچاوە لا ١٦١.

[3] البداية والنهاية لا (١٦٤).

[4] تاريخ الاسلام في عهد الخلفاء الراشدين.

بەڕادەیەك خەمبار بوون کە ئەبو حەمیدی (الساعدی) ئەنصاری کە یەکێکە لە بەشدارانی بەدر لەدوای شەهید کردنی عثمان (ﷺ) ووتی:" پەروەردگارم مەرج بێت پێکەنین لەخۆم حەرام بکەم تا دەگەمەوە لات"[1]،

و ئەو هاوەڵە بەڕێزانە زۆر ئەترسان لەوەی ئەگەر لەگەڵ عەلیدا دەربچن بۆ عێراق مانای وایە بەدەستی خۆیان بەرەو زۆنگاوی (فیتنە) و ئاژاوەکە دەڕۆن و ڕەنجی چەند ساڵە جیهادیان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بەبادا دەچێت و بەجوانی نامێنێتەوە بۆ قیامەتیان[2]. هەندێکی زۆر کەمیان بەشداریان کرد لەسوپاکەی عەلیدا(ﷺ) و تەنانەت شەعبی دەڵێت: تەنها چوار کەس لە هاوەڵانی بەشداری جەنگی جەمەلیان کرد کە ـ عەلی و عمار و طلحە و زوبێر ـ بوون و هەر کەسێ پێنجەم بهێنێ ئەوە مانای وایە من درۆزنم[3].

لەو ژمارە زۆرەی هاوەڵان کە لە (١٠) هەزار کەس زیاتر بوون، چەند کەسێکی کەمیان لەگەڵ عەلیدا بەڕێ کەوتن بۆ عێراق و بەڵکو زۆربەی ئەوکەسانەی بەشداری جەنگی جەمەلیان کرد کوفەیی و بەسرەیی بوون و ئەگەر هاوەڵانی تێدا بوبێت سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ شەهید و بریندار و ووتە و ئامۆژگاریەکانی ناو جەنگیان دەکرد و ڕێنموونی جەنگاوەرانیان دەکرد و وەك عادەتی خۆیان[4].

- عبداللە ی کوڕی سەلام(ﷺ) ئامۆژگاری ئەمیری باوەڕداران دەکات:
- عبداللە ی کوڕی سەلام(ﷺ) یەکێك بوو لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای کرد لە عەلی(ﷺ) کە لەشاری مەدینە دەرنەچێت و نەڕوات بۆ عێراق و پێی ووت: ئەترسم مێشی شمشێر تێت بدات و ئەگەر ئەم مینبەرەی پێغەمبەری خوا بەجێ بهێڵێت جارێکی تر نەگەڕێیتەوە بۆلای.

عەلی (ﷺ) ئەم شتانەی دەزانی بۆیە ووتی : وەڵلاهی پێغەمبەری خوا ئەم شتانەی بۆ باس کردووم، بەڵام ئەوانەی لەگەڵ عەلیدا بوون لە کوفی و بەسریەکان زۆر لە ئیسلام حاڵی نەبوون

---

[1] الانصاری في العصر الراشدی لا ١٦٤.

[2] تاریخ ابن خیاط لا ١٦.

[3] الاصناف في ما وقع من تاریخ العصر الراشدی من الخلاف لا ٣٨٨.

[4] مسند ابی یعلی (٣٨١/١).

و خوێنی موسڵمان لەلایان شتێکی ئاسایی بووە، دیار بوو هـاوەڵانی پێغەمبـەریان لەگەڵدانـەبوو ئەگینا چۆن دەیان ووت بە (ابو الحسن): ڕێگامان بدە با بیکوژین!! ئەمیری باوەڕدارانیش دەیووت: شتی وانەکەن عبدالله ی کوڕی سەلام پیاوێکی زۆر صالح و چاکە.

### * ئامۆژگاری حەسەن(ﷺ) بۆ باوکی:

حەسەن (ﷺ) ڕۆیشت بۆ( الربـذة) کە سوپاکەی باوکی لەوێ بوون و لـەوێ سـەربازگەیان دروست کردبوو، و لەگەڵ نزیکی (٢٠٠) کەس لە موسڵمانان چوون بۆ لایان، و لەوێ حەسەن(ﷺ) چوو بۆ لای باوکی و بەچاوی پڕ بەگریان و فرمێسکەوە پێی ووت: هەرچیم پێ ووتیـت گوێـت بـۆ نەگرتم، سبەینێ لەجێ یەکی وادا بێ کەس کوژدەکرێیت و کەسێ نییە بە چواردەورتدا و بـەرگریت لێ بکات.

عەلی یش(ﷺ) پێی ووت: هێشتا هەر وەك منداڵ دەگریت، تۆ چـیت پـێ ووتـوم و مـن بەقسەم نەکردبیت؟ حەسەن ووتی: پێم وتیت لەو ڕۆژەی عثمانی تێدا کوژرا تۆ لەمەدینە مەبە بـا کاتێ عثمان دەکوژرێت تۆ لەوێ نەبیت و پاش کوشتنیـشی ووتم: بەیعەتـە دوا بخـە تـا نوێنـەری هەرێمەکان دێن و بەیعەتت پێ دەدەن و پاشان ووتم : تـۆ خـۆت مەگلێنـە بـەو کـارەی (طلحـە و زوبیر) دەیکەن و لەماڵ دانیشە و بەرامبەریان مەوەستە، با خراپەکاری و ئاژاوە لە خەڵکی تـرەوە سەرهەڵبدات، و لەهەموو ئەوانەدا گوێت بۆ نەگرتم .

ئەمیری باوەڕدارانیش (ﷺ) لەوەڵامدا ووتی: ئێ ی کـوڕی خـۆم، ئـەوەی کـە دەیڵێـت (خۆزگە لەکاتی شەهید کردنی عثمانـدا تـۆش لەمەدینـە نەمایتایـە)، دەی وەڵڵاهـی ئـەو چـۆن ئابڵوقە درابوو، ئێمەش هەربەو شێوە ئابڵوقەدرابووین، و ئەوەشی دەڵێیت با چـاوەڕوانت بکردایـە تا هەرێمەکان (الامصار) دەهاتن و بەیعەتیان پێ بدایتایە، من ئـەوەم نـەکرد چـونکە ئـەم کـارە لەدەستی مەدینەدا بووە و حەزم نەکردووە لە دەستی ئەوان دەربچێت بۆ ناوچەکانی تر.

بۆ مەسەلەی (طلحە و زوبێر) یش، چۆن شتی وا دەبێت کەمن خەلیفەم و وەللاهی لەو کاتەوەی ئەو دوانە جموجۆڵیان هەیە من نەمتوانیوە ئیشەکانم وەك پێویست ئەنجام بدەم و تەوێت بۆخۆم دانیشم لە ماڵەکەمدا ؟!. دەی وازم لێبهێنە کوڕی خۆم[1] .

عەلی(ﷺ) وا دیار بوو ئەم جارە زۆر سوور بوو لەسەر ڕۆیشتن بۆیە لە ڕەبەزەوە ـ محمدی کوڕی ئەبوبەکرو محمد کوڕی جەعفەری نارد بۆ کوفە تا داوا لە خەڵکەکەی بکات کە شوێن عەلی بکەون و بەشداری ئارام کردنەوە و سەقامگیرکردنەوەی وولاتی ئیسلام بکەون لەگەڵیدا، بەلاّم نەیان توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنن چونکە (ئەبو موسی الاشعری) (ﷺ) والی کوفە بوو ساردی کردنەوە و پێی ڕاگەیاندن کە ئەمە (ئاشوبێکە) و دەبێت موسڵمان خۆی بەدوور بگرێت لە خوێن ڕشتنی موسڵمان و پاشان دوای چەند ڕۆژێك عەلی (ﷺ) بە سوپایەکەوە کە (٩٠٠) جەنگاوەر بوو گەیشتە شاری (ذی قار) و لەوێ وە هەوڵی دا کوفەیی یەکان قەناعەت پێ بکات و لەو کارەشیدا سەرەتا (والی کوفە)(ابو موسی الاشعری(ﷺ)) عەزل کردو (قرضە ی کوڕی کەعب)ی کرد بەوالی و پاشان عماد و حەسەنی کوڕی ناردە ناویان و بەدوایاندا عبداللە ی کوڕی عەباس ی نارد، بەلاّم سوودێکی وای نەبوو.

بەلاّم (قەعقاع) ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە قەناعەت پێ کردنیان ووتی پێیان وولاتی ئیسلام پێویستی بەرێکخستنەوە وچاککردنەوە هەیە و دەبێت ئەمیرەکەی بەتوانا و بەهێز بێت تا ئەو کارە ئەنجام بدات و ئێوەش دەبێت پشتی بگرن چونکە نیازی پاکەو بۆ نەهێشتنی ستەم و چاکسازی هاتووە و دەی ئێوەش خۆتان بنوێنن[2] .

وحەسەنیش(ﷺ) وتارێکی بۆ دان و پێ ی ووتن: ئەی خەڵکینە ، وەرن بەدەم بانگەوازە ئەمیرەکەتانەوە و خۆتان بگەیەننە ڕیزی براکانتان، خۆ خەڵك هەیە ـ ئەو کارە ئەنجام بدات لەگەڵ عەلیدا ـ بەلاّم وەڵلاهی ئاقڵ و ژیرمەندو پیاوچاکی لەگەڵدا بێت باشە چ بۆ دنیاو چ بۆقیامەتیش دەی وەرن بە دەمانەوە و لەم محنەتەدا کە ئێمەش و ئێوەیش تێوە گلاّوین[3] .

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٤٨٢).

[2] تاريخ الطبري (٥/٥١٦).

[3] هەمان سەرچاوە (٥/٥١٦).

و خەڵکی کوفە قەناعەتیان کردو نزیکەی (٦تا٧) هەزار جەنگاوەریان ئامادەکرد بۆ خەلیفەی موسڵمانان و پاشان (٢)هەزاری تریش لە خەڵکی بەسرە لە هۆی عبدالقیس چووە ڕیزیان و پاشان لە هۆزەکانی دەوروبەریشەوە ژمارەیەکی تریان بۆ هات و بەکۆی گشتی سوپاکەی عەلی (ﷺ) گەیشتە نزیکەی (١٢) هەزار کەس[1].

کاتێ سوپاکەی کوفەیی یەکان گەیشتە لای عەلی (ﷺ) لە (ذی قار) پێی ووتن : ئەی خەڵکی کوفە ئێوە هێزی فارسەکانتان شکاند و پاشاکەیتان لەناو برد و کۆمەڵیانتان بڵاوە پێکرد تاوای لێهات هەموو سامانیان بوو بەمیراتی ئێوە، و خەڵکی بەسەر دوژمنانیاندا زاڵ بوون، من ئێوەم بانگ کردووە تا بەرەو براکانمان بڕۆین لەبەسرە ئەگەر بەبێ وەی گەڕانەوە ئەوە ئێمەش هەر ئەوەمان دەوێت، و ئەگەر نەگەڕانەوە ئەوا بەنەرمی چارەسەری کێشەکە دەکەین، نزیکیان نابینەوە مەگەر ئەوان دەستمان لێ بوەشێنن بەستەم، هیچ کارێك وازلێناهێنین ئەگەر بزانین بەرژەوەندی و چاکەی موسڵمانانی تێدایە و خراپە و ئاژاوە هەڵدەگرێت ـ إنشاء الله ـ ولا قوة الا بالله )[2].

* جیاوازی بیروڕا کار لە خۆشەویستی و برایەتی ناکات :

ئەم ووتەیە بەکردەوە لەم شەڕە نەخوازراوەدا بەدی کرا، کە لەگەڵ جیاوازی بۆچوون و بیروڕادا، کەمترین ڕق وکینە نەچووە دڵی هیچ لایەکیان بەرامبەر براکەی، دە سەیری ئەم ڕوداوە بکە لە کوفە ڕویداوە:

بوخاری لە ئەبی وائیلەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (ابو موسى الاشعری ) و (ابو مسعود) و (عقبەی کوڕی عەمری ئەنصاری) (ﷺ) هاتن بۆلای عەماری کوری یاسر(ﷺ) کە نوێنەری عەلی بوو بۆلای کوفەیی یەکان کە دەیویست هانیان بدات لەگەڵ عەلیدا بڕۆن.

ووتیان : لەوەتی موسڵمان بوویت نەماندیوە ئاوا بەو خێرایی یە هەستی بەکارێك کە ئێمە پێمان ناخۆش بێت ئەوەندەی ئەم کارەی ئێستات .

عماریش (ﷺ) ووتی: منیش تا ئێستا کارێکی وام لێنەدیوون ئەوەندەی ئەم سستیەتان بەرامبەر ئەمیری باوەڕداران پێم ناخۆش بێت لەوەتی موسڵمان بوون.

---

[1] مصنف عبدالرزاق(٥/٤٥٦ـ ٤٥٧) بسند صحیح الی الزهد.

[2] تاریخ الطبری (٥/ ٥١٩).

ڕیوایەتەکان دەڵێن ـ ابو مسعودـ دەوڵەمەند بووە بە خزمەتکارەکەی دەڵێت: جوانترین جل و بەرگ بێنن و بیکەنە بەری عمار و ابو موسى الاشعرى با نوێژی جومعە بە جل و بەرگی تۆزاوی و سەفەرەوە نەکەن[1].

نابینی ئەبو مەسعود و عمار ڕای جیاوازیان هەیە و یەکتری بەهەڵە دەزانن کەچی لەولایشەوە دەبینی یەکتریان خۆش دەوێت و حەزناکەن یەکتری بە دیمەنی ناشیرین و جلی کۆنەوە ببینن و ناهێڵی خەڵکی بەسوك سەیری برا موسڵمانەکەیان بکەن.

جا کەسی ئاوا بن بۆیەکتری ئیتر چۆن حەز دەکەن شمشێر لەیەکتر هەڵبڕن و خوێنی یەکتری بڕێژن؟ هەر چەندە هەردوولا لەسەر حەق بوون و لە ئیجتهاد دا جیابوونەتەوە و هەریەکە و بەڵگەی خۆی بە دەستەوە بوو، یارانی عەلی (ﷺ) ئەو ئایەتەیان جێ بەجێ دەکرد کە ئەگەر هەردوولا بوو بەشەڕیان دەبێ موسڵمان لایەنی ستەم لێکراو بگرێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت (( فقاتلوا الذى تبغى حتى الى امر الله )).

لایەنی دووەمیش ئەو فەرموودانەیان جێ بەجێ دەکرد کە موسڵمان دەترسێنن لە فیتنە و ئاژاوەی ناوخۆ و چەکیان بەڕووی براکانیاندا بەرز دەکردەوە ، بەلاّم هەردوولا بەنا بەدڵی و بەجەنگێکی قێزەونی نەخوازراویان دەزانی[2].

* کوژراوی هەردوولا شەهیدن و بەهەشتین :

ئەبو سەلامەی دەلاّنی پرسیاری کرد لە ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) : ئایا ئەو کۆمەڵەی کە داوای خوێنی عثمان دەکەن ئەگەر بەپاکی مەبەستیان ڕەزامەندی خوا بێت لێیان وەردەگیرێت؟ ووتی: بەڵێ .

ووتی: ئەی هۆکاری دواکەوتنی تۆ لەداواکردنی خوێنەکەی عثمان قبوڵ کراوە؟ ووتی: بەڵێ، شتێك نەتوانی پێ ی بکەیت ئەتوانیت چی سوودی موسڵمانانی تێدایە ئەوە بکەیت.

---

[1] البخارى كتاب الفتن.

[2] المدينة النبوية.

پرسیارێکی تری کرد: ئەگەر تووشی جەنگ بووین پێکەوە ـ خوا نەکردە ـ ئاکامی کوژراوی هەردوولامان کوێ یە؟ ووتی: من رجام وایە هەرکەسێك ئەمڕۆ بەدڵێکی پڕ لەباوەڕی خاوێنەوە لە ئێمە یان لە ئەوان بکوژرێت خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە[1].

پێنجەم / هەوڵەکانی صولح و ئاشتبوونەوە:

عەلی(ﷺ) پێش ئەوەی سوپاکەی بەرەو شاری بەسرە بەرێ بخات، ماوەیەك لە (ذی قار) مایەوە، و مەبەستیشی هەر ئەوەبوو کە بەشێوەیەکی ئاشتیانە و دوور لەخوێن ڕشتن و کوشتاری براکوژی ئەم ئەزمەی ئاژاوەیە کۆتایی پێ بهێنرێت، و موسڵمانان لەو شەڕە بپارێزێت کە هیچ سوودی تێدا نیە جگە لە لاواز بوونی موسڵمانان و لەو پێناوەدا هەموو هێز و دەستەڵاتێکی خستەکار.

هەروەها (طلحە و زوبیریش) (ﷺ) بەهەمان شێوە حەزیان دەکرد مەسەلەکە ئاشتیانە ڕێ ڕەوی خۆی بگرێت و ئامانجەکانیان بێتەدی بەبێ ئەوەی خوێنی موسڵمانانی بێ تاوان بڕژێت و بۆئەو مەبەستە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتنە نێوانیان ئەوانەی کە بێ لایەنیان هەڵبژاردبوو واتە (اعتزال) یان کردبوو لەشەڕ لەگەڵ هیچ کام لە دوولایەنی شەڕ.

* (کەعب ی کوڕی سور) یەکێکە لەگەورە پیاوانی تابعین ، و هەموو هەولێکی خۆی خستەکار، لەتوانای خۆی زیاتر وزەی خستەکار، بەجۆرێ ڕۆڵی خۆی بینی کەلەتوانای کەم پیاودا هەیە بەو جۆرە بکات لەپێناو هەڵنەگیرسانی شەڕ لە نێوان ئەو دوو بەرەیە گەورەیەی موسڵمانان ، وبەلاّم ئەوەی لێی دەترسا هاتە دی و لەو پێناوەشدا بوو بە قوربانی و چووبووە نێوان هەردوو سوپاکەوە و بانگی هەردوولای دەکرد کە بۆخاتری خوا شەڕمەکەن و وەرنەوە بۆلای قورئانەکەی پەروەردگار و چەکەکانتان فڕێ بدەن[2].

* قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی: ئەمیری باوەڕداران هەستا بەناردنی قەعقاع بۆلای طلحە و زوبێر بەمەبەستی ڕێککەوتن و صولح و ئاشتەوایی، و پێ ی ووت: ئەو دوو پیاوە ببینەو

[1] البداية والنهاية (٧/ ٢٥٠).

[2] الطبقات لابن سعد (٧/٩٢).

بانگیان بکە بۆ پێکەوە ژیان و ناوکۆمەڵ و مەسەلەی جیاوازی و ناکۆکیان لەلا ترسناك و گەورە بکە.

(قەعقاع) هەستاو چوو بۆبەسرە ، یەکەم جار چوو بۆلای عائشە(رضی الله عنها) و پێ ی ووت: دایە گیان تۆچی هێناویتی بۆ بەسرە؟ عائشەیش ووتی: کوڕی خۆم لەپێناوی چاکسازی و ئاشتەوایی ناو خەڵکی داهاتووم، و قەعقاعیش داوای لێکرد کە با طلحە و زوبێر ئامادەی گفتوگۆی نێوانیان بن و با بێن و گوێیان لێ بێت.

* گفتوگۆی نێوان قەعقاع و طلحە و زوبێر:

کاتێ هاتن قعقاع دەربارەی ئەم هاتنەیان بۆبەسرە پرسیاری لێکردن و ئەوانیش وتیان بۆ چاکسازی و ئاشتەوایی نێوان خەڵکی هاتووین .

قعقاعیش پێ ی ووتن: ئەم ئاشتەوایی و چاکسازیە چۆنە ئێوە باسی دەکەن ؟ وەڵلاهی ئێمەش ئەگەر بەچاکی بزانین لەگەڵتان ڕێك دەکەوین و ئەگەر بەچاکی نەزانین ڕێك ناکەوین، هەردووکیان وتیان: بکوژانی عثمان (ﷺ) دەبێت بکوژرێت و ئەگەر نەکوژرێتەوە واتە وازهێنان لە حوکمەکانی قورئان، لەکار خستنی فەرمانەکانی، و بەڵام ئەگەر بکوژرێتەوە ئەوە زیندوو ڕاگرتنی قورئان و ئەحکامەکانی شەرعە.

قەعقاعیش ووتی: خۆ لەبەسرەدا (٦٠٠) کەس لە بکوژانی عثمان هەبوون، و هەموویانتان کوشت جگە لە یەك کەس کە حەرقوصی کوڕی زوهێری سەعدی یەولە دەستان هەڵهات و خۆی خزاندە ناو هۆزەکەی و (٦٠٠) کەسی هۆزەکەی بەرامبەرتان وەستا و بوویە دوژمنتان و بەیەك دەنگ بەرامبەرتان وەستان، دەی ئەگەر واز لە حەرقوص بهێنن وئەو داواکاریەش کە بانگەشەی بۆ دەکەن وازی لێ بهێنن بۆ عەلی باشتر نی یە؟ چونکە ئەگەر شەڕ لەگەڵ بەنی سەعد دابکەن و ئەوان سەربکەون بەسەرتاندا ئەوە تووشی ئەوە دەبن کە لێ ی دەترسان و بەداواکردنی (حەرقوص) هەردوو هۆزی (ربیعەو مضر) دەکەن بە دوژمنی خۆتان چونکە پشتی ئەوان دەگرن و دژی ئێوە دەوەستن و عەلیش ڕێك و پێك ئەمەی بەسەر هات لەگەڵ بکوژانی عثمان (ﷺ) کەلەناو سوپاکەیدا هەبوون.

*** کەواتە چارەسەر ئەوەیە ئارام گرتن و پاشان تۆڵە سەندن:**

عائشەو ئەوانەی لەوێ بوون، قسەکانی قەعقاع کاری تێ کردن و بەڵگەی قسەکانی قەعقاعیان زۆر پێ قبوڵ بوو، بۆیە خاتوو عائشە پێ ی ووت:

ئەی تۆ ڕات چۆنە ئەی قەعقاع ؟ ئەویش ووتی: ئەمە کارێکە دەرمانەکەی پەلە نەکردن و ئارام گرتنە و پێویستە لەمەسەلەی تۆڵە سەندنەوەدا بۆ عثمان لەسەر خۆو ئارام بین ، و ناکۆکی و جیاوازیەکان نەمان و هەموو ئوممەتی ئیسلام لەسەر خیلافەتی عەلی یەك بگرن و ئەویش خۆی یەکلا دەکاتەوە بۆ تۆڵە لێسەندنەوەیان، ئەگەر ئێوە بەتەواوەتی بەیعەت بە عەلی بدەن و بێنە ژێر ڕکێفی و لەگەڵیدا ڕێك بکەون، ئەمە نیشانەی خێرو مژدەی ڕەحمەتی خوایە و توانایە بەسەر بکوژانی عثماندا...

بەلاّم ئەگەر وانەکەن و هەر لەسەر قسەی خۆتان بن و بەنیازی شەڕو کوشتار بن ئەوە نیشانەی خراپەیەو نەمانی ئەم دەستەلاّتە ئیسلامی یە یەو هەولّی بێوەیی بدەن دەستتان دەکەوێت، دەی کلیلی چاکەبن هەر وەك جاران وابوون، و تووشی بەلاّو نەهامەتیمان مەکەن،و بەرەو ڕووی مەچن،و ئەو کاتە خوایش ئێمەش و ئێوەش لەناو دەبات .

بەخوا من ئەم قسانەتان بۆ دەکەم و بانگتان دەکەم بۆی و لەهەمان کاتیشدا زۆر دەترسم ئەم ئیشە سەرنەگرێت و خوایش بەلگەمان لەسەر بگرێت، ئەم ئوممەتەی کەچەك و تفاقی لە کەمیدایە و ئەم هەموو بەلاّو نەهامەتیانەی تووش بووە، ئەمەی توش بووە زۆر ترسناك و گەورەیە، خۆ ئەمە کوشتنی کەسێك نی یە و شەڕی نێوان دوو هۆز نی یە .

هەموویان قەناعەتیان کرد بەم قسە جوانانەی قەعقاع کە دلێکی پاك و دلسۆز و ڕاستگۆوە دەردەچێت، و ڕازی بوون لەسەر ئاشتەوایی لەگەڵ عەلیدا(ﷺ) و پێیان ووت: زۆر چاکت کرد و زۆر جوانت ووت، بڕۆرەوە ، ئەگەر عەلیش لەسەر هەمان ڕای تۆ بوو ئەم ئیشە چاك دەبێتەوە - انشاء الله - .

قەعقاع گەڕایەوە بۆ (ذی قار) بەسەرکەوتوویی لە کارەکەیدا، و بەدرێژی بۆ عەلی گێڕایەوە چی ڕوویدا بوو لە نێوان ئەو و ئەواندا، و عەلیش زۆر بەوە ڕازی و دلخۆش بوو، خەریك بوو

بەیەکجاری صولح بکەن، ئیتر کێ پێ ی ناخۆشە با هەر پێ ی ناخۆش بێت و کێیش پێ ی خۆشە با هەر پێ ی خۆش بێت[1].

* مژدەی ڕێککەوتن:

کاتێ قەعقاع گەڕایەوە و هەواڵەکەی دابەعەلی، و ئیمام عەلیش(ﷺ) دوو پیاوی نارد بۆ زیاتر متمانە بەو هەواڵە خۆشەی کە قەعقاع لەگەڵ خۆی هێنایەوە لەلایەن سوپاکەی طلحە و زوبێرەوە، دوو پیاوەکە گەڕانەوە بە ئیمامیان ووت: لەسەر هەمان ڕان و فریا بکەوە بڕۆ بۆلایان... و ئەویش ڕۆشت بۆ ئەوێ چووە لایان و هەر هۆزەو لەلای هۆزەکەی خۆیدا بەزی - مضر بۆ مضر و ربیعە بۆ ربیعە و یەمەن بۆ یەمەن.

کەس نارازی نەبوو لە پێکهاتن و صولح، و هەندێك بوون بە میوانی هەندێك و هەندێك دەچوون بۆلای هەندێکی تر، و باس و نیازیان هیچ نەبوو جگە لە باسی صولح و ئاشتەوایی[2].

لە ئاکامدا ئەمیری باوەڕداران بڕیارە ترسناکەکەی کۆتایی داو ووتی: ئەوا من سبەینێ بەرەو بەسرە دەکەومە ڕێ و ها ئەو کەسانە لەگەڵم نەیەن بۆئەوێ کەلە کوشتنی عثماندا دەستیان هەبووە[3].

## شەشەم/ هەڵگیرسانی جەنگ:

لەناو سوپاکەی ئەمیری باوەڕداراندا (ﷺ) کەسانێك هەبوون لە کوشتنی عثماندا دەستیان هەبوو بەلاّم خەڵك پێی نەزانیبوون و نەیدەناسین یان خەڵکی دەیناسین بەلاّم هۆزەکەی لە پشتی بوو کە نەیدەتوانی دەستیان بۆ بەرێت، و هەندێکی تر بەڵگە نەبوو لەسەری کە بەژداری کوشتنەکەی کردووە، و یان هەندێکی تردڵی دووڕووی - نفاق - ی تێدابوو بەلاّم ئاشکرای نەکردبوو[4].

---

[1] البداية والنهاية (٧/ ٧٣٩).

[2] تاريخ الطبري (٥/٥٣٩).

[3] هەمان سەرچاوە (٥/٥٢٥).

[4] هەمان سەرچاوە (٥/ ٥٢٦).

شوێنکەوتوانی (ابن سبئا) هەوڵیان دەدا ئاگری جەنگەکە هەڵبگیرسێنن، تا بەم کارەیان لە کوشتن و تۆڵە سەندنەوە لێیان دەرباز بن[1].

ئیتر پاش ئەوەی خەڵکەکە هەموو بە دڵ ئارامیەوە چوونەوە ناو چادرەکانیان، و عەلی (ﷺ) دەرچوو، هەروەها طلحە و زوبێریش دەرچوو بەرەو سەربازگەکەی خۆیان، و چ عەلی و - طلحە و زوبێر -(ﷺ) جوابیان نارد بۆ فەرماندە و سەرکردەکانی سوپاکانیان جگە لەو کەسانەی کە گەمارۆی ماڵی عثمانیان دابوو کاتی خۆی، و خەڵکی زۆر بەدڵی ئاسودە و خۆشحاڵی یەوە ئەو شەوە خەویان لێ نەدەکەوت و لە خۆشی صوڵح و پێک هاتن لە نێوان ڕیزەکانی شوێن کەوتوانی قورئاندا....

(ئای کە هەستی موسڵمانەتی زۆر ناسکە، زوو هەڵدەوەرێ، ئەگەر نەشارەزایانە دەستی بۆ بەرین، یان وریا نەبین و لەتاریکایی شەودا نەخشەی هەڵکێشانی لەلایەن حەسودان و دڵ گەنیواندا دەدرێت بەڵام خۆزگە گومانی چاکەمان بەرامبەر بە براکانمان ببردایە و بمانزانیایە لە ئاومان هەرگیز بەدەستی یەکتر لیڵ نابێت بەڵکو دەستێکی ڕەشی لە پشتەوەیە و ئێمە زۆر جار هەستی پێ ناکەین)[2].

ئەوەتا لەم شەوەدا کە موسڵمانانی ناو هەردوو سوپا و موسڵمانانی دورە پەرێزیش دڵخۆشن بەم ئاشتەوایی و پێك هاتنە، بەڵام ئەی هەڵگیرسێنەرانی ئاژاوە (فتنە) دەبێ ئەم شەو چەند خەفەتبار بن و چەند دڵتەنگ بن بەو ئاشتی و ئارامی و سەقام گیری ڕیزەکانی موسڵمانان.

بۆیە بکوژانی عثمان لە شوێن کەوتوانی (ابن سبئا) ئەو شەوەیان بە ناڕەحەت ترین و ناخۆشترین ساتەکانی ژیانیان لێ دەڕۆیشت... چونکە لەناو چوونی خۆیانیان تێدا دەبینی یەوە، بۆیە ئەو شەوە خەو نەچووە چاویان و بەدزیەوە کۆبونەوەیەکیان کرد و لەناو خۆیاندا باسیان لەوە دەکرد کە سبەینێ چی بکەین.

یەکێکیان وتی: (طلحە و زوبێر) دوو کەسن باش دەیان ناسین، بەڵام تا ئەمڕۆیش هێشتا نازانین علي بەنیازە چی بکات، چونکە داوای لە خەڵکی کرد هەموویان بکەونە ڕێ لەگەڵیدا جگە

---

[1] تحقيق مواقف الصحابة (٢/ ١٢٠).

[2] ووتەی وەرگێڕ.

لەو کەسانەی بە شێوەیەك لـە شـێوەکان بەشـداری کوشـتنی عثمانیـان کـردووە، ڕای خـەڵکیش وەڵلاهی یەك شتە دەربارەی ئێمە، کە ئەوەش ڕێکەوتنیانە لەگەڵ عەلی لەسەر خوێنی ئێمە[1].

(عبداللە بن سبأ)یش - کە ڕاوێژکاریان بوو- دەسـتی کـرد بـە قـسەکردن و ووتـی: ئـەی خەڵکینە، سەربەرزی ئێوە لەوەدایە، کە خەڵکی بـێن بەیەکـدا دەی وایـان لێ بکـەن، و سـبەینێ ئەگەر خەڵکەکە گەیشتن بەیەك و شەڕو هەرا بنێنەوە و بواریان بۆ مەهێڵنەوە پێکەوە دابنیـشن و ڕێك کەوتن مۆر بکەن.

لەهەر کەسەوە نزیکن هەوڵ بدەن ئاگری شەڕەکەی پێ رابگەیەنن و ئەو کاتە خوا عەلی و طلحە و زوبێر وا خەریك دەکات بەشەڕەوە نەیانپەرژێتە سەر ئاشتی و صولح بـەلاَم مـەهێڵن یـەك کەس هەست بەم جموجۆڵەی ئێوە بکات[2].

هەموویان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە بەنهێنی جەنگەکـە دروسـت بکـەن و لـەتاریکایی کۆتـایی شەودا کە کەس کەس ناناسێتەوە و هەستان یەمەنیان نارده سەرچادری یەمەنیەکان و ڕەبیعـە بـۆ ڕەبیعە و مضر بۆ مضر و شمشێریان لێ هەڵکێشان.

خەڵکی بەسرەیش ئاگریان تێ بەربوو، هەڵچوون و هەر هۆزە پەلاماری ئەو هۆزەی خـۆی دەدا کە شەو هاتبوونە سەریان و طلحە و زوبێر(ﷺ) خێرا ئاگاداری بەرپرسانی لای ڕاسـتی سـوپا کە (عبدالرحمن ی کوڕی حارث) سـەرۆکایەتی دەرکـردو لای چـەپیش کـە (عبـدالرحمن ی کـوڕی عیتاب ی کوڕی اسید) ی کرد کە لەحاڵەتی ئامادەباشیدا بن.

و ئەوانیش پرسیان چی ڕوویداوە؟ ووتیان: ئەم شەو کوفەیی یەکان داویانە بەسەرماندا، و ئەوانیش ووتیان: هەرگیز گومانمان نەبردووە عەلی (ﷺ) شتی وا بکات و نیەتی خۆی بگۆڕێت بـۆ خوێن ڕشتن و بەلاَم خۆ کرا، بۆیە سوپاکەیان گەڕاندە دواوە بۆ نزیکی بەسرە و دەستیشیان کرد بـە قەسف کردنی هێرش بەرەکان و فڕاندنیانەوە بۆ سەربازگەکەی خۆیان[3].

عەلی (ﷺ) و کوفەیی یەکان گوێیان لە دەنگەکە بوو، (عبداللە ی کـوڕی سـەبەئی ) بـۆ سەرگرتنی نەخشە ژاهراوی یەکەی - کە پیاوێکی لـە نزیکـی عـەلی دانـابوو تـا هەاڵکـەی بـە

---

[1] تاریخ الطبری (٥/٥٢٦).

[2] هەمان سەرچاوە (٥/ ٥٢٧).

[3] هەمان سەرچاوە (٥/ ٥٤١).

پێچەوانەوە بۆ باس بکات، کاتێ عەلی (ﷺ) ووتی: ئەمە چی بووە؟ پیاوە - نەگبەتەکەش وەك نەخشەی بۆ کێشرابوو- ووتی: جگە لەوان کێ هەیە لەناخۆفدا بدات بەسەرماندا و بەلاّم باش بوو لێیان هاتینە دەست و ڕایان کردەوە، ئەوە هەموو موسڵمانێك لێ ی دەترسا هاتە دی، و ناچار عەلی (ﷺ) ئاگاداری بەرپرسانی لای ڕاست و لای چەپی سوپای کردەوە کە ئامادەبن، و لەم کاتەدا سەبەئی یەکان بەردەوام ئاگری جەنگەکەیان خۆش دەکرد[1].

لەگەڵ ئەو جەنگە سەرتایی یەی بەو بەیانی زووە ڕووی دا، بەلاّم هەردوولا بەئارام و لەسەرخۆیی یەوە لەوەزعەکەیان ڕوانی بزانن مەسەلەکە چی بووە؟ و عەلی(ﷺ) و سوپاکەی لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن کە دەست پێشخەری نەکەن لەم جەنگە - نەخوازراوەدا - تا ڕاستی ڕوداوەکەیان بۆ روون دەبێتەوە و بەڵگەیان دەکەوێتە مشت،بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا برینداریان نەدەکوشت و شوێن هەڵهاتوو نەدەکەوتن، بەلاّم سەبەئی یەکان بەردەوام ئاگری جەنگەکەیان خۆش دەکرد[2].

لەلایەن سوپاکەی طلحە و زوبێریشەوە - طلحە - بەسەر وەلاّخەکەیەوە بوو چواردەوریان دابوو بەجەنگاوەر و ئەویش هاواری دەکرد: گوێتان لێمە؟ گوێم بۆ دەگرن؟ بەلاّم جەنگاوەرەکانی گوێیان لێ نەبوو هەر دەهاتن و دەچوون بەیەکدا، و ئەویش ووتی: ئۆف - ئۆف لە پەپولەکانی دەوری ئاگر و قەڵەڕەشەکانی دەوری لاك[3]. ئای لە ئاژاوە چی یە سەبەئی یەکان کە دەرگایان داخست لەدواین تروسکایی ئاشتەوایی و پێکهاتن .

و لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە سەبەئی یەکان و هاوکارانیان ئاگری شەڕیان هەڵگیرساند - و گومانی تێدانیە کە هاوەڵان(ﷺ) - مەبەستیان چاکسازی و پێکهاتن و ئاشتەوایی و برایەتی بووە، و ئەمەیە کە شتێکی ڕاست و بەڵگە نەویستە و دڵئارامی تێدایە[4].

واهەندێ دەقی مێژوویی دەکەینە نمونە لەسەر ئەودەستە ئاژاوەگێڕەی کەکەوتە نێوان ئەو دوو سوپا موسڵمانە و توشی شەڕێکی قێزەونی نەخوازراوی کردن لەوانە:

---

[1] هەمان سەرچاوە.
[2] تاريخ خليفة بن خياط لا ١٨٢.
[3] فتح الباري (١٣/٥٦).
[4] شرح العقيدة الطحاوية لا ٥٤٦.

١ـ له کتێبی (أخبار البصرة) ی (عمری کوڕی شیبة) داهاتووه که ئەو کەسانەی کـە بـەبکوژانی عثمان تاوانبارکرابوون لەوه ترسان که هەردوو سوپا پێك بێن و بڕیاری کوشتنی ئەمان بدەن، بۆیه شەڕەکەیان هەڵگیرساند و ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا..

٢ـ (الامام الطحاوی) دەڵێت: ئاژاوەی (جەمەل) لەلایەن خراپەکارانـەوه تەقیـەوه بـەبیٚ ویـست و حەزی عەلی و بەبیٚ ویست و حەزی طلحه[1].

٣ـ قازی (عبدالجبار) ووتەی زاناکان نقلٚ دەکات که عەلی و طلحه و زوبێر و عائشه(ﷺ) لەسـەر صولح و ئاشتەوایی پێك هاتن و شەڕنەکردن و ووردبوونەوه لـە ڕاسـتی مەسـەلەکان، بـەلاٚم لـەناو سەربازگەدا دوژمنانی عثمـان هەبوون که ئەو صولٚحەیان پیٚ ناخۆش بوو، ولەوەش ترسـابوون کـە ئیتر هەردوولا یەك بگرن و بیانپەرژێته سەر ئەمانـەو ئـەو کارەیـان دروسـت کـرد کـە کردیـان و بۆیشیان چووه سەر[2].

٤ـ **(ابوبکر العربی) دەڵێت:** عەلی بەرەو بەسره ڕۆیشت و لەیەك نزیك بوونەوه تا لەیەکتر حالیٚ بن بەلاٚم ئارەزوو پەرستان وازیان نەهێنا و دەست پێشخەریان کرد لـە خـوێن ڕشـتندا و وەزعەکـەیان تێکدا بەسەریەکدا تا مەسەلەکه ڕۆشن نەبێتەوه و بکوژانی عثمان گوم بن، و یەك کەس دەتوانێت سوپایەك تێك بدات، جاوەره هەزار کەس بن)[3].

٥ـ **(ابن حزم) دەڵێت:** وبەلٚگەیش لەسەر ئەوەی کەیـەکیان گرتـوو و شـەڕو پێکـدادانیان نـەکرد، ولەشەوەکەیدا بکوژانی عثمان بۆیان دەرکەوت ئەم صولح و ئاشتەوایی یە زیانی بۆ ئەوان تێدایه، و بەوشەوەدا دایان بەسەر سـەربازگەی طلحـە و زوبێـردا وشمـشێریان لیٚ خـستنه کـار، و ئـەوانیش بەرگریان لەخۆیان کرد و هەموو شەڕانی یەکانیان فڕاندەوه ناو سەربازگەی عەلی و ئەوانیش لەویٚ بەرگریان لەخۆیان کرد و ئا بەم جۆره هەردوولا کردیان بەجەنگ و هەرلایەك وای دەزانی لایەکـەی تر هێرشی بۆکردووه.

---

[1] تثبیت دلائل النبوة/ همدانی ٢٩٩.

[2] العواصم من القواصم لا (١٥٦- ١٥٧).

[3] الفصل في الملك والنحل (٤/ ١٥٧-١٥٨).

فاسق و یاخی یەکان لە بکوژانی عشمان شەڕەکەیان تا بێت گەرم تر دەکرد، وبەلاّم هەردوولا لایەنی طلحە و عەلی ـ تەنها بەرگریان لەخۆیان دەکرد و خاوەنی نیەتێکی پاك و مەبەستێکی خاوێن بوون.

و زوبێر لەداخانداو ئەو دیمەنەی بەدڵ نەبوو کە موسڵمان برای موسڵمانی خۆی بکوژێت، بۆیە مەیدانی جەنگەکەی بەجێ هێشت و (طلحە)یش تیرێکی وێڵ لەدوورەوە هات و دای قاچی و پڕاو پڕ ئەو جێگایەی پێکا کە کاتی خۆی لە جەنگی (ئوحود)دا بریندار بوو بوو وا ئێستا کولایەوە و پشتی هەلکرد لە جەنگەکە و گیانی سپارد(ﷺ).

و زوبێریش پاش ئەوەی لەمەیدانی جەنگەکە پاشەکشەی کردەوە بۆ دووری ڕۆژێك لەبەسرەوە ولەوێ لە(وادی السباع) شەهیدیان کرد[1].

**٥ـ (الذهبی) دەڵێت:** جەنگی جەمەل بێ مێشکەکانی هەردوولا هەڵیان گیرساند[2].

## جەولەی یەکەمی جەنگی نەخوازراوی جەمەل:

سەبەئی یەکان لە زیادبووندابوون لە ریزەکانی هەردوو سوپادا، تا بێت ئاگری شەڕەکەیان خۆشتر دەکرد، و هێرشیان دەبردە سەر لایەنەکەی تر، وهانی هەردوولایان دەدا بۆ پەلاماری لایەنەکەی تر، وبەو جۆرە جەنگەکە زۆر گەرم و ترسناك بوو، ناوی لێنرا جەنگی جەمەل چونکە دایکی باوەڕداران عائشە (رضی الله عنها) لەجەولەی دووەمی شەڕەکەدا لەناو جەرگەی جەنگەکەدا بەسواری حوشترەکەیەوە بوو...

ئەو جەنگەیش لە ڕۆژی هەینی ١٦ی جمادی دووەمی ساڵی ٣٦ی کۆچی ڕوویدا، لەناوچەی (زابوقە)ی نزیك شاری بەسرە، و عەلی زۆر خەفەتباری ئەو ڕوداوە نەخوازراوە بوو بانگی خەلکی دەکرد و دەیووت: وازبهێنن لە جەنگ و کوشتار، بەلاّم کەس گوێ ی بۆنەدەگرت و هەمووی خەریکی شەڕ بوو لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا[3].

---

[1] العبر (٣٧/١).

[2] تاریخ الطبری (٥١٦/٥).

[3] الطبقات (١٠٨/٣) صحیح الاسناد.

ئەم جەنگە بەدوو جەولە ئەنجام درا و جەولەی یەکەم (طلحـە و زوبێر) فەرماندەیی سوپای بەسرەیان دەکرد، لە بەرەبەیانەوە تاکەمێ پێش نیوەڕۆ بـەردەوام بـوو، عـەلی (ﷺ) لەلایەکـەوە هاواری دەکرد بەسەر سوپاکەی خۆیدا و (طلحـە و زوبێر)یش بەهەمان شـێوە بـە جـەنگاوەرەکانی خۆیانیان دەووت: بریندار نەکوژن، ئەوەی هەڵدێ شوێنی مەکەون، و ئەوەی مەیدانی جەنگ بەجێ دێڵی وازی لێ بهێنن.

زوبێر(ﷺ) لەو کاتەدا بە عبداللە ی کوڕی ووت: ئەمڕۆ هەر کەسێك دەکوژرێـت یـان سـتەمکارە یان ستەم لێکراو، ومن وادەزانم بەستەم لێکراوی دەکوژرێم، و گـەورەترین خەفـەتم قەرزەکانمـە) و داوای لێ کرد دوای خۆی بۆی ببژێرێت[1].

تەنانەت شەڕکردنیشیان لەگەڵ یەکتریدا پڕیەتی لەپەند و ئامۆژگاری بۆ موسڵمانانی دوای خۆیان و ئەوە زوبێر(ﷺ) پیاوێك دێت بۆلای و پێشنیاری بۆ دەکات کە ئەگەر پێت خۆش بێت من ئەچمە ناوسوپاکەی عەلی و خۆمی لێ نزیك ئەکەمەوە و ئەو کاتە بە ئاسـانی دەیکـوژم بـۆت، و زوبێر زۆر توڕە بوو لێ ی ،و پێ ی ووت: نـا، موسـڵمان پـەلاماری موسـڵمان نـادات و بـاوەردار بەرگری لێ کراوە لە کوشتنی باوەڕدار[2].

(کەواتە زبێر بۆ کوشتنی برای موسڵمانی خۆی لـەماڵ دەرنەچـووە، چـونکە پـەروەردەی دەستی محمد المصطفى یەو تەنهامەبەستی تۆڵە سەندنەوەیە لەو کەسـانەی کەبـەناڕەوا، بەسـتەم ـ گەورەی باوەڕدارنیان لە پایەتەختی ئیسلامدا و لەناو شارەکەی پێغەمبەری خـودادا و لەماڵەکـەی خۆیدا شەهید کرد و وەك باسکی بانانیش و بەڕۆژی ڕۆشنا و بەبێ ترس گەڕانەوە شارەکانی خۆیان و زوبێر و هاوبیرانی بۆماوەی چوار مانگ خۆیان گرت تـابزانن ئـەمیری بـاوەڕداران عـەلی (ﷺ) تۆڵەیان لێ دەسەنێت بەلاّم هیچ دەنگی نەبوو عەلی (ﷺ) مەشغولی کاری زۆر لەوە گەورەتر بـوو کە یەکخستنەوەی ماڵی دەوڵەتی ئیسلامی بوو کـە هـەموو هـەرێمێك بۆخـۆی ببـووە ولاتێکـی سەربەخۆ و وجودی بۆخەلیفەی موسڵمانان دا نەدەنا)[3].

---

1 مسند احمد (١٩/٢) احمد شاكر دەڵێت: (اسناده صحیح ).

2 البداية والنهاية (٥٢١/٧).

3 ووتەی وەرگێر.

بەلاّم زوبێر کاتێ بینی وەزعەکە لەدەست دەرچووە و شەڕ ڕوویـدا و کوشـتنی موسـڵمان بەدەستی موسڵمانەکەی ئاسایی بوو، ئیتر بینی لەباتی تۆڵە لە بکوژانی عثمان، وا ئەمڕۆ سـەدان و هەزاران موسڵمان دەکوژرێت و وازی لـە جەنگەکـە هێنـاو بـەرەکانی جـەنگی بـەجێ هێـشت، بەتایبەت لەبەرئەوەی کە عەماری کوڕی یاسری بینی(ﷺ) لە ڕیزەکانی سـوپای عەلیـدا جـەنگ دەکات ئیتر پشتی بەتەواوی سارد بوویەوە وزانی لەم کارەیاندا لەسەر هەق نەبوون و ئـەم جەنگـە ناڕەوایە لەگەڵ خەلیفەدا ئـەنجامی دەدەن و فەرموودەکـەی پێغەمبـەری خـودای بیرکەوتـەوە کـە فەرموویەتی " تقتل عمار الفئة الباغية" واتە کۆمەڵێکی یاخی ولەسنور دەرچوو عمار دەکوژن.

و هەروەها (ابن عباس) یش(ﷺ) کاریگەری هەبووە لەسەر زوبێر کەواز لەجەنگ بهێنێ و چونکە خزمایـەتی لەگـەڵ عەلیـدا بیرخـستەوە و پـێ ی ووت: دەی کـوا وەفـات بـۆ (صـفیە ی کـچی عبدالمطلب) کە شەڕ لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو طالیبدا دەکەیت؟..

لەبەرامبەری ئەو تێك شکاندنە هات بەسەر سوپای بەسرەیی یەکاندا کە زوبێـر وازی لـە جەنگەکە هێنا و طلحە بە تیرێکـی ویـڵ شـەهید بـوو، کۆمـەڵێکی زۆر کـوژرا و برینـداریان لێ کەوت، عەلی (ﷺ) هیچ دڵخۆش نەبوو بە سەرکەوتنیشی نەدەزانی، و بەگریانـەوە باوەشـی کـرد بەحەسەنی کوڕیدا و فرمێسك لە چاوەکانی دەهاتە خوارەوە، و حەسـەنیش(ﷺ) دەیـووت: باوکـە گیان ئائەمە بوو من بەرگریم لێ دەکردیت، و باوکیشی ووتی: من چوزانم کار دەگاتە ئەم ڕادەیـە، توخوا ژیان تامی چی یە دوای ئەم ڕووداوە؟ و بەتەمای چ خێرێك بین ئیتر؟.[1]

## جەولەی دووەمی جەنگەکە:

هەواڵی جەنگەکە گەیشتە دایکی باوەڕداران عائشە (رضی اللە عنها) و ئـەویش سـواری حوشترەکەی بوو و بەچواردەوریدا پیاوانی هۆزی ئەزدی یەکان دەوریان دابوو، و (کـەعب ی کـوڕی سور)ی لەگەڵدا بوو، عائشە قورئانێکی دابوو بـە دەسـتی یـەوە تـا بـانگی خـەڵکی بکـات بـۆ وازهێنان لە خوێن ڕشتن.

[1] البداية والنهاية (٧/٥٢١).

و دایکی باوەڕداران خۆی کرد بەناو جەنگەکەدا ـ کەزۆر ـ متمانــەی تــەواوی هــەبوو بــەوەی کەگوێ ی بۆ دەگیرێت و بەقسەی دەکەن لەبەر ئەو شوێنەوارە مەزنەی هەیەتی لەدڵی موسڵمانانداو دەتوانێت ئاگری ئەو ئاژاوە گێڕی یە بکوژێنێتەوە[1].

کەعب قورئانەکەی بەرز کردەوە و چووە پێشی سوپاکەی بەسرە و بانگی سوپاکەی عەلی کردو ووتی: ئەی خەڵکینە، من کەعبی کوڕی سورم و قازی و دادوەری بەسرەم و تکاتان لێ دەکـەم بـۆ خاتری قورئانەکەی پەروەردگار کار بەم قورئانە بکەن و لەسەر صولح و ئاشتی بنیات بنێن.

بەڵام گێرەشێوێنەکان و سەبەئی یەکان ترسی ئەوەیان لێ نیشت کە ئەم هەوڵەی کەعب سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، بۆیە بەیەك جار دایانە بەرتیر و شەهیدیان کرد و بە جۆری کوژرا کە قورئانەکـەی بەدەستی یەوە بوو تا گیانی دەرچوو[2].

وە بەوەشەوە نەوەستان بەڵکو تیربارانی کەژاوەی عائشەیشیان کرد و ئەویش هەر هاواری دەکرد و دەیووت: ئای، کورەکانم، خودا...خودا...خودا و ڕۆژی قیامەت بخەنەوە بیری خۆتان و واز لەشەڕ بێـنن، بـەڵام سـەبەئی یـەکان نـەیان دەهێـشت خەڵکـە پاکەکـە بـچن بـەدەم داواکـەی دایکـی باوەڕدارانەوە تا بێت توند تر لەسوپای بەسرەیی یەکانیان دەدا،

عەلیش(ﷺ) لەدوای جەنگەکەوە هاواری دەکرد بۆ وازهێنان لەشەڕ بـەڵام سـەبەئی یـەکان کەلـە پێشی شەڕەکەوە بوون تا بێت جەنگەکەیان دژوارتر دەکرد و گوێیان بۆ عەلی نەدەگرت.

و کاتێ عائشە (رضی الله عنها) بینی وا کەس گوێ ڕایەڵی ناکات، و هـەروەها کەعبیـشیان بـە قورئانەی باوەشی یەوە کوشت، هاواری کرد: ئەی خەڵکینە نـەفرەت بکـەن لـەبکوژانی عثمـان و شوێن کەوتوانیان، و هەموو سوپاکەی بەسرە دەستیان کرد بە نەعلەت کردن لە بکـوژانی عثمـان، تاوای لێهات عەلی(ﷺ) پرسی: ئەم دەنگ و هاوارە چی یە؟ وتیـان : عائـشەیە لەگـەڵ بەسـرەی یەکاندا نەفرەت لە بکوژانی عثمان دەکات، و ئەویش فەرمووی: ئادەی هەموو لەگەڵمدا بانەفرەت لە بکوژانی عثمان و هەموو سوپاکەی عەلی بەیەك دەنگ هاواریان دەکرد نـەفرەت لـە بکـوژانی عثمان[3].

---

[1] مصنف عبدالرزاق (٥/٤٥٦) مسند صحيح الى الزهرى.

[2] البداية والنهاية (٧/٢٥٣).

[3] البداية والنهاية (٧/ ٢٥٣).

شـەڕەكە گـەرم بـوو شمـشێرەكان شـكان و سـوپاكان تێكـەڵی یـەكتر بـوون، و لـەم كاتـەدا گێرەشێوێنەكان ویستیان خۆیان بگەیننە عائشەو حوشترەكەی سەر ببڕن و خۆیشی بكـوژن، بـەڵام بەسرەیی یەكان بەرگری سەرو ماڵیان لێ كرد و هەركەسێ دەستی بگەیشتایە تەڕەشۆی حوشترەكە خێرا دەیانكوشت.

بەڕاستی هۆزەكانی ناو بەسرە هەر لە ئەزدیەكان و بەنی صنبە و گەنجانی قوڕەیش بەرەنگاریـەكی بێ وێنەیان كرد لە دایكی باوەڕداران و تا دەهات شەڕەكە گەرم تر دەبوو.

محمدی كوڕی طلحە (السجاد) ڕشۆی حوشترەكەی گرت و پێ ی ووت: دایە گیان، چی دەفـەرمویت تا بیكەم؟

عائشەیش پێ ی ووت: وەك كوڕە چاكەكەی ئادەم بكە (هابیل) واتە دەسـت لەشـەڕ هـەڵبگرە، و ئەویش شمشێرەكەی كردەوە كێلان بـەڵام ـ بەداخـەوە ـ بـەبێ شمـشێر لـەدواوە شـەهیدیان كـرد ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ.[1]

ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) هەستی كرد كە ئەم كارە زۆر ترسـناكە و هـەموو هۆزەكـانی بەسرە وازناهێنن و بەسەر و گیان بەرگری لـەدایكی بـاوەڕداران دەكـەن بۆیـە بـەزیرەكی خـۆی و لێهاتوویی سەربازی یە بێ وێنەكەی بۆی دەركەوت مانەوەی ئەو حوشترە لەناو جەرگەی جەنگـەدا هۆی بەردەوامی جەنگەكەیە و لەناو چوونی هەموو خەڵكی بەسرەیی یەكان نەواز لەشەڕ دەهێـنن و نەشكستیش دێت بەسەریاندا مادەم عائشە بە حوشترەكەیەوە لەناو جەرگەی بەرەكانی جەنگـدا بێت.

و هەروەها مانەوەشی مەترسی یەكی گەورەیە لەسەر ژیانی خۆی چونكە كەژاوەی كـون كـون بوو بوو بەهۆی ئەو هەمووە تیر و ڕم و شتانەی تر كە بەری كەوتبوو[2].

بۆیە فەرمانی دەركرد بۆ محمدی كوڕی ئەبوبەكر(ﷺ) كەبرای عائشە بوو لەگەڵ چەند كەسێكدا بڕۆن و حوشترەكە دانەوێنن و عائشە دابگرن لەكەژاوەكەی ئـەوانیش وایـان كـرد و حوشـترەكەیان

---

[1] انساب الاشراف ـ بلازی (٤٣/٢) باسناد متصل.

[2] مصنف ابن ابی شیبه (٢٨٦/١٥) بسند جید.

سەربڕی و عائشەشیان هێنایە خزمەت ئەمیری باوەڕداران، و ئەویش فەرمانی دا بردیان بۆ مـاڵی عبدالله ی کوڕی بەدیل.

و هەروا دەرچوو کە ئەمیری باوەڕداران زەینی بۆی ڕۆیشت و بیری لێ کردەوە و هەر ئەوەندەت وانی هەموو سەربازەکانی سـوپای بەسـرە بلاّوەیـان لێ کـرد و هەریەکـە بەلایەکـدا ڕایـان کـردو عەلیش(ﷺ) هاواری دەرکرد: بریندار نەکوژن و شوێن هەڵهاتوو نەکـەون و مـاڵ و سامانیان بـە غەنیمە نەگرن جگە لەوەی لەناو جەنگەکەدایە وەك چەك و تفاق و تەقەمەنی ، جگە لەوە هیـچی تریان بۆ ئێوە ڕەوا نیە، و نەی هێشت کەسیان بچنە ناو ماڵەکانەوە.

نەك هەرئەوەندە بەڵکو بە خەڵکی بەسرەیشی ووت: ئەگەر کەل و پەلێکی خۆتان برابـووە لـەلای سەربازەکانی من دۆزیتانەوە بیبەنەوە، بۆیە پیاوێك هات بۆلای کۆمەڵێ سەربازی سوپاکەی عەلی دەبینی لە مەنجەڵێکی گەورەدا، گۆشت دەکوڵێنن و ئەویش مەنجەڵەکـەی خۆیـانی ناسـی یـەوە و گۆشتەکەی بۆداکردن و مەنجەڵەکەی لەداخاندا بردەوە[1].

* ئایا چەند کەس بەسوپای هەردوولا شەهید بوون لەو جەنگەدا:

ئەم جەنگە نەگریسە نەخوازراوەی کە موسڵمان تیایدا بۆ بەرگری لەگیانی خۆی، جـەنگی لەگەڵ برا موسڵمانەکەیدا دەکرد و یەکتریان دەکوشت، بەلاّم ژمارەی کوژراوانی هەردوولا ڕوون نی یە، هەرچەندە ڕاوی نووسەرەکان هەرکەسەو بەئارەزو و مەزاجی خۆی ڕێژەی بۆ داناون.

بۆ نمونە قەتادە دەڵێت (٢٠)هەزار کەس کوژرا[2]. و یـەعقوبیش دەڵێـت: (٢٣) هـەزار کـەس کوژرا بوون، و ئەم ژمارانە ئەبو (مخنف) ی رافزی وادەزانێت چاکی کردووە کە بڵێت بەس لەسوپای بەسری یەکان (٢٠) هەزار کوژرا، و ئەمانە و چەندان بۆچوونی تر کە هـەموویان لەڕاسـتی یـەوە دوورن و زیادەڕۆییان بەئاشکرا پێوە دیارە، چونکە بە هەردوولاوە ئەوەندە نەدەبوون!.

---

[1] مروج الذهب (٣٦٧/٢).

[2] مصنف ابن ابی شیبه (٥٤٦/٧) و فتح الباری (٦٢/١٣).

ئەم زیادە ڕۆیی یەش کۆمەڵێ هۆکاری هەبوو لەوانە:

* ناحەزانی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) وەك سەبەئی یەکان و شوێنکەوتەکانیان، دەیان ویست بازنەی ناکۆکی یەکەی نێوان هاوەڵان گەورەتر بکەن کە خۆشەویستی و چاوکردن لە پێغەمبەرەکەیان ودوای خۆی کۆی کردبوویەوە کاریان تیَ نەکات.

* شاعیرە ناحاڵی یەکانی هۆزەکانی هەردوولا مەسەلەکەیان گەورە دەکرد و ڕێژەی کوژراوی بەرامبەرەکانیان زۆر دەکرد تا شیعرەکەیان بەهێز بێت و هۆزەکەشیان لێهاتوو سەربەرزبێت ئەوە، جگە لە حیکایەت خوانە خوانەناسەکانیش کە ئەوانیش ڕۆڵیان هەبوو تیایدا لە پێناوی گەرم کردنی شەوچەرەکانیاندا.

بەڵام خۆشبەختانە لە ڕاستیدا ڕێژەی کوژراوی هەردوولا لە جەنگی جەمەلدا زۆر کەم بووە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

* ماوەی جەنگەکە زۆر کورت بوو کە (ابن ابی شیبه) بە (اسناد صحیح)[1] ەوە هێناویەتی کە جەنگەکە دوای نیوەڕۆ بەرپاکرا و پێش خۆر ئاوابوون کەس بەدەوری حوشترەکەدا نەما کە بەرگری لیَ بکەن.

* شێوازی جەنگەکە کە هەموو بەرگری لەخۆی دەکرد و مەبەستی کوشتنی ڕێژەیەکی زۆرتر نەبوو.

* هەموو جەنگاوەرێك هەوڵ داوە تووشی پیاو کوژی و قەتڵ نەبێت لەبەر گەورەیی گوناهەکەی لە شەرعدا .

* ئەگەر قیاسی بکەینە سەر جەنگی یەرموك ـ کە (٣) هەزار کەس کوژران و قادسیە(٨) هەزاری تێدا کوژراوە چونکە جەنگەکە چەند ڕۆژێکی زۆری خایاند و بەڵام (جەمەل) ماوەیەکی زۆر کەم بوو، پاشان جەنگێکی بیروباوەڕی و سەرو ماڵی نەبوو وەك ئەو جەنگانەی سەرەوە.

---

[1] مصنف ابن ابی شیبه (٧/٥٤٦) و فتح الباری (١٣/٦٢).

* (خەلیفەی کوڕی خیاط) ناوی کوژراوانی جەنگی جەمەل دەهێنێت، کە (١٠٠) کەس تێناپەڕێت[1]، باواش دابنێین دوو قاتی ئەو ژمارەیە بوون کە (٢٠٠)کەس دەکات و دکتۆر خالد محمد غیث لە نامەی دکتۆراکەیدا (استشهاد عثمان و وقعة جمل في مرويات سيف بن عمر، في التاريخ الطبري، دراسة نقدية)دا ئەمەی بەڕاست زانیوە و هەڵبژاردووە.

* ئەمیری باوەڕداران عەلی لەدوای جەنگەکە:

جەنگ لەتەواو بوون دابوو، بانگەواز کاری عەلی(ﷺ) هاواری کرد: پەلاماری برینـدار نادرێت، شوێن شکاو و هەڵاتوو مەکەون و خۆتان مەکەن بەماڵاندا، هەر کەسێ چەکەکەی دانا ئەوە بێ وەی دەبێت، و ئەو کەسەی چووە ماڵی خۆی و دەرگای داخست بێ وەی دەبێت، و ماڵ و سامانیان غەنیمە ناکرێت جگە لەوەی لەگەڵ خۆیان هانیویانە بۆجەنگ وەك چەك و پێداویستی جەنگ و هیچی تریان بۆ کەس حەڵاڵ نی یە.

و داوایشی لەخەڵکی بەسرەکرد کە هەرکەسێ هەر شتێکی بردوون لێ ی بسەننەوە[2]، ولەناو سوپاکەی عەلیدا بڵاوبوویەوە گوایە ئەو ئافرەتانەی گیراون عەلی دابەشیان دەکات بەسەر جەنگاوەرەکاندا وەك کەنیزەك، بەڵام عەلی (ﷺ) لەناکاودا فەرمانی دەرکرد و ووتی: بۆ کەس نی یە بەتەمای ئافرەتان بێت و هەر ئافرەتێکیش مێردەکەی شەهید بووە با چوار مانگ و دە ڕۆژی خۆی تەواو بکات، و خەڵکەکەش هاواریان لێ هەستاو بەڵگەیەکی لاوازیان گرت بەدەستیانەوە و ووتیان: خوێنیان حەڵاڵ بێت بۆمان کەچی ژن و ماڵیان حەڵاڵ نی یە بۆمان؟!.

لەوەڵامدا عەلی (ﷺ) پێ ی ووتن: ئەمە ئەخلاقی موسڵمانە لەگەڵ ئەهلی قیبلەدا و پاشان پێی ووتن: دەی باشە وەرن قورعەی بۆ بکەن بزانن عائشە (رضی الله عنها) بەری کێ دەکەوێت چونکە ئەو سەرکردەیانە، و هەموویان بەیەك دەنگ ووتیان : " استغفر الله" و بۆیان دەرکەوت لەسەر هەڵەیەکی گەورەبوون، بەڵام لەباتی ئەوەدا لە (بيت المال) سەری (٥٠٠) درهەمی پێدان[3].

---

[1] تاريخ خليفة لا ٦٨٧-٦٩٠.

[2] خلافة علی بن ابي طالب ـ عبدا لحميد لا ١٨٦.

[3] مصنف ابن ابی شيبة (٥٨٦/١٥) بسند صحيحة ابن حجر (٥٧/١٣).

* عەلی (ﷺ) سەردانی شەهیدەکانیان دەکات و دووعای لێخۆش بوون و بەزەییان بۆ دەکات:

لەپاش تەواو بوونی جەنگەکە عەلی (ﷺ) لەگەڵ کۆمەڵێ لە یارانیدا چوون بۆ شوێنی جەنگەکە و سەردانی کوژراو و بریندارانی کرد و لەوێ لەناو شەهیدەکاندا چاوی کەوت بە محمدی کوڕی طلحە(السجاد) و ووتی: " إنا لله وإنا اليه راجعون" وەڵلاهی ئەمە لاوێکی زۆر صالح و بۆخوا ژیاو بوو، پاشان لەبەردەمی تەرمەکەیدا بەچۆکدا هات و بێ تاقەت و خەفەتبار بوو، و داوای لێ خۆشبوونی کرد بۆ شەهیدەکانیان و باسی چاکە و پیاوەتی ژمارەیەکیان دەکرد[1].

کاتێ گەڕایەوە بۆماڵە دەبینێ خێزانەکەوهەردوو کچەکەی بۆ (عثمان و طلحە و زوبێر) و خزمەکانی تریان لە هۆزی قورەیش دەگریان ، و ئەویش پێ ی ووتن: تکام وایە ئێمە و ئەوان لە بەهەشتدا کۆ بکاتەوە و ئەو ئایەتە بمانگرێتەوە کە دەفەرموێت " و نزعنا ما في قلوبهم من غل، اخوانا على سرر متقابلين" واتە: ڕق و کینەمان لەناو دڵەکانیاندا ڕیشەکەن کردووە و بەرامبەری یەکتری لەبەهەشتدا بە خۆشی و شادی یەوە دانیشتوون، پاشان ووتی: دەی ئەوانە کێن ئەگەر ئێمە نەبین؟ دەی ئەوانە کێن ئەگەر ئێمە نەبین؟...

* بەیعەت دانی خەڵکی بەسرە:

ئەمیری باوەڕداران عەلی(ﷺ) زۆر خەمی ئەوەی بوو کە یەك ڕیزی موسڵمانان بپارێزێت، و ڕێزی دانیشتوانی ناو دەوڵەتی ئیسلام بگرێت، و بەشێوەیەکی جوان هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا بکات، و ئەم هەڵوس و کەوتە جوانەشی وای لە خەڵکی بەسرە کرد کە بەیعەتی خۆیانی پێ بدەن...[2]

ئەمیری باوەڕداران، ئێوارەی ڕۆژی (جەمەل) دیلەکانی بردە شوێنێکی چاك و تایبەتەوە و لەپاشا نوێژی مەغریب داوای کرد موسای کوڕی طلحە ی کوڕی عبیداللە ی بۆ بهێنن و هێنایان و ئەویش لەبەری هەستاو بەخێرهاتنی جوانی کرد و لەتەنیشت خۆیەوە دای نیشاند، و هەواڵی خۆی و براکانی تری لێ دەپرسی و پاشان پێ ی ووت: ئێمە ئەم زەویەمان لەئێوە نەسەندوە و هەرچەندە

---

[1] هەمان سەرچاوە (١٥/ ٢٦١) . المستدرك (٣/ ١٠٣-١٠٤، ٣٧٥) اسناده حسن لغيره.

[2] الطبقات (٣/٢٢٤) بسند حسن.

دەشمانەوێت بیگرین بەڵام گرتمان لەترسی ئەوەی خەڵکی بەتاڵان نەیبەن و هەمووی پێدایەوە و پێی ووت: برازای خۆم هەر پێویستی یەکت بوو سەرمان لێ بدە تا بۆت جێ بەجێ بکەین، و هەربەو شێوەیەشی کرد لەگەڵ عمرانی برایشی داو ئەوانیش هەردووکیان بەیعەتیان پێدا، وسەرجەم دیلەکانی تریش کە ئەو هەڵوێستە جوانەیان لە عەلی بینی هەموو بەیعەتیان خۆیانیان پێدا و ئەویش بەیعەتی لێ وەردەگرتن، هەموویان هۆز بەهۆز دەهاتن بەیعەتیان پێشکەش دەکرد[1].

و پاشان هەواڵی مەروانی کوڕی حەکەمی پرسی و ووتی: کوانێ لەکوێ یەمن خۆشەویستی یەکی تایبەتی و خزمایەتیم هەیە لەگەڵیدا و هەروەها گەورەیەکە لەناو گەنجەکانی قوڕەیش دا، و مەروانیش (حسن و حسین و ابن عباس)ی ڕاسپارد کە قسە لەگەڵ عەلیدا بکەن بۆی و کاتێ پێیان ووت: ووتی: ئەو سەربەستە و بۆکوێ دەڕوات بابڕوات و مەروانیش بەرامبەر ئەم چاکەیەی عەلی (ﷺ) نەڕۆیشت هەتا بەیعەتی خۆی پێ نەدا[2].

پاشان مەڕوان - پێش ئەوەی بڕوات - دەربارەی عەلی (ﷺ) بە حەسەنی کوڕی ووت: تا ئێستا نەم دیوە باشترین کەسی سەرکەوتووی وەك باوکت، چونکە کاتێ لەشەڕی جەمەلدا شکاین و ڕامان کرد، هاواری کرد، بریندارەیان مەکوژن، شوێن هەڵهاتوویان نەکەون[3].

پاش ئەوەی خەڵکی بەسرە بەژن و پیاوەوە بەیعەتیان دابە ئەمیری باوەڕداران ، (عبداللە ی کوڕی عباس) ی ئامۆزای کرد بەوالیان و (زیادی کوڕی ابیە)یشی کردە بەرپرسی خەراج و دارایی ویستی ماوەیەکی زۆر لەناویاندا بمێنێتەوە بەلاّم هەرکەزانی مالیك (الاشتر) لەو زویر بوو کەنەیکرد بەوالی بەسرە و بەخۆی و هۆزەکەیەوە بەسرەیان بەجێ هێشت و عەلیش(ﷺ) لەترسی ئەوەی نەوەك فیتنە و ئاژاوەیەك هەڵگیرسێنێت زووکەوتە ڕێ و خۆی پێ گەیاند و لەوێ پێ ی ووت: ئەم دەرچوونە چی بوو بەبێ پرسی کەس؟ ئەویش ووتی: نەمزانیووە تۆ ڕازی نیت[4].

---

[1] سنن سید بن منصور (٢/٣٣٧) بسند حسن.

[2] کتاب اهل النبی - للماوردی لا ١١٧، وفتح الباری(١٣/٦٢).

[3] فتح الباری (١٣/٥٧).

[4] ڕۆژی پێنج شەممە گەیشتنە یەك و ڕۆژی هەینی جەنگەکە هەڵگیرسا.

* شەڕی جەمەل کەی بووە؟

ڕای زۆر هەیە لەسەر ڕۆژەکەی بەڵام هەموو لەسەر ئەوەن کە ڕۆژی پێنج شەممەی ساڵی ٣٦ی کۆچی بوو، بەڵام لەمانگەکەدا جیاوازیان هەیە و ڕای بەهێزیش ئەوەیە کە خەلیفەی کوڕی خیاط لە ڕێگەی قەتادەوە هێناویەتی و لەم بارەیەشەوە ڕاست ترین (اسناد)ە.[١]

* ئافرەتان سەربەست بوون لە دەربڕیندا:

ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) چوو بۆ سەردانی ئەو ماڵەی کە عائشەی لێ دانرابوو، و داوای ڕوخسەتی کرد و ئەویش پێشوازی لێکرد و لەوێ کۆمەڵێك ژنی لێ بوو بۆ شەهیدەکانیان دەگریان کە عبدالله و عثمانی کوڕی خەلەفیان تێدابوو، کە عبدالله لەگەڵ عائشەدا بوو شەهید کراو عثمانیش لەگەڵ علي دا بوو شەهید کرا و خێزانەکەی عبدالله کە ناوی (صفیه) بوو ڕووی کردە ئەمیری باوەڕداران و پێ ی ووت:
خوای گەورە منداڵەکانت هەتیو بکات وا منداڵەکانی منت هەتیو کرد!، و عەلیش هیچ وەڵامی نەدایەوە و تێك نەچوو، و هەڵیش نەچوو، و لەکاتی هەڵسانیدا دووبارە قسەکەی پێ ووتەوە و ئەو هەرسەری داخستبوو بێ دەنگ بوو.
بۆیە پیاوێك لەگەڵ عەلیدا بوو ووتی: ئەی ئەمیری باوەرداران بۆ ئەم ئافرەتە بێ دەنگ ناکەیت؟ گوێت لێ نی یە چی دەڵێت؟ و ئەویش لەوەڵامدا ووتی: بێ قەزا بیت ئێمە فەرمانمان پێدراوە دەست بەرزنەکەینەوە لە ژنانی بێ باوەڕو بت پەرست، ئەی چجای ئافرەتانی موسڵمان ؟!.[٢]

* هەڵوێستی عەلی(ﷺ) دەربارەی قسەی سووك ووتن بە عائشە( رضی الله عنها):

پیاوێك ووتی: ئەی ئەمیری باوەرداران دوو کەس لەبەردەرگان و قسە بە عائشە دەڵێن، و عەلیش(ﷺ) فەرمانی دا بە (قەعقاع) کەیەکی (١٠٠) جەڵدەیان لێ بدات و جلەکانیشیان لەبەر دابکەنێت، و قەعقاعیش فەرمانەکەی جێ بەجێ کرد.

---

[1] البداية والنهاية (٧/٣٥٧).

[2] سيراعلام النبلاء (١/ ١٧٩).

* عماری کوڕی یاسر (ﷺ) بەرگری لە دایکی باوەڕداران دەکات:

محمدی کوڕی عەریب دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك لەپاڵ عەلیدا بەخراپە باسی عائشەی دەکرد و عەماری کوڕی یاسریش هاتە ژوورەوە و ووتی پیٚ ی: ئەم پیاوە کێ یە وا بێ ئەدەبی دەنوێنی بەرامبەر خێزانی پێغەمبەرمان (ﷺ) ؟ وکابراکەیش... تەریق بوویەوە و بەشەرمەزاری یەوە بێ دەنگ بوو[1].

* ئایا دایکی باوەڕداران خوێنی موسڵمانانی حەلاڵ کردووە؟

پێشتر باسمان کرد کە بۆچ مەبەستێکی گەورە و گران لەماڵ دەرچوو، نەك بۆ شەڕو کوشتار، ئەوە زوهەری یە لە عائشەوە دەگێڕێتەوە کە دوای جەنگی جەمەل ووتویەتی: من بەم دەرچوونەم ویستم بچمە نێوان خەڵکی و نەهێڵم زوڵم لەیەکتری بکەن، و حسابی ئەوەم نەکردبوو کە موسڵمانان پێکەوە شەڕ دەکەن، ئەگەر دەمزانی شتی وا ڕوودەدات هەرگیز ئەو هەڵوێستەم وەرنەدەگرت[2].

و ئەمەش ڕاست ترین شتە لەم بابەدا هاتبێت و ئیتر عائشەی خێزانی (خیر البشر) چۆن خوێنی خوشك وبرا موسڵمانەکانی حەلاڵ دەکات و ئەوەی لەو بارەیەوە بەناڕەو دەمی کوتاوە لەدوو کەس بەدەرنی یە، یان ڕافزیەو ویستوویەتی مێژووی جوانی ئیسلام لەکەدار بکات و جەنگی نێوان (عەلی و عائشە) بەشەڕی ناوخۆ ناوزەند بکات!.

یان قەڵەم بەدەستە نەخوێندەوارەکانی هاوچەرخی کەلە سەرچاوە باوەڕ پێنەکراوەکانەوە شت وەردەگرن و وەك تووتی دەیلێنەوە وەك سەرچاوەکانی : (الامامە والسیاسە - الاغانی - مروج الذهب ـ تاریخ الیعقوبی ) و بەڵکو (تاریخ التمد الاسلامی ) جورجی زێدان.

---

[1] المغازی للزهری لا ١٥٤.

[2] دراسة و تحلیل للعهد النبوی الاصیل محمد جمیل.

* ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) بەڕێزەوە عائشە بەرەو مەککە بەرێ دەخاتەوە:

عەلی کوڕی ئەبو طالیب(ﷺ) هەستا بەرێ کردنی دایکی باوەڕداران عائشە (رضی الله عنها) خواردن و پارەو هەموو پێداویستی یەکی ڕێگای بۆ ئامادەکرد و ئەوانەشی کە مابوون و کاتی خۆی لەگەڵیدا هاتبوون، مەگەر کەسێکیان خۆی پێ ی خۆش بێت لەبەسرە بمێنێتەوە و (٤٠) ژنی خەڵکی بەسرەی خستە تەکی و بە محمدی ووت: تۆ لەگەڵیدا بڕۆ تادەگەیەنیتە شوێنی خۆی.

کاتێ ڕۆژی بەرێ کەوتنی قافڵەکەی عائشە هات (رضی الله عنها) و عەلی هات بۆلای و تالەگەڵ خەڵکەکەدا خوا حافیزی لێ بکات، وبەعەلی ووت: کوڕی خۆم هەندێکمان گلەیمان لە هەندێکی ترمان هەیە، و هەندی دەڵێین تۆ لەوکارەدا کەمتەر خەمیت نواند و ئێوەش دەڵێن: ئێمە بەزیادەوە مەسەلەکەمان جولاندوە، ولەمەولا لەسەر ئەو مەسەلەیە کەس دەست درێژی نەکاتە سەر کەس، کەس کەس زویر نەکات.

وەڵلاهی پێشتر و لەکۆنیشدا لەنێوان من و عەلیدا هیچ دوژمانیەتی یەك نەبووە و نێوانمان خزمایەتی زیاتر نەبێت هیچی تر نەبووە، و ئەو لەگەڵ ڕەخنەی زۆرم دا لێ ی لەلای من لە پیاوچاکانە....

عەلیش(ﷺ) ووتی: ئەی خەڵکینە، وەڵلاهی ڕاستەکات ، وباش دەڵێت، نێوان من و ئەو جگە لەخزمایەتی و موسڵمانەتی هیچی تر نەبووە و وەئەویش خێزانی پێغەمبەرەکەتانە لەدونیا و لە قیامەتدا.

لە ڕۆژی شەممەی مانگی ڕەجەبی ساڵی ٣٦ی کۆچیدا بە جوانترین هەڵس و کەوت و کردار عائشەی ڕەوانە کرد و چونکە کاتی خۆی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی دابوو پێ ی کە تۆو عائشە ناکۆکیەك دەکەوێتە نێوانتان و ئەگەر ڕوویدا بە شێوازو هەڵس و کەوتی جوان لەگەڵی بجولێرەوە وبە ڕێزەوە بیگێڕەوە بۆ شوێنی خۆی، وەك پێغەمبەر(ﷺ) بە عەلی دەفەرموویت " إنە سیکون بینك وبین عائشة أمر" قال" انا یا رسول الله؟ قال : نعم :فقال انا ؟ قال: نعم، فقلت فأنا اشقاهم یا رسول الله ، قال : لا، ولكن إذا كان ذلك فارددها الی مأمنها"[1].

---

[1] مسند احمد (٣٩٣/٦) اسنادە حسن.

* هەموویان لەو کارەیان پەشیمان بوون:

(ابن تیمیه) دەڵێت:....... و هەروەها هەموو ئەوانەی پێشین، پەشیمان بوونەوە لەو جەنگەی کە کردیان، و هیچ لایەکیان مەبەستیان شەڕو پێکدادان نەبوو، بەڵام بەبێ حەزو ویستی خۆیان جەنگ دروست بوو[1].

و ئەمیری باوەڕداران عەلی(ﷺ) لەدوای ڕووداوی جەمەل دەیووت: خۆزگە (٢٠) ساڵ لەمەوبەر بمردمایە، و عائشەیش (رضی الله عنها) هەر جارێ بگەیشتایە ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت ((وقرن فی بیوتکن)) واتە: لەماڵەکانی خۆتاندا ئۆقرە بگرن ومەچنە دەرەوە، ئیتر ئەوەندە دەگریا تا سەرپۆشەکەی خۆی تەڕ دەکرد[2].

## ئەوسێ کەسەی سەرۆکایەتی بەسرەیی یەکانیان دەکرد لە جەمەلدا:

### ١- دایکی باوەڕداران عائشە(رضی الله عنها):

عائشە کچی ئەبوبەکری صدیق و دایکیشی أم رمان الکنانیە بە چوارساڵ دوای هاتنی ئیسلام لەدایك بووە و پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەتەمەنی لە تەمەنی (٩) ساڵیدا خواستی.

* عائشە ئەو تاکە ئافرەتەیە لە خوای گەورە لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە پاکی و ڕەوشت بەرزی ئاشکرا کرد بە ئایەتی قورئانی پیرۆز، و تاکە ژنی پێغەمبەرە(ﷺ) کە بەکچی خواستوویەتی، و خۆشەویست ترین هاوسەری پێغەمبەری خوا بووە لە دڵی پێغەمبەردا و لەناو هەموو خێزانەکانی تریدا،

بوخاری لە (عەمری کوڕی عاص)ەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ سوپاکەی (ذات السلاسل)دا ناردمی و منیش چووم بۆلای و لێم پرسی: چ کەسێکت لە هەموو کەس خۆشتر دەوێت؟ فەرمووی "عائشە" وتم ئەی لە پیاوان؟ فەرمووی" ابوها" واتە باوکی[3].

---

[1] المنتقی من مناهج الاعتدال فی نقض کلام اهل الرفض و الاعتزال ـ محی الدین الخطیب لا ٢٢٢.

[2] سیراعلام النبلاء (٢/ ١٧٧).

[3] البخاری ـ فضائل الصحابة٣٦٨٧.

"حافظ الذهبی" دەڵێت: ئەم فەرموودەیە صحیحە و شتێکی وایە لای هەموان هاتووە ئیتر با "رافزە" لەداخا بتەقن.

* عائشە (رضی الله عنها) تاکە ئافرەتێکە کە جوبرەئیل بە پێغەمبەردا سەلامی بۆناردووە و بخاری بە ئیسنادی عائشە خۆیەوە دەگێڕێتەوە کە ووتویەتی: پێغەمبەری خوا ڕۆژێك ووتی: " یا عائشة هذا جبریل یقرئك السلام" واتە: ئەمە جوبرەئیلەو سەلامت لێ دەکات" ئەمیش لەوەڵامدا ووتی: " وعلیه السلام ورحمة الله وبرکاته،بەڕاستی ئەوەی تۆ دەیبینی من نایبینم[1].

* عائشە (رضی الله عنها) یەکێکە لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە بەهەشتدا، حاکم لە عائشەوە گێڕاویەتەوە کە دەڵێت: بە پێغەمبەری خوام ووت: کێ خێزانتە لە بەهەشتدا؟ فەرمووی:" اما إنك منهن" واتە: تۆ یەکێکیت لەوان.

* ئەمە و سەرەڕای ئەوەی کەبەڕاستی زانا بوو لە تەفسیر و ئەحکامی شەرعدا و زۆرێ لەفەرموودەکانی پێغەمبەری خوای گێڕاوەتەوە بۆمان، و یەکێکە لەو سێ ئافرەتەی کە باشترین ئافرەتی ئوممەتی ئیسلامن کە خدیجە و عائشەو فاطمە یە (رضي الله عنهن).

## ٢ـ زوبێری کوڕی عەوام (رضي الله عنه) :

زوبێری کوڕی عەوام ی کوڕی خویلد و کوڕی پوری پێغەمبەری خوایە(ﷺ) کە دایکی صفیەی کچی عبدالمطلب ە و یەکێکە لەو دە کەسەی مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە و یەکێك بووە لە ئەندامانی شورا لەسەردەمی هەر چوار خەلیفەکەدا، لەتەمەنی (١٦)ساڵیدا موسڵمان بووە و لەهیچ جەنگێکی ئیسلام و کافران دوانەکەوتووە[2].

---

[1] سیر السلف (١/٢٢٦).

[2] الطبرانی في الکبیر(١/ ١٢٢).

* ولەدوای موسڵمان بوونی دووچاری سزای سەخت بووە لەلایەن مامی یەوە و دەیخستە ناو حەسیرێك و لەژێرەوە دوکەڵی دەدا و پیٚ ی دەووت: بگەڕێرەوەبۆناو کوفر و ئەویش دەیـووت: هەرگیز ناگەڕێمەوە ناوکوفر[1].

* یەکەم کەس بوو لـەپێناوی خـوادا شمـشێری هەڵبکێـشێت لەسـەردەمی مـەککی دا، سەعیدی کوڕی موسەیب (ﷺ) دەڵێت جارێکیان کەوتـە بـەر گـوێ ی زبـێری کـوڕی عـەوام کـە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کوژراوە، و ئەویش شمشێری هەڵکێشاو بەرەو دەرەوە ڕای کـرد... و لـەڕێگا لەگەڵ پێغەمبەردا ڕووبەڕووبوونەوە و پیٚ ی فەرموو (( ما شأنك يا زبـير؟ واتـە : چـی ڕوویـداوە زوبێر؟ ووتی: بیستم وتیان تۆ کوژراویت، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی " فمـا كنـت صـانعاً؟ دەی چیت دەکرد؟ زوبێریش ووتی: وەڵلاهی پیشانی قورەیشم دەدا چی دەکەم، پێغەمبـەریش دوعـای خێری بۆ کرد،و سەعید دەڵێت: ڕجام وایە ئەم دوعایەی پێغەمبەر لەلای خوا نەفەوتێت[2].

* یەکێکە لەو هاوەڵانەی کە کۆچی کرد بۆحەبەشە، ولەوێ ڕێزێکی زۆریان لیٚ گیرا بەڵام پاش ماوەیەك نەجاشی توشی شەڕێك هات لەگەڵ دوژمنەکانیدا و خۆی و سـوپاکەی چـوونە ئـەو بەری نیل بۆ شەڕی سەروماڵی.

تاماوەیەك هیچ هەواڵێك نەبوو، هـاوەڵان زۆر نیگـەرانی نەجاشـی بـوون و لەناوخۆیانـدا ووتیـان یەکێکمان بڕوات هەواڵێکمان بۆ بزانێت و زوبێری بەغیرەت کە هێشتا منداڵیش بـوو ووتـی: مـن دەڕۆم و گۆزەیەکی بەست بەسنگیەوە و دای لە ڕوباری نیل و ڕۆیشتە ئـەو بـەرەوە و پـاش چـەند ڕۆژێك زوبێر هاتەوە و ووتی: مژدە بێت نەجاشی سەرکەوت بەسەر دوژمنانیدا..[3]

* حەواری و خۆشەویستی تایبەت ی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بـوو، لە جـەنگی خەنـدەق دا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی : کیٚ هەواڵێکی (بني قريظـة) مان بۆ دێنێتەوە؟ زوبێرووتی: مـن، بەسواری ئەسپێکەوە ڕۆیشت هەواڵی بۆهێنایەوە، بۆجاری دووەم فەرمووی کیٚ هەواڵمان بۆ دێنیٚ؟ زوبێر ووتی: من و بۆهێنایەوە و بۆجاری سیٚ یەمیش بەهەمان شـێوە تـا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)

---

[1] فضائل الصحابة (٢/٩١٤).
[2] السيرة النبوية لابن هشام (٢٧٩/١)
[3] مسلم ٢٤١٤.

فەرمووی " لكل نبي حواريَ ، وحواريَ زبير" واتـە: هـەموو پێغەمبـەرێك حـەواری و دۆسـتی نزیکیان هەبووە، ودۆست و حەواری منیش زوبێرە[1].

* زۆر حەزی کردووە کردەوە چاکەکانی شاراوە بێت وکەس پیٚ ی نـەزانێت و خالـصا بـۆ خوای عزوجل بێت، هانی موسڵمانانیش دەدات تا کردەوەجوانەکانیان بەدزیەوە بێت و کەس پیٚ ی نەزانێت و لەوبارەیەوە دەڵێت (( ایكم إستطاع ان یکون له خبیئه من عمل صالح فلیعمل))[2].

* زوبێر ترسنۆکانە کوشتوویانە:

کاتیٚ لەناو جەنگی جەمەلدا بوو بینی موسڵمان خوێنی موسـڵمان دەرِژێـت بـەبیٚ تـاوان بۆیە - اسغفر الله - ی کرد وپاش ئەوەی کەس بەقسەی نەدەکرد وازیان لە شەرِەکە نەدەهێنا ناچار خۆی بە ولاٚخەکەی گۆرِەپانی جەنگەکەی بەجیٚ هێشت و لـەرِێگا عـەمری کـورِی جـەرموزی پـیٚ گەیشت و عەمر پیٚ ی ووت: تۆزێك ئیشم پێت هەیـە، زوبێـر ووتـی: دەی وەرە نزیـك ببـەرەوە ، خزمەتکارەکەی زوبێر بە زوبێری ووت: ئاگاداربە چەکی پیٚ یە. زوبێری بـەغیرەت ووتـی: دەی بـا چەکی پیٚ بێت، و پیاوەکەش هاتە پێشەوە و قسەی لەگەڵ زوبێردا کرد تاکاتی نوێژ، زوبێر پـیٚ ی ووت: با نوێژەکانمان بکەین، ووتی : زۆرچاکە با بیکەین، زوبێر لە پێـشەوە بـەر نوێـژی دەکـرد و جەرموز لەدواوە دایە بەر خەنجەر و شەهیدی کرد.

هەندێکی تریش دەڵێن: جەرموز هاتبوو بۆ دۆڵی (وادی السباع) و لەویٚ دەبینیٚ زوبێر لە بنی درەختێکدا خەوتووە و بەخەنجەر دای دەگرێتەوە و شەهیدی دەکات.

و کاتیٚ عەلی(ﷺ) هەواڵەکەی بیست فەرمووی " مژدە بدەن بەبکوژی کورِی صفیە کە دەخرێتـە ناو ئاگری جەهەنەم"[3].

## ٣ـ طلحە ی کورِی عبیداللە (ﷺ):

ناوی ئەبو محمد (طلحـە) ی کـورِی (عبیـداللە) و لـە (مـرة ی کـورِی کـەعب)دا لەگـەڵ پێغەمبەردا یەك دەگرێتەوە، دایکیشی ناوی (صعبة ی کـچی حضرمی یەمـەنی)یـە و خوشـکی

---

[1] الزهر ابن مبارك، ص٣٩٢.
[2] الطبقات (١٠٥/٣) اسناده حسن.
[3] الاصابة (٢٢/٢).

(علاء الحضرمی)یە[1]. و هاوەڵێکی دڵسۆزی پێغەمبەری خوا بووە و شەڕەف مەند بووە بە کۆچ کردن بۆ مەدینەی پڕ لەنوور و یەکێکە لەو دەکەسانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ژیانـدا مـژدەی بەهەشتی پێداون و یەکێکە لەو هەشت کەسەی کە تەنها ئەوان موسڵمان بوو بوون لە مەککـەدا و یەکێکە لەو (٥) کەسەی لەسەر دەستی ئەبوبەکری صدیق موسڵمان بوون و یەکێکە لە ئەندامانی شورا.

* موسڵمان بوونی:

طلحە (ﷺ) دەڵێت: لەبازاڕی (بـصری) بـووم، ڕاهیبێـك لەشـوێنی بەندایـەتی خۆیـەوە دەیووت: پرسیارم بۆ بکەن لە حاجیانی ئەم ساڵ یا خەڵکی شاری مەککە یان لەگەڵدایە؟ (طلحـە) ووتی: بەڵێ، منم، ووتی: ئایا هێشتا احمد پەیدانەبووە لەناوتاندا؟ ووتم: ئەحمەد کـێ یـە؟ ووتـی: کوڕی (عبدالله)ی کوڕی ( عبدالطلب) ئەم مانگە ئەو مانگەیە کە تیاتیدا دەردەکەوێت و ئـەویش کۆتا پێغەمبەرە لەکەعبەدا دەردەکەوێت و کۆچ دەکات بـۆ شـاری خورمـا، دەخیلـت بم باکـەس پێشت نەکەوێت بۆلای.

(طلحە) دەڵێت: قسەکانی کاریان تێ کردم و خێرا بەرەو مەککە هاتمەوە ووتم: شتی تـازە ڕوو داوە؟ ووتیان : بەڵێ : (محمد الامین) دەڵێ بووم بە پێغەمبەر و ابن ابی قحافەیش باوەڕی پـێ کردووە ، طلحە دەڵێت: خۆم گەیاندە ئەبوبەکرو پێم ووت: تـۆ شـوێنی کـەوتویت؟ ووتـی: بـەڵێ، بابرۆین ببۆلای و شوێنی بکەوە، چونکە خەڵکی بۆ ڕێگای ڕاست و خێر و چاکە بانگ دەکـات، و (طلحە)یش ئەبوبەکری ئاگادارکر لە ووتەکانی (ڕاهیبە)کـە، و ئـەبو بـەکر (ﷺ) طلحـەی لەگـەڵ خۆی برد بۆلای پێغەمبەری خوا و لەوێ موسـڵمان بـوو، و ئـەویش هەواڵەکـەی ڕاهیبەکـەی بـۆ گێڕایەوە و پێغەمبەریش (ﷺ) زۆر دڵخۆش بوو. پاشتر نوفلّ ی کوڕی خویلـد ـ کـە پێیـان دەوت شێری قوڕەیش ـ هەردووکیانی بەیەك پەت بەشتەوەو بەیەکەوە و هۆزەکەشیان (بنو تمیم) هیـچیان نەووت، بۆیە دواتر بە طلحە و أبو بکر دەڵێن ـ دوانەکە ـ[2].

[1] البداية والنهاية (٢٥٨/٧).
[2] الحاكم في المستدرك (٣٦٩/٣).

و لەڕێگای شام و لە بازرگانی گەڕایەوە لەنێوان مەکەو مەدینەدا گەیشت بە پێغەمبەری خواو ئەبو بەکر - کۆچیان دەکرد بۆ مەدینەو جل و بەرگ و خواردنی پێدان و گەڕایەوە مەککەو پاش تەواوکردنی ئیش و کارەکانی لە مەککە، خانەوادەی ئەبو بەکری لەگەڵ خۆی برد و کۆچیان کرد بۆ مەدینە.

* بەشداری جەنگی بەدری نەکردووە چونکە پێش جەنگەکە - پێغەمبەری خوا (ﷺ) طلحە و سەعیدی کوڕی زەیدی نارد بۆ زانینی ڕێڕەوی قافڵە بازرگانی یەکەی قورەیش و ئەوانیش چوونە کەناری دەریاو لەوێ مانەوە هەر زانیان ڕێڕەوی گۆڕی خێرا چوونەوە بۆ مەدینە تا هەواڵەکە بەرنەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا بەشی خۆیانی لە غەنیمە دیاری کرد وەك جەنگاوەرێك[1].

* لە جەنگی ئوحود دا - ڕۆڵێکی پاڵەوانانەی بینی، و ئەبو داود (الطیالیسی) لە عائشەوە دەگێڕێتەوە کە ووتوویەتی ئەگەر باسی جەنگی ئوحود لەلای ئەبو بەکردا بکرایە دەیووت: ئەو ڕۆژە هەمووی ڕۆژی طلحە بوو[2].

* و لەو جەنگەدا (٣٦ - تا - ٣٩) جار بریندار بوو، دوو پەنجەیشی شەلەل لێیداو وەستان[3]،

* هەر لەدنیا پێغەمبەرمان (ﷺ) مژدەی شەهیدی پێداوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی طلحە دەفەرموێت: ((من أحب أن ینظر الی شهید یمشي علی وجه الأرض فلینظر الی طلحه بن عبیدالله))

* هاوەڵانی پێغەمبەری زۆر خۆش ویستووە و ڕازی نەبووە کەس باسیان بکات بەجۆرێك، جارێکیان پیاوێك دێت بۆلای طلحە و پێ ی دەڵێت: ئەم پیاوەیە مانی یە - أبو هریرە - لەئێوە زاناترە لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ)؟ چونکە هەندێ فەرموودەمان بۆ باس دەکات کە ئێوە بۆتان باس نەکردووین، طلحە یش زۆر بەهێمنانە ووتی: ((ئەو شتانێکی زۆری لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بیستووە کە ئێمە نەمان بیستووە، چونکە ئێمە ماڵ و حاڵمان هەبوو دەچووینەوە بۆ ماڵی خۆمان و تەنها بەیانیان و ئێواران دەگەیشتینە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵام - ئەو پیاوە - ماڵ و حاڵی نەبوو، هەژار بوو، هەمیشە لەبەر دەرگای پێغەمبەردا

---

[1] فتح الباري (٣٦١/٧).

[2] البخاري (٣٦١/٧).

[3] رواه الترمذي والحاكم وصححه الألباني في صحیح الجامع (٥٩٦٢).

دادەنیشت تا زیاتر بگاتە خزمەتی و گومانی تێدانی یە کە لە ئێمە زیـاتر فـەرموودەی لـە زاری پێغەمبەرەوە بیستووە، ئایا کەسێك هەیە کە خێرو چاکەی تێدابێت و قسە هەڵبەستێت بـەدەمی پێغەمبەری خواوە کە نەیفەرمووبێت))[1]

* پیاوێکی زۆر بەخشندە بوو و لەرێ ی خوادا بەلێشاو مـاڵی بەخـشیوەو هـەرگیز ڕازی نەبووە پارە لەماڵێدا بخەوێت و خێری دابەشی کردووە بەسەر هاوەڵە هەژارەکاندا، حەسـەنی بەسـری (ﷺ) دەڵێت: طلحه (ﷺ) زەویەکی هەموو فرۆسشت بـە (٧٠٠) هـەزارو ئـەو شـەوە خـەوی لێ نەکەوت تا بەیانی لەترسی ئەو پارەیە، و هەرکە ڕۆژ بوویەوە دابەشی کرد[2].

* شەهیدبوونی (طلحه) (ﷺ) لە جەنگی (جەمەل) دا بوو، کاتێ شـەڕەکە دەسـتی پـێ کردبوو عەلی و طلحـە بەرامبـەری یـەکتری وەسـتان و عـەلی (ﷺ) ئامۆژگـاری کـردو ئـەویش گەڕایەوە ڕیزەکانی دواوەو بەڵام تیرێکی وێڵ هات و دای لە ڕانی طلحـە و دەڵـێن لـە ڕانـی یـەوە چەقی بووە ورگی ئەسپەکەیشی و پێکەوە نووسان و طلحه هاواری کرد: بەندەکانی خوا فریام کەون و خزمەتکارەکەی چووە سەر ئەسپەکەی و لە دوایەوە سوار بوو تا نەکەوێت و بردیـە نـاو بەسـرەو کردی بەماڵێکدا و لەو ماڵەدا گیانی پاکی سپارد،

هەندێکیش دەڵێن کاتێ تیرەکە لێ ی دا هەر لە گۆڕەپانی جەنگەکانی تردا گیانی سـپارد و عەلی (ﷺ) گەڕا بەناو شەهیدەکانداو لە ناویاندا ـ طلحـه ـ ی بینی بوویەوەو خـۆڵی لـە دەم و چاوی سڕیوە و پاشان ووتوویەتی: ئەی باوکی محمد، زۆر نیگەرانم و پێم ناخۆشـە ئـاوا بـەکوژراوی لـەم دۆڵـەدا دەتبیـنم، و پاشـان ووتـی: هـەموو خەفـەت و سـکاڵای نـاخم دەبەمـە لای خـوای پەروەردگار.و پاشان ووتی: خۆزگە بیست ساڵ پێش ئێستا بمردبایە[3].

---

[1] سير أعلام النبلاء (٧/١) إسناده حسن.

[2] هەمان سەرچاوە (٣٢/١).

[3] تأريخ الإسلام ـ عهد الخلفاء الراشدين (٥٢٨)

### * خوای (عز وجل) جەستەی طلحە بە پارێزراوی دەهێڵێتەوە:

لەپاش شەهیدبوونی لە بەسرە دەنێژرێت و پاش زیاتر لە (٣٠) ساڵ گۆڕەکەی دەگوێزنەوە بۆ شوێنێکی تر، و جەستەکەی ـ سبحان الله ـ وەك خۆی مابوویەوە هیچی لێ تێك نەچووبوو مەگەر چەند تەڵێك لە لایەکی ڕیشی یەوە وەریبوو،

(مثنى) ی کوڕی سەعید دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پیاوێك هات بۆلای عائشەی کچی طلحە و پێ ی ووت: طلحە م لەخەودا بینیوە پێ ی ووتم بڵێ بە عائشەی کچم با گۆڕەکەم بگوێزنەوە بۆ جێگایەکی تر چونکە ئاوو تەڕایی ناڕەحەتیان کردووم و کاتێ گوێزایانەوە دەبینن لاشەی پیرۆزی وەك خۆی ماوەتەوە مەگەر چەند تەڵێك لە ڕیشی وەریبوو، کە سی و شتێك ساڵ لەوەو بەر شەهید کرابوو[1]، دەی خوای گەورە لەویش و لە هەموو هاوەڵانی پێغەمبەرەکەی خۆش ببێت.

### * سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ﷺ) دوعا لە پیاوێك دەکات:

سەعیدی کوڕی موسەییب (ﷺ) دەڵێت: پیاوێك بێ شەرمی دەنواند و قسەی سوکی بە طلحە و زبیر و عثمان و علي (ﷺ) دەووت و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص یش (ﷺ) بەرگری لێ دەکرد و پێ ی دەووت: قسە بە براکانم مەڵێ، ئەو هەر وازی نەدەهێنا،

سەعد هەستا دوو ڕکات نوێژی کردو پاشان دەستی بەرز کردەوە بۆلای پەروەردگار ووتی: ئەی خوای بەدەستەڵات ئەگەر قسەکانی ئەم پیاوەت پێ ناخۆشە دەی ئەمڕۆ شتێکی وای بەسەر بهێنە بۆم تا بیکەیتە بەڵگەو بیکەیتە پەند،

پیاوەکە لەماڵ دەرچوو یەکسەر لەسەر کۆڵانەکەدا هەڵتەقی بەدەزگای کابرایەکدا کە ئاوی پێ دەدا بەخەڵکی و ئەم کەوتە ناو سنگی دەزگاکەو تا فریای کەوتن ئەنجر ئەنجری کردو کوشتی، و خەڵکیش هاتن بۆلای سەعد پێیان دەووت: پیرۆزت بێت ئەی (باوکی ئیسحاق) دوعاکەت گیرا بوو[2].

---

[1] أصحاب الرسول (١/ ٢٧٠).

[2] البداية والنهاية (٧/ ٢٥٩).

## جێباسی دووەم

# جەنگی صفین

## یەکەم: زنجیرە ڕووداوەکانی پێش جەنگەکە:

### ١- کراسە خوێناویەکەی عوسمان:

کاتێ عوسمانی ستەم لێکراو شەهید کرا (ﷺ) ، دایکی باوەڕداران (ام حبیبە)ی کچی (أبو سفیان) کراسە خوێناوییەکەی بە نوعمانی کوڕی بەشیردا ناردی بۆ شام، کە چەند تەلێك لە ڕیشی خوێ تێدا بوو کە لە کاتی کوشتنی وەری بوون، و نوعمان کەوتە ڕێ بە خۆی و کراسەکە و نامەیەکەوە، و لەگەڵ چەند پەنجەیێکی نائلەی خێزانیدا کە ئەو گێرەشێوێنانە بە شمشێر قرتاندبوویان کاتێ خۆی دابوو بە سەریدا و بەرگری لە خەلیفەی هاوسەری کردبوو[1].

موعاویە (ﷺ)کە ئەو کاتە ئەمیری شام بوو، ئەو دیمەنەی زۆر کاری تێ کرد و ئەویش لە ڕۆژی هەینی دا و لە کاتی ووتاردا کراسەکەس بەرزکردەوە و کە لە خوێندا سوور بوو بوو، پیشانی خەلکەکەی دا و کە پەنجەکانی نائیلە بەسترابوو بە سەر قۆلەکانییەوە ..

خەلکی هەر کە ئەوەیان بینی دایانە پرمەی گریان و لەو تاواندا باوەشیان دەکرد بەیەکدا و هانی یەکتریان دەدا تۆلە سەندنەوە لە بکوژانی[2].

شەرحبیلی کندی هات بۆ لای موعایە و پێی ووت: عوسمان خەلیفەمان بووە ئەگەر دەتوانیت تۆلە بسیەنیت ئەوە باشە، ئەگەر ناتوانیت ئەمیریمان مەکە[3].

و کۆمەڵێ لە پیاوانی شامیش سوێندیان خوارد کە لە خێزانەکانیان نزیك نەبنەوە خەویش نەچێتە چاویان تا بکوژانی عوسمان نەکوژنەوە یان گیانیان لەو پێناوەدا دانەنێن[4].

و موعاویەش هەر ئەمەی دەویست، هێنای ئەو کراسە بەوشێوە ترسناکە و کوشتنی خەلیفە و فەرماندەیی و بەرپرسیارێتی وا لە دەست گێرەشێوێنەکاندا، و (البیت المال) تالان کراوە،

---

[1] البدایة و النهایة (٢٥٩/٧) تێبینی: بەدوور دەزانرێت کە پەنجەی خێزانەکەی عوسمان نەنێژرابێت چونکە ئەوە دژی دەقەکانی شەریعەتە ((وەرگێڕ)) .

[2] البدایة والنهایة (٥٣٩/٧) سندها ضعیف .

[3] الانساب (٤١٨/٤) .

[4] تاریخ الطبري ( ٦٠٠/٥) .

و خێزانی خەلیفە پەنجەکانی دەستی قرتاوە، ئەمانە هەست و نەست و مەشاعیری خەلکیان جولاند و کاریکردە سەر دڵەکان و چاوەکانی پڕکرد لە ئاو، ئیتر شتێکی غەریب نیە کە موعاویە و هەموو موسلمانانی شام داوای تۆلە بکەن بۆ عوسمان، و بەیعەت بە علی نەدەن تا ئەو کەسانە بە سزای خۆیان نەگەیەنێت .

و ئایا دەچێتە عەقلی کەسەوە ئەمیری باوەرداران و سەرکردەی وڵاتانی ئیسلام لەلایەن کۆمەڵێ گێرەشێوێن و کینە لە دڵ و پیلان گێڕەوە بکوژرێت و کەچی جیهانی ئیسلام لەو پەر بۆ ئەو پەری مەوج نەدات و داوای تۆلە نەکات لەو کەسانەی بەم تاوانە نا مرۆڤانەیە هەستان؟![1]

## ٢- هۆکارەکانی بیعەت نەدانی موعاویە:

موعاویە (ﷺ) والی شام بوو لە سەردەمی عمر و عوسماندا (ﷺ) و کاتێ عەلی خیلافەتی گرتە دەست ویستی لای ببات و (ابن عمر) بخاتە شوێنی و (ابن عمر)یش داوای لێ بووردنی کرد و ئەویش زۆری لێ نەکرد و لەباتی ئەودا (سهل کوڕی حنیف)ی نارد هەر کە گەیشتە لێوار شام چەکدارەکانی موعاویە بە سەرۆکایەتی (حبیب کوڕی مسلمە المهری) هاتە ڕێگەی و پێ ووت: ئەگەر نێردراوی عوسمانی ئەوە ئەخەینە سەرچاوان و ئەگەر کەسی تر ناردویتی ئەوە لە کۆیوە هاتوویت بگەڕێرەوە بۆ ئەوێ[2] .

دەیان ووت: ئێمە بەیعەت بە کەسێك نادەین کە بکوژانی عوسمان داڵدەداوە و هەتا (عەلی) (ﷺ) هەڵنەستێت بەسەندنەوەی تۆلە لەو کەسانەی عوسمانیان شەهیدکرد هەرگیز بەیعەتی پێنادەین، و دەترسان لە بکوژەکانی عوسمان کە هەموو دەستەڵاتدار و لە ئاستی بەرپرسیارەتیدا بوون و دەیان ووت: بەیعەت لەسەرمان واجب نیە وە ئەگەرلە پێناویشیدا کوژراین ستەم لێکراو دەبین .

---

[1] معاوية بن ابو سفيان-غضبان ص(١٧٨-١٨٣) .

[2] التاريخ الطبري (٥/٤٦٦) .

دەیان ووت: عوسمان بە ستەم کوژراوە و ئەمە ڕای هەموو موسڵمانانە و ئەگەر بیعەت بدەین بە عەلی ئەوە ئێمەش لە خۆمان دەترسین لەمەولا چونکە بکوژانی عەلی زیاتر دەستەلاتمان بە سەردا پەیدا دەکەن و ئا بەو جۆرەی خوێنی عەلی وون دەبێت .

موعاویە وای دەبینی کە تۆلەسەندنەوە لە بکوژانی عوسمان ئەرکی سەرشانی ئەوە بە پلەی یەك چونکە ئەو ئامۆزایەتی و وەلی خوێنەکەیەتی و خوای گەورەش دەفەرموێت (( وَمَنْ قُتِلَ مَظْلُوماً فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَاناً فَلا يُسْرِفْ فِي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنصُوراً )) "الاسراء"٣٣" .

بۆیە موعاویە خەڵکەکەی کۆکردەوە و وتارێکی بۆ دان و باسی کوشتنی عوسمانی بۆ کردن لە سەر دەستی کۆمەڵێ بێ مێشکی دووڕوو کە خۆیان لە ڕشتنی خوێنی حەرام لانەدا، کە لە مانگی حەرامدا و لە شاری حەرامدا، و خەڵکی هاواریان لێ بەرزبوویەوە بۆ تۆلەسەندنەوە، وە ژمارەیەکیان کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا بوون (ﷺ) ئەم بیستایە هەرگیز قسەم نەدەکرد و باسی ئاژاوەی بۆ کردین کە نزیك بۆتەوە و لەو کاتە پیاوێك لەوێوە تێپەری دەم و چاوی هەڵبستبوو، و فەرمووی: ئا ئەو پیاوە لەو کاتەدا لەسەر هیدایەت و ڕینموونییە، و چووم بۆ لای ئەو پیاوە دەبینم عوسمانە، و ڕووم کردە پێغەمبەر و ووتم: ئەمەیە؟ فەرمووی: بەلێ[1] .

ئەمە بوو هۆی سەرەکی بیعەت نەدانی موعاویە و خەڵکی شام بە ئەمیری باوەڕداران عەلی (رضي الله عنه) و ئەوان بۆچونیان وا بوو کە تۆلەسەندنەوەکە پێش بەیعەت دانەکە بێت، وئیتر هەرگیز لە بەۆ ئەوە نەبووە کە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (موعاویەی کوڕی ئەبو سفیان) حەزی لە کورسی حوکم و سەرۆکایەتی شام بووبێت، یان داوای شتێك بکات هەقی ئەو نەبێت چونکە ئەو باش لەوە دڵنیا بوو کە کاری ـ خیلافەت ـ دەبێت لە ئەندامانی شورا دەرنەچێت کە عەلی یەکێك بوو لەوانە، و لەویش بەڕێزتر و باشتر و شایانتر بوو .

و لە شاری مەدینە بە کۆی دەنگ هاوەڵان کردوویانە بە ئەمیری باوەڕداران و بۆ چوونی موعاویە پێچەوانەی ڕاستی بوو .

[1] صحيح سنن إبن ماجة (١/٠٤٢) .

### ٣- موعاویه وەڵامی ئەمیری باوەڕداران دەداتەوە:

عەلی (ﷺ) نامەی زۆری نارد بۆ موعاویه له شام بەڵام ئەو وەڵامی نەدەدایەوە، تا بەردەوام بۆ ماوەی سێ مانگ نامه له دوا نامەی بۆ دەنارد، و پاشان موعاویه نامەیەکی نووسی بۆ عەلی به پیاوێکدا بۆی نارد، و پیاوەکەش هاته خزمەتی عەلی (ﷺ) و لێی پرسی: چیتان دەوێت؟ پیاوەکه ووتی: له لای گەلێکەوە هاتووم بۆ لات که به هیچ ڕازی نابن له تۆله سەندنەوە له بکوژانی عوسمان و هەموویان دەمەغیان کولاوە بۆ تۆلەسەندنەوە .

(٦٠) هەزار کەسم دیوە له ژێر کراسه خوێناویەکەی عوسماندا گریاون و موعاویەش له سەر مینبەر به گریانەوە پیشانی داون له دیمەشق، و عەلیش (ﷺ) ووتی: ئەی پەروەردگارم من دوورم له خوێنی عوسمان، و پیاوەکەش هەستا و گەڕایەوە بەڵام خەواریجەکانی دەوروبەری ویستیان ئەویش بیکوژن بەڵام به هەزار حاڵ ڕزگاری بوو له دەستیان و ڕۆیشتەوە[1] .

### ٤- عەلی به نیازه شام بگرێتەوە و حەسەن ناڕازییە:

پاش ئەوەی عەلی (ﷺ) وەڵامی موعاویەی بیست (ﷺ) ، خەلیفه نیازی کرد جەنگ لەگەڵ خەلکی شامدا بکات، و نامەی نارد بۆ قەیسی کوڕی سەعد که والی میسر بوو، که خەلکی ئاماده بکات بۆ ئەو جەنگە، هەروەها جوابیشی نارد بۆ ئەبو موسا الاشعری له کوفه و بۆ عوسمانی کوڕی حونەیف بۆ هەمان مەبەست .

و خۆشی دەستی کرد به ووتاردان و هەندانی خەلکی بۆ ئەم مەبەسته و خۆی سازدا بۆ هێرش بردن و له شاری مەدینه ڕۆیشته دەرەوە (قثم کوڕی عەباس) له جێگەی خۆی دانا لەوێ، و حەسەنی کوڕی هات بۆ لای و ووتی: واز لەم کاره بیهێنه ئەمه خوێن ڕشتنی موسڵمانانه و کەوتنەوەی دووبەرەکی یه، بەڵام گوێی به ووتەکانی کوڕی ژیری خۆی نەدا زیاتر سوور بوو له سەر جەنگ، و دەستی کرد به ڕێك خستنی سوپا، و لیوای دایه دەستی محمدی کوڕی حنیفه و عبداللەی کوڕی عەباسیش (ﷺ) دەسته ڕاست و عەمری کوڕی ئەبی سەلەمی بەر پرسی لای

[1] البداية والنهاية (٧/٢٤٠) .

چەپ، و بە تەواوی خۆی خستە ڕێ بۆ گرتنەوەی شام، بەڵام هاتنی عائیشە و زوبێر و طلحە بۆ بەسرە و دواتر جەنگی جەمەل- ئەو نیازەی پێ دواخست[1].

٥- ئەمیری باوەڕداران نوێنەری دەنێرێت بۆ لای موعاویە:

لە ڕۆژی دووشەممەی ١٢ی ڕەجەبی ساڵی (٣٦)ی کۆچی، گەیشتە کوفە، و پێیان ووت: فەرموو دابەزە بۆ ناو قەسری سپی، عەلی (ﷺ) ووتی: نەخێر، عمری کوڕی خطاب (ﷺ) پێ ی ناخۆش ناخۆش بووە تێدا بحەوێتەوە، و منیش وەك ئەو پێم ناخۆشە، و بۆیە لە ( جامع الاعظم) دابەزی و دوو ڕکات نوێژی کرد، و پاشان ووتارێکی بۆدان و تیایداهانی دان بۆ خێر و چاکە، و بەرگری لێ دەکردن لە خراپە، و لە ووتارەکەیدا وەسفێکی کوفەی کرد .

وپاشان جوابی نارد بۆ جەریری کوڕی عبدالله کە والی هەمەزان بوو، و بۆ - اشعثی کوڕی قەیس - کە والی ئازربایجان بوو، و پێی ووتن بەیعەتی لە خەلك وەربگرن و ئامادەیان بکەن بۆ مەبەستی کۆنترۆل کردنی شام و ئەوانیش بەو جۆرەی ئەو ووتی هاتنەوە بۆ لای عەلی (ﷺ) .

هەرکە عەلی (ﷺ) نیازی کرد کەسێك بنێرێت بۆ لای موعاویە و بانگی بکات بۆ بەیعەت دان، جەریری کوڕی عبدالله ی بەجەلی ووتی: ئەی ئەمیری موسڵمانان من ئامادەم بڕۆم بۆ لای، چونکە نێوان من و ئەو دۆستایەتی یەك هەیە، و بەیعەتی لێ وەردەگرم بۆت.

(الأشتر) ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران مەینێرەوە، ئەترسم دڵی لەگەڵ ئەودا بێت. و عەلیش ووتی: وازی لێ بێنە، و بەنامەیەکەوە ناردی بۆ لای موعاویە و تیایدا باسی ئەوەی بۆ کردبوو کە موهاجرین و ئەنصار هەموو بەیعەتیان پێداوم و لەجەنگی جەمەلیش دا ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا و بانگت دەکەم بۆ ئەوەی تۆش وەك ئەو خەڵکەی تر وەرە ژێر بەیعەتەوە،.

کاتێ جەریر نامەکەی دایە دەستی موعاویە، ئەویش عەمری کوڕی عاص و سەرانی شامی کۆکردەوە و ڕاوێژی پێکردن، و هەموو ڕازی نەبوون بەیعەت بدرێت مەگەر پاش تۆڵە لە بکوژانی عثمان بکاتەوە یان بیداتە دەستی ئەوان.

---

[1] هەمان سەرچاوە (٧/٢٤٠-٢٤١) .

کاتێ عبدالله گەڕایەوە و هەواڵەکەی بە ئەمیری باوەڕداران دا (الأشتر) ووتی: ئەم ووت ئەو مەنێرە؟ ئەگەر خۆمت بناردایە، ئەمزانی چۆن وەڵامیان دەدەمەوە و دەمیان دادەخەم، جریر ووتی: جا ئەگەر تۆ بچویتایە هەر لەوێ لەتۆڵەی عثمان دەیانکوشتیت داماو، (الأشتر) یش ووتی پێ ی: ئای ئەمیری باوەڕداران بەقسەی منی بکردایە تۆو وێنەی تۆی سجن بکردایە تا کارەکانی ئەنجام دەدا.

و جەریریش بە توڕەیی یەوە هەستاو ڕۆشتەوە بۆ (قەرقیساء) کە خۆی والی ئەوێ بوو ئا بەو جۆرە (الأشتر) هاوەڵێکی دڵسۆزی عەلی دوورخستەوە کە یەکێکە لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خۆی دەڵێت: هەرکاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی بدیایە بەدەمەوە پێدەکەنی دەیفەرموو: ((يطلع عليكم من هذا الباب رجل من خير ذي يمن، على وجهه مصحة مَلَك))[1]

٦- عەلی (رضي الله عنه) بەرەو شام بەڕێ دەکەوێت:

عەلی (رضي الله عنه) تەواو ئامادە باشی کرد بۆ گرتنی شام، سوپایەکی گەورەی خستە ڕێ کە ڕیوایەتەکان هەریەکەو ژمارەیەکیان ووتوە بەڵام زۆربەیان لاوازن و پشتیان پێ نابەسترێت[2]. و ئەوەی کە تەنها ڕیوایەتێکی ڕاست و ئیسناد باش بێت ئەوەیە کە دەڵێت (٥٠) هەزار جەنگاوەر بووە[3].

و ئەمیری باوەڕداران لە (نەخیلە) سەربازگەی خست کە نزیك بوو لە کوفەوە و بەرامبەری شام بوو، و لەوێوە هۆزەکان یەك یەك بەجەنگاوەرەکانیانەوە هاتن بۆ پاڵپشتی، و زیادی کوڕی نضر الحارثی نارد بە (٨) هەزار چەکدارەوە، و پاشان بەرەو مەدائین ـ بەغدادی ئێستا ـ ڕۆیشت و لەوێشەوە (٣) هەزار چەکداری نارد بۆ ناوچەی موصل ..

لەو کاتەدا هەواڵی بۆ هات کە موعاویە بەسوپایەکی گەورەوە هاتووە بۆ (صفین) بۆ بەرەنگاری کردنی سوپاکەی عەلی (رضي الله عنه)، و ئەویش بەسوپاکەیەوە کەوتە ڕێ بەرەو (ڕەقە) کە

---

[1] مسلم، ذ (٢٤٧٥).

[2] (البداية والنهاية) دەڵێت (١٥٠) هەزار/ خليفة بن خياط (٩٠) هەزار/ المعرفة والتاريخ (١٢٠) هەزار کەس بووە.

[3] تاريخ خليفة لا (١٩٣) بسند حسن.

شارێکی سوریایە ئێستا ـ و لەوێشەوە بە بەلەم و کەشتی چووە ئەوبەری فورات و لە (صفین) گیرسایەوە[1].

## ٧- دەرچوونی موعاویە بۆ (صفین):

موعاویە (ﷺ) زۆر بەڕاستی بوو لە تۆڵە سەندن لە بکوژانی عثمان (ﷺ) بۆیە کەمینی دانا بۆ کۆمەڵێ میسری کە بەشداربوون لە کارەساتی شەهید کردنی عثماندا، و لەکاتی گەڕانەوەیاندا گرتنی و هەموویانی کوشت، کە یەکێکیان ئەبو عەمری کوڕی بەدیل (الخزاعی) بوو[2].

و هەروەها توانی ئەو سەرانەی کە دەستیان هەبوو لەو تاوانەدا لە میسری یەکان وەك عبدالرحمن کوڕی عدیسی، کەنانەی کوڕی بشیر و محمدی کوڕی حوزەیفە، بگرێت و بیانکاتە گرتوخانەوە لە فەلەستین ـ لەمانگی ذی الحجة ی ساڵی (٣٦) ی کۆچیدا هەموویانی کوشت[3].

و لەو کاتەدا هەواڵی بۆ هات کە عەلی (ﷺ) خەڵکی عیراق و ناوچەکانی تری خستۆتە ڕێ بۆ گرتنی شام و بۆیە ووتارێکی بۆ خەڵکی شام داو ووتی: وا عەلی هەموو خەڵکی عیراقی لێ هان داوون. (ذو الکلاع الحمیری) ووتی: دەی سا تۆ ئەمرکەو ئێمەش جێ بەجێ ی دەکەین[4].

و خەڵکی شام هەموو هەستان و بەیعەتیان دا بەموعاویە لەسەر سەندنی خوێنی عثمان و جەنگ لەو پێناوەدا، و عەمری کوڕی عاص (ﷺ) دەستی کرد بە ئامادەکردنی سوپا و سازدانی لیواکان، و ژمارەی سوپاکەی ئەوانیش دیسان جیاواز لەناو راویەکان و مێژوو نووسەکاندا لەنێوان (١٢٠ هەزار) و (١٠٠ هەزار) و (٧٠ هەزار) بەڵام هەموویان لاوازن و جێگەی ئارامی دڵ نین، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە ئەوە دەردەکەوێت کە (٦٠ هەزار جەنگاوەر بوون) چونکە ڕاوی یەکەی صفوان کوڕی عەمری سەکسی یە و خەڵکی (حمص) لە شام و خۆی زۆرێ لەو کەسانەی بینیوە کە بەشداری جەنگی صفین یان کردبوو[5].

---

[1] تاریخ الطبري (٦٠٤/٥).

[2] المحن لأبي العرب التميمي، لا ١٢٤.

[3] خلافة علي، عبدالحميد، لا ١٩١.

[4] الاصابة (٤٨٠/١).

[5] خلافة علي بن أبي طالب، لا ١٩٤.

### ٨- جەنگ لەسەر ئــاو:

سوپاكەی عەلی (ﷺ) گەیـشتە (صـفین) كـە سـوپاكەی موعاویـە لـەوێ سـەربازگەیان خستبو، دەبینێ شوێنێكی فراوان نی یە تـا سـوپاكەی تێـدا دابـەزێنێت و ناچـار بـە شـوێنێكی لێژگایی یەوە گیرسایەوە كە هەمووی تەلەزمە بەردی گەورە بوو[1]،

لەم كاتەدا سوپای عیراق ئەبڵەق بوون لەوەی كە سـوپاكەی موعاویـە نـاهێڵێ دەسـتیان بگاتە ئاو، خێرا هاتن بۆ لای ئەمیری باوەڕداران و پێیان ووت چی بكەین؟ تیا دەچین؟!

عەلی (ﷺ) هەستا بەناردنی (أشعث ی كوڕی قـەیس) بـە دوو هـەزار جـەنگاوەرەوە تـا ڕێگە بكەنەوە بۆ گەیـشتن بـەئاو، و ئـەوانیش جەولەیـەكی سـەرەتایی جـەنگیان كـرد و تیایـدا سەركەوتن و ڕێگایان كردەوە[2].

بەڵام ریوایەتێكی تریش هەیە كە پێچەوانەی ئەم ریوایەتەی پێشەوەیە كە دەڵێت: (أشعث ی كوڕی قەیس) دەچێت بۆ لای موعاویەو پێ ی دەڵێت: بۆ خاتری خـوا، موعاویـە ـ ئاگـات لـە ئوممەتی محمد بێت، ئەوا ئەهلی عێراقتان هەمووی كوشت ئەی كێ بێنێ بۆ ماڵ و منداڵـەكانیان؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَـا)) و موعاویـەش ووتی: ئێستا تۆ بۆچی هاتوویت؟ ووتی: وازمان لێ بێنن با دەستمان بگاتـە ئـاوی خواردنـەوە، و ئەویش بە (ابی الاعور) ی ووت: واز لە براكانمان بێنن با ئاو بەكاربێنن[3].

ئیتر لەپاش ئەو ڕووداوە بۆ ماوەی یەك مانگ ڕۆژی كەتیبەیەكی بـچووك لـە هـەردوولا دەردەچوون و جەنگیان دەكرد و پاشان دەگەڕانەوەو جاری واش هەبوو ڕۆژی دوو جـار، و ئەمـەش لەبەرئەوە بوو هیچ لایەكیان پێیان خۆش نەبوو خوێنێكی زۆری موسڵمانانی هـەردوو لا بڕژێـت و بەو هیوایەوە ئەم جەنگە بـچوكانەیان ئـەنجام دەدا بـەڵكو صـوڵح و ئاشـتەوایی جێگـای شمـشێر بگرێتەوە ...

---

[1] هەمان سەرچاوە، لا ١٩٦.

[2] مصحف ابن ابي شيبة (١٥/٢٩٥) بسند حسن.

[3] سير أعلام النبلاء (٢/٤١) و مرويات أبي مخنف، لا ٢٩٦.

٩- وەستانی جەنگ و هەوڵەکان بۆ ئاشتی:

هەر مانگی (محرم) هاتە پێشەوە هەردوو لا پێشنیاری صوڵح و ئاگربەستیان کرد کە ئەم خوێن ڕشتنە بووەستێنێ و ئەم مانگەیان بە هەل زانی بۆ نامە گۆڕینەوە و ناردنی نوێنەر بـۆ لای یەکتری، بەڵام نامەکان شتێکی نوێ ی تێدا نەبوو لە لایەن عەلی یەوە داوای بەیعەت یەکەم جـار پاشان تۆڵە سەندن، و وەڵامی ئەوانیش تۆڵە سەندن یەکەم جار پاشان بەیعەت دان.

و دوو هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەرمان (ﷺ) زۆر هەوڵیان دا ئاشتی بخەنە نێوان هـەردوو لا بەڵام بێ هود بوو هیچ لایەك لە قسەی خۆی دانەدەبـەزی، بۆیـە ناچـار هـەردووکیان وازیـان لـە هەردوو لایەنی شەڕکەر هێناو بەشداری ئەو خوێنە نەبوون کە یەکەمیان (أبو درداء و أبو أمامـة) بوو (رضي الله عنهما).

## دووەم

## دەستپێکردنی جەنگ

وەزعەکە گەڕایەوە بۆ سەردەمی پێش (ذي الحجة) و جەنگ دەستی پێ کردەوە وەك جاران بە مەفرەزە، مەفرەزەو سریە سریە و شمشێربازی تاکە کەسی دەستی پێکردەوە، و ئەمەش لە ترسی ئەوەی جەنگی گەورەو گرانەکە نەکرێت، و لەو ماوەیەدا ئەو جەنگە لاوەکیانە گەیشتە (٧٠)تا (٩٠) جەنگ.

بەڵام دوو سوپای زەبەلاح بەرامبەری یەکتری وەستابن ئاکامیان هەر تێك رژان و شوڕی ماڵ کاولکەر دەبێت، بۆیە عەلی (ﷺ) بە سوپاکەی خۆی ووت: سبەینێ چوارشەممە جەنگی یەکلاکەرەوەیان لەگەڵدا دەکەین، و موعاویەیشی لەو نیازەی ئاگادار کرد[1] و هەمووان خۆیان چەك و تفاقیان بۆ سبەینێ ڕێك دەخست و دڵە ڕاوکەی ئەوەشیان بوو کە بەرامبەرەکەیان براو موسڵمانەکەیانە و بیکوژن هەروەی نەیکوژن هەروەی.

### ١- ڕۆژی یەکەم:

لە ڕۆژی چوارشەممەدا، هەردوو لا خۆیان ئامادە کرد و ڕیزەکانیان ڕێك خست، و سوپاکەی ئەمیری باوەڕداران بەو شێوەیە سوپاکەیان ڕێك خست، عەلی خۆی لەناو جەرگەدا بێت، و عبداللهی کوڕی عباس لەلای چەپ و عماری کوڕی یاسریش سەرکردەی ئەسپ سوارەکان، و محمدی کوڕی حەنەفی یەیش لیوای بەدەستەوەبوو.

و سوپای شامیش خۆی لەسەر گردەکە هەموو جەنگاوەرانی ناوجەرگەی بەدەستەوەبوو، و عەمری کوڕی عاص سەرکردەی ئەسپسوارەکانی شام و (ذي الكلاع الحميري) بەرپرسی لای ڕاست ..

---

[1] البداية والنهاية (٧/٢٧٣).

و بۆجۆرە هەردوو سوپا تێكەڵی یەكتری بوو، دۆڵ و دەشتەكەیان پڕ كرد، و لەوێدا علي (ﷺ) ووتاری دەدا بۆ جەناگاوەران و تیایدا داوای لێ دەكردن خۆگرو بەئارام بن و ذیكرو یادی خوایان لەبیر نەچێت، لەبەیانی زووەوە جەنگ بە ناڕەحەت ترین شێوە دەستی پێكردو بەردەوام هەر گەرم دەبوو مەگەر بۆ كاتی نوێژەكان شەڕەكە بوەستایە، و هەرلایەك- و لە سەربازگەی خۆیدا بەكۆمەڵ نوێژیان دەكرد و جەستەی شەهیدانی هەردوو لا لەیەكی جیادەكردنەوە. یەكێ لە جەنگاوەرەكانی سوپای عەلی (ﷺ) لەعەلی پرسی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئاكامی كوژراوی ئێمەو ئەوان كوێ یە؟ و عەلی (ﷺ) ووتی: هەركەسێ لەئێمەو هەركەسێكیش لەوان نیەتی پاك بێت و لەبەر خاتری ڕەزامەندی خواو ڕۆژی دوایی بجەنگێت و بكوژرێت دەڕواتە بەهەشتەوە[1].

و بەردەوام ئەو ڕۆژە جەنگ بوو بەڵام هیچ لایەك سەركەوتنی بەدەست نەهێنا، و لەئێوارەی ئەو ڕۆژەدا عەلی (ﷺ) سەیرێكی سەربازگەی شامی یەكانی كرد و ووتی: خوایە لە منیش و لەوانیش خۆش ببیت[2].

٢- ڕۆژی دووەم:

بۆ ڕۆژی داهاتوو كە ڕۆژی پێنج شەممە بوو، عەلی (ﷺ) بەپەلە نوێژی بەیانی بە موسڵمانان كرد و دای بەسەر سوپای شامی یەكاندا، و پێش ئەوە هەندێ گۆڕانكاری لە سوپاكەیدا كرد وەك گۆڕینی مەیمەنە كە (أشعث) ی گۆڕی بە عبدالله ی كوڕی بەدیل الخزاعی و ئەویشی خستە لای چەپ. و هەردوو لا بەرەو یەكتری كسان و شەڕێكی گەرم و خوێناوی دەستی پێ كرد و سوپای عێراقی یەكان بەرەوپێش چوونێكی بەرچاویان پێوە دیار بوو، و عبدالله ی كوڕی بەدیل توانی لای چەپی سوپای موعاویە بشكێنێت و بەرەو كەتیبەكەی موعاویە كەوتە ڕێ و جەنگێكی دژوار و بێ وێنەی دەكرد، و لەم سەركەوتنە لاوەكی یەی عێراقی یەكاندا هەموو سوپا تەكانێك ڕۆشتە پێشەوە تا وای لێ هات موعاویە خەریك بوو گۆڕەپان بەجێ بهێڵێت و هەڵبێت، بەڵام خۆی گرت و ڕووی نەهات ئەو كارە نەنگە بكات و بەپێچەوانەوە هانی كەتیبەی (السهباو) ی دا كە

---

[1] سنن سعيد بن منصور (٢/٣٤٤-٣٤٥) بسند ضعيف.

[2] مصنف ابن ابي شيبة (١٥/٢٩٧) بسند ضعيف.

خۆی سەرپەرشتی دەکردن بۆ گیان فیدایی و بە گوڕو تینەوە بەرپەرچی سوپای عەلیان دایەوە و عبداللە ی کوڕی بەدیل شەهید بوو، و یەکسەر (الاشتر) یان خستە جێگەی،

و سوپای شام ئارامیان گرت و خۆیان گرت و پەیمانی مردنیان دا بەیەکتری و سەرلەنوێ هێرشیان بردەوەو کۆمەڵێکیان لێ شەهید بوو لەوانە (عبداللە ی کوڕی خطاب و حەوشەب و ذو الکللاع) (ﷺ) و ئەم جارە سوپای شام هێرشیان هێناو زۆریان هێنا بۆ سوپای ئەمیری باوەڕداران تا وای لێ هات عەلی (ﷺ) دەستی کرد بەگەرم کردنەوە و بەرزکردنەوەی ورەی سوپاکەی و هەموو پەیمانی جەنگ تا مردنیان دا بەیەکتری[1].

و(عماری کوڕی یاسر) (ﷺ) لەتەمەنی (٩٤)ساڵیدا بوو کاتێ بەشداری ئەم جەنگەی کرد، و بەگوڕو تینەوە دەجەنگاو هانی خەڵکەکەی دەدا و ورەی بەرزدەکردنەوە بەڵام سۆزو خۆشەویستی هەر هەبوو بۆ براکانی لەسوپای شام، ئەوەبوو جەنگاوەرێکی تەنیشتی ووتی: خەڵکی شام بێ باوەڕن، و عمار زۆری پێ ناخۆش بوو بەرگری لێ کرد شتی وا بڵێت و پێ ی ووت: بەڵکو لێمان یاخی بوون و ئێمە لەسەر ئەو یاخی بوون و سەرکەشی یەیان (البغی) جەنگیان لەگەڵ دەکەین ئەگینا خوامان یەکەو پێغەمبەرمان یەکەو قیبلەشمان یەکە[2].

ئەو گوڕو تینەی لە عمارێکی پیردا کە لەتەمەنی (٩٤) ساڵیدا بەو گوڕو تینەوە دەجەنگا ئەوە ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە بەرزکردنەوەی ورەو لێبڕانی جەنگاوەرەکاندا و توانیان ڕێ ڕەوی جەنگەکە بە بەرژەوەندی خۆیان بگۆڕن و عماریش زیاتر هانی دەدان و دەیووت: بۆ پێشەوە هشام، بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێردایە،

لە خۆرئاوابوونی ئەو ڕۆژەدا عمار (ﷺ) داوای قاپێ شیری کرد و پاشان ووتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ ی فەرمووم ئەی عمار ئاخر خواردنەوەیەك لەدنیادا بیخۆیتەوە قاپێك شیرە[3]. و دوای ئەو قاپە شیرە، خۆی و هشامی کوڕی عوتبە ی کوڕی أبي وقاص ڕۆشتنە ناو جەنگەکەوە و بەگوڕو تینەوە شەڕیان دەکرد و هەردووکیان شەهیدبوون و نەگەڕانەوە[4](ﷺ).

---

[1] الأصابة (٤٥٤/١).

[2] مصنف ابن ابي شيبة (٢٩٠/١٥) إسناده حسن لغيره.

[3] مصنف ابن ابي شيبة (٣٠٣،٣٠٢/١٥).

[4] تاريخ الطبري (٦٥٣/٥).

**٣- شەوی هەریر:**

شەوی هەینی جەنگەکە تا بێت گەرمتر دەبوو کە ڕۆژانی پێشوو شتی وای بەخۆوە نەدیبوو، و هێرش و پەلاماری عێراقی یەکان زۆر بەهێزتر بوو تا وایان کرد لە شامی یەکان لە شوێنەکانی خۆیان بترازێن، و عەلی (ﷺ) شەڕێکی ئازایانەو نەبەردی کرد و پەیمان مردنی دەبەست[1]. ئیمام شافعی دەڵێت: لە عەلی یەوە دەگێڕنەوە کە شەوی هەریر نوێژی ترسی (صلاة الخوف)ی کردووە لە مەغریبدا[2].

یەکێ لە بەشداربووانی ئەو جەنگە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: سێ شەو و سێ ڕۆژ بەردەوام جەنگمان دەکرد تا ڕمەکانی دەستمان شکا، تیرمان پێ نەما، و ناچاربووین دەستمان کرد بە شمشێربازی و تا نیوەی شەو بەو جۆرە بووین، تا وامان لێ هات باوەشمان کرد بەیەکدا، و کاتێ شمشێرەکانیش کول بوون ـ وەك ئاسن ئەمان کێشا بەیەکتریدا و دواتر هەر دەسکەکەی مابوو بەدەستمانەوە و ئەمان دا لەیەکتری و تەنها گوێمان لە مرەو همەی یەکتری بوو، و پاشان دەستمان کرد بە شەڕە بەرد و پاش ئەوەش دەستمان کرد بە شەڕە قوڕ و خۆڵ و پاشان دەستمان کرد بە گازگرتن لەیەکتری بەدانەکانمان.

تا ڕۆژی هەینی بەردەوام بوو، و خۆر بەرز بوویەوە و یەك ئاڵا بە هەڵکراوی نەدەبینرا و لەناو تۆزو غوباردا هیچ کوێ دیارنەبوو و جەنگ هەردوو لای ماندوو کردبوو و دەستەکانی شەکەت کردبوو، و گەروەکانی ووشك کردبوو[3].

(ابن کثیر) وەسفێکی ئەو ڕۆژەمان بۆ دەکات و دەڵێت: شەوی هەینی بوو ـ شەوی هەریر ـ جەنگاوەرەکان گازیان لەیەکتری دەگرت تا هیلاك دەبوون ئیتر هەردووکیان دادەنیشتن و کەمێ دەحەوانەوە و بەدانیشتنەوە مڕیان دەدایە سەر یەکتری و پەلاماری یەکتریان دەدا و پاشان هەڵدەسانەوە و وەك لەسەرەتاوە دەستیان دەکردەوە بەجەنگ ـ إنا لله وإنا اليه راجعون ـ و خەڵکی

---

[1] المستدرك (٤٠٢/٣) الذهبي: ضعيف.

[2] تلخيص الحبير (٧٨/٢).

[3] وقعة صفين، لا ٣٦٩.

ئا بەم جۆرە بوون تا ڕۆژ بوویەوە و هەموو موسڵمانەکان بەئاماژەی چاو نوێژی بەیانیان ئـەنجام دا و جەنگ بەردەوام بوو تا کاتی چێـشتەنگاو، و لەوکاتـەوە وردە وردە سـەرکەوتن بـەلای سـوپای ئەمیری باوەڕداراندا دەشکایەوە[1].

## ٤- بانگەشەی ـ تەحکیم ـ:

حاڵی هەردوو سوپاکە شپرزە بوو، و گەیشتە ئاستێك کـە ئـیتر توانـای جـەنگیان نـەما، و (أشعث ی کوڕی قەیس) کە سەرۆکی هۆزی کندە بوو لەشەوی هەریردا ووتارێکی بـۆ هاوڕێکـانی داو ووتی: (بەچاوی خۆتان ئەی موسڵمانان ـ لـەدوێنێ وە دەبیـنن چـۆن عـەرەب قـڕی تێکـەت، وەڵڵاهی گەشتوومەتە ئەم تەمەنەم شتی وام نەدیوە، دەی ئەوەی لێرەیە بـا نادیارەکـان ئاگـادار بکاتەوە و ئەگەر سەبینێ دەست هەڵگرین لە جەنگ عەرەب هەموو لـەناو دەچـێت، و ئابڕوەکـان دەتکێن، خۆ بەخوا لەترسی جەنگ من ئەم قسەیە ناکەم، بەڵام من پیاوێکی بەتەمـەنم و خـەمی سبەینێ ی ژن و منداڵەکانمانە کاتێ ئێمە هەموو لەناو بچین، ئـەی خـوای گـەورە مـن بۆچـوونی خۆمم پێشکەشی هۆزەکەم و هاودینەکانم کردو کەمتەرخەم نەبووم)[2].

ئەم قسانەی (أشعث) موعاویە (ﷺ) ووتی: (بە ڕەبّی کەعبە ڕاستەکان، ئەگەر بەیانیش ئەم شەڕە بەردەوامبکەین ـ پیاو نامێنێ ـ ڕۆمەکانیش زۆر بەئاسانی پەلاماری ژن و منداڵـە جێماوەکانمـان دەدەن، و فارسەکانیش پەلاماری عێراقیان دەدایـەوە و ژن و منداڵـەکانیان زەوت دەکـرد، بـەخوا ئاقڵ و ژیرمەندان هەست بەمە دەکەن، و پاشان بـەهاوڕێکانی ووت: قورئـان هەڵواسـن بـەنووکی شمشێرەکانتانەوە)[3].

ئیتر ئەمە ڕاستی یەکـەو هـەردوو لایـەنی شـەڕکەر هەسـتیان پێکـرد و گەیـشتنە ئـەو قەناعەتە و ئەمەش حەقیقەتێکە و دەبوایە پێش جەنگەکە هەستیان پێ بکردایـە بـەڵام شـەیتان ناهێڵێ نەوەکانی ئادەم بەردەوام دەست لە ملی یەکتر بن و کەرنـەفاڵی خۆشەویـستی بـۆ یـەکتری بچرن.و ئەمە فێڵ نەبوو لەلایەن هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ)کـە(عـەمری کـوڕی عاص) بانگەشەی بۆ بکرێت و سەبەئی یەکان زۆر پێ ی قاس بوون چونکە ئەوان لـەئاوی لێـڵ دا

---

[1] البداية والنهاية (٢٨٣/٧).
[2] وقعة صفين، لا ٤٧٩.
[3] هەمان سەرچاوە، لا (٨٨١،٨٨٤).

حەزیان لە مەلە بوو، دەیانزانی موسڵمانان تا مەشغوڵی شەڕو جەنگ بن نایانپەرژێتە سەر ئەوان کە بکوژانی عثمانی کوڕی عەفان (ﷺ) ی بێ تاوان و غەدر لێ کراوبوون.

و سەبەئی یەکان کە خەریك بوو خۆریان بەرەو ئاوابوون بچێت بەئاشتەوایی موسڵمانان لەناو خۆیاندا ئەوان ناچاربوون هەموو شتێك کە بشێ و نەشێت، بیدەنە پاڵ هەموو موسڵمانێك و بەدەم عەلی یەوە دەیان درۆ ڕێك بخەن، و لەوانە: ئەو قورئانانەیان بەرز نەکردۆتەوە مەگەر فێڵ و ساختەیەکی بەدواوەیە[1].

ئەو ڕیوایەتەی (أبی مخنف) کە گریمانی ئەوە دەکات کە گوایە عەلی (ﷺ) بەو بانگەشەیەی کە خەڵکی شام پێشنیاریان کردبوو کە - تەحکیم ی قورئانە - ڕازی نەبوو بەڵام لەژێر فشاری قورئان خوێنەکان - خەواریج - دا ناچاربوو قبوڵی بکات)[2]. ئەم ڕیوایەتە واهی یەو بەهیچ جۆرێك قبوڵ ناکرێت چونکە (أبی مخنف) ئیمامی یەکی داخ لە دڵە.

لەبەرامبەردا ڕیوایەتی وا هەیە لە ڕاویەکانی بەوە تۆمەتبار نەکراون کە ئارەزووی خۆیان چیرۆك و ووتە هەڵبەستن و بیدەنە پاڵ ئەو دوو هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە علي و موعاویە بوون، لەوانە ئەو ڕیوایەتەی پێشەوا (أحمدی کوڕی حەنبەل) لە (حبیب) ی کوڕی (أبی ثالث) ەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئێمە لە (صفین) بووین، کاتێ جەنگەکە لەسەر خەڵکی شام گەرم بوو عەمری کوڕی عاص ووتی بە موعاویە: قورئانێك بنێرە بۆ لای و بانگی بکە بۆ لای کتێبەکەی خواو دڵنیابە ئەو نەخێر ناکات، و بەپیاوێکدا قورئانی ناردو ووتی بە عەلی (ﷺ): لەنێوان ئێمەو ئێوەدا با قورئان حەکەمان بێت، ((أَلَمْ تَرَى إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيباً مِنْ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ وَهُمْ مُعْرِضُونَ)) " آل عمران/٢٣".

عەلی ووتی: بەڵێ باشە، من شایانترم قبوڵی بکەم، و قورئان خوێنەکان کە بەدەوری عەلیدا بوون شمشێرەکانیان خستە سەر شانیان ووتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆ بەردەوام نەڕۆین بۆیان تا خوای گەورە نێوانمان دەخات بەلایەکدا؟.

---

[1] الکامل (٢/٣٨٦).

[2] تاریخ الطبري (٥/٦٦٢).

و لەوکاتەدا ـ سهل ی کوڕی حەنیف الانصاری ـ (ﷺ) ووتی: ئەی خەڵکینە خۆتان تاوانباربکەن، ئێمە لەڕۆژی حودیبیە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووین، زۆربەمان شەڕمان پێ باش بوو بەڵام پێغەمبەری خوا ڕێکەوتنی کرد لەگەڵ بێ باوەڕاندا و تەنانەت (عمر) (ﷺ) ناڕازی بوو بەو سوڵحەو سورەتی فەتح هاتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)، و عەلیش (ﷺ) ووتی: بەڕاستی ئەمەش فەتحەو مەسەلەکە دادەخات و گەڕایەوە و خەڵکەکەش لەگەڵیدا گەڕانەوە[1].

ڕازی بوون هەردوو لا بەوەی قورئان حەکەمی هەردوو لا بێت و صولّح بکەن لەسەری، بەبێ ئەوەی مەرامی هیچ کام لەلایەنی شەڕکەر بێتەدی، نە شامی یەکان بکوژانی عثمانیان لەبیرما، و نە عەلی (ﷺ) داوای بەیعەت دانەکەی لەبیرما، ئەمەش لەبەر بەرژەوەندی گشتی و نەفەوتانی ئوممەتی محمد (ﷺ) لەشەڕی نەخوازراوی لابەلاییدا کە دەبێت ئەو خوێنانە لە جەنگە ڕزگاریخوازەکاندا بڕژێت لەپێناو بانگەوازی ئیسلام و گەیاندنی ئاینی نوێ بەسەراپای دانیشتوانی سەرزەوی،و ئەمری واقیع ئەمەی بەسەر موسڵمانانی هەردوولادا فەرز کرد و ئەم هەنگاوەش دەری خست کە موسڵمانان هێشتا لەئاستی بەرپرسیارێتی و هێزو دەستەڵات و باوەڕ بەخۆکردندان[2].

ئەمیری باوەڕداران علي (ﷺ) دڵی زۆر خۆش بوو بەوەستانی جەنگی (صفین) و ڕازی بوو بە (تەحکیم). و بەسەرکەوتن هەژماری دەکرد و گەڕایەوە بۆ کوفە[3]. و ئومێدی خواست تەحکیم خاڵی ئاشت بوونەوەی ئوممەت بێت و یەکریزی بگەڕێنێتەوە و دەوڵەت بەهێزبکاتەوە و بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکانی وڵاتان بخەنەوە گەڕ.

کۆمەڵێك هۆکار بوونە هۆی ئەوەی هەردوو لا تەحکیم قبووڵ بکەن لەوانە:

* کۆتا چارەسەر بوو بۆ وەستانەوەی دەریای خوێن ڕشتن لەهەردوو لایەنی موسڵمانان و هەوڵێکی هەمەلایەنەو گومانی سەرکەوتنی زۆر بوو بەپێچەوانەی هەوڵە تاکەکەسی یەکانی جەنگی جەمەل کە شکستیان دەهێنا.

---

[1] الانصاف، لا ٥٣٠.

[2] دراسة في تأريخ الخلفاء الأمويين، لا ٣٨.

[3] دراسة في تأريخ الخلفاء، لا ٣٨.

* کوژراوێکی زۆر و ڕشتنی خوێنێکی لەڕادەبەدەر لە هەردوو لا و ترسان لە لەناوچوونی هـەموو پیاوانی ئیسلام و هەوڵ دان بۆ ئاگربەست ئارەزوی هەردوو لا بوو.

* ئەو وەرسی و بێتاقەتی یەی ڕووی کردە خەڵکی بەبۆنەی درێژی جەنگەکە، وەك بڵێ ی هـەموو لایەك چاوەڕوانی ئاوا پێشنیارێك بوون کە هاواری وەستانی لافاوی خوێن بکـات و خـەڵکی بـڕۆن بەدەمی یەوە و جەنگاوەرەکان هاواریان دەکردو دەیان ووت: جەنگ سەری خواردین و مانـەوەمان لە ئاگربەست و شەڕوەستاندایە[1].

و بەرزکردنەوەی قورئان شتێکی تازە نەبوو، بەڵکو پێشتر لەجەنگی جەمـەل دا (کـەعب ی نـوری سور) ی لەسەر شەهید کرا کاتێ هاواری دەکرد وەرن بەدەم ئەم قورئانەوە و شەرمێکی لێ بکەن و جەنگ بوەستێن بەڵام ئەم جارە لە (صفین) دا بەرزکردنـەوەی قورئـان هـەوڵی تاکەکەسـی نـەبوو بەڵکو هەوڵی سەرکردایەتی بوو بۆیە ئومێدی سەرکەوتنی زیاتربوو.

* ئیمان و بیروباوەڕ لەدڵەکاندا جێگیر بوو بۆیە هاتن بەدەم بانگەوازی دەنگی ئاشـتی یـەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت ((فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ)) "النساء/٥٩"، واتـە: لەهەرشتێکدا ناکۆکی کەوتە نێوانتان بگەڕێنەوە بۆلای خواو پێغەمبەر بۆتان چارەسەر دەکات.

### ٥- شەهیدکردنی عەماری کوڕی یاسر (ﷺ):

ئەو فەرموودەیە (صحیحە) و لەزانستی فەرموودەدا وەرگیراوە کە پێغەمبـەری خـوا بـە عماری کوڕی یاسری فەرموو: ((تقتلك الفئـة الباغيـة))[2] واتـە عـەمار کۆمـەڵێکی یـاخی بـوو شەهیدت دەکەن، بۆیە شەهیدبوونی زۆر کاریگەربوو لەسەر جەنگەکـە و هـەموو هاوەڵـان (ﷺ) بەدوای عەمارەوە بوون و ئەو لەهەمو لایەك بوایە، ئەوانیش دەچوونە ئەو سـەنگەرە و (خزیمـە)ی کوڕی (ثابت) (ﷺ) دەستی نەدەچووە جەنگ لەگەڵ برا شامی یەکانیـدا بـەڵام هەرکـە عـەماری بینی شەڕ دەکات ئەویش دەسـتی دایـەوە شمـشێرەکەی و چـونکە ئـەو فەرموودەیـەی سـەرەوەی بیستبوو[3].

---

[1] الصفين، لا (٢٨٢-٢٨٤).

[2] مسلم، ژ (٢٩١٦).

[3] مسلم، ژ (٢٩١٦).

لەڕیوایەتێکی ـ صحیح ـ دا هاتووە کە دوو کەس لەلای عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی عاص دا دەمەقاڵەیان بوو لەسەر ئەوەی ئەو دەیووت من کوشتوومە و ئەوی تریش دەیووت من کوشتوومە و عبداللە یش توڕەبوو ووتی: یەکێکتان خۆی لێ ڕزگار بکات و ئەو خوێنە بخاتە سەر برادەرەکەی چونکە من لەپێغەمبەری خوا بیستووە کە فەرموویەتی ((تقتله الفئة الباغية)) واتە کۆمەڵێکی سەرکەش و یاخی لەموسڵمانان دەیکوژن، موعاویە بە عبداللە ی ووت: دەی کەواتە تۆ چی دەکەیت لەگەڵماندا؟ ئەویش ووتی: باوکم سکاڵای منی کرد لەلای پێغەمبەر (ﷺ) کە گوێڕایەڵی ناکەم و پێغەمبەریش پێ ی فەرمووم: ((اطع أباك مادام حياً ولا تعصه)) واتە: ((بەگوێ ی باوکت بکە تا لەژیاندایە و سەرپێچی مەکە)) و منیش لەگەڵی دەبم و بەشداری جەنگیش ناکەم[1].

و (بخاري) لە ئەبی سەعید خودەریەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: ئێمە ـ لەکاتی دروست کردنی مزگەوتەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) یەك یەك خشتمان هەڵدەگرت بەڵام عمار دوو دوو خشتی هەڵدەگرت و پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو جۆرە چاوی پێ ی کەوت بانگی کرد و تۆزەکەی لێ دەکردەوە و پێ ی دەفەرموو: ((ويح عمار تقتله الفئة الباغية يدعوهم الى الجنة ويدعونه الى النار))[2] واتە بێ قەزابێ عەمار کۆمەڵێکی سەرکەش و یاخی دەیکوژن و ئەو بۆ بەهەشتیان بانگ دەکات و ئەوان بۆ ناو ئاگری بانگ دەکەن و عەماریش ووتی: پەنا ئەگرم بەخوا لە فیتنەو ئاژاوەگێڕی.

و پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((قاتل عمار وسالبه في النار)) واتە بکوژی عەمارو ئەو کەسەیشی شتەکانی لێ دەکاتەوە بۆخۆی لەئاگری دۆزەخ دان.

## ٦- هەڵس و کەوتی جوان لەکاتی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەکەدا:

لەجەنگی ـ صفين ـ دا شتی وا سەیر ڕووی داوە کە تاکانەیەو لەهیچ جەنگێکی دونیادا شتی وا نەبینراوە، و ئەگەر هەزاران کەسی ناو گۆڕەپانەکە بەچاوی خۆیان نەیانبینیایە کەس باوەڕی پێ نەدەکردن و بەڵکو خۆیشیان باوەڕیان پێ نەدەکرد، چونکە گۆڕەپانی جەنگ کەشێکی

---

[1] البخاري، ژمارە (٤٤٧).

[2] السلسلة الصحيحة (٥/١٨-١٩).

تایبەتە .. سۆزو بەزەیی .. خزمایەتی .. نوێژو ئاینداری .. وەفاو بەڵێن بردنە سەر و فێڵ نەکردن و بەشداری کردن بەبێ شەڕکردن! و ئەمانەو چەندان شتی تر کە ڕەوشتی بەرزی موسڵمانان دەسەلمێنێت تنانەت لەکاتی شەڕو پێکادانیشدا لەوانە:

* لەگەرمەی شەڕدا گوێیان لە بانگ بوایە جەنگەکەیان دەوەستان و دەستیان دەکرد بەنوێژ جگە لەشەوی هەریر کە هەمووان بەئامازەی چاو نوێژەکانیان کرد بەخێرایی پاشان دەستیان کردەوە بەجەنگ[1].

* ئەو ڕۆژەی عەماری کوڕی یاسر (ﷺ) ـ شەهید کرا ـ شەڕەکە وەستاو هەردوو لا نوێژیان لەسەر کرد لەتەنیشتی یەکتریدا[2].

* عەمری کوڕی عاص (ﷺ) جوابی نارد بۆ سەربازگەی عەلی (ﷺ) کە با جەنگەکە بەشێوەیەکی کاتی بووەستێنین تا جەستەی کوژراوەکان بەخاك دەسپێرین و ئەوانیش پێیان باش بوو هاتن بەدەم داواکاریەکەیانەوە و ڕاوی یەکە دەڵێت وەك پەنجەکانی دەست هەردوو دەچوون بەناو یەکدا.

* هاوەڵانی عەلی (ﷺ) شەهیدێکی خۆیان بەلای عەمری کوڕی عاص دا بردەوە ـ عەمر دەستی کرد بەگریان بۆی و ووتی: ئەوپەڕی ئیجتیهادی خۆی کرد و ئەمەی بۆ خوا بەباش زانی[3].

* کاتێ شەڕ دەوەستا ـ وەك سەربازێکی بەشداربووی صفین دەگێڕێتەوە ـ هەموو سەردانی یەکتریان دەکرد و دەچووین بۆلای یەك و قسەمان دەکرد لەگەڵ یەکتریدا[4].

هەموو دەچوون بۆ ئاوهێنان و لەوێ وەك برا بوون و کەس جەنگی لەگەڵ کەسدا نەدەکرد و پاڵ پاڵێنیان بوو لەسەر ئاو خواردنەوە و هیچ کەس ئازاری کەسی تری نەدەدا[5].

---

[1] تاريخ دیمشق (٢٣٣٩/١٨).

[2] أنساب الأشراف (٥٦/٦) بسند حسن الى عتبة.

[3] هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

[4] سير أعلام النبلاء (٤١/٢).

[5] تاريخ الطبري (٦١٠/٥).

* دووکەس دەستیان دەکرد بەشەڕ بە بۆکزو گاز لەیەکتر گرتن و هەرکە ماندوو دەبوون هەردووکیان دادەنیشتن و دەستیان دەکرد بگفتووگۆو ڕا گۆڕینەوە و قەناعەت بەیەکتری کردن و لەپاش ئەوەی حەوانەوە دیسان هەڵدەستانەوە بۆ یەکتری و پەلاماری یەکتریان دەدا.

* گەنجی یەك هۆز بوو بوون بەدوو بەشەوە هەرلایەك و قەناعەتی وابوو لەلایەك شەڕیکەن و لەوپێناوەدا گیانیان دادەنا و لەکاتی شەڕوەستاندا هەموو هۆزەکە دەچوونەوە بۆ سەردانی یەکتری[1].

* کوڕ دەبینی بەس لەبەرئەوەی دڵی باوکی لێ نەڕەنجێ و لێ ی زویر نەبێت لەگەڵیدا ڕۆیشتووە بۆ جەنگ بەڵام لەوێ ئامادە نی یە خوێنی برایەکی موسڵمانی خۆی بڕژێنێت وەك عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص.

* لەناو ئەم جەنگەدا کۆمەڵێ لە قوتابیانی عبدالله ی کوڕی مەسعود (ﷺ) بەشداری جەنگەکەیان کرد بەئامادەبوون و بۆ بەرگری لەخراپە و زوڵم و ناڕەوایی لەهەر لایەکیانەوە ڕوویدات، و بەعەلیان ووت: ئێمە لەگەڵ هیچ لایەکتاندا نابین بەڵام حەزدەکەین لەنزیکەوە چاودێری جەنگەکە بکەین و ئەگەر شتێکی ناڕەوا لەهەر جەنگاوەرێکەوە ڕوویدا ئێمە دەڕۆین بۆی و بەرگری ئەو کارەی لێ دەکەین،

و عەلی (ﷺ) زۆر خۆشحاڵ بوو بەم هەڵوێستەیان و ووتی: زۆرباشە یاخوا بەخێربێن، ئەمەیە تێگەیشتنی ڕاستقینە لە ئیسلام و زانیاری فەرموودەکان و ئەوەی بەم کارەی ئێوە ڕازی نەبێت ئەوە زاڵم و ناپاکە[2].

## ٧- هەڵس و کەوتی جوان لەگەڵ دیلەکاندا:

لەجەنگی صفین دا بەڕوونی هەڵس و کەوتی جوان و شایستە دەبینین لەلایەن عەلی یەوە (ﷺ) بەرامبەر بەو کەسانەی کە بەدیل گیرابوون، ئەمەش شتێکی سەیر نی یە چونکە ئیسلام وا ڕۆڵەکانی پەروەردە دەکات لەگەڵ ئەسیری بێ باوەڕانیشدادەبێت بەڕێزو حورمەتەوە هەڵس و

---

[1] البداية والنهاية (٧/ ٢٧٠).

[2] خلافة علي بن ابي طالب، عبدالحميد، لا (٢٤٣).

کەوتیان لەگەڵدا بکرێت و نابێت نان و خواردنیان لێ بگیرێتەوە و نابێت ببەسترێنەوە و نابێت سەرما یان گەرمایان بێت و نابێت نەتوانن پەیوەندی بەکەس و کاریانەوە بکەن و هتد.

بەڵام لەبەرئەوەی ئەسیرەکان هێزو پاڵپشتی لایەنەکەیەتی نابێت ئازاد بکرێت لەناو جەنگەکەداو دەبێت ڕابگیرێت تا جەنگەکە دەکەوێت بەلایەکدا، چونکە دەڕواتەوە ناو سوپاکەی و بەهێزیان دەکاتەوە، لەبەرئەوە عەلی (ﷺ) دیلەکانی حەپس دەکرد و داوای بەیعەتی لێ دەکردن و ئەگەر هەرکەسێکیان بەڕاستی بەیعەتی بدایە ئەوە بەڕەڵای دەکردن، و ئەگەر گیربووایەو بەیعەتی نەدایە، ئەوە چەك و وڵاخ و شتەکانی لێ دەسەند و دەیدا بەو جەنگاوەرەی کە دیلی کردووە، و پاشان قورئانی دەهێناو سوێندی دەدان کە بەشداری شەڕەکە نەکەنەوە و پاشان ئازادی دەکردن و لەڕیوایەتێکیشدا یەکی (٤) درهەمیشی پێ دەدان[1].

ئەسیرێکی تریان هێنا بۆلای ئەمیری باوەڕداران و هاواری کرد: بەئەشکەنجە مەمکوژن، عەلی (ﷺ) پێ ی ووت: بەهیچ شێوەیەك ناتکوژین من لەخوای هەموو جیهانیان دەترسم و پاشان ئازادی کرد و ووتی: ئەگەر خێرداربیت بەیعەت دەدەیت؟

## ٨- چەند کەس کوژرا لەو جەنگەدا؟:

هەروەك جەنگی جەمەل ـ کە مێژوونووس و ڕاویەکان جیاوازیان هەبوو ـ هەریەکەو ژمارەیەکی خەیاڵی نووسیوە، هەیە حەزدەکات ژمارە کوژراوی خۆیان کەم بکاتەوە و ژمارەی بەرامبەر زیاد بکات تا ئازایەتی خۆیان دەربخات، و هەش بووە ژمارەی بەرامبەری کەم کردۆتەوە و کوژراوی خۆیانی زیادکردووە ئەمەش لەبەرئەوەی سۆزو بەزەیی خەڵکی بۆلای خۆیان ڕابکێشێت بەڵام نزیکەی (٢٨ تا ٣٠) کاتژمێر شەڕ کراوە[2].

هەرچەندە جەنگەکە خەست و دژوار بوویێت، دژواری و ناهەمواریەکەی نەدەگەیشتە ڕادەی شەهیدو کوژراوانی جەنگی مەزنی قادسیە کە موسڵمانەکان (٨٠٠٠) شەهید و فارسەکانیش (١٢) هەزار کوژراویان هەبوو، ئیتر نازانم ئەم ڕێژە زۆرانەیان لەکوێ هێناو چۆن چووە

[1] الدولة الأموية (٣٦٠-٣٦٢).

[2] الصواعق المرسلة (٣٣٧/١) بدون سند.

عەقڵیانەوە کە پیاوێکی وەك (ابن ابي خیثمة) کوژراوانی هەردوولا بە (٧٥) هەزار کەس مەزەندە دەکات و ابن قەییمیش ـ بەزیاتر لە (٧٠) هەزار کەس مەزەندە دەکات!

٩- ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) سەردانی کوژراو و بریندارەکان دەکات:

ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) لەدوای هەموو جەولەیەکی جەنگەکان، سەردانێکی مەیدانی گۆڕەپانی جەنگەکانی دەکرد و سەیری کوژراو و بریندارەکانی دەکرد و دوعای لێخۆش بوونی بۆ دەکردن، یەکێ لەو کەسانەی لەوێ بوو دەڵێت: عەلیم بینی بەسواری ئەسپەکەی پێغەمبەری خواوە بوو (ﷺ) کە ناوی (الشهباء) بوو بەناو کوژراوەکاندا دەگەڕاو لەکاتی گەڕانیدا (الأشتر) یشی لەگەڵدابوو،

دایان بەلای یەکێ لە شەهیدەکانی شام دا (الاشتر) ناسی یەوە ووتی: وەڵڵاهی بەپیاوێکی موسڵمان و چاك دەهاتە بەرچاوم، عەلیش (ﷺ) فەرمووی: ئێستایش موسڵمانێکی پیاوچاکە، ئەو پیاوە ناوی حابس ی کوڕی سەعد ی طائی بوو ، یەکێك بوو لەخواناس و قازی یە ناودارەکانی شام، و ئەم قازیە هاتە لای عمری کوڕی خطاب (ﷺ) و پێ ی ووت: خەوێکم دیوە زۆر ترساوم لێ ی!، عمر فەرمووی: چی یە؟ ووتی: خۆرو مانگم لەخەومدا بینی کردیان بەشەڕو ئەستێرەکانیش بوون بەدوو بەشەوە، عمر (ﷺ) ووتی: تۆ لەگەڵ کامیاندا بوویت؟ ووتی: لەگەڵ مانگدا بووم و عمریش ئایەتێکی قورئانی خوێند کە ئەمەبوو ((وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً)) "الاسراء/١٢" واتە: شەوو ڕۆژمان وەك دوو بەڵگەی خۆمان دروستمان کردوون و شەومان بەتاریکی سڕیوەتەوە و ڕۆژمان بە ڕووناکی هێشتۆتەوە، دەی وەڵڵاهی هیچ ئەرك و بەرپرسیارێتی یەکت ناخەمە ئەستۆ و هەرگیز ناتکەم بە بەرپرس، و ڕاویەکە دەڵێت بیستوومە لەجەنگی (صفين) دا لەگەڵ موعاویەدا بوو شەهید کرا[1].

و دای بەلای کوژراوەکانی خۆیانداو کوژراوەکانی موعاویەداو ووتی: خوا لێتان خۆش بێت، خوا لێتان خۆش بێت، بەهەردوو لای دەووت[2].

---

[1] مصنف ابن ابي شيبة (١١/٧٩) بسند منقطع.

[2] خلافة على بن ابي طالب، عبدالحميد، لا (٢٥٠).

یەزیدی کوڕی (أصم) دەڵێت: دای بەلای کوژراوانی خۆیاندا ووتی: ئەمانە بەهەشتین و دای بەلای کوژراوانی شامدا ووتی: ئەمانەش بەهەشتین[1]، و پێ ی دەووتن ئەمانە لە باوەڕدارانن[2].

## ١٠- هەڵوێستێکی مەردانەی موعاویە (ﷺ):

پاشای ڕۆمەکان ئەم جەنگەی نێوان مەعاویەو علي کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) ی بەهەل زانی تا هەندێ لە زەویە لەدەست چووەکانی لە موسڵمانان بسەنێتەوە،

(ابن کثیر) دەڵێت: پادشای ڕۆمەکان تەماحی کردە موعاویە. دوای ئەوەی کە سەرشۆڕو ترسە زاوری دەستی موعاویە و سوپای ئیسلام بوو، ئەم شەڕەی نێوان موعاویەو عەلی (ﷺ) بەهەل زانی و بەسوپایەکی گەوەوە نزیکی سنوورەکانی دەوڵەتی ئیسلام بوویەوە و بەنیازبوو بیانگرێتەوە، موعاویەیش (ﷺ) نامەیەکی بۆ نووسی و تیایدا ووتی: وەڵڵاهی ئەگەر وازنەهێنی و نەگەڕێیتەوە شوێنی خۆت ـ ئەی نەفرەت لێکراو ـ هەر ئێستا لەگەڵ ئامۆزاکەمدا یەك دەگرینەوەو پێکەوە هێرشت بۆ دەهێنین و لەهەموو خاکەکانی خۆیشت دەرت دەکەین وە کونە مشکت لێ دەکەین بە قەیسەری.

پادشای ڕۆم لەگەڵ خوێندنەوەی نامەکەدا هەموو گیانی هاتە لەرزە و سوپاکەی پاشەکشە پێ کردەوە و داوای تازەکردنەوەی هودنەیشی کرد لە موعاویە[3]. (ئەمەش بەڵگەیە لەسەر نەفس بەرزی و پیاوچاکی و بەرگری کردنی لە ئیسلام و خاکی ئیسلام، ئەگینا سەرکردەیەکی دونیایی خۆفرۆش و هەلپەرست و کورسی دۆست بووایە ـ جوابی دەنارد بۆ پادشای ڕۆم دەیووت (١٠٠) هەزار جەنگاوەرم بۆ بنێرە با سوپاکەی علي تێکبشکێنین و دواتر چەندی زەویت دەوێت لەخزمەتتدایە)[4]

## ١١- ئەمیری باوەڕداران دەدات بەلای گۆڕستانێکدا:

---

[1] مصنف ابن ابی شیبة (١٥/٣٠٣).

[2] تاریخ دمشق (١/٣٢٩-٣٣١).

[3] البدایة والنهایة (٨/١٢٢).

[4] ووتەی وەرگێڕ.

کاتێ ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) لەجەنگی ـ صفین ـ گەڕایەوە، دای بەلای گۆڕستانێکداو ووتی:

((السلام عليكم أهل الديار الموحشة، والمحال المقفرة، من المؤمنين والمؤمنات، والمسلمين والمسلمات، أنتم لنا سلف فارط، ونحن لكم تبع، وبكم عما قليل لاحقون، اللهم اغفر لنا ولهم، وتجاوز بعفوك عنا وعنهم، الحمد لله الذى جعل الأرض كفاتا، أحياءً وأمواتاً، الحمد لله الذى خلقكم وعليها يحشركم، ومنها يبعثكم، وطوبى لمن ذكر الميعاد وأعدّ للحساب، وقنع بالكفاء))[1].

## ١٢- بکوژانی عثمان (ﷺ) حەزدەکەن جەنگ بەردەوام بێت!:

ئاژاوەگێڕەکان ئەوانەی دایان بەسەر مەدینەی منەوەرەداو خەلیفەی سێ یەمی پێغەمبەری خوایان شەهیدکرد و ئەو شارە پیرۆزەیان تاڵان و بڕۆکرد، وا ئەمڕۆ ئەوەتان لەناو سوپاکەی عەلیدا و وەك گورگ پێستی مەڕیان لەبەر کردووە و خۆیان بەدڵسۆزی عەلی دەزانی، بۆیە لەئاشتی و صوڵحدا زەرەریان بوو، و هەروەها بۆئەوەی هەردوو لایان بێ هێزو لاوازبن و دواتر نەتوانن تۆڵەی عثمان بکەنەوە و سزای کەس بدەن، هەر تێکچوون کاتێ بینیان وا خەڵکی شام قورئان هەڵدەبڕن، و عەلی (ﷺ) دەڕوات بەدەمیانەوە و فەرمانی وەستانی شەڕ دەدات، زۆر هەوڵیاندا عەلی لەو بیرە لابدەن، بەڵام لەدەستیان دەرچوو، جەنگ وەستا، و هیچ چارەیەکیان نەما جگە لەوە نەبێت کە ئەو ئاژاوەگێڕانە لە عەلیش جیابوونەوە، و قسەیەکیان داهێناو ووتیان (الحكم لله) و لەهەردوو لا خۆیان بەدوور گرت.

ئەوەی سەیرو نامۆیە لەم قۆناغەدا مێژوونووسان باسی ئەو پیلان و کارانە ناکەن کە ئەو جیا خوازانە ـ خواریج ـ پێ ی هەستان، و لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆرێکیان لەناو سوپاکەی عەلیدا بوون، و باسی نهێنی سەرنەکەوتنی ئەو ئاگربەستەی نێوان ئەو دوو لایەنەیان نەکردووە کە ماوەی چەند مانگێکی خایاند و ئایا ڕۆڵی ئەوانە چی بووە لە سەرنەکەوتنیدا، و هەرەس پێهێنانی گشت دانیشتن و ڕێکەوتنەکان، چونکە بێ کەم و زیاد هەروەك لەجەنگی جەمەلدا دەترسان شەڕ بوەستێ

[1] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، لا (١٤٧).

و تۆڵـە لـەوان بـسەنرێت خـۆ لەجـەنگی (صـفین)یـشدا هـەمان ترسـیان هـەبوو، چـۆن هـەوڵی سەرنەکەوتنی پێکهاتنەکانیان نەدابێت؟![1] .

۱۳- عـەلی (ﷺ) ڕازی نابێت قسە بە موعاویە بووترێت:

دەگێڕنەوە دووکەس لە هاوەڵانی عـەلی (ﷺ) جنێوو قسەی سوکیان بە موعـاویـە دەووت و نوفرەتیشیان لەخەڵکی شام دەکرد، عـەلیش (ﷺ) جوابی بۆ ناردن و پێ ی ووتن: واز لەو قسانە بێنن کە بیستوومە لێتان.

ئەوانیش هاتن بۆ لای و ووتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئایا ئیمە هەق نین و ئەوان لەسەر ناهەق ـ باطـل ـ؟ ووتی: با، بەڕەبّی کەعبە وایە ... ووتیـان: ئـەی ئـیتر بۆچـی نـاهێڵی جنێـوو نەفرەتیان لێ بکەین؟ ووتی: حەزم نەکرد ئێوە لە نەفرەت کەران بن، بـەڵام واباشـە بڵـێن: خوایـە خوێن ڕشتن هەڵگرە لەنێوئێمەو ئەواندا و ئاشتی بخەرە نێوان ئێمەو ئەوان، و لەگومڕایی بیانپارێزە تا هەقیان بۆ ڕۆشن ببێتەوە و لەناو هەڵەدا بەردەوام نەبن[2] .

ئەو درۆو دەلەسانەی بەدەمی (عـەلی و موعاویەو حەسەن و حسین و أبن عباس) ەوە هەڵبەسـتراوە هەمووی دەچێتە خانەی ئەو هەوڵانەوە کە نەخشەی ووردی بـۆ دارێـژراوە ـ بـۆ ناشـیرین کردنـی مێژووی ئیسلامی زێڕین و ژیانی ئەو پیاوە مەزنانەی کە پێشەواو مامۆستای ئێمـەن و لەهـەموو ڕەوشتێکی بەرزدا سەرمەشقن بۆ مرۆڤایەتی لەدوای خۆیان، کە گوایە لەسەر مینبـەر لەعنـەتیان لەیەکتر کردووە!!

ئەوانەی ئەمانەیان گەورەکردووە و هەڵیان بەستووە وایان زانیوە ئیتر موسڵمانان مێـژووی پاکی خۆیانیان لێ دەشێوێت و بەچاوی سوکەوە دەڕواننـە پێـشەواو سـەرکردە ئیـسلامی یـەکانی

---

[1] ووتەی وەرگێڕ.

[2] الاخبار الطوال، لا (١٦٥).

دێرینیان و دواتریش دەڵێن قورئانێک و پێغەمبەرێک مرۆڤی ئاوایان پەروەردە کردووە کە لەڕاستیدا بۆ دژایەتی کردنی خودی ئیسلامەکەیە نەک کەسایەتی یەکان.

ئەگینا هەڵەی ئەوان چی یە؟ ئەوانیش مرۆڤ بوون و مرۆڤیش هەڵە دەکات و شتی لەبیر دەچێت و بۆچوون و ئیجتیهادی نەپێکی دەبێت و بەوەش لەبازنەی موسڵمانێتی دەناچێتە دەرەوە.

پێغەمبەری ئیسلام محمد (ﷺ) هاوەڵانی واگۆش کردبوو کە بەهیچ جۆرێک نەفرەت لەکەس نەکەن و قسەی ناشرینیش بەکەس نەڵێن و دەفەرموێت ((ليس المؤمن بطعان ولا اللعان))[1] واتە: موسڵمان جنێوفرۆش و نەفرەت کەر نی یە.

و عەلی (ﷺ) لەعنەت کردن و بەکافرکردنی نەیارەکانی خۆی بەدوورگرتووە و لەڕەوشتی بەرزی ئامۆزاو زاوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خەلیفەی چوارەمی ئوممەتی ئیسلام نەوەشاوەتەوە و ئەمەش لەکتێبە صحیحە باوەڕپێکراوەکانی شیعەدا بەڕوونی بەدی دەکرێت[2].

[1] السلسلة الصحيحة للالباني، ژ ٣٢٠.

[2] أصول مذهب الشيعة، ٩٣٢.

# جێباسی سێ یەم

# ( التَحكيم )

لەدوای جەنگی (صفین) هەردوولا ڕێك کەوتن لەسەر (تەحکیم)، تەحکیم واتـە هـەردوولا یەکی حەکەمێك دەستنیـشان بکـەن و ئـەو دوو حەکەمـە چـیان بڕیـاردا و بەرژەوەنـدی هـەموو موسڵمانانی تێدابوو، کاری لەسەر بکرێت و هەردولا پێ ی ڕازی بن.

لەلایەن موعاویەوە عەمری کوڕی عـاص و لەلایـەن عەلیـشەوە (أبـا موسـی الأشـعری) دەستنیشان کرا، و بەو بۆنەیەوە هەردوولا پەیماننامەیەکیان نووسی، و (دومە الجندل) دیـاری کـرا بۆ شوێنی کۆبوونەوەی هەردوو حەکەم لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی ٣٧ ی کۆچی.

ئا لێرەوە کێشە سەری هەڵداو کۆمەڵێك لەسـوپاکەی عـەلی (ﷺ) نیگـەران بـوون بـەو ڕێکەوتنەو وتیان ئەوە گوناهێکە و خاوەنەکەی پێ کـافر دەبێـت، و پێویـستە لەسـەری تەویـەو پەشیمانی دەربڕێت لەلای خواو ئیتر لەلای عەلی دەرچوون و ناویان نرا ـ خواریج ـ و ئەویش ـ إبن عباس ـ ی نارد بۆ ناویان و گفتوگـۆو دەمەقاڵـەی لەگەڵـدا کـردن و پاشـان عـەلی (ﷺ) خـۆی لەگەڵیان دانیشت مەسەلەکەی لەگەڵیان تاوتوێ کرد، و کۆمەڵێکیان گەڕانەوە بـەڵام کۆمـەڵێکی تریان ملیان نەدا لەسەر ڕای خۆیان سووربوون.

ئیتر عەلی (ﷺ) تووشی کۆمەڵێ جەنگ هات لەگەڵیاندا کە بەتەواوی سوپاکەی مانـدوو بوو و شەکەت بوون و هێزیان لێ بڕاو ئەو کارە هەر بەردەوام بوو تا کار گەیشتە ئەوەی شـەهیدی بکەن کە لەمەولا بەدرێژی باسی لێوە دەکەین ـ إنشاء الله ـ.

مەسەلەی تەحکیم ترسناکترین بابەتە لەمێژووی خەلیفە ڕاشـیدەکاندا، زۆرکـەس تیایـدا بەهەڵدا چووە لەنووسەران و بەپشت بەستن بەسەرچاوە لاوازەکان یان هەڵبەستراوەکان، کە تیایـدا هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ناشیرین کراوە بەتایبـەتی (أبـو موسـی الأشـعری) (ﷺ) کـە بەمرۆڤێکی فەقیر حاڵی، گێلۆکە داویانەتە قەڵەم وتیان لەبەر سادەیی خۆی عـەمری کوڕی عاص (ﷺ) فێڵی لێ کردووە لەمەسەلەی (تەحکیم) دا.

ئەم جۆرە ناوناتۆرانەی کە دراونەتە پاڵ ئەو دوو هاوەڵـە مەزنـەی پێغەمبـەری خـوا ـ یەکـەمیان بەگێلۆکەو دووەمیان بەفێڵباز ـ بدرێتە قەڵەم ـ پەنا بەخوا ـ.

ئەو دوو پیاوە زۆر گەورەو لێهاتوو بوون و توانیان پێکەوە دابنیـشن و گـەورەترین شـەڕو پێکادان بکوژێننەوە و ئوممەتی محمد (ﷺ) لەقەتڵ و امێکـی حـەتمی ڕزگاریکـەن و لەسـەر چـەند خاڵێك کە هەردوولا پێ ی ڕازی بن.

* زۆر پێویـستە لێـرەدا کورتەیـەك لـەژیانی ئـەو دوو هاوەڵـە مەزنـەی پێغەمبـەرمان بخەینـە بەردەسـتی خوێنـەر تـا بـۆی دەربکـەوێت کـە هەرچـی ووتـراوە و هەرچـی نووسـراوە لەلایـەن ناحەزانیانەوە درۆن و شایستەی ئەو دوو پیاوە نین:

یەکەم/ ژیانی (ئەبو موسای ئەشعەری):

ناوی عبداللە ی کوڕی قەیس ە، زانای گەورەو هاوەڵی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) و نازنـاوی (أبو موسى الأشـعري) لێ نراوە کە فیقەزان و قورئـان خـوێنێکی بڵنـد مـەقام بـووە، و لەشـاری مەککە موسڵمان بووە، إبن سعد دەڵێت: هاتووەتە مەککـەو بـووە هاوپـەیمانی سـەعیدی کـوڕی عاص و هەرلەوێ موسڵمان دەبێت و یەکێکە لە کۆچەویانی حەبەشە[1].

و هەندێ لەڕیوایەتەکان دەڵێن لەحەبەشە گەڕاوەتەوە بۆ موسڵمان کردنی هۆزەکەی. پـاش ئـەوەی پێغەمبەری خوا کۆچ دەکات بۆ مەدینە و لەوێ سـەقامگیر دەبێـت، و لـەوێ خـۆی و موسـڵمان بووەکانی هۆزەکەی کۆچ دەکەن بۆ شاری مەدینە[2]،

١- لەسەروەریەکانی (أبو موسى الأشعري) (ﷺ):

**أ/ دووجار کۆچەریان:** کاتێ کۆچـەریانی حەبەشـە گەڕانـەوە، موسـڵمانان خـەریکی ڕزگـارکردنی خەیبەر بوون، و پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی تێکردن و فەرمووی: ((لكم الهجرة مرتين: هاجرتم الى النجاشي، وهاجرتم إليَّ))[3] واتە: دووجار پاداشتی کۆچتان هەیە: کۆچتان بۆلای نەجاشی و کۆچتان بۆلای من.

---

[1] الطبقات (٤/١٠٧).

[2] فتح الباري (٧/١٨٩).

[3] مسلم، ژ (٢٥٠٢).

ئەنەس دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((یقدم علیکم عداً قوم هم أرق قلوباً للإسلام منکم)) واتە: هۆزێك بەرێوەیە بۆ لاتان کە لەئێوە زیاتر دڵیان بۆ ئیسلام دەجولێت، و (ئەشعەریەکان) هاتن و بەشیعرەوە دەیان ووت: غداً نلقى الأحبه محمداً وحزبه . واتە: سبەینێ بە محمد و یارانی شاد دەبین و کاتێ گەیشتن تەوقەیان کرد و ئەوان یەکەمین کەس بوون تەوقەیان داهێنا[1].

ب/ مەبەستی هۆزەکەی تۆیە ئەی ئەبا موسی:

عەیازی ئەشعەری دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە ((فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ)) "المائدة/٥٤" واتە: خوای گەورە گەلێکی تر دەنێرێت کە خوا خۆشی دەوێن و ئەوانیش خوایان خۆش دەوێت. لەوکاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((هم قومك یا أبا موسى، وأومأ الیه))[2] واتە: ئەوانەی خوا ناویان دەبات مەبەستی هۆزەکەی تۆیە ئەی ئەبو موسا، و ئاماژەشی بۆ دەکرد.

ج/ پێغەمبەر دوعای لێخۆشبوونی بۆدەکات:

ئەبو موسی الأشعری دەڵێت: کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەجەنگی حونەین بوویەوە، سوپایەکی خستەڕێ بەفەرماندەیی (أبو عامر الأشعری) و منیشی لەگەڵدا بووم و ڕۆیشتین و گەیشتین بە (دریدی کوڕی صمة) کە فەرماندەی سوپایەکی بێ باوەڕان بوو، توانی درید بکوژێت و جەنگاوەرەکانیشی هەڵهاتن، بەڵام یەکێکیان تیرێکی وەشاند و دای لە ڕانی (أبو عامر)[3] ، ووتم پێ ی: کێ لێ ی دای؟ ئاماژەی کرد بۆ پیاوێك و منیش کەوتمە دوای و ئەو نەیدەوێرا بووەستێت، تا پێم ووت: تۆ عەرەبیت زۆر عەیبە دەترسیت و ڕادەکەیت، کەوام ووت وەستاو دەستمان کرد بەشەڕو لەئاکامدا کوشتم و هاتمەوە و ووتم بە (أبو عامر) خوای گەورە ئەو نەگبەتەی گوشت، ووتی: تیرەکە لەڕانم دەربهێنە، منیش لێم نەوەو دەرم هێناو ئاوی سپی لێ هاتە دەرەوە، ووتی: ئەی برازاکەم، بڕۆرەوە بۆلای پێغەمبەرو سڵاوی منی پێ بگەیەنە پێ ی بڵێ داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات، و پاشان منی خستی شوێنەکەی خۆی و پاش کەمێك گیانی سپارد، و کاتێ هاتینەوە

---

[1] سیر اعلام النبلاء (٢/٣٨٤) اسناده صحیح.
[2] المستدرك (٢/٣١٣) صححه الحاكم.
[3] سیر أعلام النبلاء (٢/٣٨٥).

هەواڵەکەم بەپێغەمبەر دا (ﷺ) و ئەویش دەستنوێژی گرت و هەردوو دەستی بەرزکردەوە بۆلای پەروەردگار فەرمووی: ((اللهم اغفر لعبيد الله بن ابى عامر)) واتە: (خوایە لە عبیدالله خۆش بە) و ئەوەندە دەستی بەرزکردبوویەوە بن باڵیم دەبینی و پاشان ووتی: ((اللهم اجعله يوم القيامة فوق كثير من خلقك)) واتە: خوایە لەڕۆژی دواییدا پلەی بەرزکەرەوە بەسەر زۆرێ لەدروستکراوەکانتدا)).

منیش ووتم: دوعا بۆ منیش بکە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((اللهم اغفر لعبد الله من قيس ذنبه وأدخله يوم القيامة مدخلاً كريماً))[1] واتە: خوایە لەگوناهەکانی عبدالله ی کوڕی قەیس خۆش بە و لەڕۆژی دواییدا بیخەرە جێگایەکی زۆر بەڕێز.

د/ مژدەی ناوێت ئێوە وەرن:

ئەبو موسا (ﷺ) دەڵێت: لە جەعرانە لەخزمەت پێغەمبەردا بووم (ﷺ) دەشتەکی یەك هات ووتی: ئایا ئەو وەعدانەی داوتە بۆم جێ بەجێ دەکەیت؟ فەرمووی ((ابشر)) مژدەت لێ بێ، کابرا ووتی: مژدەی زۆرت داوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لای کردەوە بەلای من و بیلال داو فەرمووی ((ان هذا قد ردّ البشرى فاقبلا أنتما)) واتە: ئەمە موژدەی ناوێت ئێوە وەرن. هەردووکیان ووتیان: وەری دەگرین ئەی پێغەمبەری خوا، داوای جامۆلکەیەکی کرد دەستوو دەم و چاوی تێ شۆرد و ئاوی ڕادایە دەمی و فەرمووی: ((إشربا منه وافرغا على رؤوسكما ونحوركما)) واتە: ها لێ ی بخۆنەوەو بیکەن بەسەروبەر و کێشتاندا و ئەوانیش وایان کردو (أم سلمه) لەودیوی پەردەکەوە هاواری کرد: کەمێکیشی بهێڵنەوە بۆ دایکتان، و کەمێکیان بۆ هێشتەوە[2].

## ٢- پلەو مەقامی (أبو موسى) لەلای عومەری کوڕی خطاب (ﷺ):

(أبو موسى الأشعري) بەیەکێك لە پایەکانی دەوڵەتەکەی عمر دەژمێردرێت و زیرەکترین و زاناترینی هاوەڵان بوە و فەرماندەی سوپاکانی (فتح) ی قوم و قاسان و تەستەر بووە، و پاشان

---

[1] مسلم، ژمارە (٢٤٩٨).

[2] مسلم، ژ (٢٤٩٨).

بەناوبانگترین والی یەکانی بەسرە بووە و لەو کاتەیشدا خۆی بەسواری ئەسپەکەیەوە جیهادی کردووە لەڕزگارکردنی ناوچە فارس نشینەکاندا.

(کەواتە هەڵبژاردنی عەلی (ﷺ) ئەبو موسی الأشعری وەك نوێنەری خۆی کە مەسەلەی تەحکیم و ئاشتەوایی لەگەڵ موعاویەدا (ﷺ) و پیاوێکی ئا بەو چەشنەی کە پێشتر باسمان کرد ئایا جێگەی هەزار گومان نین ئەو کەسانەی بە فەقیرۆکە و گێلۆکە دای بنێن یان مەسەلەکە ئەوەنەبوو بەڵکو ئەگەر بەهیچ مەرجێکی عەمری کوڕی عاص ڕازی نەبوایە جگە لەبەیعەت بەعەلی، ئایا جەنگ دووبارە هەڵنەدەگیرسایەوە و ئەوەی مابوو لەئوممەتی محمد ئەویش تێدانەدەچوو؟ بێگومان بەڵێ، بەڵام ئاژاوەگێڕەکان ئەوەیان دەویست ئەگەر ئەوەی بکردایە، پێیان دەووت چەند ژیرو زۆرزان و دنیا دیدەو زانایە)![1]

---

[1] ووتەی وەرگێڕ.

## دووەم

## (ژیانی عەمری کوڕی عاص) (ﷺ):

ناوی عەمری کوڕی عاص ی کوڕی وائل السهمی یە، (ابن إسحاق و ابن زبیر و ابن بکار) پێیان وایە لە حەبەشەو لەسەر دەستی نەجاشی موسڵمان بووە، و لەساڵی (٨) ی کۆچیدا کۆچی کرد بۆ مەدینە ...

### ١- موسڵمان بوونی:

عەمر (ﷺ) خۆی باسی موسڵمان بوونی خۆیمان بۆ دەکات وەڵێت: کاتێ لەجەنگی ئەحزاب گەڕاینەوە، کۆمەڵێ لەپیاوانی قوڕەیشم کۆکردەوە کە لەسەر ڕاوبۆچوونی من دەجوڵانەوە، پێم ووتن: ئێوە چاك دەزانن کە من وادەبینم کاری محمد ڕۆژ بەرۆژ بەهێزترو بەرزتر دەبێت، و من ڕایەکم هەیە، ئێوە چی دەڵێن؟ ووتیان: چی یە؟ ووتم: با هەڵبێین بۆلای نەجاشی و لەژێر سایەی دەوڵەتەکەی ئەودا بژین زۆر لەوە باشترە لەژێر دەستی محمدا بژین، و ئەگەر هۆزەکەشمان سەرکەوت بەسەریدا ئەوە ئێمە داناسن و زۆر چاکە، ووتیان: ڕایەکی جوانە ..

ووتی خۆتان کۆبکەنەوەو زۆر حەزی لەدیاری یە با هەندێ پێستەی جوانی بۆ بەرین لەگەڵ خۆمان.

و پاشان بەرێ کەوتین بۆلای، ئێمە لەلای بووین ـ کاتێ (عەمری کوڕی أمیة الضمری) هات بۆلای و هەندێ قسەی محمدی بۆهێنا دەربارەی (جەعفەر) و هاوەڵەکانی.

و منیش بەهاوڕێکانی خۆم ووت: چۆنە داوای ئەو پیاوە بکەم لە نەجاشی و ئەویش دەیداتە دەستم و منیش دەیکوژم و بەم کارە خزمەتێك بەقوڕەیش دەکەم بەکوشتنی نوێنەرێکی.

بۆیە چوومە ژوورەوە و سەرم بۆ دانەواندو وتی: سڵاو لەهاوڕێم، ئایا شتێکت لە وڵاتەکەی خۆتەوە بەدیاری بۆ هێناوم؟ ووتم: بەڵێ پادشا، پێستێکی زۆرو جوانم بۆ هێناوی، و پادشا سەیری کردن و زۆر جوان بوون لەلای و دڵی گرتبوونی.

و پاشان پێم ووت: پادشا، من ئەو پیاوەم بینی کە هات بۆلات و پاشان چووە دەرەوە، ئەوە لەلایەن پیاوێکەوە هاتووە کە دوژمنی ئێمەیە، دەی بیدە دەستی من تا بیکوژم، چونکە زۆرێ لەگەورە پیاوانی لەناو بردووین، دەڵێ: پاشا زۆر تووڕە بوو، دەستی ڕاکێشاو دای بە لووتی خۆیداو

وام زانی لووتی خۆی شکاندووه، ئەگەر زەوی شەقی ببردایە دەرۆیشتم پیایداو خۆم ڕزگار دەکرد، و پاشان پێم ووت: پادشا، وەللاهی بمزانیبایە تۆ پێت ناخۆشە شتم وام لێ داوا نەدەکردی.

پادشان ووتی: تۆ دەتەوێت نوێنەری پێغەمبەرێکت پێ بدەم کە ئەو (ڤاموس)ە هاتووە بۆلای کە پێشتر بۆلای موسی هاتووە تا بیکوژیت؟ ووتی: پاشا تۆیلێ ی وابێت؟ پادشا ووتی: بێ قەزابی عەمر بەگوێم بکەو شوێنی بکەوە، چونکە ئەو وەللاهی لەسەر هەقە، و خوای گەورە سەری دەخات بەسەر ئەوانەدا کە دژی دەوەستن وەك چۆن موسی ی سەرخست بەسەر فیرعەون و سەربازەکانیدا، ووتم: دەی بەیعەتم لێ وەردەگریت لەسەر ئیسلام؟ ووتی: بەلێ. و دەستی درێژکردو منیش بەیعەتم پێدا لەسەر ئیسلام.

و پاشان هاتمە دەرەوە و مەسەلەکەم لەهاوڕێکانم شاردەوەو پاشان دەرچووم و گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر تا موسڵمان ببم و لەڕێ گەیشتم بەخالیدی کوڕی وەلید کە ماوەیەکی کەم پێشی - فەتحی مەککە و لەمەککەوە هاتبوو، پێم ووت: ئەی باوکی سولەیمان بەرەو کوێ دەچیت؟ ووتی: وەللاهی مەسەلە ڕۆشن بوویەوەو ئەو پیاوە پێغەمبەرەو من وەللاهی دەڕۆم موسڵمان دەبم، هەتاکەی؟ و منیش ووتم: وەللاهی منیش بۆئەوە هاتووم موسڵمان ببم، پێکەوە چووین بۆ مەدینەو چووینە خزمەت پێغەمبەری خواو خالید پێش کەوت و موسڵمان بوو بەیعەتیشی داو منیش چوومە پێشەوەو ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتت پێ دەدەم بەڵام بەو مەرجەی لەگوناهەکانی پێشووم خۆش ببێ، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ((یا عمرو بایع، فإن الإسلام یجب ما کان قبله، وإن الهجرة تجب ماکان قبلها)) واتە: ئەی عەمر بەیعەت بدە، ئیسلام بوون گوناهەکانی پێشوو هەمووی دەشواتەوە و کۆچکردنیش گوناهی پێشوو دەسڕێتەوە و منیش: بەیعەتم پێداو هاتمە دەرەوە[1].

## ٢- عەمر بۆماڵ و سامان موسڵمان نەبووە:

عەمر دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردی بەدوامدا و پێ ی فەرمووم ((خذ علیك ثیابك وسلاحك، ثم آئتنی)) واتە: (جل و بەرگ بپۆشەو شمشێرەکەت هەڵگرەو وەرە بۆلام) و کاتێ هاتم بۆلای دەبینم دەستنوێژ دەگرێت، و چاوێکی پێداخشاندم و پاشان چاوی داخست و فەرمووی ((انی

[1] صحیح السیرة، لا (٥٠٨) صححه الألبانی.

أريد أن أبعثك على جيش، فيسلمك الله ويغنمك، وأرغب لك في المال ورغبة صالحه)) واتـه: (مـن دەمەوێت بەفەرماندەی سوپایەك بتنێرم و خوا بێ وەیت دەكات و دەسكەوتی باشیشت دەبێـت، و تۆش سامانی باشت دەدەمێ و تووشی خێریش دەبیت) دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خـوا مـن بـۆ پارەو سامان موسڵمان نەبووم، من خۆشەویستی ئیسلام موسڵمانی كردووم و لەگـەڵ پێغەمبـەری خوادا بم، پێغەمبەریش (ﷺ) پێ ی فەرموو: ((یا عمروو نعم المال الـصالح للمـرء الـصالح))[1] واتـە ئەی عەمر چەند جوان و گونجاوە پارەو سامانی چاك بۆ پیاوی چاك.

### ٣- پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەدحی عەمر دەكات:

عەمری كوڕی عاص (ﷺ) دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوكاتەوە مـن و خالـد موسـڵمان بـووین بەموسڵمانێكی ترمان ناگۆڕێتەوە لەبواری جەنگدا[2].

طلحەی كوڕی عبدالله (ﷺ) دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفـەرموو: (( ان عمـرو بن العاص من صالحی قریش))[3] واتە: عەمری كوڕی عاص لەپیاوە چاكانی قوڕەیشە.

---

[1] سنن البيهقي (٤٣/٤).

[2] السلسلة الصحيحة (١/ ٢٤٠) ژ (١٥٦).

## سیٰ یەم

# دەقی پەیمان نامەکەی (التحکیم) :

بسم الله الرحمن الرحیم

١- ئەمە دەقی ئەو ڕێکەوتننامەیە کە علي کوڕی ئەبو طالیب و موعاویە لەگەڵ کۆمەڵانیاندا لەسەری پێك هاتوون کە هەردوولا ڕازی بن بەوەی قورئان و سوننەت حوکمیان بەسەردا بکات.

٢- علي لەباتی ئامادەو نائامادەی دانیشتوانی خەلکی عێراق و موعاویەش لەباتی دیارو نادیاری خەلکی شام ئەم ڕێکەوتنە دەکەن.

٣- ئێمە ڕازین بەهەر حوکمیٰ کە قورئان بۆمان دەردەکات و لەئەلفی یەو تا تاء، و ئەوەی قورئان بەجوانی زانی بەجوانی بزانین و ئەوەی گۆڕی نا ئێمەش گۆڕی بنێین.

٤- علي و دەستەو کۆمەڵەکەیڕازین کە عبداللە ی کوڕی قەیس نوێنەرو حەکەمیان بێت و موعاویە و کۆمەڵەکەیشی ڕازین بە عەمری کوڕی عاص (ﷺ) کە ببێتە نوێنەرو حەکەمیان.

٥- عەلی و موعاویە پەیمانی خوایان لەهەردوو نوێنەر وەرگرت کە حوکمی قورئان هەڵبژێرن و ئەگەر نەبوو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و لەو دوانە لانەدەن و دەست ئەنقەس ناکۆکی لە مەسەلەکاندا دروست نەکەن و خۆیان لەناو ـ شبهات ـ داگیر نەکەن.

٦- هەردوو نوێنەریش پەیمانی خوایان لە عەلی و موعاویە وەرگرت کە یەکسەر ڕازی بن بەهەر حوکمێك ئەمان دەگەن پیٰ ی لەقورئان و سوننەت و دژی نەوەستن و پێچەوانەی کارنەکەن و بۆیان نەبێت هیچ خالێك هەڵبوەشێننەوە.

٧- هەردوولا ئەمین دەبن لەحکومەتەکەی خۆیاندا لەسەرو ماڵ و هەموو شتێکیان و ئوممەتیش پالپشتیان دەبێت لە ڕازی بوونیان بەحوکمی قورئان.

٨- ئەگەر یەکێ لەنوێنەرەکان لەم ماوەیەدا مردن، بۆ لایەنەکەی تر هەیە کەسێکی تر دیاری بکات لەشوێنیدا کە پیاوچاك و خواناس بێت.

٩- ئەگەر لەم ماوەیەدا یەکێ لە ئەمیری لایەنەکان مرد، بۆ لایەنەکەی تر هەیە ئەمیرێك دیاری بکات خۆیان پێ ی ڕازی بن.

١٠- ئەم قەزیەیە لەنێوان هەردوولا ڕووی داوەو ڕێکەوتوون لەسەر جەنگ نەکردن.

١١- ئەم ڕێکەوتنە ـ تەحکیم ـ واجب بووە لەسەر هەردوولا و هەردوو ئەمیرو هەردوو نوێنەرو هەرکەسێك خۆی لێ لابدات و کاری پێ نەکات ئەوە ئوممەت بۆی نی یە بەقسەیان بکات و دەتوانێت لەعەهدو پەیمانیان دەربچێت.

١٢- تا ماوەی دیاری کراو هەموو خەلکی لەسەرو مالّیان ئەمینن و چەك دادەنرێت و نادیاری ئوممەت ـ غائب ـ، وەك دیارو ئامادە حوکم دەیانگرێتەوە.

١٣- هەردوو حەکەم دانیشتنەکانیان لەشوێنێکدا ئەنجام دەدەن کە ناوەندبێت لەنێوان عێراق و شام دا.

١٤- هەردوو حەکەم نەهێلّن کەس ئامادەی دانیشتنەکانیان بێت مەگەر کەسێك خۆیان پێیان خۆش بێت و پێ ی ڕازی بن.

١٥- ماوەی دانیشتنەکان تا ماوەی ڕەمەزان دەبێت و ئەگەر هەردوو حەکەم بەپێویستیان زانی حوکمی کۆتایی پێش دەخەن یان دوای دەخەن.

١٦- ئەگەر هەردوو حەکەم تا ماوەی دیاری کراو ـ تا مانگی ڕەمەزان ـ نەگەیشنە ئەنجامێکی باش ـ لەحوکمی قورئان ـ ئەوا هەردوولا وەك سەردەمی جەنگەکانیان لێ دێتەوە و ڕێکەوتننامە لەئارادا نامێنێت.

١٧- ئوممەتیش پەیمان و بەلّێنی خوایان لەسەرە لەم کارەدا، و هەموو یەکدەستن بەرامبەر ئەو کەسەی بێ باوەڕ یان ستەمکاری یان بەدڕەوشتی دەنوێنێ بەرامبەر ئەم ڕێکەوتننامەیە.

و ئەم ڕێکەوتننامەیە ئیمزا کرا بەشایەتی کۆمەلّێکی زۆر لەهاوەلّان و موسلّمانان بەگشتی لەوانە (حسن و حسین) و عبدالله ی کوڕی عباس و عبدالله ی کوڕی جعفر و الأشعث ی کوڕی قەیس و

الأشتری کوڕی حارث، سەعیدی کوڕی مەتسی هەمـەدانی و طفیـل و حـصین و عـوف و کـوڕانی حارث ی کوڕی عبدالمطلب و عبدالله ی کوڕی خباب ی کوڕی ئەرەت و عتبەی کوڕی ئەبو سـفیان و محمدی کوڕی ئەبو سفیان و لـەڕۆژی چوارشـەممەی (١٣) مـانگی صـفر ی سـالّی ٣٧ ی کۆچـی نوسرایەوە.

## چوارەم

# بەسەرهاتی (التحكيم) و لاوازیەکانی لەچەند لایەنێکەوە:

١ـ هەموو ڕێگاکانی ڕاویەکانی لاوازن، و بەهێزترینیان ئەوەیە کە بەسەنەدی زوهەری کە هەموو ڕاویەکانی جێگەی متمانەن بە (مرسل)ی دەیگێڕێتەوە:کە خەڵکی شام قورئانیان هەڵبڕی و خەڵکی عێراقیش هەبیەتی قورئانەکە چەکی پێ دانان و هەردولا ڕازی بوون قورئان حەکەم بێت لە نێوانیاندا، و هەردولا یەکی حەکەمێکیان بۆ ئەو مەسەلەیە دیاری کرد، و بڕیاریان دا قورئان کێ هەڵبڕێ هەڵی بڕن و کێ ی دابەزان دایبەزێنن، و بڕیاریان دا لە (دومة الجندل) کۆببنەوە وە ئەو ساڵە بۆیان نەکرا لەوێ کۆببنەوە بۆ ساڵی ئاینەدە لە (ئەزرەح) کۆبوونەوە،و لەو کاتەوە ـ حەروریەکان ـ لە عەلی جیابوونەوە و دەستیان کرد بە جەنگ و هەرا لەگەڵیدا.

و ئیتر هەموو ڕێگاکانی تری ئەم مەسەلەیە لاوازە چ لە دەقی ووتەکاندا و چ لەسەنەدو پیاوەکاندا.

## ٢ـ زانایان زۆرگرینگیان پێ نەداوە:

لەبەر ئەوەی بە سەنەدێکی صحیح ەوە نەگەیشتۆتە دەستمان ، مەحاڵە زاناکان پشتی پێ ببەستن لەمەسەلە فیقهی یەکاندا لەگەڵ زەرورەتی و پێداویستیشیان پێ ی .

## ٣ـ موعاویە(ﷺ) دانی ناوە بەوەی عەلی(ﷺ) شایستەترە لەو:

هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان موعاویە کێ بەرکێ ی خیلافەتی لەگەڵ عەلیدا نەکردووە و لەگەڵ مانی عەلیدا لە ژیان ئەو هەرگیز داوای بەیعەت و خیلافەتی بۆخۆی نەکردووە.

یحیی ی کوڕی سولەیمانی الجعفی بەسەنەدێکی (جید)[1] ەوە نقلی دەکات و دەڵێت: لە ئەبی موسلم الخولانی یەوە کە پرسیاری لە موعاویە کردووە: ئایا تۆ کێشمە کێشمی خیلافەت لەگەڵ

[1] فتح الباری (١٣/ ٨٦).

عەلیدا دەکەیت یان تۆ خۆت بەئاستی ئەو دەزانیت؟ ووتی: نــەء، و مــن چـاك دەزانم ئـەو لـەمن باشترەو شایانتریشە بەم کارە، بەڵام ئەی ئێوە نـازانن کـە عثمـان بەسـتەم شـەهیدکراوەو منـیش ئامۆزایم و خاوەنی خوێنی ئەوم؟ بڕۆن بۆلای عەلی و پێ ی بڵـێن: بـا بکـوژانی عوسمانـان بداتـە دەست و ئێمەش خۆمان دەدەینە دەستی ئەو، و ئەوانیش چوون بۆلای عەلی و قسەیان لەگەڵ کرد بەڵام ئامادەنەبوو بیانداتە دەستیان[1].

و ئەمە هۆی سەرەکی هەموو نـاکۆکی یـەکانی نێـوان عـەلی و موعاویـە بـوو و کـاری (التحکیم) یش بۆ ئەم مەسەلەیە هاتە ئاراوە و نەك لابردنی خەلیفە و هەڵبـژاردنی خەلیفەیـەکی تر[2]. کەواتە وەك ابن حزم دەڵێت جەنگی ئەمیری باوەڕداران دژی موعاویەو دەسەڵاتی شام لەسـەر ئەوەبوو کە خیلافەتی ئیسلامی کە عەلی (ﷺ) لێپرسراوی بوو دەستی نەدەڕۆیـشت بەسـەر ئـەو ناوچەی ژێر دەستەڵاتی موعاویەداو ئەمیش ئەمیر المؤمنین بوو ـ واجب ـ بۆ گوێڕایەڵی کردن.

٤- هەموو مەرجەکانی خیلافەت لە عەلیدا هەبووە:

وەك دادپەروەری و زانایی، سیاسەت مەداری، و بەرژەوەندی زانی خەڵکی و دەبێ خەڵکی قورەیشیش بێت. و هەموو ئەم خاڵانەدا لە عەلی دا (ﷺ) هاتبوونەدی، موهـاجرین و ئەنـصار و ئەهلی حەل و عەقد هەڵیان بـژارد وەکـەس ناتوانێـت لای بـەرێت مەگـەر ئەوانـەی کـە هـەڵیان بژاردووەو ئەوانیش لەخۆیانەوە ئەو کارە ناکەن بەڵکو دەبێت بەجوانی ڕوون ببێتـەوە کـە خەلیفـە ئەو مەرجانەی تێدا نەماوە ...

ئەگەر هەرکەسێك و هەندێ ڕەخنەی لە خەلیفە هەبێت و بتوانێت بەو هۆیەوەلایبەرێت ئـەوا هـیچ مانایەك بۆ خەلیفەی موسڵمانان نامێنێت.

خۆ ئیمام عەلیش (ﷺ) هەرگیز نەگۆڕاوەو تـا مـردن هـەر لەسـەر دادپـەروەری و خێـرو چـاکەو خزمەتگوزاری لێبڕان بووە.

[1] سیر اعلام النبلاء (١٤٠/٣).

### ٥- سەردەمی (تەحکیم) سەردەمی ئاشوب بوو:

ئەو دەمەی بڕیاری (تەحکیم) درا لەنێوان ئەو دوو لایەنە شەڕکەرەدا سەردەمێکی پڕ لەئاژاوەو ئاشوب بوو، کەس بە کەسەوە نەبوو، جا ئەمە هێشتا خەلیفەش هەبوو، جا ئەی ئەگەر خەلیفە لابرایە چی ڕووی دەدا؟ بێگومان وەزعەکە بەرەو خراپترو شپرزەتر دەبوو، هاوەڵانی پێغەمبەریش (ﷺ) زۆر لەوە ژیرتربوون کە وەزعێکی ئاوا بخولقێنن.

### ٦- عومەری کوڕی خطاب (ﷺ) پێش شەهیدبوونی: شایستەکانی خیلافەتی لەشەش کەسدا

بینی یەوەو هەموو ئەنصارو موهاجرین بەوە ڕازی بوون و ئەوەش مانای ئەوەبوو نابێت لەو کەسانە دەربچێت بۆ کەسانی تر، و لەسەردەمی عەلیدا (ﷺ) تەنها یەك كەس مابوویەوە کە ئەویش (سعدی کوڕی ئەبی وقاص) بوو بەڵام سەعد خۆی نەیدەویست و خۆی لەبەرپرسیارێتی بەدوور دەگرت و پلەوپایەی دنیایی نەدەویست و کاتێ عمری برای پێ ی ووت: خەڵکی خەریکی دەستکەوتنی پۆست و بەرپرسیارێتی یەکانن کەچی تۆ لێرەدا خەریکی ئاژەڵداریت؟ سەعد دای بەپشتی عمری برایدا ووتی: خوا بەندەیەکی لەخوا ترسی شاراوەی خۆش دەوێت، کەواتە عەلی (ﷺ) بەهەموو پێوانەیەکی خەلیفەیی شایستەی ئەمیری موسڵمانان بووەو تەحکیم بۆ لابردن و هەڵبژاردنی خەلیفە نەبووە[١].

### ٧- هەموو ڕیوایەتەکان باس لەوە دەکەن کە بەیعەت دانی شام بەموعاویە دوای شەهیدکردن عەلی بوو:

(ابن عساکر) بەسەنەدێکی واوە کە هەموو پیاوەکانی جێگەی متمانەن لە سەعیدی کوڕی عبدالعزیز التنوخی[٢] یەوە دەڵێت: عەلی (ﷺ) لەعێراق بوو پێ ی ووتراوە (أمیر المؤمنین) و موعاویەیش لەشام پێ ی ووتراوە (ئەمیر)، و پاش ئەوەی عەلی ـ شەهید ـ کرا ئیتر خەڵکی شام بەموعاویەیان دەووت: ئەمیر المؤمنین[٣].

---

[1] مرویات تأریخ ابی مخنف، لا ٤١١.

[2] تنوخی زاناترین کەس بووە لە نیش و کاری شام.

[3] تاریخ الطبری.

## پێنجەم/ هەڵوێستی ئەهلی (سوننە) لەو جەنگانەدا:

ئەهلی (سوننەو جەماعە) هەڵوێستیان بەرامبەر ئەو جەنگانەی لەناو هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ڕووی داوەئەوەیە هیچ نەڵێین لەو بارەیەوە مەگەر شتێك کە شایستەی ئەو بەرە ناوازە قورئانی یە بێت، چونکە قسەکردن لەو مەسەلانەدا زیاتر ڕق و کینە دروست دەکات و دوژمنایەتی جێگیر دەکات و لەوبارەیەوە وتوویانە:

(لەسەر هەموو موسڵمانێك واجبە هەموویانی خۆش بوێت و لێیان ڕازی بێت و داوای ڕەحمەت و بەزەیی خوایان بۆ بکات و کرداره چاکەکانیان بپارێزێت، و دان بەپلەو مەقام و پێشینەیاندا بنێت و چاکەو بەرزیەکانیان لەناو خەڵکدا بڵاوبکاتەوە، و ئەوەی لەناویاندا ڕووی دا لە مەسەلەی ـ ئیجتیهاد ـ ەوە بووە و هەموویان پاداشتی خۆیان هەیە چ پێکابێتیان یان بەهەڵەدا چووبن، و بکوژو کوژراوەکانیان لەبەهەشتی خوادان، بەڵام ئەوەندەهەیە پاداشتی ئەوانەی پێکاویانە دوو بەرامبەری ئەوانەیە کە بەهەڵدا چوون.

و ئەهلی سوننە ڕێگەیان نەداوە بە موسڵمانان لەو مەسەلانەی لەناو هاوەڵاندا ڕوویدا قسەو گفتوگۆ بکەن، و پێش ئەوەی هەندێ وتەی زانایان بهێنین لەوبارەیەوە با هەندێ دەقی قورئان و سوننە باس بکەین کە دەربارەی ئەو شەڕو ناکۆکیانەی ناو هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرمووێت ((وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ))" الحجرات/٩"

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای پەروەردگار فەرمان بەسەر موسڵماناندا دەدات کە ئەگەر ئاژاوەو شەڕو ناخۆشی کەوتە نێوان دوو تاقم لە موسڵمانان هەوڵ بدەن ئاشتی و صوڵح بخەنەوە نێوانیان چونکە ئەوان برای یەکن، و ئەم جەنگ و لەیەکتری کوشتنە لەبازنەی بیرواوەڕ ناچنە دەرەوە چونکە خوای

ـ عز وجل ـ به ـ مؤمنين ـ ناويان دەبات و ئەگەر لەناوهەموو موسلّمانانيشدا جەنگ وەرا دروست بوو ئەوا هەردەبێت هەولّ بدرێت ئاشتی و پێکهاتن بخرێتەوە نێوانیان[1].

٢- له ئەبی سەعید (الخدری) یەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((تمرق مارق عند فرقه من المسلمين تقتلهم أولى الطائفتين بالحق))[2] واتە: تاقمێك لەموسلّمانان جیادەبنەوە و کۆمەڵێکی تر جەنگیان لەگەڵ دەکەن کە لەحەقەوە نزیکترن.

ئەو تاقمەی لەفەرموودەکەدا ئاماژەیان بۆکراوە ئەو ناکۆکی یەیە کە کەوتە نێوان علي و موعاویە، وەسفی هەردوو لایان دەکات بە (مؤمنين) و هەردووکیان مەبەستیان هەق و ڕاستی یە ... فەرموودەکە موعجیزەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکرا دەکات کە چۆنی فەرموو بەو شێوەیە هاتەدی، و هەردوولای بە موسلّمان داناوە ئەمەش بەپێچەوانەی تاقمی ڕافیزەکان کە دەڵێن خەڵکی شام بێ باوەڕ بوونەوە، و تیایدا واش دەردەخات کە کۆمەڵەکەی عەلی (ﷺ) زیاتر لەسەر هەقن، و عەلی (ﷺ) لە ئیجتیهادەکەیدا دووجار پاداشتی بۆ دەنووسرێت لەلای خوا، بەڵام موعاویەو ئەهلی شام یەکجار پاداشتیان هەیە چونکە عەلی پێکای بەڵام موعاویە لە ئیجتیهادەکەیدا نەیپێکا. وپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إذا إجتهد الحاكم فأصاب فله أجران وإذا إجتهد فأخطأ فله أجر))[3]

٣- (ئەبی بەکرە) (ﷺ) دەگێڕێتەوە و دەڵێت لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتاری دەدا ـ حەسەنی کوڕی عەلی هات و پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لعل هذا سيد ولعل الله ان يصلح به بين فئتين من المسلمين))[4] واتە: بەڵکو ئەمە دەبێتە گەورەو بەڵکو خوا بەبۆنەی ئەمەوە ئاشتی دەخاتە نێوان دوو کۆمەڵی موسلّمانان.

فەرموودەکە ئاماژە بۆ ئەوەدەکات کە خەڵکی شام و خەڵکی عێراق موسلّمانن و ڕەدێکی زۆر بەهێزیشە بۆ (خەواریج) کە دەیان ووت عەلی و خەڵکی عێراق و موعاویەو خەڵکی شام

---

[1] العواصم من القواصم، لا (١٦٩-١٧٠). أحكام القرآن (١٧١٧/٤).

[2] مسلم (٧٤٥/٢).

[3] البخاري — في فتح الباري (٣١٨/١٣).

[4] البخاري، كتاب الفتن، ژ (١٧٠٩).

هەموویان کافر بوونە چونکە فەرموودەکە شایەتی موسڵمانەتی هەردوولای دا، بۆ سوفیانی کوڕی عیینە، دەڵێت: ووشەی (دوو تاقم لەموسڵمانان) زۆر جێگەی دڵخۆشی یە لەلامان.
و بەیهەقی دەڵێت: پێ ی سەرسام و دڵخۆش بوون چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردوو لایان بە موسڵمان دادەنێت و ئەوەش ـ موعجیزەیەکی تری پێغەمبەرمانە (ﷺ) و بەو کارەش ئاشتی خستەوە نێوان عێراق وشام[1].

* هەڵوێستی زاناو دەستەڵات دارانی ئیسلام دەربارەی ئەو جەنگانە:

١- پرسیاریان کرد لە (عمری کوڕی عبدالعزیز) (ﷺ) دەربارەی ئەو شەڕو کوشتارەی کەوتە نێوان هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: ((ئەوە خوێنێکە خوای گەورە دەستی ئێمەی لێ پاراست با زمانیشی لێ بپارێزین[2])) و بەیهەقی لەسەر ئەو ووتەیە تالیقێکی جوانی هەیە و دەڵێت: قسەیەکی زۆر جوانە چونکە بێ دەنگی بۆپیاو زۆر باشە لەو شتانەی پەیوەندە بەوەوە نی یە[3].

٢- لە (حسن البصری) پرسیارکرا دەربارەی شەڕو کوشتاری ناو هاوەڵان لەوەڵامدا ووتی: جەنگێك بوو هاوەڵانی محمد (ﷺ) بەشداریان کرد وئێمە لەوێ نەبووین، و ئەوان دەیانزانی ئێمە نایزانین، یەکیان گرت شوێنیان کەوتین، و جیابوونەوە ئێمە وەستاین.

٣- لە جعفر (الصادق) یان پرسی دەربارەی ئەو جەنگانەی ناو هاوەڵان و لەوەڵامدا ووتی: منیش هەر ئەوە دەڵێم کە خوای گەورە فەرموویەتی ((عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي فِي كِتَابٍ لا يَضِلُّ رَبِّي وَلا

---

[1] الاعتقاد للبیهقی، لا ١٩٨.
[2] الانصاف، باقلانی، لا ٦٩.
[3] مناقب الشافعی، لا ١٣٩.

يَنسَى)) "طـه/٥٢" واتە: ((شارەزایی دەربارەی ئەو مەسەلەیە لەلای پەروەردگارمە لـەلای خـۆی نووسراوەو خوایش هیچی لیّ وون نابیّت و هیچی لیّ ناشیّویّت))[1].

٤- دیسان لەو بارەیەوە لە أحمدی کوڕی حەنبەلیان پرسی، لەوەڵامدا ووتی: چاکەنەبیّت لـەبارەیان هیچ ناڵیّم، و جاریّکی تر پیاویّك لەوەی نیّوان علي و موعاویە پرسیاری کرد، و ئەویش پشتی لیّ هەڵکدو پیّیان ووت ئەم پیاوە هاشمیە، لەوەڵامدا ئەم ئایەتەی بۆ خویّندەوە ((تِلْكَ أُمَّـةٌ قَـدْ خَلَـتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُمْ مَا كَسَبْتُمْ وَلا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ)) "البقرة/١٣٤" واتـە: ((ئەوانـە گەلانیّك بوون ڕۆشتوون هەرچیان کردووە بۆخۆیانـەو ئیّـوەش هەرچـی بکـەن بۆخۆتانـەو پرسـیار مەکەن لەوەی ئەوان کردوویانە)).

٥- ابن تیمیە سەبارەت بەوەی ناوهاوەڵان ڕووی دا دەڵیّـت: ((ئـەهلی سـوننەو جەماعـە دەمـی خۆیان دەگرن لەقسەکردن لەوبارەیەوە و دەڵیّن: هەرچی ووتراوە لەو بارەیـەوە کـە باسـی خراپیـان دەکات یان بۆیان هەڵبەستراوە یان لیّیان لابراوەو ئەوەیشی ـ صحیحە ـ دەربارەیان بیانوویـان بـۆ بنیّینەوەو بڵیّین لەئیجتیهادیاندا لەنیّوان پیّکان و هەڵەدا بوون))[2].

٦- (ابن کثیر) یش دەڵیّت: ((هەندیّ ناکۆکیـان مەبەسـتدار نـەبوو ـ عـن قـصد ـ وەك جـەنگی جەمەل، و هەندیّ ناکۆکی تریان لە ئیجتیهادەوە بووە وەك (صفین) و ئیجتیهادیش خیّـرە بپیّکـیّ یان بەهەڵەدا بچیّت))[3].

## ئاگاداری لە هەندیّ کتیّب کە میّژووی هاوەڵانیان شیّواندووە:

یەکەم – (الامامة والسیاسة) دراوەتە پاڵ (ابن قتیبة) :

ئەم نووسراوە یەکیّکە لەو کتیّبانەی کە ڕۆڵیّکی ترسناکی هەیە لە شـیّواندن وتیّکـدانی میّـژووی هاوەڵانی بەڕیّزی پیّغەمبەری خوا(ﷺ)، لەم بارەیەوە دکتۆر عبداللە عەسیلان لە کتیّبەکەیدا کـە

[1] الجامع لأحكام القرآن (٣٣٢/١٦).
[2] هەمان سەرچاوە (٣٣٢/١٦).
[3] الانصاف فيما يجب اعتقاده، لا ٦٧.

به ناوی (الامامة والسياسة في ميزان التحقيق العلمي) دايه به كۆمەڵێكبەڵگەوە دەیسەلمێنێت كه ئەو كتێبه به ناڕەواو درۆ دراوەته پاڵ زانای خوا ناس (ابن قتيبة) ، لەو بەڵگانەیش

أ — هەموو ئەوانەی له كۆندا باسی (ابن قتيبة) یان كردووه كه سیان ئاماژەیان بۆ ئەوه نەكردووه كه كتێبێكی مێژوویی بەو ناوەوه هەبێت ، بەڵكو جگه له كتێبی (المعارف) كه تاكه كتێبێكه ئەو زانایه دەربارەی مێژوو نووسیبێتی.

ب — هەركەسێ لاپەڕەكانی ئەو كتێبه هەڵبداتەوه هەست بەوه دەكات كه (ابن قتيبة) له دیمەشق‌ومەغریبی عەرەبیدا ژیاوە! ،له كاتێكدا كه ئەو پیاوه به درێژایی ژیانی له بەغدا دەرنەچووه مەگەر بۆ دەینوور نەبێت.

ج — ئەو شێوازوڕێڕەوەی (الامامة والسياسة) ی لەسەر نووسراوه زۆر پێچەوانەیه لەگەڵ نووسینەكانی (ابن قتيبة)دا كه لەبەر دەستماندایه ، چونكه ابن قتيبه پێشەكی دووردرێژی داناوه بۆ هەموو نووسراوەكانی وتیایدا مەبەست له نووسینەكانی‌و پرۆگرام‌وڕێڕەوی نووسینی خۆی ڕوون كردۆتەوه ، كەچی نووسەری كتێبی (الامامة والسياسة) پێشەكیەكی زۆر كورتی نووسیوه كه له سێ دێڕ زیاتر نییه ، ئەمەش جگه لەشێوازی دانان‌ونووسینەكەی كه له هیچ نووسینێكی (ابن قتيبة) ناكات.

د — نووسەر ئەو كتێبه وا دەر دەخات كه گوایه ڕاستەوخۆ له زاری (ابن ابی ليلی)وه وەریگرتووەۆئەم (ابن ابی ليلی) یه زانیاكی فیقهزان‌وقازی كوفه بووه وله ساڵی ١٤٨ی كۆچیدا له دنیا دەرچووه،وشتێكی زانراویشه كه(ابن قتيبه)تا ساڵی ٢١٣ی كۆچی له دایك نەبووبوو،كه دوای مردنی (ابن ابی ليلی) دەكات به (٥٦) ساڵ!.

ه — ئەو ڕاوی‌وماموستایانەی كه (ابن قتيبة) له هەمو كتێبەكانیدا ناویان دەبات ولەوانەوەمەسەلەكان دەگێڕێتەوەلەم كتێبەدا بوونیان هەر نی یه.

و — زۆرێ له ڕیوایەتەكانی ئەم كتێبه به شێوەی نەخۆش‌ولاوازهاتووه كه زۆربەیان بەو جۆرەیه،له هەندێ له میسریەكانەوه دەگێڕنەوه !،له محمدی كوڕی سولەیمان وئەویش له هەندێ له ماموستاكانی میسرەوه دەگێڕنەوه لیان هەندێ له ماموستایانی مەغریب بۆیان باس كردوین !

یان لە هەندێ لە مامۆستاکانەوە دەگێڕنەوە ! هەندێ لە مامۆستایان بۆیان باس کردوین! ئەمەو چەندان دەستەواژە و شێوازی (ابن قتیبة) ناکات ولەنووسینەکانیدا بوونیان نییە.

ز — دانەری کتێبی (الامامة والسیاسة) لە دوو زانا گەورەی میسرەوە شت دەگێڕێتەوە ، کە لە کاتێکدا ابن قتیبە پێی نەخستۆتە میسر لەو دووزانایەوە هیچی وەرنەگرتووە!

ح — (ابن قتیبة) لە لای زانایانی ئیسلام پلەوپایەیکی بەرزی هەیەوبە(اهل السنة)ی ناوەزەد دەکەنومتمانەیان هەیە بە زانست ودینداری یەکەی ، وەك (السلفي) دەڵێت (ابن قتیبة) یەکێکە لە متمانە پێکراوەکان و ئەهلی سوننەتە.

ئین حزم یش دەڵێت : زانستودینداریەکەی جێگای متمانەبوو ، و(الخطیب البغدادي) یش بەو شێوەیە دەڵێت.

(ابن تیمیة)ش دەڵێت : (ابن قتیبة) لەو کەسانەیە کە سەر بە(احمد)و(اسحاق)دادەنرێتوبەسەرخەرانی سوننەت ناوی دەرکردووە ، دەی کەسێك خاوەنی ئاوا پلەوپایەومتمانەبێتلە لای زانایانی ئیسلام کەی ڕەوایەوکەی ماقوڵە نووسەری (الامامە والسیاسە) بێت کە مێژووی جوان وزێڕینی هاوەڵانی پێغەمبەرمان(ﷺ)بشێوێنێت و شتیان بەدەمەوەهەڵبەسێت؟!

دکتۆر عەلی نەفیع (العلیانی)لە کتێبی (عقیدة الامام ابن قتیبة)لە ڕوانگەی کتێبی (الامامة والسیاسة) دا دەڵێت: پاش ئەوەی بە ووردی کتێبی (الامامة والسیاسة)م خوێندەوەوبەجوانی لێی کۆڵیمەوە بۆم دەرکەوت کە نووسەری ئەو کتێبە شیعەیە، وویستوویەتی ئەم کتێبە بئاخنێتە ناو کتێبەکانی ( ابن قتیبة)وبەو ڕێگایە بتوانێت ڕێزێکی بۆ پەیدا بکات چونکە(ابن قتیبة) لە لای مەغریبیەکان زۆر بەرزوبەڕێزبووە،ئەوەی ئەوە دەسەلمێنێ کە نووسەرەکەی شیعەبووە ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بووە:

١- نووسەری کتێبی( الامامة والسیاسة) لەسەر زمانی عەلی کوڕی ئەبو طالیب کە بە کۆچەریانی وتووە دەڵێت (توخوا ، توخوا ئەی کۆمەڵیکۆچەریان،دەستەلاتی محمد لە بنەماڵەکەی دەرمەکەن ،سوێند بەخوا ئەی کۆچەریانئێمەوەك (اهل البیت)لە هەمو کەس

شایانترین بەو کاپلەیە- خیلافەت- وئێمە لە ئێوە زیاتر بەو کارە شایانین ،سوێند بـەخوا ئەو کارە هی ئێمەیە دەی شوێن ئارەزواتتان مەکەون گومڕا دەبن لە ڕێگەی خودا.

٢- نووســـەری (الامامـــة والـــسیاسة) زۆر پـــیس دابەزیوەتـــە ســـەر هـــاوەلاّنی پێغەمبەر(ﷺ)ولەکەداری کردوون (ابن عمر) بەترسنۆك!! وسەعدی کوڕی ئەبوو وەقـاص بە حەسوود!! دەزانێت ، وباسی محمدی کوڕی سەلەمە دەکـات گوایـە لـە عـەلی کـوڕی ئەبوطالیـب توڕە بووە لەسەر ئەوەی کە لە خەیبەردا – مەرحەبی – جولەکەی کوشـتووە !وگوایەعائیشە خـوا لێـی رازی بێـت فـەرمانی کوشـتنی عوسمـانی دەرکـردووە!.ودەی لەکەدارکردنی هاوەلاّنی پێغەمبەر(ﷺ)لە شێوازو ڕەوشتی شیعەکانە ئیتر با خەواریجیش لەسەر ئەو بۆچوونە بن چونکە خەواریج هاوەلاّن بـە گـشتی لەکـەدار ناکـەن وەك ئـەوان دەیکەن.

٣- دانەری الامامە والسیاسە باسی ئەوە دەکات گوایە (مختار)ی کوڕی (ابی عـبید)بە دەستی (مصعب)ی کوڕی (زوبیر)کوژراوە ، چونکە پشتیوانی بنەماڵـەو ئالوبـەیتی پێغەمبـەری خوای کردووە وئیتر باسی ئەو قسە پڕوپووچانەی ناکات کـە دەیـووت نیگـام (وحـی)بـۆ دێت.

دەی بەس شیعەکان موختاریان خۆش دەوێت چونکە تۆڵەی لە بکوژانی حوسەین کـردەوە ،دەی لەگەڵ ئەوەدا کە (ابن قتیبة) وا باسی ئەو موختـارە دەکـات کـە لـە یاساوسـنور دەرچوویووەووای بلاّوکردۆتەوەکە جوبرەئیل دێت بۆ لای.

٤- نووسەری (الامامة والسیاسة) دەربارەی ژیانو سەردەمی سـێ خلیفـەی یەکـەم نزیکـەی (٢٥)لاپەڕەی نووسیوە لبەلاّم لەسەر ئـەو فیتنەوناکۆکیـەی لـە نـاو هاوەلاّنـدا ڕووی دا (١٠٠)لاپەڕی نووسیوە !،کە ئەونووسەرە هەستاوە مێژووی پرشنگداری هاوەلاّنی کـورت کردۆتەوەومێژووی شـەڕوناکۆکی یەکـەی ناویـانی گـەورەکردووەودەیان پـەڕەی پـێ ڕەش کردۆتەوە کە زۆربەیان هەلّبەستراون یان زۆر لاوازن وئەمەش لە ڕەوشتی شـیعەکانە پـەنا بە خوا.

٥- سەید محمود شکری (الالوسي) لە (مختصر التحفة الاثنا عشرية)دا دەڵێت یەکێ لە فێڵەکانیان -واتە ڕافیزەکان- ئەوەیە دێن بزانن چ زانایەکی گەورەی ئەهلی سوننە هەیەوهاوکات ئەوانیش بەوناوەوە کەسێکی نووسەریان بوبێت ئەوە هاتوون هەموو قسەو ووتار وبۆچونەکانی شیعەکەیان داوەتە پاڵی ئەو زانا سوننە پایەدارە،بۆ نمونە (الامام السدی) دوو پیاون یەکەمیان (الامام السدی الکبیر)ودووەمیان(السدی الصغیر)ویەکەمیان لە زانا باوەڕ پێکراوەکانی ئەهلی سوننەوجەماعەیەوبەلاّم دوەمیان لە فەرمودەهەڵبەستە درۆزنەکانی ڕافیزەیەوهەروەها(ابن قتيبه)یش دوانن یەکەمیان (عبدالله بن قتيبه)ی ڕافیزی یەو دووەمیان عبدالله ی کوڕی مسلم ی کوڕی قتيبەیەولە زانا خاوەن متمانەکانی ئەهلی سوننەیەوکتێبێکی هەیە بەناوی (المعارف) وئەو عبدالله ڕافیزیەیش بۆ سەر لێتێکدان کتێبێکی نووسیوە بە هەمان ناو(المعارف)لبۆ چەواشەکردنی خەڵکی!!.

٦- کەواتە بەمەدا بۆمان دەردەکەوێت نوسەری کتێبی (الامامه والسياسه) لە نووسینی ابن قتيبه ڕافیزیەکەیە نەك ابن قتيبه سونی یە خاوەن متمانەکە وئا بەو جۆرە شتەکانیان تێکەڵ کردووەوناوەکانیان تێکەڵ کردووەوخەڵکیش لێ ی تێك چووە، والله اعلم.

دووەم - نهج البلاغه:

(نهج البلاغه) یەکێکە لەو نوسراوانەی کە ویستوویەتی ڕووی گەشی هاوەڵانی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) ناشیرین بکات و ئەم کتێبە (لەسەنەدو مەتن)دا ڕەخنەی زۆری لەسەرە. شیعەکان دەڵێن ئەم کتێبە (شريف الرچى) دایناوە، ئەم شەریفەیش لەلای زانایانی فەرموودە قبوڵ کراو نی یەو ئەگەر سەنەدیش بهێنێت، چجای ئەگەر بەبێ سەنەد و لەسەر هەواو ئارەزوی خۆی قسە ڕێك بخات وەك لە (نهج) دا کردوویەتی.

بەڵام تاوانباری یەکەم لەلای (زانایانی فەرموودە) براکەیەتی کە ناوی (عەلی الرچى) بووە:

١- (ابن خلكان) سەبارەت بەژیانی (شریف المرتچی) دەڵێت: خەڵكی جیاوازیـان هەیـە لـە (نهـج البلاغە) دا كە ئایا هەمووی ووتەی ئەمیری باوەڕدارانە؟ ئایا خـۆی كـۆی كردۆتـەوە یـان عـەلی برای[1]، دەڵێن هیچی ووتەی ئیمامی عەلی نی یە بەڵكو ئەوەی كۆی كردۆتەوەو ئەوەی داویەتی یە پاڵی عەلی كوڕی ئەبو طالیب هەرئەوەش دایناوە[2].

٢- (الزهبی) دەڵێت: ئەوەی كتێبی (نهج البلاغە) بخوێنێتەوە دڵنیا دەبێت لـەوەی كـە درۆكـراوە بەدەمی ئەمیری باوەڕدارانـەوە عـەلی كـوڕی ئـەبو طالیـب (ﷺ) جنێـوی ئاشـكرای تێدایـە، و دەمكوتان بۆ هەردوو جێنشینی یەكەم و دووەمی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ـ أبـو بكـر و عمـر ـ بەئاشكرا هاواردەكات، و هەندێ دەستەواژەی رەكیك و لاوازی تێدایـە كـە هەركەسـێ شـارەزایی هەبێت دەربارەی نەفسیاتی صحابە قورەیشی یـەكان، بەتـەواوی بـۆی دەردەكـەوێت كـە زۆربـەی ناڕەوایە[3].

٣- (ابن تیمیە) دەڵێت: هەموو زانایان دەزانن كە زۆربەی ئـەو وتارانـەی لـە (نهـج البلاغـە) دا هـاتووە بـەدەم عـەلی یـەوە هەڵبەسـتراوە، و لـەهیچ كتێبێكـی كۆنـدا زۆربـەیان نـەهاتوون و سەنەدەكانیشیان نەزانراون[4].

٤- (ابن حجر) یش دەڵێت: ئەوەی (مطالعة)ی (نهج البلاغة) بكات لەوە دڵنیا دەبێت كە درۆیـەو بەدەم ئەمیری باوەڕدارانەوە هەڵبەستراوە ..... و زۆربەی ناڕەوایە[5].

زانایان لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە گومانیان لەو كتێبە هەیە كە عەلی (ﷺ) ئاگـاو خەبـەری لێ ی بێت، لەوانە:

١- یان سەنەدی نی یە یان سەنەدەكان زۆر لاوازن.

---

[1] الباعث الحثیث، لا ١٨٢.
[2] الأدب الإسلامی، نایف معروف، لا ٥٣.
[3] الوفیات (١٢٤/٣).
[4] میزان الاعتدال (١٢٤/٣).
[5] منهاج السنة (٢٤/٤).

٢- ووتاری دوورو درێژ کە کێ ئەم هەموو وتارەی عەلی لەبەرکرد! کە زۆربەی وتارەکانی پێغەمبەری خوایش (ﷺ) لەبەرنەکراون.
٣- زۆر وتاری تێدایە کە کتێبە باوەڕپێکراوەکان داویانەتە پاڵ کەسانی تر جگە لە عەلی (ﷺ).
٤- کۆمەڵێ قسەو توانجی تێدایە بۆ خەلیفەکانی پێش خۆی کە ئەوانە هیچی لەو ناوەشێنەوە.
٥- قسەکانی زۆربەیان - سجع - یان تێدایەو ئەو ئەدەبەش لەسەردەمی عەباسی یەکاندا بەرەوی پێ درابوو.
٦- دەستەواژەی فەلسەفی و کەلامی تێدایە کە لەسەدەی سێ یەمی کۆچیدا هاتنە ئاراوە.
(بەڵام هەندێ شتی بەسودو جوانی تێدایە کە موسڵمان دەتوانێت سودی لێ وەربگرێت و دڵی پێ خۆش بکات بەڵام بەئاگاداری یەوە).

سێ یەم - کتێبی (الاغانی) اصفهانی:
کتێبی (الاغانی) کە (ابی الفرج الاصفهانی) نووسیویەتی ، کتێبێکی ئەدەبی‌وشەوچەرەوگۆرانییە، نەك کتێبێکی زانستی‌ومێژوویی‌وفیقهی‌وسەمفۆنیای خۆشی هەیە لە مێشك‌وگوێی ئەهلی ئەدەب‌ومێژوودا وخۆ ئەوەش ئەوە ناگەیەنێ کە بێ دەنگ بیت بە ژاری شعوبی‌ودەستی ناپاکی‌وڕێکخستنی درۆودەلەسەولەکەدارکردن. نووسەرو شاعیروخۆشنووسی عیراقی- مامۆستا ولید الاعظمي – هەستاوە بە نووسینی کتێبێك بە ناوی (السیف الیمانی فی نحر الاصفهانی صاحب الاغانی)، ئەو پیاوە خوا پاداشتی بەخێری بداتەوە قۆڵی لێ هەڵماڵیوەودەستی کردوە بە جیاکردنەوەی ڕاستی یەکان لە سوعبەت وجیاکردنەوەی ژەهر لە هەنگوین،ئەو هەموو درۆو ووتە ڕێکخراوانەوئاگری شعوبیەت‌وڕەگەز پەرستی وکینەبازی هەڵوەشاندۆتەوە،کە ڕق‌وکینەی لەناو دڵەکانداپەنگیان خواردۆتەوە، هەموو ئەو پۆخڵەواتانەی بە درۆ خستۆتەوە کە ئەسفەهانی لەملاوئەولا کۆیان کردبوونەوە لە چیرۆك‌وحیکایەتە درووستکراوەکان کە هیچیان جێگای متمانە نین‌ودەبنە هۆی نا شیرین کردنی ڕووی گەشی ئال‌وبەیت‌ولەکەدارکردنیان وشێواندنی ڕەوشت‌وباویان ،هەروەك بۆچوونی

هەڵەی ئەسفەهانی بە درۆ خستۆتەوە، دەربارەی موعاویەوخەلیفەکانی ئومەویبە جۆرێ کە ڕیوایاتی ترسناکیان دەم هەڵبەستولەکەدارکەر.

هەروەك چۆن وەلید الاعظمی خوای گەورە بە بەهەشت شادی بکات کۆمەڵێ بابەتی جۆراوجۆری هێناوە وتیایدا بەرگری کردووە لەو تانەوتەشەرانەی بە ناڕەوا دراوە لە بیروباوەڕی ئیسلامی وئاینی ئیسلام وبەچاکتر زانینیسەردەمی نەفامی لە سەردەمی ئیسلامی وهەندێشتی ناڕەواوپڕوپووچی تریش زانایان لە کۆندا دەربارەی ئەسفەهانی وتوویانە :

✪(خطيب البغدادي) دەڵێت :ئەبو فەرەجی ئەسفەهانی درۆزن ترین کەس بوو، شتێکی زۆری لە خەڵکی دەکڕی وپاشان حیکایەتەکانی خۆی لەسەر دادەمەزراند

✪(ابن الجوزی) دەڵێت: وێنەی ئەو پیاوە متمانە ناکرێت بە ڕیوایەتەکانی ، کتێبەکانی شتی وای تێدایە کە یەکسەر فاسقی بکات وئارەق خواردنەوە سوك وئاسان دەکات،هەندێ کات ئەو شتانەی لە خۆیەوە باس دەکرد وهەرکەسێك لە کتێبی (الاغانی)ببێتەوە،هەمو خراپەوپیسیەکی تێدا بەدی دەکات

✪(الذهبي) دەربارەی دەڵێت : ابن تیمیە ی مامۆستامانم دەبینی بە لاواز ناوی دەبردولە مەسەلەی نەقلکردندا تاوانباری دەکردو ئەوشتانەیزۆر بەگەورەوترسناك دەزانی کە ئەو دەینووسی.

چوارەم - (تأريخ اليعقوبی) لە ساڵی ۲۹۰ی کۆچیدا مردوە:

ناوی احمدی کوڕی یەعقوبی اسحاق ی کوڕی وەهەبی عەباسی بووەوخەڵکیبەغداد بووە ، مێژوو نووسێکی شیعەی ئیمامی بووەو لە دەوڵەتی عەباسیدا کاری نووسینی دەواوین بووە ، تا ناوبانگی بە — نووسەری عەباسی- دەرکردووە.

ئەم یەعقووبی یە باسی مێژووی ئیسلامی کردوە بەلاّم لە ڕوانگەی شیعەبیەوەودان بە هیچ خەلیفەیەکدا نانێت جگە لە علی کوڕی ئەبو طالیب وکوڕەکانی بە پێی خاڵبەندیئیمامەکانی شیعەوعەلیش بە (وصی) ناو دەبات .

کاتێ باسی مێژووی ( ابوبکر وعمر و عثمان(رضي الله عنهم)) دەکات ووشەی خەلیفەیان ناداتە پاڵ بەڵکو ئەوەندە دەڵێت فلاَن کەس بوو بە دەسەلاَتداروئیتر یەك کەسیان نەپەڕاندووە لە تانە لێدان ولەکەدارکردن، هەروەها گەورە هاوەلاَنیشی گرتۆتەوە.

دەربارەی عائیشە خوا لێی ڕازی بێت وخالیدی کوڕی وەلیدوعەمری کوڕی عاص وموعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان شتی خراپی نووسیوە وڕووداوی سەقیفەی بەو شێوەیەکی زۆر ناشرین باس کردووە وتیایدا باسی پیلان گێڕانی کردوە بۆ زەوت کردنی خیلافەت لە علی(رضي الله عنه)کە ئەو (وصی) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)بووە لە لای.

ئیتر شێوازی تاوانبارکردن ولەکەدارکردنەکانی هەرهەمان شێوازی هاو مەزهەبەکانی بووە لە (تشیع)، ئیتر یان هەواڵەکە ڕاستە بەلاَم بۆی زیاد کردووە یان هەرخۆیدروستی کردووە. یان لە شوێنی خۆیداباسی نەکردوە تا ماناکەی لە دەست بداتوئەوەی سەیروجێی تێبینیە لە نووسینەکانیدا کاتێ باسی خەلیفە ئومەویەکان دەکات بە پادشا ناویان دەبات لەبەلاَم هەر کە دێتە سەر باسی خەلیفە عەباسیەکان بە خەلیفە ناویان دەبات وناوی دەوڵەتی عەباسی بە دەوڵەتە پیرۆزەکە ناو دەبات لە کتێبەکەیدا بە ناوی (البلدان) کە ئەمەش دوو ڕوویی وخۆحەشاردانی دەردەخات لە پشتی شیعاری (توقیە)داوئەم کتێبە کە نمونەی شێواندنی ڕاستیەکان ولادانە لە ڕاستی ڕووداوەکان لە کتێبەکەیدا کە بە ناوی (التاریخ الاسلامی)یە ،بۆتە سەرچاوەی زۆرێك لە ڕۆژهەلاَتناسە داخ لە دڵەکان کە هەستاون بە لەکەدار کردن وناشیرین کردنی مێژووی ئیسلام وژیانی پیاوەمەزنەکانی، هەرچەندە لە لایەنی زانستیەوەئەم کتێبە نرخ وبەهایەکی نی یە چونکە لە بەشی یەکەمدا ئەفسانەوچیرۆکیخورافی لە خۆ گرتووە ولەبەشی دووەمیشدا بە تێڕوانینێکی حیزبیانە نووسراوەولەلایەنی بابەتی وپرۆگرامیەوەکەمترین مانای متمانەی زانستی لە خۆ گرتووە.

پێنجەم -(المسعودی)وکتێبی (مروج الذهب ومعادن الجوهر) :

ئەم نووسەرە ناوی ابو الحسن علی کوڕی حوسەین ی کوڕی عەلی مەسعوودی یەولە نەوەکانی (عبدالله بن مسعود)خوا لێی ڕازی بێت، هەندێ دەڵێن خەڵکی مەغربی عەرەبیە بەلاَم خۆی ڕاستە خەڵکی عیراقەومالّی باری کردووەبۆ میسرو لەوێ ژیاوە.

ئەم مەسعوودی یە پیاوێکی شیعە بووەو(ابن حجر)لەو بارەیەوە دەڵێت : کتێبەکانی پڕن لەوەی کە ئەم کەسە شیعەیەکی موعتەزیلەبووە.
باسی لەوە کردووە کە وەسیەت کردن بۆ عەلی هەر لە باوکە ئادەمەوە پشتاوپشت تا پێغەمبەر(ﷺ)کراوەوپاشان باسی ئەوەی کردووەکە خەڵکی جیاوازیان لە تێگەیشتن لەو دەقانە بۆ درووست بووەوشیعەی ئیمامیش هەروا دەڵێت پڕاوپڕ، گرنگی دانبە عەلی ﷺ وژیانەکەی لەو کتێبەیدا زۆر زیاتر پانوپۆر ترە لە گرنگی دان بە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)وزیاتر گرنگی داوە بە خانەوادەی علیﷺوبە ووردی هەرچی هەواڵوشتێك لەسەر ئەوان هاتبێت لە (مروج الذهب) دا هێناویەتیوهەوڵی تەواوی داوە کە بێشەرمانەوبێ پەردەویستوویەتی سەرەتای ئیسلام بشێوێنێت.
ئەمەش هەندێك بوون لەو کتێبانەی لە کۆندا نووسراون ئێمە باسمان کرد تا خوێنەری موسڵمان ئاگاداریان بێت ،کە ئەو کتێبانەش بوونەتە جێگای گرنگی پێدانی هەندێ لە نووسەرە هاوچەرخەکان وەك (طه حسين) لە فیتنە گەورەکەدا بە ناوی (علي وبنوه)
وعەقادیش لە عەبقەرێکانیدا ،هاتوون خۆیان گلاندوە بەو ڕیوایەتە هەڵبەستراوولاوازانەوشیکارەکانیشیان لە سەر ئەوانە بنیات نراوەودواتریش ڕاستیان نە پێکاوەولەمەسەلەی هاوەڵاندا کەوتوونەتە هەڵەی زەقوپیسەوە ، هەروەها -عبدالوهاب النجار- یش لە کتێبی (الخلفاء الراشدون) دا هەندێ ڕیوایەتی لە کتێبی (الامامة والسياسة) وە نەقڵ کردووە.هەروەها -حسن ابراهيم حسن - لە کتێبی (عەمری کوڕی عاص)دا پشتی بەستووە بە ڕیوایەتە هەڵبەستراوەکانی ڕافیزەکان کە دەڵێن: عەمری کوڕی عاص -پەنا بەخوا-پیاوێکی بەرژەوەند پەرستوتەماح کار بووە وهیچ شتێکی نەکردووە ئەگەر نەیزانیبێت بەرژەوەندیوسوودێکی دنیایی بۆ خۆی تێدایە.
ئەمەو کۆمەڵێك لە لێکۆڵەرەوان بە هەمان ڕێژەوداڕشتنەوە خۆیان کردۆتەوەبە ناو تونەیلی تاریکدا بە هۆی دوریان لە پرۆگرامورێڕەوی ئەهلی سوننەوجەماعەوە لە کاتی هەڵسەنگاندنوهەڵسوکەوت کردن لە گەڵ ئەو لێشاوە زۆرەی ڕیوایەتە مێژوویەکان.

# بەشی حەوتەم

# هەڵوێستی ئەمیری باوەڕداران عەلی دەربارەی (خەواریج) و پاشان شەهیدکردنی

## جێباسی یەکەم

## ((خەواریجەکان))

### یەکەم/ (خەواریج) چۆن پەیدابوون و کێن؟

ئەهلی عیلم کۆمەڵێ پێناسەیان داناوە بۆ خەواریج هەریەکە کۆمەڵێك کەس دەگرێتەوە لەوانە:

* (أبو الحسن الأشعری) ناوی ـ خەواریج ـ دەبڕێت بەباڵای ئەو تاقمەدا کە لە خەلیفە ڕاشیدی چوارەم علي کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) جیابوونەوە، و ئەوەشی ڕوون کردۆتەوە کەهۆی ناونانەکەشیان لەوەوە هاتووە کە دەرچوون لەژێر فەرمانی عەلی کوڕی ئەبو طالیب کاتێ بتەحکیم ڕازی بوو[1].

* بەڵام (ابن حزم) دوورتر دەڕوات و دەڵێت ـ ناوی خەواریج ـ هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە هاوشێوەی ئەو کەسانەن کە لەفەرمانی عەلی کوڕی ئەبو طالیب دەرچووون و لەبیرو باوەڕدا وەك ئەوان وان و دەڵێت: هەرکەسێك وەك ئەوان بیربکاتەوە لەمەسەلەی تەحکیم و بەکافرکردنی هاوەڵان بەگوناهی گەورەو دەرچوون لەدژی ئەمیرە ستەم کارەکان، و ئەوانەی خاوەنی گوناهی ـ کەبیرەن ـ بەهەمیشەیی لەدۆزەخا دەمێننەوە، و پێشەوایەتی لەغەیری قورەیشیشدا دروستە ئەوە بە ـ خاریجی ـ دادەنرێت، و هەرکەسێك جگە لەو شتانەی باس کران جیاوازی هەبێت لەگەڵ موسڵمانانادا ئەوە ـ خەواریج ـ نی یە[2].

---

[1] مقالات الإسلاميين (١/٢٠٧).

[2] الفصل في الملل والأهواء والنحل (٢/١١٣).

* (الشهرشتانی) دەڵێت: (خەواریج) بریتی یە لەدەرچوون لە حوکمی خەلیفەیەك کە موسڵمانان بەکۆی دەنگ هەڵیان بژاردووە ئیتر با لەهەر سەردەم و لەهەر شوێنێکدا بێت، ئیتر لەسەردەمی هاوەڵاندابێت یان لەهەر سەردەمێکی تردا[1].

* (ابن حجر) یش دەڵێت: (خەواریج) ئەو کەسانەن قبوڵی ئەوەیان نەکرد کە عەلی بەتەحکیم ڕازی بوو و لە عثمان و نەوەکانی تەبەڕایان کردو جەنگیشیان لەگەڵ کردن و ئەگەر بەکافریشیان بزانن ئەوە پێیان دەڵێن (الغلاة) واتە: ڕۆچووەکان[2].

بەکورتی و پوختی خەواریج بەوانە ووتراوە کە لە عەلی (ﷺ) هەڵگەڕانەوە دوای قبوڵ کردنی ـ تەحکیم ـ لەپاش جەنگی ((صفین)) و کۆمەڵێ ناوی تریشیان هەیە لەوانە ـ الحرورية، الشراة، المحكمه، و بەهەموو ئەو ناوانە ڕازی بوون جگە لەناوی (المارقە) نەبێت واتە لەئاین چووەتە دەرەوە و ئەوان خۆیان بەموسڵمان تر دەزانی لەخەڵکی تر[3].

و هەندێ لەئەهلی عیلم ـ دوورتر دەڕوات و بنەڕەتی خەواریج دەباتەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و یەکەمین قبوڵ نەکردن و دەرچوون (ذو الخويصرة) بوو کە ڕەخنەی لە پێغەمبەری خوا گرت (ﷺ) کاتێ عەلی (ﷺ) لە یەمەنەوە ئاڵتون و زێڕی ناردەوە بۆ (بيت المال). و پێغەمبەری خوا (ﷺ) وای بەپێویست زانی بیدات بە (٤) کەس کە ناویان (عيينه بن الحصن) و (اقرع بن حابس) و (زيد الخيل) و (علقمه بن كلاثه) و یەکێ لەهاوەڵان ووتی: هەقی ئێمە بوو پێمان بدات نەك ئەوانە ... کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ووتەیەی بیست و فەرمووی: ((الا تأمنوني وأنا أمين من في السماء يأتيني خبر السماء صباحاً ومساءاً)) واتە: ئایا باوەڕتان بەوە نی یە کە دەسپاك و ئەمینم لەکاتێکدا من ئەمینم لەلای ئەوانەی لە ئاسمانن و بەیانی و ئێوارە هەواڵی ئاسمانم بۆدێت؟!.

و پیاوێك هەستایە سەرپێ کە چاوقووڵێکی توێل زق ی ڕیش زلێکی سەرتاشراوی جل شۆڕ بوو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەخوا بترسە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ويلك أولست أحق أهل الأرض أن يتقى الله)) واتە: وەیل بۆتۆ ئایا من شایانترین کەسی سەرزەوی نیم کە

---

[1] الملل والنحل.

[2] هدى الساري في مقدمة فتح الباري، لا ٤٥٩.

[3] مقالات الإسلاميين (٢٠٧/١).

دەبێت لەخوا بترسم؟! کابرا هەستاو ڕۆشتە دەرەوە، و خالیدی کوڕی وەلید (ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا با بدەم لەگەردنی، فەرمووی ((لا، لعله أن یکون یصلی)) واتە: نەء، لەوانەیە نوێژگەر بێت.

و خالیدیش ووتی: نوێژگەر هەیە بەدەم ستێك دەڵێت و بەدڵ شتێکی تر، و پێغەمبەریش فەرمووی: ((انی لم أؤمر ان أنقب عن قلوب الناس)) واتە: من فەرمانم پێ نەدراوە سەیری ناودڵی خەڵکی بکەم و پاشان سەیرێکی پیاوەکەی کردو فەرمووی:

((انه یخرج من ضئضئي هذا قوم یتلون کتاب الله رطباً ولا یجاوز حناجرهم یمرقون من الدین کما یمرق السهم من الرمیة))[1] واتە: (( لە وەچەی ئا ئەم پیاوە کۆمەڵێك دێن قورئان دەخوێننەوە ـ بەزمان ـ بەڵام لەگەرویان ناڕواتە خوارەوە ـ بەرەو دڵیان ـ لەئیسلام دەچنە دەرەوە وەك چۆن تیر لەکەوان دەردەچێت)).

* (ابن جوزی) دەڵێت: یەکەم کەس و خراپترین کەس کە بوو بەخەواریج (ذو الخویصرة التمیمی*) بوو کە بەپێغەمبەری خوای ووت: دادپەروەربە، و پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی ((ویلك ومن یعدل اذا لم أعدل[2])) واتە: لەناوچیت، ئەگەر من دادپەروەر نەبم کێ دادپەروەر دەبێت؟!. و ئەم پیاوە یەکەمین ـ خاریجی ـ بوو کە لە ئیسلام دەرچوو و نەگبەتی یەکەی لەوەدابوو کە ڕای خۆی پێ پەسەند بوو، وە ئەگەر کەمێ خۆی بگرتایە دەیزانی کە لەسەرووی ڕای پێغەمبەرەوە ڕای تر نی یە ـ ڕای ئەو وەحی لەگەڵدایە ـ و شوێن کەوتوانی ئەم پیاوەبوو کە شەڕیان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو طالیبدا کرد[3].

و (ابن کثیر) یش ئەو کەسانەی گێرەشێوێنیەکەیان نایەوەو هاتنە سەر شاری مەدینە و عثمانیان شەهیدکرد بە ـ خەواریج ـ ناویان دەبات، دەڵێت: خەواریجەکان (بیت المال) ی موسڵمانانیان بڕی کە ماڵ و سامانێکی زۆری تێدابوو[4].

---

[1] اخرجه البخاري (٢/٢٣٢) ومسلم (٢/٧٤٢).

* ذو الخویصره ناوی عمدی کوڕی حمزم بووه.

[2] اخرجه مسلم (٢/٧٤٠).

[3] تلبیس الابلیس، لا ٩٠.

[4] البدایة والنهایة (٧/٢٠٢).

## ڕای کام لە زانایان لەم بارەیەوە ڕاجیحە؟

ڕای بەهێزو تەواو لەو پێناسەیەوە نزیکە کە ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بە (تەحکیم) ڕازی نەبوون و لە عەلی هەڵگەڕانەوە چونکە یەکەم ئەوانە وەك تاقم ناسراون و بۆچونی سیاسی و ڕای تایبەتیان هەبووە و کاریگەری فیکری و عەقائیدیان لەسەر موسڵمانان بەجێ هێشتووە[1].

ئەوەی زۆر ناشیرین و ناشیاوە بۆ ئەو خەواریجانە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هانی موسڵمانان دەدات هەرکاتێ ئەوانە پەیدابوون بیانکوژن، و تەنانەت باس لەوەش دەکات کە ئەگەر خۆیشی دەستی بیانگاتێ لەناویان دەبات وەك لەناوبردنی عاد و ثمود و دەفەرموێت ((لئن أدركتهم لاقتلنهم قتل عادٍ))[2] پاداشتی تەواوی ئەو کەسەی کە دەیانکوژێت زۆر گەورەیە لەلای خوای گەورە.

بەڵام لەسەردەمی ئەمیری باوەڕداراندا دەرکەوتن و ئەو شەرەف مەند بوو بەکوشتن و لەناوبردنیان، چونکە بڕاوپڕ ئەو سیفەتانەیان تێدابوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرموودەکانیدا هەواڵی پێدابوو، و عەلی (رضي الله عنه) بەو سوپا مەزنەوە کە ئامادەی کردبوو بۆ خەڵکی شام، و خوای گەورە ئەو شەرەفەی پێداو لە جەنگێکی نەخوازراودا لەکۆڵ موسڵمانانی کردنەوەو بەسوپاکەیەوە بەرەو نەهرەوان کەوتە ڕێ کە لەوێ موڵیان دابوو، و دای بەسەریانداو نەیهێشت یەك کەسیان دەربچن و مێژوونووسەکان دەڵێن ئەوانەی دەرچوون لەپەنجەکانی دست کەمتر بوون.

بەڵام یەکسەر جەنگی لەگەڵ نەکردن تا ئەوان خوێنی حەرامیان ڕشت و پەلاماری قافڵەو سامانی موسڵمانانیان دا، ئەویش لەبەر ئەو زوڵم و ستەم و دزی و جەردەیی یەیان شەڕی لەگەڵدا کردن.

---

[1] الفرق معاصر، عواجي (١/٦٧).

[2] البخاري.

## دووەم/ خەواریج دەڕۆن بۆ حەوراء و (ابن عباس) دەڕوات بۆ ناویان بۆ مێزگرد:

کاتێ ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) بەخۆی و سوپاکەیەوە لە صفین گەڕایەوە بەرەو کوفە، چەند کیلۆمەترێکیان مابوو بگەنە ناوشار، ژمارەیەکی زۆر لەخەواریج خۆیان جیاکردەوەو کە ڕیوایەتەکان جیاوازن لەڕێژەی ژمارەکەیاندا هەندێ دەڵێن (١٢) هەزار کەس بوون[1]. و ڕیوایەتێکی تر بە (١٤) هەزار ناوزەدی کردووە[2]. ابن کثیریش بە (٨) هەزار کەس ناوزەدی کردوون[3].

ئەم جیابونەوەیە عەلی و هاوڕێکانی نیگەران کرد و بەخۆی و ئەوانەی لەگەڵیدا مابوونەوە هاتنەوە بۆ کوفە، و ئیترئەمیری باوەڕداران فیکرو هۆشی بەوانەوە خەریك بوو، بە تایبەت دوای ئەوەی زانی کە خۆیان ڕێکخستووە و ئەمیری نوێژ و ئەمیری جەنگیان دیاری کردووە، و شیعاری بەیعەت تەنها بەخوا دەدرێت ، و فەرمان بەچاکە و بەرگری لەخراپەیان بەرزکردبوویەوە، کەئەمە مانای ئەوە بوو ئیتر بە یەکجاری لە عەلی (ﷺ) جیابوونەتەوە و لەکۆمەڵی موسڵمانان دەرچوون.

ئەمیری باوەڕداران زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی هەوڵی گەڕانەوەیان بدات بۆناو کۆڕ و کۆمەڵی موسڵمانان و بۆ ئەم مەبەستە (ابن عباس)ی نارده ناویان تا قەناعەتیان پێ بکات و لەکەلی شەیتان دابەزن.

(ابن عباس) (ﷺ) خۆی ئەم سەردانەیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ڕۆشتم بۆناویان و جوانترین جل و بەرگی یەمەنیم لەبەرکرد، کە گەیشتمە ئەوێ لەئەسپەکەم دابەزیم و ڕۆیشتمە ژوورەوە بۆلایان کە کات نیوەڕۆ بوو، ـ ابن عباس ـ پیاوێکی زۆر پێکەوتە و جوان بوو ـ ووتیان : مەرحەبا (ابن

---

[1] تاریخ بغداد (١/١٦٠).

[2] مصنف عبدالرزاق بسند جید (١/١٥٧-١٦٠).

[3] البدایة والنهایة (٧/٢٨٠) إسناده صحیح.

عباس) بەخێر بێیت ئەم جلە کەشخەیە چی یە لەبەرتدایە؟ ووتی: جا چ عەیبێکی هەیە؟ من خۆم پێغەمبەری خوام دیووە (ﷺ) زۆر لەمە کەشخەتری لەبەر دابووە " قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنْ الرِّزْقِ ".[1] هاتە خوارەوە...

ووتیان پێ ی : بۆچی هاتویت؟ ووتی: من لەلای هاوەڵانی پێغەمبەرەوە هاتووم بۆ لاتان موهاجرین و ئەنصار ولەلای ئامۆزاو زاوای پێغەمبەر(ﷺ) کە قورئان لەسەر ئەوان هاتە خوارەوە، و ئەوان لە ئێوە باشتر لێ ی تێگەیشتوون و کەسێك لەوان لەناوتاندا نابینم.

هاتووم بۆ ناوتان تا ووتەی ئەوانتان پێ بگەینم، ووتەی ئێوەش بەوان بگەینم، و چەند کەسێك هاتنە بەرامبەرم و منیش رووم تێ کردن و پێم ووتن : ئەو بەڵگانەم پێ بڵێن چی یە وا بەو هۆیەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەرو ئامۆزاکەی هەڵگەڕاونەتەوە؟ ووتیان: لەبەر سێ شت، ووتم: کامانەن؟ ووتیان یەکەم: قبوڵی دانانی حەکەمی کرد لە کاری خوادا و حوکمیش تەنها هی خوایە، دەی ئیتر خەڵکی و حوکم لە کوێ؟ ووتم : ئەمە یەکەمە ئەی دووەم کامەیە؟ ووتیان: خوێنی حەلاڵ کردن کەچی ماڵ و سامان و خێزانەکانیانی حەرام کرد لێمان، دەی ئەگەر کافر بوون خۆ ماڵ و منداڵیان حەلاڵ دەبێت، و ئەگەر موسڵمانیش بن نەك ماڵیان بەڵکو خوێنیشیان حەرامە بۆمان، ووتم : ئەمەش دووەمە ئەی کامەیە سێ یەم.

ووتیان : خۆی لە (ئەمیر المؤمنین)ی سڕیەوە، دەی ئەگەر ئەمیری باوەڕداران نەبێت، دیارە ئەمیری کافرانە، ووتم: هەرئەمەندە؟ هیچی ترتان پێ نیە؟ ووتیان: جارێ ئەوەندە بەسە، دەڵێ پێم ووتن ئەگەر ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرتان بۆ باس بکەم بۆ وەڵامی ووتەکانتان دەگەڕێنەوە؟ ووتیان: بەڵێ.

(ابن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ ووتم: ووتەی یەکەمتان کە دەڵێن حوکمی خوا نادرێتە دەستی پیاوان ، دەی من لە قورئاندا ئایەتتان بۆ دەخوێنم کە تیایدا حوکمی خۆی داوەتە دەستی پیاوان لە نرخی چارەکە دەرهەمێکدا، کە خوای تەعالا فەرمانی داوە حەکەمی بۆ بگرن، نابینن خوای (عزوجل) دەفەرموێت ((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ وَمَنْ قَتَلَهُ مِنْكُمْ مُتَعَمِّداً فَجَزَاءٌ مِثْلُ مَا قَتَلَ مِنْ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ )). (سورة المائدة٩٥) .

---

[1] سورة الاعراف ٣٢.

دەی من بۆ خوا پێتان دەڵێم: حەکەم لەپیاوان دابنرێت بۆ صولح و ئاشتی نێوان موسڵمانان وەستانی لافاوی خوێن باشترە یان ڕاو کردنی کەروێشکێك؟ ووتیان: بەڵێ، ئەمەیان باشترە،

ووتم: دەربارەی ئاشتەوایی نێوان ژن و پیاو حەکەمی داناوە وەك دەفەرموێت ((وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا)) (النساء ٣٥). دەی توخوا حەکەم گرتن بۆ هێنانەوەی ژنێك گەورەیە یان وەستاندنەوەی لافاوی خوێنی موسڵمانان؟ ووتیان: بەڵێ وایە.

ووتم: ووتەی دووەمتان کە دەڵێت: پیاو دەکوژێت بەلاّم سامانەکەی ناکاتە غەنیمە و دەستکەوت، ئایا ڕازیتانە عائشەی دایکتان بکەنە نەیزەك؟ و ناموسی حەلاڵ کەن بۆ خۆتان کە دایکتانە؟ ئەگەر بلێن: ئەویش وەك خەڵکانی ترەو دەبێت حەلاڵ بکرێت بۆمان و ئەوە کافر دەبن خۆ ئەگەر بلێن دایکمان نی یە هەر کافر دەبن چونکە خوا دەفەرموێت دایکتانە ((النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ )) (سورة الاحزاب ٦).

دەی ئێستا تێ گەیشتن یان نا؟ ووتیان بەڵێ، زۆر باش.

دەی ئەوەشی کە دەڵێن ناوی خۆی لە ئەمیری باوەڕداران سڕیوتەوە، دەی من شتێکتان بۆ باس دەکەم لەوە زۆر خراپتر، پێیغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕۆژی حودەیبیەدا صوڵحی کرد لەگەڵ بێ باوەڕەکاندا و بە عەلی ووت " اكتب يا علي هذا ما صالح عليه رسول الله " ووتیان ئەگەر بلێین تۆ پێغەمبەری خوایت ئیتر بۆ شەڕت لەگەڵدا دەکەین، و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بە عەلی فەرموو ((امسح يا علي، اللهم انك تعلم اني رسول الله، امسح يا علي واكتب هذا ما صالح عليه محمد بن عبدالله )) واتە: (محمد رسول الله) بسڕەوە ئەی عەلی و خوایە بەخوا تۆیاش دەزانیت کەمن پێغەمبەری خوام بەلاّم عەلی بیسڕەوە) دەی وەڵڵاهی پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر گەورەترە لە عەلی، ئەو ناوی خۆی کوژاندەوە، دەی هەر بەوەی ناوی خۆی سڕیەوە خۆ لە پێغەمبەرایەتی نەسڕایەوە دەی خۆ تێگەیشتن؟ ووتیان ىبەڵێ، هەر لەو مێزگرد و گفتوگۆیەدا (٢٠٠٠) کەسیان گەڕانەوە بۆلای کۆمەڵی موسڵمانان و ئەمیری باوەڕداران، و ئەوانی تریان یاخی بوون و لەسەر گومڕایی یەکەیان دەستیان دایە شمشێر دژی عەلی(ﷺ) و موجاهرین و ئەنصاریش لێیان هاتنە دەست و لەناویان بردن.[1]

---

[1] خصائص امير المؤمنين علي بن ابي طالب، تحقيق احمد بلوشي لا ٢٠٠ اسناده صحيح.

## سیٚ یەم / عەلی (ﷺ) خۆی میٚزگردیان لەگەلٚ دەكات:

دوای ئـەوەی عبـداللە ی كـوڕی عـەباس (ﷺ) میٚزگـردو كفتوگـۆی لەگەلٚـدا كـردن و لەئەنجامدا (٢٠٠٠) كەسیان ڕاستیان بۆ دەركەوت و گەڕانەوە بۆلای كۆمـەلٚی موسـلٚمانان، بلـٚام عەلی (ﷺ) هیٚشتا دلٚی ئاوی نەخواردەوەو ئەم جارە بڕیـاری دا خـۆی بـچیٚتە ناویـان و قـسەیان لەگەلٚدا بكات و ئەوەبوو قسەی لەگەلٚ كردن هەموویان لەگەلٚیدا گەڕانەوە بۆ كوفە.

بەلٚام پاشتر دەركەوت كە ئەو خەواریجە سەر سورلیٚشیٚوانە ـ بەهەلٚە تیٚگەیشتبوون و وایان زانیبوو عەلی (ﷺ) لەو گوناهە گەورەیەی كەكردی پەشیمان بوەتەوەو تەوبەی كردووە ـ بەقس ەی ئەوان ـ وئیتر وردە وردە لەناو خەلٚكدا وایان بلاٚوكردەوە كە پەشیمانە لـە قبـولكردنی تـەحكیم و حەكەم، تا وای لیٚهات (الاشعث ی كوڕی قیس الكندی) هات بـۆلای پـیٚ ی ووت: خـەلٚكی بـاس لەوە دەكەن تۆ لەبەر خاتری ئەوان لەكوفر پەشیمان بوویتەوە، و عـەلیش (ﷺ) ڕۆژیٚ چـووە سـەر مینبەرو وتاریٚكی داو لەپاش حەمدو سەنای خوا باسی ڕاستی مەسەلەكەی بۆ خەلٚكەكە كردو كە چۆن قسەی لەگەلٚ كردوون و ئاخرجار چۆنی بەجیٚ هیٚشتن[1].

لەكاتی وتارەكەدا پیاویٚك هاواری كرد ((ان الحكم الّا لله)) و یەكیٚكی تر ووتی (الحكـم الا لله) وپاشان هەموویان هەستانە سەرپیٚ (الحكم لله) یان دەكرد، ئەمیری باوەڕدارانیش ئاماژەی بـۆ دەكرن كە دانیشن، ووتی: بەلیٚ ((الا حكم الا لله)) بەلاٚم ئەمە ووشەیەكی ڕاستە بەلاٚم بۆ ناڕاسـت بەكاری دەهیٚنن (قول حق یبتغی مع الباطل))

و پاشان ئەمیری باوەڕداران بەسیاسەتی ژیرانەی خۆی بۆ ڕوونكردنـەوە بەرامبـەر لایەنـە توندڕەوەكان و طە رەف گیرەكان و پیٚ ی ووتن: ئیٚوە سیٚ شتتان لەسەر ئیٚمە هەیە:

١- ڕیٚتان لیٚ ناگرین لەمزگەوتماندا نویٚژ بكەن.

٢- لەهیچ دەستكەوت و غەنیمـەو فـەیئیٚك بـیٚ بەشـتان ناكـەین مـادەم دەسـتان لـەناو دەستماندایە.

[1] مصنف ابن ابي شيبة (١٥/٣١٢-٣١٣) وصححه الألباني في أرواء الغليل (١١٨/٨).

٣- جەنگتان لەگەڵ ناکەین تا ئێوە جەنگمان لەگەڵدا نەکەن[1].

ئەمیری باوەڕداران علي (ﷺ) ئەو سێ مافەی بۆ دیاری کردن، تا دەستدرێژیی یان دەرچوونیان لەکۆمەڵی موسڵمانان لێ دەردەکەوێت، ئیتر هەرچی بۆچوون و ڕای تایبەتیان هەیە پەیوەندی بەخۆیانەوە هەیەو کەس هیچیان پێ ناڵێت مادەم لەچوارچێوەی بیروباوەڕی ئیسلامیدا بێت، ە ئەو لەسەرەتاوە لە ئیسلام نەیکردنە دەرەوە، بەڵکو ئەو مافی جیاوازی لەبیرو ڕای پێ بەخشین بەمەرجێ بەرەو ناکۆکی و جیایی و چەك هەڵگرتن نەڕوات[2].

ئەمیری باوەڕداران هەڵنەسا زیندانەکانیان لێ پڕبکات یان سیخور و چاودێریان بەسەرەوە دابنێ، و سەربەستیشی نەگرتنەوە، بەڵام هەردەم سوربوو لەسەر ئەوەی کە بە بەڵگەو بەشێوەی ئاشتیانە هەقیان بۆ ڕۆشن بکاتەوە بۆ ئەوان و بۆ ئەوانەیش کە بەڕاو وبۆچوونەکانیان خەڵەتابوون.

• ڕۆژێك هەموو مامۆستاو ـ مەلاکان بەزاراوەی ئەمڕۆ ـ قورئان خوێنەکانی کۆکردەوە و داوای گەورەترین قورئانی کرد و بۆیان هێنا و بەدەست ئاماژەی دەکرد بۆ قورئانەکەو دەیووت پێی : دەی فەرموو قسە بکە بۆ ئەم خەڵکە، و خەڵکەکەیش هاواریان لێ بەرز بوویەوە و ووتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە تەنها مرەکەب و وەرەقەیە وفەرموو ئێمە قسەکانی ئەو دەکەین چیت دەوێت لێمان؟ ئەویش ووتی: ئەو برادەرانەتان کەلە سنوور دەردەچوون و ئەوامن و ئەوا قورئان با لەنێوانماندا بێت.

خوای گەورە دەربارەی ژن و پیاو بڕیاری حەکەم گرتنی بۆ هەردوولا داناوە و ئوممەتی محمد زۆر لەو کێشەیە گەورەترە و ڕەخنە لەمن دەگرن کە حەکەمم داناوە بۆ نێوانی وەستانی خوێنی عێراق و شامی یەکان وەك دەفەرموێت ((وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقْ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً (٣٥)) سورة النساء )) .

یان دەڵێن پێم کە تۆ لەگەڵ ناوی موعاویەدا، نووسیوتە ـ علي کوڕی ئەبو طالیب ! و نەت نوسیوە ئەمیری باوەڕداران! دەی من لەگەڵ پێغەمبەردا بووم (ﷺ) لە صولحی حودەیبییەدا کاتێ نووسی (بسم الله الرحمن الرحيم) ـ سوهەیلی کوڕی عەمر ـ ووتی: ئێمە ئەم شێوەیە نازانین

---

[1] مصنف ابن ابي شيبة (١٥/٣١٢-٣١٣)، والشافعي في الام (١٣٦/٤).

[2] الوظيفة العقيدية للدولة الاسلامية، لا ٤٧.

بەلکو بنوسن (بسمك اللهم)! و کاتێ نووسی لە محمد پێغەمبەری خواوە.... سوهەیل ووتی: جا ئەگەر بمان ووتایە تۆ پێغەمبەریت چۆن جەنگمان لەگەڵ دەکردیت! بنووسە: (هذا ما صالح علیه محمد بن عبدالله)! دەی ئێمەش پێغەمبەر سەر مەشقمانە وەك خوا ـ عزوجل ـ دەفەرموێت ((لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الآخِرَ)) الاحزاب٢١.

بەلام دواتر ـ خەواریج ـەکان بۆیان ڕۆشن بوویەوە کە عەلی(ﷺ) سورە لەسەر دانانی (ابو موسی الاشعری) بەحەکەم، و داوایان لێ کرد ئەو کارە نەکات، وئەو بەقسەی نەکردن و پێ ی ووتن ئەوە غەدرو ناپاکی و پەیمان شکاندنە و ئێمە لەگەڵ ئەوانەدا عهد و بەڵێنمان نووسیوە و خوایش دەفەرموێت ((وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللَّهِ إِذَا عَاهَدْتُمْ وَلا تَنقُضُوا الأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلاً)) "لنحل/٩١".

ئیتر پاش ئەوە خەواریج بڕیاریان دا لەشار دەربچن و ئەمیرێك بۆخۆیان دیاری بکەن و بۆ ئەو مەبەستە لەماڵێ عبدالله ی کوڕی وەهەبی ڕاسبی دانیشتنیان کرد، و ئەو پیاوەش ووتارێکی بەهێزو پاراوی بۆدان و تیایدا باسی زوهد ودنیانەویستی بۆکردن لەگەڵ هەوڵدان بۆ مسۆگەرکردنی ڕۆژی دوایی و بەهەشت، وهانی دان بۆ فەرمان بەچاکە وبەرگری لەخراپە و پاشان پێی ووتن: با بڕۆین لەم شارە ستەم کارە دەرچین کەخەلکەکەی ستەمکارن و بدەینە ئەو کەژانە یان بڕۆینە ناوباخەکانی سنوری عێراق و نارەزایی خۆمان دەربڕین لەبەرامبەر ئەم زاڵمانە.

پاشان حرقوص ی کوڕی زوهێر[1] هەستایە سەرلا پێ پاش حەمد و سەنای خوا ووتارێکی دا ووتی: ژیان و خۆشی دنیا چەند ڕۆژێکی کەمە و تەواو دەبێت و دەی جوانی ڕازاوەیی و سەوزیەکەی ڕاتان نەکێشی بۆخۆی، و ڕێتان لێ نەگرێت لە شوێن ڕاستی کەوتن و ڕازی نەبوون بە زوڵم و زۆر ((إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُمْ مُحْسِنُونَ (١٢٨) "لنحل/١٢٨".

حمزەی کوڕی سنان الاسدیش هەستایە سەرپێ و ووتی: ((ئەی هۆزینە ڕای پەسند ئەو ڕایەیە ئێوە باستانکرد، وهەق و ڕاستیش هەر ئەو قسانەیە کە ئێوە کردتان، و ئەگەر یەکێکیش دیاری بکەن ببێتە ئەمیرتان زۆرچاکە، چونکە پێویستە پایەیەك[2] و دانتان[3] هەبێت، و ئاڵایەکیش

---

[1] ئەم حەرقوصە یەکێکە لەبکوژانی عوسمان و خەلکی بەسرەیە و تەنها کەسێك بوو کە نەکوژرا بەدەستی طلحە و زوبێر لە تۆڵەی عوسماندا و رزگاری بوو.

[2]، ٣ پایە/ ئەمیر/ دان و سوپاو دەستەلات.

سۆزتان هەبێت بۆی، و لەژێریدا کۆببنەوە، و جوابیان نارد بۆ زەیدی کوڕی الحصن الطائی ـ کە یەکێ بوو لە سەرکردەکانیان کە ببێتە ئەمیریان بەڵام ئەو نەیکرد، و پاشان بە (حەرقوص ی کوڕی زوهەیر) یان ووت ئەویش نەیکرد، و بەحەمزەی کوڕی سنانیشیان ووت، قبوڵی نەکرد، و بەشورەیح ی کوڕی ئەبی أوفی العیسی یان ووت، بەڵام ئەویش قبووڵی نەکرد، و عبدالله ی کوڕی وهب ی (الراسبی) یان ووت و ئەو قبوڵی کرد، ووتی: وەڵڵاهی لەبەر دەستکەوتی دونیایی وەری ناگرم و لەترسی مردنیش ڕەدی ناکەمەوە))[1]

و کۆبوونەوەیەکی تریان کرد لەماڵی (زیدی کوڕی حصن الطائی) و ئەویش ئەوەندەی تر هانی دان و پێ ی ووتن فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپە بەرپا بکەن و ئایەتێکی قورئانی بۆ خوێندنەوە و ووتی: ((يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلا تَتَّبِعْ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ)) "ص/٢٦". و پاشان ئایەتێکی تری خوێندەوە ((وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ)) "المائدة/٤٤".

و پاشان ووتی: (من شایەتم کە ئەهلی بانگەوازەکەمان و موسڵمانی ڕوو لەقیبلەکەمان، شوێن هەواو ئارەزوو کەوتن و حوکمی خوایان دایە دواوەوە و زوڵم و ستەم تێکەڵی قسەو کرداریان بوو، و جیهادو کوشتاریان پێویست بووە لەسەر موسڵمانان ).

پیاوێك لەناویاندابوو بەناوی (عبدالله بن شجره السلمی) دەستی کرد بەگریان و هانی دان لەسەر چەك هەڵگرتن و دەرچوون لەدژیان، ووتی: بەشمشێر دەموچاو تەوێڵیان بشکێنن تا ـ خوای گەورە ڕەحمان و ڕەحیم گوێڕایەڵی دەکرێتەوە، و ئەگەر ئێوە سەرکەوتن و گەشتنە مەبەست و بەو شێوەیەی ئێوە دەتانەوێ خودا پەرسترا ئەوا پاداشتی گوێڕایەڵان و کردەوەکاران بۆ ئێوە دەبێت، و ئەگەر سەریش نەکەوتن دەی چی لە شەهیدبوون لەپێناوی خواو بەهەشت گەورەترو چاکترە[2]؟!

(ابن کثیر) دوای ئەوەی باسی ئەو دانیشتنەی کرد کە شەیتان بۆی نوسیبوونەوەو لەوبارەیەوە ووتی: ئەمانە جۆرە کەسێك بوون، و نامۆترین جۆرەکانی ئادەمیزادن، و پاك و بێگەردی بۆ ئەو

[1] البداية والنهاية (٣١٢/٧).

[2] هەمان سەرچاوە (٣١٢/٧).

خوایەی کە خەڵکی جۆراوجۆری دروست کردووە و بەڕاستی دروست کەرێکی مەزنە، هەندێ لە سەلەفی صالّح جوانیان ووتووە دەربارەی ئەوانە کە پڕاوپڕ ئەو ئایەتە باسی ئەوانە دەکات و دەفەرموێت ((قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً (١٠٣) الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً (١٠٤) أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْناً)) "الكهف/١٠٣-١٠٥".

مەبەست لەو ئایەتە ئەو مرۆڤە گومڕایانەن، کە کردارو گوفتاریان هەمووی نەگبەتی یە کە ڕایان پێکەوە هاتە سەر ئەوەی لەدژی موسڵمانان و خەلیفەکەیان هەستن، وردە وردە بەرەو شاری مەدائن کەوتنە ڕێ تا ئەوێ بکەنە پێگەی خۆیان و خۆیانی تێدا پارێزراو بکەن، و نامەیان نارد بۆ هەموو ئەو کەسانەی لەسەر هەمان ڕای ئەمان بوون ـ لەهەموو هەرێمەکان بەتایبەتی شاری بەسرە تا کۆچ بکەن بۆلای ئەوان،

بەڵام زیدی کوڕی حصن الطائی ووتی: مەدائن باش نی یە بۆ ئەم کارەتان چونکە سوپایەکی بەهێزی تێدایە کە ئێوە چاریان ناکەن و دەرتان دەکەن لێ ی، بەڵام باشتر وایە بەهەموو براکانتان بڵێن بەرەو ((ڕوباری جوخا)) بڕۆن و لەوێ کۆببنەوە، بەڵام یەك یەك و دوو دوو دەربچن و بەکۆمەڵ و بەئاشکرا لەکوفە دەرمەچن تا ئاشکرا نەبن و پێتان نەزانن.

و یەك نامەی گشتیان نووسی بۆ خەڵکی بەسرەو ئەو شوێنانەی تریش کە هاو مەسلەکی خۆیانی لێ بووە وەك میسر، و بۆ ئەم کارەشیان، دایك و باوك و ماڵ و منداڵیان بەجێ هێشت و وایان دەزانی ئەوە دەبێتە مایەی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار، و هەستیان بەوە نەکرد کە ئەوە لەگەورەترین گوناهەکانەو یەکێکە لە گوناهە لەناوبەرەکان، بەڵام ئەو شەیتانە (نەفرەت لێکراوە) ی کە لەپەروەردگار یاخی بوو بڕیاری دا ڕۆڵەکانی ئادەم سەرلێشێواو بکات مادەم گیان لەجەستەیاندا بێت، بەڵام باش بوو هەندێ لەباوکان و دایکان ڕۆڵەکانی خۆیانیان هێنایەوەو سەرزەنشتی زۆریان کردن، و هەندێ لەو گەڕاوانە ئیتر باش بوون و تەوبەیان کرد بەڵام هەندێکیان بەدزیەوە سەرلەنوێ ڕایان کردەوە بۆ ناو گومڕاکان و قیامەتیان لەدەست دەرچوو، ئیتر هەموویان بەرەو (نەهرەوان) کەوتنە ڕێ و لەوێ زۆربوون و دەستەڵاتیان پەیداکرد[1].

---

[1] البداية والنهاية (٣١٢/٧-٣١٣).

و کاتێ هەردوو حەکەم (عەمری کوڕی عاص و ئەبو موسا الاشعری) ڕێك نەکەوتن و بەدەستی بەتاڵ بڵاوەیان لێ کرد، لەو کاتەدا ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) نامەکی بۆ ناردن و تیایدا نووسی: ئەوا هەردوو حەکەم ڕێك نەکەوتن، و داواتان لێ دەکەم وەرنەوە بۆ کوفەو با پێکەوە بڕۆینەوە بۆ جەنگ لەگەڵ شامی یەکاندا،

بەڵام ئەوان قبولی شتی وایان نەکرد، ووتیان: شتی وا ناکەین هەتا کافر بوونی خۆت ئاشکرا نەکەیت و پاشان تەوبە بکەیت، و ئەویش شتی وای نەکرد[1].

یان نامەیەکیان بۆ ناردەوەو بۆیان نووسی: ((تۆ لەبەر خاتری خودا تووڕە نەبوویت، تۆ لەبەر خاتری خۆت تووڕە بوویت، ئەگەر دان بەکافر بوونی خۆتدا دەنێیت و پاشان تەوبەیەکیش دەکەیت، ئەوە باشەو لەنێوان خرماندا تاوتوێ ی مەسەلەکە دەکەین، وە گەرنا ئێمە تۆمان لەئەمیری خستووە بەئاشکراو خوایش ناپاکانی خۆش ناوێت)) و هەکە نامەکەی خوێندنەوە ئیتر بێ هیوا بوو لێیان، و بڕیاری دا وازیان لێ بهێنێت و بەسوپاکەیەوە بەرەو شام بڕوات تا سەردەکەوێت بەسەریاندا[2].

---

[1] اناب الاشراف (٦٣/٢) بسند فيه ضعف وله شراهد.

[2] خلافة على بن أبى طالب، عبدالحميد، لا ٣١٩.

## پێنجەم/ جەنگی (نەهرەوان)ساڵی ٣٨ ك:

### ١- هۆكارەكانی جەنگەكە:

ئەو مەرجانەی كە ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) بۆ خەواریجەكانی دانابوو ئەوەبوو كە خوێنی كەس نەڕژێنن، و كەس نەترسێنن، ڕێگری نەكەن، بەڵام ئەگەر ئەوان ئەم سەرپێچیانەیان كرد شەڕكردنیان لەگەڵدا حەڵاڵ دەبێت.

لەبەرئەوە ـ خەواریج ـ هەركەسێ لەگەڵ ئەو بۆچوونەی ئەواندا نەبوایە بەكافریان دەزانی، و هەركەسێكیشیان بەكافر بزانیایە ئەوە خوێن و ماڵ و منداڵیان بەحەڵاڵ دەزانی، و یەكەم كەس بوون لەئیسلامدا موسڵمان كافر بكەن و پاشتریش خوێنی حەڵاڵ بكەن.

ڕیواتەكانیش لەو بارەیەوە زۆرن و هەریەكەو بەجۆرێك، و ئەوەی كە صحیحەو ڕاویەكەی یەكێك بووە لەخۆیان و بەچاوی خۆی تاوان و خوێن ڕشتنەكانی ئەو تاقمەی بینیوە، و پاشان وازی لێهێناون و خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ((هاوڕێیەتی تاقمەكەی نەهرەوانم كرد، و پاشان بێزم لەكارەكانیان دەهاتەوە بەڵام لەبەرئەوەی نەمكوژن، مەسەلەی خۆم بەشاراوەیی هێشتەوە، جارێكیان لەگەڵ كۆمەڵێكیاندا بووم، و لەئاوایی یەك نزیك بووینەوە كە نێوان ئێمەو ئەو لادێ یە ڕووبارێك هەبوو، و هەر ئەوەندەمان زانی پیاوێك لە لادێ كەوە دەرچوو، عەباكەی خۆی كۆكردبۆوەو ڕای دەكرد، ئەوانیش پێیان ووت: چی یە ئەڵێی لێمان دەترسیت؟ ووتی: بەڵێ، و پێیان ووت: هیچ مەترسەو بێخەمبە، ووتم: وەڵلاهی وادیارە ئەیناسی بەڵام من نەمدەناسی، و پێیان ووت: تۆ كوڕی خەبابی هاوەڵەكەی پێغەمبەری خوایت؟ ووتی بەڵێ، ووتیان: فەرموودەیەكت لەلایە كە باوكت لەپێغەمبەری خواوە بۆی گێڕابیتەوە؟ ووتی: لێم بیستووە كە گوێ ی لێبووە لە پێغەمبەری خوا باسی سەردەمی ئاشوب و فیتنەی كردو فەرمووی ((القاعد فيها خير من القائم، والقائم فيها خير من الماشي، والماشي فيها خير من الساعي، فإن أدركتك فكن عبدالله المقتول))

واتە: ((ئەوەی دانیشی باشترە لەو كەسەی پێیادا بەپێوە بێت، و ئەوەی بەپێوە بێت باشترە لەوەی كە تیایدا دەڕوات، و ئەوەیشی تیایدا دەڕوات باشترە لەو كەسەی كە تیایدا ڕادەكات و ئەگەر كەوتیتە ئەو سەردەمە، ئەوا ببە بە بەندەیەكی كوژراوی خودا)).

پاشان خۆی و خێزانەکەیان گرت کە لەگەڵیدا بوو، گرتنیان و بردنیان، لەڕێگا دایان بەلای چەند دەنکە خورمایەکدا کە وەریبوونە زەویەکە و یەکێکیان بردی بۆ دەمی، و ئەوانی تر پێیان ووت: ئەوە هی خاوەنەکەیەتی چۆن حەڵاڵت کرد بۆخۆت؟ و ئەویش خستی یەوە شوێنی خۆی. و پاشان دایان بەلای بەرازێکدا یەکێکیان بەشمشێرەکەی پەلاماری دا، یەکێ تر پێ ی ووت: ئەوە بەرازی ئەهلی ذمەیە چۆن حەڵاڵە بۆت بیترسێنیت؟

لەوێدا عبدالله ی کوڕی خباب (ﷺ) ووتی: ئەزانن چی لەو دوانە حەرامترە لەسەرتان؟ ووتیان: چی یە؟ ووتی: خوێنی من، بەڵام ئەو دڵڕەقانە گرتیان و لەقەراغی ڕووبارەکەدا سەریان بڕی و ڕاویەکە دەڵێت: بەچاوی خۆم بینیم خوێنەکەی بەدرێژایی ڕووبارەکە سوری دەکردەوە تا لەچاو وون بوو، واتە تێکەڵی ئاوکە نەدەبوو - و پاشان (سریە) یان بانگ کرد کە سکی پڕبوو، بەخەنجەر سکیان دڕی و کۆرپەکەیان دەرهێنا، و هەر ئەو ڕاویە دەڵێت: تا ئەو کاتە هاوڕێیەتی کەسم نەکردووە ئەوەندەی ئەوان خوێنڕێژو قێزەون سروشت بێت و پاشتر هەلێکم بۆ هەلکەوت و ڕام کرد[1].

ئیتر دوای ئەوە خەڵکی زۆر دەترسان لێیان بەتایبەت دوای بیستنی هەواڵی سك دڕینی ئەو ژنە بێ تاوانە و کوشتنی کۆرپەکەیشی و نەك هەر ئەوەندە بەڵکو بوبونە جێگای مەترسی و هەڕەشە بۆ ناوچەکە، و هەرچەندە هەندێ کات هەر لەخۆیان ئەو کارانەیان پێ ناخۆش بوو پێیان دەووتن: وەیل بۆئێوە ئێمە کەی بۆ ئەم کارانە لەعەلی جیابووینەوە[2]؟!.

لەگەڵ ئەو هەموو کارە حەرام و ناشایستانەدا کە ئەو تاقمە پێی هەڵدەستان عەلی (ﷺ) نەیدا بەسەریانداو دەست پێشخەری نەکرد لەکوشتنیاندا، بەڵکو نامەی بۆ دەناردن تا پیاوکوژو خوێنڕێژەکانم بۆ بنێرن با بەحەدی خوا بیانکوژمەوە، و ئەوانیش بەفیزێکەوە و وەك گاڵتەکردنێك دەیان ووت: هەموومان پیاوکوژین[3].

ئەمیری باوەڕدارانیش (ﷺ) بەخۆی ئەو سوپا گەورەیەی ئامادەکردبوو بۆ گەڕانەوەی شام بۆ ژێر دەستەڵاتی خیلافەت لەساڵی - ٣٨ - ی کۆچیدا بەرەو مۆڵگەکەیان کەوتەڕێ لە نەهرەوان[4]. و

---

[1] مصنف ابن ابي شيبة (١٥/٣٠٨-٣٠٩).

[2] مجمع الزوائد (٦/١٣٧-١٣٨) بسند صحيح.

[3] مصنف ابن ابي شيبة (١٥/٣٠٨-٣٠٩).

[4] انساب الاشراف (٢/٦٣).

لەکەناری خۆرئاوای ڕووبارەکەوە سەربازگەی داکوتا، و لەبەرامبەریشدا خەواریجەکان لەڕووی کەناری خۆرئاوای ڕووبارەکەوە بوون لەتەنیشتی شاری نەهرەوان[1].

## ٢- ئەمیری باوەڕداران هانی سوپاکەی دەدات:

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) هەستی بەوە دەکرد کە ئەو کۆمەڵە کەسەی بەخەواریج ناویان دەرکردووە، هەر ئەوانەن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرموودەکانیدا بە لەئاین دەرچوو (مارقة) ناویان دەبات، بۆیە هانی هاوڕێکانی خۆی دەدا تا بەسوپاکەوە بۆیان بچین و لەناویان بەرین، و ئەم فەرموودانەی دەربارەی ئەو تاقمە هاتبوون زۆر کاریگەریان دروست کردبووو لەسەر شوێن کەوتووانی عەلی (ﷺ).

عەلی (ﷺ) لەو بارەیەوە ڕووی کردە سوپاکەی ووتی: من لەپێغەمبەری خوا بیستووە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((یخرج قوم من أمتي یقرؤون القرآن، لیس قراءتکم الی قراءتهم بشيء، ولا صلاتکم الی صلاتهم بشيء، ولا صیامکم الی صیامهم بشيء، ﴿...﴾، الآن ویحسبون ان لهم وهو علیهم لا تجاوز صلاتهم تراقیهم، ویمرقون من الإسلام کما یمرق السهم من الرمیة))

واتە: ((کۆمەڵێك کەس لەناو ئوممەتی مندا دەردەکەون کە قورئان خوێنن، بەڵام قورئان خوێندنی ئێوە لەگەڵ ئەوان زۆر جیاوازە، نوێژو ڕۆژ دەگرن بەڵام لەگەڵ هی ئێوەدا زۆر جیاوازن، قورئان دەخوێنن وادەزانن خێریان دەگات بەڵام هەمووی لەسەریانە ـ گوناهبار دەبن بەخوێندنی ـ و ئەوانە لەئیسلام دەرچوون وەك چۆن تیر لەکەوان دەردەچێت)).

و بەردەوام لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و ووتی: ئەگەر ئەو سوپایەی کە ئێوە بۆیان دەچن بیانزانیبایە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیاندا چیان بەسەردێت هەرگیز وازیان لەکردەوەی چاك نەدەهێنا، بەڵگەیش لەسەر ئەوەی کە ئەو فەرموودانە مەبەستی ئەوانە پیاوێکیان تێدایە بەس قۆڵی ماوەو باڵی پەڕیوەو لەسەر زامەکەی قۆڵێدا گۆیەك هەیە وەك گۆی مەمك وردە و تووکی سپیشی لێ سەوز بووە، ئێوە دەڕۆن بۆ جەنگی موعاویەو خەڵکی شام واز لەو کەسانە دێنن دوایی ماڵ و منداڵتان ببێتە هی ئەوان؟

---

[1] تاریخ بغداد (١/٢٠٥-٢٠٦).

وەڵڵاهی من خوازیارم ئەوانە ئەو کەسانە بن چونکە خوێنی حەرام و بێ تاوانان دەڕژێنن و ئەدەن بەسەر ماڵ و حاڵی خەڵکیدا، دەی بکەونە ڕێ بۆیان بەناوی خوداوە[1].

عەلی (ﷺ) لەڕۆژی نەهرەواندا ووتی: فەرمانم پێدراوە لەگەڵ لەئیسلام هەڵگەڕاواندا بجەنگم و ئەوانەیش لە دین هەڵگەڕاوەن[2].

سوپای ئیسلام بەرامبەر سوپای خەواریجەکان سەربازگەی داکوتاو نێوان هەردوولایان ڕووباری نەهرەوان بوو، و فەرمانی دەرکرد بۆ سوپاکەی دەسپێشخەری نەکەن تا خەوریجەکان دەپەڕنەوە ئەمبەر ڕووبارەکە، و عەلی (ﷺ) لەوکاتەدا داوای لێ دەکردن بۆ خاتری خوا بگەڕێنەوە، و بۆ ئەو مەبەستە بەراثی کوڕی عازبی نارده ناویان (ﷺ) و لەوێ سێ ڕۆژ مایەوە بەڵام بێسوود بوو، گەڕانەوە لەبەرنامەیاندا نەبوو[3].

بەردەوام نوێنەری دەنارده ناویان ـ تا شەڕ هەڵنەگیرسێت ـ بەڵام ئەوان لەکۆتاییدا نوێنەری عەلییان شەهیدکردو هاتنە ئەم بەری ڕووبارەکە[4].

و کاتێ خەواریجەکان تا ئەو ڕادەیە هیوای ئاشتی و گەڕانەوە بۆناو کۆمەڵی موسڵمانانیان دایەوە دواوەو ئیتر کەس بەتەمای ئەوە نەما ئاشتی و صولح بێتە ئاراوە، و دەرگاکانیان بەتەواوەتی داخست و سووربوون لەسەر جەنگ و خوێنڕێژی.

ئیتر ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) دەستی کرد بە ئامادەسازی تەرتیباتی سوپاکەی، و ئامادەسازییان بۆ جەنگ[5]، و بەرپرسی لای ڕاست (حجری کوڕی عەلی) و لای چەپیش (سبث ی کوڕی ڕەبعی) و (معقل) ی کوڕی (قیس الریاحی) و (أبو أیوب الأنصاری) یشی کردە فەرماندەی ئەسپ سوارەکان، و فەرماندەی پیادەکانیش (أبو قتادة الأنصاری) و فەرماندەی موجاهیدەکانی شاری مەدینەیش (قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عبادە) و فەرمانیشی دا بە (أبو أیوب الأنصاري) کە ئاڵایەك هەڵگرێت لەناو شەڕەکەدا بۆ ئەمان و بێ وەیی خەواریجەکان و پاشان هاواری کرد:

---

1 مسلم (٢/٧٤٨).

2 السنة لإبن ابي عاصم، تحقيق الألباني، حديث صحيح.

3 السنن الكبرى، البيهقي (٨/١٧٩).

4 مصنف ابن ابي شيبة (١٥/٣٢٥-٣٢٧).

5 خلافة علي بن أبي طالب، عبدالحميد، ل ٣٢٤.

هەرکەسێك لەخەواریجەکان بێتە ژێر ئەو ئاڵایەوە، ئەوە ئـەمین و بـیٚ وەی دەبێـت، و هەرکەسـێك لەوان بگەڕێتەوە بۆ کوفە یان مەدائین ئەویش هـەر ئـەمین و بـیٚ وەیـە، و ئێمـە هـیچ مـافێکی ئەوەمان نی یە کەس بکوژین مەگەر ئەوانە نەبێت کە براکانمان دەکوژن.

ئەوەبوو لەسەر ئەو ووتە جوانانە کۆمەڵێکی زۆر لەخەواریجەکان وازیان هێنا کە نزیکـەی (٤) هەزار کەس دەبوون، تا وای لێهات نزیکـەی (١٠٠٠) کـەس مایـەوە بەدەسـتی عبـدالله ی کوڕی وهبی ڕاسبی یەوە) و بەرامبەری عەلی وەستان و سوپاکەی خۆیانیان سازدا و زەیدی کـوڕی حصن الطـائی لەلای ڕاست و شورەیحی کوڕی ئەوفا بۆلای چـەپ و حـەمزەی کـوڕی سـنانیش بـۆ ئەسپ سوارەکان و حەرقوص ی کوڕی زوهێریش بـۆ پیادەکـان و بەرامبـەری عـەلی و سـوپاکەی وەستان.

## ٣- دەست پێکردنی جەنگەکە:

خەواریجەکان بەرەو ڕووی سوپاکەی عەلی هێرشیان هێناو عـەلیش ئەسـپ سـوارەکانی لەپێـشەوە وەستاند و تیرهاوێژەکانی خستە بەردەمیان، و پیادەکانیشی لەدواوە دانـا، و پـیٚ ی ووتـن لێیـان مەدەن تا ئەوان لێتان نەدەن.

و خەواریجەکان بەرەو ڕوویان دەهاتن و هاواریان دەکرد (لا حکم الا لله) و با بڕۆین با بڕۆین بـەرەو بەهەشت، و دایان بەسەر ئەسپ سوارەکان و ئەسپ سوارەکانیش خۆیان لاداو بوون بەدوو بەشـەوە بەشێك چوونە لای ڕاست و بەشێکیش چـوونە لای چـەپ و تیرهاوێـژەکان پێـشوازیان لیٚ کـردن و تیربارانیان کردن، و ئەسپ سوارەکانیش لەلای چەپ و ڕاستەوە دایان بەسـەریاندا، و پیادەکـانیش بەڕم و شمـشێر داران گرتنـەوە، کارێکیـان کـرد بـە خەواریجـەکان هـەر شـێت بـوون لـەژێر پێـی ئەسپەکاندا، و هەموو فەرماندەکانیان کوژران عبدالله ی کوڕی وەهب و حەرقوصی کوڕی زوهەیرو شوڕەیحی کوڕی ئەوفاو عبدالله ی کوڕی سەخیر السلمی)[1].

---

[1] تاریخ الخلافة الراشدة، لا ٤٢٥.

ئەبو ئەیوبی ئەنصاری دەڵێت: ڕمێکم کرد بەسکی خەواریجێکدا و لەپشتی یەوە دەرم کردو پێم ووت: مژدەبێت ئەی دوژمنی خـوا ئەچـیتە ئـاگری دۆزەخـەوە، و ئـەویش پێـی ووتم: لـەوێ دەزانیت کامان دەڕۆینە ناویەوە[١].

کۆمەڵێکی تریان وازیان لە جەنگ هێنا لەبەر ووشەیەك کە لـە سـەرکردەکەی خۆیانیـان بیست کاتێ عەلی (ﷺ) بەشمشێرێك دای لەخەواریجێك و پێش ئەوەی بمرێت ووتی: چەند خۆشە بە بەهەشت شادبوون، و عبدالله ی کوڕی وەهب ی الراسبی ووتی: نازانم بۆ بەهەشت دەچیت یـان بـۆ ئاگر! و ئەم ووتەیە لەلای برادەرانی عبدالله سەیر بوو کە بەڵگە بوو لەسەر نـەبوونی دووربینـی و ئازایەتی و یەقینی لەسەر ڕاستی.

و پیاوێك بەناوی فەروەی کوڕی نوفلێ الاشعبی ووتی: من ئەمـە خەڵەتانـدمی بـەم کـارە هەستم کەچی وادەبینم گومانی هەیە؟ بۆیە لەگەڵ کۆمەڵێ لە هاوڕێکانیدا وازیان لەشەڕ هێنـا. و کۆمەڵێکیش دایانە پاڵی ئەبو ئەیوب الأنصاری، و ئیتر خەڵکەکە بەدزیـەوە هەڵـدەهاتن و ڕایـان دەکرد[٢].

ئەم جەنگە ماوەیەکی کورتی خایاند و بەخێرایی لەبەرژەوەندی سوپای ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) یەکلایی بوویەوە، تەنها ماوەی چەند سەعاتێکی خایانـد لـەڕۆژی نۆیـەمی مـانگی (صفر) ی ساڵی ٣٨ی کۆچی[٣].

و ئەم جەنگە بوو بەهۆی کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە خەواریجەکان و بەپێچەوانەوە لەناو سـوپاکەی عەلیدا (ﷺ) وەك مسلم لە (صحیح) دا لەزەیدی کوڕی وەهبەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: تـەنها دوو کەس شەهید بوون[٤]. لەڕیوایەتێکی تردا کە سەنەدەکەی حەسەنە دەڵێت (١٢) تا (١٣) کەس شەهیدکرا.

بەڵام خەواریج هەر هەموویان قات و قڕ کران مەگەر چەند کەسێك نەبێت کـە توانیـان بەدزیـەوە

---

[1] هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەرە.

[2] هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەرە.

[3] اخبار الخوارج، لا ٢١.

[4] انساب الأشراف (٢/٦٣).

هەڵبێن وەك مەسعودی دەڵێت[1].

٤- دۆزینەوەی بێ باڵەکە لەناو سوپای خەوارجدا:

فەرمووده هاتووه دەربارەی (ذو ثدی) واتـه مـەمك دارەکـەو ئـیتر هەنـدێکیان لاوازن و هەنـدێکیان بـەهێزن، و یـەکێ لەوانـە دەفـەرمووێت: (أسـود البـشره)[2] واتـە: ڕەش پێـستە، و لەڕیوایەتێکدا دەفەرموێت: حەبەشی یە، یان دەفەرمووێت: بێ قۆڵەو لەکۆتایی ئـەو خڕایـی پاڵـە قرتاوەی وەك گۆی مەمك هەیەو بـەدەوری گۆکەیـشدا وردە مـووی سـپی هەیـەو ئـەو باڵەیـشی دەجوڵێت واتە دێت و دەچێت، و لەڕیوایەتێکدا هاتووە کە ناوەکەیشی مالك ە،

بۆیە ئـەمیری بـاوەڕداران عـەلی (ﷺ) لەگـەڵ موجاهیـدەکانی هـاوڕێ ی دا بەگـەرمی دەگەڕان بۆ تەرمەکەی چـونکە دەیـانزانی هەواڵـەکانی پێغەمبـەری خـوا ڕاسـتەو (ﷺ) دەبێـت تیایاندا بێت، تەرمەکان لەپاڵ دەریاکەدا لەسەریەك کەوتبوون و هاوەڵـان لایـان دەبـردن تـا ئـەو (مالیك) ە دەرکەوێت، و کاتێ دۆزیانەوە عەلی (ﷺ) ووتی: ((الله أکبر)) کەسیش نازانێ بـاوکی ناوی چی یە؟ و عەلی (ﷺ) فەرمووی: باوکی ناوی چی یە؟ و کەس نەیزانی کوڕی کێ یە[3].

لەسەرەتاوە هەر نەیاندەدۆزیەوە، ئیتر خـەمی ئـەوەیان لێ هـات کـە ئـەم کۆمەڵـە ئـەو کۆمەڵە نەبن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هـانی موسـڵمانان دەدات بیـانکوژن، بۆیـە عـەلی (ﷺ) لەکۆتاییدا ووتی: ئەو کۆمەڵە تەرمـەی کـەوتوون بەسـەریەکدا جیایـان بکەنـەوە بـزانین نـی یـە لەژێرەوە؟ کاتێ جیایان کردنەوە ئەو کابرایە لەناو کوژراوەکانـدا دەرکـەوت و عـەلی ووتـی: (الله أکبر)، خواو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرمووە، و لەوێدا سوجدەەکی سوپاسگوزاری بۆ خودا بـردو (الله أکبر) یان دەکردو مژدەیان دەدا بەیەکتری[4].

---

[1] مسلم (٢/٧٤٨).

[2] تاريخ خليفة، لا ٩٧.

[3] مصنف عبدالرزاق (١٠/١٤٦).

[4] الفتح الرباني على سند الإمام أحمد (٢٣/١٥٥) بإسناد حسن.

٥- هەڵسوکەوتی ئەمیری باوەڕداران لەگەڵ خەواریجەکاندا:

ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) وەك موسڵمانان مامەڵەی لەگەڵدا کردوون چ لەپێش جەنگەکە و چ لەپاش جەنگەکە، بۆیە هەرکە جەنگ بەرەو تەواوبوون چوو فەرمانی دا بەسەربازەکانی کە شوێنی ڕاکردوو نەکەون و بریندارێش نەکوژن، و جەستەی کوژراوەکان نەشێوێنن، و یەکێ لە زانا فیقهزانەکان ـ ئەبی وائل ـ دەڵێت: نە لەڕۆژی جەمەل و نە لەڕۆژی نەهرەوان دا علي (ﷺ) جنێوو قسەی سوکی پێ نەوتوون[1].

هەموو ئەو شتانەی لەخەڵکیان داگیر کردبوو بەحەرامی و دزی ـ چونکە ئەوان خوێن و ماڵی خەڵکیان حەڵاڵ کردبوو ـ عەلی (ﷺ) لەگەڵ خۆی بردنیەوە بۆ کوفەو فەرمانی دەرکرد ـ هەرکەسێ شتی خۆی دەناسێتەوە بێت بیباتەوەو هەر هەموویان بردەوە تەنها مەنجەڵێك نەبێت مایەوە کەچی پیاوێك هات و ووتی لە منیان سەندووەو بردیەوە[2].

و فەرمانی دا تەنها ئەو شتانەی بەکاری دێنن بۆ شەڕو پێداویستی یەکانی دابەش بکرێت بەسەر سەربازەکاندا ...

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ﷺ) بە فاسق ناوی بردوون یان لادەر ـ زاغوا ـ باسیان دەکات و لە ئەمیری باوەڕدارانیان پرسی: ئایا کافرن؟ ووتی: ئەوان لە (کوفر) هەڵهاتن، ووتیان دەی دووڕوون؟ علي (ﷺ) فەرمووی: نەء، چونکە مونافیقەکان زۆرکەم یادی خوا دەکەن، ووتیان ئەی کەواتە چی بوون؟ فەرمووی لێمان هەڵگەڕانەوەو جەنگمان لەگەڵ کردن.

لەکۆتاییدا عەلی ئامۆژگاری سوپای ئیسلامی داهاتوو دەکات و ئەفەرموێت ((ئەگەر هەر کۆمەڵێك لە ئیمامی عادل و دادپەروەر هەڵگەڕانەوە ـ بێگومان جەنگیان لەگەڵدا بکەن بەڵام ئەگەرلە ئیمامی ستەمکارو نادادپەروەر هەڵگەڕانەوە شەڕیان لەگەڵ مەکەن چونکە بەڵگەیان پێ یە[3].

---

[1] مصنف ابن ابي شيبة (١٥/٣١٧-٣١٧) مسند صحيح.

[2] السنن الكبرى للبيهقي (٨/١٨٢) بسند صحيح.

[3] تلخيص الحبير (٤/٤٧).

## شەشەم/ شوێنەواری فیقهی لە جەنگەکانی عەلیدا (ﷺ):

ئەمیری باوەڕداران بەبۆنەی ئەو زانیاری یە زۆرو تێگەیشتنە وردەیەوە توانی کۆمەڵێ بنەماو یاسا دابنێت بۆ مەسەلەی جەنگ و کوشتار لەگەڵ - بغاة - یاخی و دەرچوان لەدژی ئیمامی موسڵمانان لە هەموو سەردەمێکدا، و ئیتر زاناکان لەدوای خۆی بە بەڵگە دەیان هێنایەوە لەو بوارەداو یەکێ لە زانایان دەڵێت: ((ئەگەر ئەو جەنگانەی عەلی نەبوایە لەگەڵ دژو نەیارانیدا کەس لەدوای خۆی نەیدەزانی چۆن مامەڵەی شەرعی بکات لەکاتی شەڕکردن لەگەڵ ئەهلی قیبلەدا))[1]

بۆیە خۆیشی دەربارەی خۆی دەڵێت: ((ئەگەر من نەبوومایە لەناو خەڵکیدا کێ ئەم جۆرە هەڵسو کەوتەی لەگەڵ هەڵگەڕاواندا دەکرد[2]؟)).

ئەحنەف ووتی بەعەلی (ﷺ) کەس و کارەکانمان لەبەسرە وادەزانن ئەگەر تۆ سەرکەویت بەسەریاندا ژن و منداڵەکانیان دەکەیتە غەنیمەو دابەشی دەکەیت، و پیاوەکانیشیان دەکوژیت، ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: (وێنەی من کەس ترسی وای نی یە لێ ی، دەی شتی وا کەی ڕەوایە مەگەر لەگەڵ بێ باوەڕاندا).

لەسەر ئەم بنەمایانە بۆمان دەردەکەوێت جەنگ لەگەڵ موسڵمان و ئەهلی قیبلە زۆر جیاوازە لەگەڵ جەنگ دژی بێ باوەڕان یان هەڵگەڕاوان.

١- مەبەست لەجەنگ لەگەڵ یاخی بووان لەلای ئیمامی موسڵمانان هێنانەوەیانە بۆلای ڕاستی و بۆ ناو کۆمەڵی موسڵمانان و کوشتنیان زۆر زەروری نی یە بەپێچەوانەی بێ باوەڕو هەڵگەڕاوەکاندا کە دەتوانرێت کوشتن و لەناوبردنیان بکرێتە مەبەست[3].

٢- ئەگەر ئافرەت یان منداڵ یان بەندە لەریزی یاخی بووەکاندا جەنگیان دەکرد ئەوە حوکمی پیاوە جەنگاوەرەکانیان هەیەو دەکوژرێن بەڵام برینداریان ناکوژرێت و شوێن هەڵهاتوویان ناکەوێت، چونکە مەبەست لە شەڕ لەگەڵیاندا بۆ وازهێنانیانە و بەڵام کافرو هەڵگەڕاوە ئەتوانرێت

---

[1] فتح الباری (١٢/٣٠١) سەنەدێکی صەحیحی هەیە لەلای گیری.

[2] التمهید للباقلانی، لا ٢٢٩.

[3] مصنف عبدالرزاق (١٠/١٢٤).

بكوژرێن چ لە گۆڕەپان یان لەکاتی هەڵاتندا[1].

٣- ئەگەر ـ بغـاة ـ و یاخی بووەکان وازیان لەشەڕ هێنا ئیتر بەگەڕانەوە بۆناو بازنـەی گوێڕایـەڵی یان بەدانانی چەك یان بە تێکشکان یان بە بریـندارو نەخۆشـی یـان (گولـە ـ پێنـەمان ـ)، ئـەوە دروست نی یە هەڵکوتینە سەریان بۆ کوشتنی بریندار یان ئەسیر، ئیتر با کوشتنی دیل و برینداری بێ باوەڕانیش دروست بێت.

(ابن ابی شیبه) لە (مصنف) دا لە عەلی یەوە دەگێڕێتەوە کە لەڕۆژی جەمەلدا ووتوویەتی (شوێن ڕاکردووانیان مەکەون، برینداریان مەکوژن، و هەرکەسێ چەکی دانا ئەمین و بێ وەی دەبێت)[2].

یان لەڕۆژی جەمەلدا هاواری کرد ئەسـیرەکان نـەکوژن و دەخیلتـان بم دەسـت نەبـەن بـۆ ئافرەتان ئیتر با جنێویشتان بدەنێ و قسەیش بە فەرمانـدەو سـەرۆکەکانتان بڵـێن، چـونکە ئێمـە لەسەردەمی نەفامیشدا دەست بۆ ئافرەت نەبراوە لەشەڕدا مەگەر بەشتێکی سووکە لێیان درابێـت ەك نەعل و پەلی دارخورما و لەسەردەمی ئیسلامیشدا هەروابووە[3].

ئەبی ئومامەی باهلی (ﷺ) دەڵێت: (خۆم بەشـداری (صـفین)م کـرد نەمـدی بریـندارێك بکوژن و شوێن ڕاکردوویەك بکەون و یان بەندەیەك بکوژن یان شتەکانی کوژراو بەرن)[4].

٤- یاسای گرتنی ئەسیری یاخی بووان بەم چەشنەیە ئەگـەر دڵنیابوویـت دووبـارە ناچـێتەوە نـاو گۆڕەپان ودووبارە جەنگت لەگەڵ بکاتەوە، ئەوە دەبێت بەڕەڵای بکەیت و ئەگەر زانیـت بەشـداری دەکاتەوە ئەوە لەزیندان دەهێڵرێتەوە تا دوای جەنگەکەو پاشان دروست نی یە لەزیندان بمێنێتەوەو دەبێت ئازاد بکرێت بەڵام دیلی بێ باوەڕان دەتوانرێت لەزینداندا بهێڵرێتەوە[5].

٥- پەنا نابرێت بۆ بێ باوەڕان یان هاوپەیمانان ـ معاهد ـ لە ئاینەکانی تر کـە بەشـداری جـەنگ بکەن لەگەڵ موسڵمانە یاخی بووەکاندا، هەرچەندە دروستە بۆ کوشتاری کـافران یـان هەڵگـەڕاوان

---

[1] المغنی (٨/١٠٨-١٢٦).
[2] الأحکام السلطانیة، ل ٦٠.
[3] الفتح (٥٧/١٣) إسناده صحیح.
[4] نصب الرایة (٤٦٣/٣).
[5] المستدرك (١٥٥/٢) سنده صحیح وافقه الذهبی.

بەشداری جەنگیان پێ بکەیت[1].

٦- دەبێت ئاگربەستیان بۆ ماوەی دیاری کراو لەگەڵدا نەکات و لەو پێناوەشدا پارەیان لێ وەرنەگریت چونکە ئەگەر لاوازە دەبێت چاوەڕوان بێت تا بەهێز دەبێت و چاریان دەکات، ئەگەر لەسەر ماڵیش لەگەڵیان ڕێك کەوتبوو ئەوە دروست نی یە ئەو پارەیەش دەبێت بزانرێت چۆن دەستیان کەوتووە ئەگەر (زەکات و فەیئە) نایان داتەوە بەڵکو بیخاتە ناو (بیت المال) بەڵام ئەگەر پارەو سامانی خۆیان بوو دەبێت بۆیان بگێڕێتەوە[2] چونکە علي (ﷺ) ماڵ و سامانی خەڵکی جەمەلی حەڵاڵ نەکرد.

٧- ئەگەر لەدژی ئیمام هەستابوون و تەئویل و بیانوویەکی گونجاویان بەدەستەوەبوو یان دەیان ووت ستەمیان لێ کراوە ئەوا ستەمەکەیان لەسەر لادەبات و لەڕێگەی نامەو نوێنەرەوە تەئویل و بیانووەکانیان ڕاست دەکاتەوە، وەك چۆن عەلی (ﷺ) لەگەڵ خەواریجدا کردی و زۆر لەوانە ڕاستیان بۆ دەرکەوت و گەڕانەوە ناو کۆمەڵی موسڵمانان[3]، ئەگەر نەگەڕانەوە ئەوە پێویستە جەنگیان لەگەڵدا بکات[4].

٨- ئەگەر بەئاشکرا لە گوێڕایەڵی ئیمام دەرنەچووبوون و لەماڵێکدا خۆیان جیانەکردبوویەوە، بەڵکو تاك تاك بوون و ئاسان بوو لەسەر ئیمام ڕێك و پێك کردنیان و کۆنترۆل کردنیان، دەبێت شەڕیان لەگەڵدا نەکرێت و وازیان لێ بهێنرێت و حوکمی دادپەروەرانەیان بەسەردا جێ بەجێ بکرێت وەك (حدود) ەکان[5].

٩- نابێ لەگەڵ ـ سەرکەش و یاخی بوواندا ـ بەمەنجەنیق و ئاگر پێوەنان بۆردومانیان بکات چونکە زیانەکانی گشتی دەبێت و بێ تاوانیش پێوەدەبێت و نابێت ماڵەکانیان ئاگر تێ بەربدات و درەخت و ڕەزەکانیان ببڕێت یان پانی بکاتەوە، ئیتر با ئەو کارانە لەگەڵ سوپای بێ باوەڕاندا دروستیش بێت، چونکە (دار الاسلام) هەموو شتێکی پارێزراوەو نابێت ببەزێنرێت، بەڵام مەگەر

---

[1] الاحكام السلطانية، لا ٦٠.

[2] هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەرە.

[3] الأحكام السلطانية للماوردي، لا ٦٠.

[4] السنن الكبرى للبيهقي (٨/١٨٠).

[5] مجموع الفتاوى (٤/٤٥٠).

لەكاتێكدا زۆر پێویست بەوكارە بكات لەلای شافعی و أبو حنیفە دروستە چونكە خۆیان قایم كردووەو نایەنە دەرەوە[1].

١٠- نابێت ماڵ و سامانیان بكرێتە غەنیمەو ژن و منداڵەكانیشیان ناكرێتە كەنیزەك و دابەش ناكرێن بەسەر موجاهیدەكاندا چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لا يحل مال امرىء إلا بطيب من نفسه))[2] واتە: (ماڵی كوسڵمان بۆ كەس حەڵاڵ نی یە مەگەر بەخۆشی و حەزی خۆی). یان بە بەڵگەی ئەوەی كە عەلی (ﷺ) لەڕۆژی جەمەلدا ووتی: هەركەسێ شتێكی برابوو، ناسیەوە لەلای كێ یە با لێی بسەنێتەوە[3].

هەر هۆی ئەمەش بوو كە خەوارجەكان ڕقیان لە ئەمیری باوەڕداران هەستاو پێیان دەووت: ئەو خەڵكە دەكوژرێت كەچی ماڵ و سامانی بەغەنیمە ناكرێت و ژن و منداڵیان دابەش ناكات بەسەر جەنگاوەراندا، و (ابن عباس) یش (ﷺ) ئەم بۆچوونەی بۆ ڕاست كردنەوەو پێی ووتن: دەی ئایا ئێوە ڕازی دەبن دایكتان عائشە (رضي الله عنها) بكەن بە كەنیزەك؟ و هەموو سەریان داخست و قسەیان بۆ نەماوە.

بەڵام دروستە چەك و وڵاخەكانیان بۆ جەنگاوەران وەك ابن ابی شیبە لە (أبی البختری) وە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: كاتێ لەجەمەلدا سوپای بەسرە تێك شكاو عەلی (ﷺ) ووتی: بەدوای كەسدا نەگەڕێن كە لەدەرەوەی سەربازگەیە، هەرچی شمشێرو وڵاخەكانیانە بیبەن بۆخۆتان[4].

١١- كوژراوی ـ بغاة ـ یاخی بووان دەشورێت و كفن دەكرێت و لەگۆڕستانی موسڵماناندا دەنێژرێت، چونكە ئەوانیش موسڵمانن ـ لەسەر مەزهەبی شافعی و (أصحاب الرأی)[5].

١٢- ئەهلی ـ بغاة ـ یاخی بووان لەبەرئەوەی ئەهلی بیدعە نین ـ فاسق ـ نابن، چونكە مەسەلەی شەڕ لەگەڵكردنیان لەسەر ئەوەیە كە بەهەڵە كەوتوونەتە ناو ماناكردنی دەقەكانەوە ـ تأویل ـ وەك

---

[1] الأحكام السلطانية، لا ٥٨.
[2] المغني لابي قدامة (٨/١٠).
[3] السنن الدار القطني (٣/٢٦) صححه الألباني في أرواء الغليل، ذ (١٤٩٥).
[4] ) المغنی (٨/١١٥).
[5] مصنف ابن ابي شيبة (١٥/٢٦٣).

مجتهد چۆن هەڵە دەكات و ناشبن بە (فاسق) و شایەتییان وەرگیراوە لە دادگای ئیسلامیدا، لەسەر ڕای ئیمامی شافعی. بەڵام خەواریج و ئەهلی بیدعە فاسقن و شایەتییان لێ وەرناگیرێت[1].

١٣- دروستە بۆ ئیمامی عەدل خزمەكانی خۆیشی بكوژێت ئەگەر لەڕیزی - یاخی بوواندا - بوون و وەك جێ بەجێ كردنی (حدود) ەكانی خوا وایە كە دەبێت جێ بەجێی بكات با لەدڵیشەوە خەفەتی بۆ بخوات[2].

١٤- ئەگەر یاخی بووان پارەو سامانیان لەئەهلی ناوچەی ژێردەستەڵاتیان كۆكردبوویەوە لەكاتی دەست ڕۆشتنیاندا وەك زەكات و سەرانەو شتی تر، بۆ ئیمام دروست نی یە داوای ئەو پارانە بكاتەوە لەكاتی سەركەوتنی بەسەریاندا چونكە علي (ﷺ) لەدوای (جەمەل) هیچ بەرپرسیارێتی یەكی دارایی نەخستە ئەستۆی سوپای بەسریەكان و داوای هیچی لێ نەكردنەوە.

١٥- ئایا یاخی میرات لەعادل دەبات؟ یاخی میراتی عادل نابات ئەگەر خۆی كوشتبێتی چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی ((القاتل لا یرث))[3] واتە پیاوكوژ میراتی پێ ناشێت.
بەڵام ئەبو حەنیفە دەڵێت ((عادل میراتی لە باغی دەكەوێت بەڵام باغی - یاخی - لە - عادل - ی ناكەوێت بەڵام ئەبو یوسف دەڵێت: ئەویش دەیكەوێت چونكە تەئویلێكی هەبووە لەو جەنگەیدا[4].
١٦- ئەگەر هیچ چارەیەكی تر نەبوو جگە لەجەنگ كردن و كوشتنی یاخی بووان ئەوە دروستە ئەوكارە بكرێت و هیچ گوناه و خوێن و كەفارەتێك ناكەوێتە سەر جەنگاوەرەكان كە جەنگیان لەگەڵ دەكەن، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت ((فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ))[5]
واتە: جەنگ دژی یاخی بوان بكەن تا وایان لێ دەكەن بگەڕێنەوە بۆلای خوای گەورە.

---

[1] تحقيق مرافق الصحابة (٣٠١/٢).
[2] المغنى (١١٨/٨).
[3] تحقيق مواقف الصحابة (٣٠١/٢).
[4] المغنى (١١٩/٨)
[5] حجج سنن ابن ماجه، ذ (١٢٤٠).

## حەوتەم/ سیفاتەکانی خەواریج:

### ١- ڕۆچوون لەئیسلامدا (الغلو في الدين):

گومانی تێدانی یە کە خەواریجەکان ئەهلی بەندایەتی و خواناسی یەکی زۆربوون و زۆر لەهەوڵی ئەوەدا بوون کە گەورەو بچووکی ئیسلام جێ بەجێ بکەن و لەهەموو قەدەغەکراوەکانیشی بەدووربن.

(ابن عباس) (ﷺ) کاتێ چوو بۆ ناویان بۆ ئەوەی قسەو گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات پاشان دەڵێت: (چوومە ناو گەلێکەوە کەسم نەدیوە تا ئێستا وەك ئەوان تێبکۆشێت ـ لەئاین داریدا ـ تەوێلیان دیاری بوو بوو لەتاو کرنووشی زوریاندا و دەستەکانیشیان وەك ئەژنۆی حوشتر تره‌کیبوو لەزۆری دەست نوێژگرتن و دەم و چاویان گۆڕابوو لەبەر زۆری شەونوێژو نەخەوتن)[1]

((جندب الازدی)) دەڵێت لەگەڵ ئەمیری باوەڕداران ـ عەلیدا بووم ـ (ﷺ) کاتێ لە خەواریجەکان نزیك بووینەوە یەك گیزە گیزیان لێوە دەهات وەك پورەهەنگ لەتاو قورئان دەور کردنەوە[2]، خەریکی ڕۆژو نوێژێکی زۆر دەبوون و لەسنوری ئاسایی دەرچوبوون و بەرەو توندڕەوی و ڕۆچوون چووبوون کە ئەمەش بردنی بەرەو ئەوەی لەگەڵ بنەماو یاساکانی ئیسلامدا پێچەوانە بینەوە وەك ئەوەی دەیان ووت: هەرکەسێك گوناهی گەورە بکات ئەوە کافر دەبێت و تەنانەت هەندێکیان لەوە خراپتریشیان ووت کە ئەوەی گوناه بکات با بچوکیش بێت بەهەمیشەیی لەناو ئاگردا دەمێنێتەوە[3].

و پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڕەشەی لەو کەسانە کردووە کە زۆر قووڵ دەبنەوە لەخواناسی و موسڵمانەتی و بەندایەتیدا ـ بەتایبەت بەندایەتی یە ڕووکەشەکان ـ ظاهري ـ و دەفەرموێت ((هلك المتنطعون، هلك المتنطعون، هلك المتنطعون))[4] واتە: لەناوچن ڕۆچوان لەناوچن ئەوانەی لەبەندایەتی یەکاندا زیادەڕەوی دەکەن و لە فەرمودەکانی پێغەمبەر و شێوازی بەندایەتی یەکانی

---

[1] هەمان سەرچاوە، ٩٣.
[2] مسلم کتاب العلم شرح النووي (٢٢/١٦).
[3] تلبیس ابلیس لا ٩٣.
[4] الفصل لابن حزم (١٩١/٤).

پێغەمبەریان بەدڵ نی یەو دەڵێن عیبادەتی کەم بووە!!!.و ئێمە زیاتری ناکەین!.

٢- تێنەگەیشتن و جەهل بە ئیسلام:

یەکێ لە نەخۆشیە سامناکەکانی خەواریج تێنەگەیشتن بوو لە حەقیقەتی دەقەکانی قورئان و سوننەت و خراپ حاڵی بوونیان لێ ی وەك (ابن عمر) (ﷺ) دەربارەیان لەوەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی الحروریە دا دەڵێت: موسڵمان بەکافر دەزانن و خوێن وماڵیان بەحەڵاڵ دەزانن و ژنیان مارە دەکەن کە بیشزانن مێردی هەیە، و کەسێ نابینم شایەنی ئەوە بێت شەڕیان لەگەڵدا بکرێت لەوان[1].

و (ابن عمر) خوای لێ ڕازی بێت بەخراپترین دروستکراوی خوا سەیریان دەکات و دەڵێت ((هەرچی ئەو ئایەتانەی لەسەر کافرو بێباوەڕان دابەزیوە ئەوان دایدەبەزێننە سەر موسڵمانان))[2].

٣- لەت کردنی ڕیزی موسڵمانان:

(ابن تیمیه) دەڵێت (( ئەوانە لە بیرو باوەڕیاندا بەرامبەر پێشەوایانی ڕێنموویی و کۆمەڵی موسڵمانان گومڕایی ڕووی تێ کردوون و لە میانەڕەوی ـ عدل ـ چوونەتە دەرەوە و گومڕاو سەرلێشێواو بوون و ئەمەش هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە لەپرگرامی سوننەو جەماعە دەچنە دەرەوە، و پاشان هەر شتێك لەلای ئەوان بەزوڵم بکرێت ئەوە بەکوفری دادەنێن و کۆمەڵێ حوکمی بۆ دادەنێن[3].

هەر لە نەفامی و تێنەگەیشتنیان ئەوەبوو کە دانی تەحکیمیان بەکوفر زانی و داوایان لەعەلی کرد تەوبە بکات و موسڵمان بێتەوە!![4] و لە ناڕەحەت ترین کاتدا پشتی ئەمیری باوەڕدارانیان بەردا و لەقسەی دەرچوون.

ئیتر لەبەرئەوە لە عەلی جیابوونەوەو ڕیزی موسڵمانانیان لەت کردو دووبەرەکیان خستە ناویانەوەو تەنانەت دواتریش خۆیشیان لەناو یەکدا یەکتریان بەبێ باوەڕ لەقەڵەم دەدا[5].

---

[1] الاعتصام (٢/١٨١،١٨٣).

[2] ظاهرة الغلو في الدين، محمد عبدالكريم، لا ١١٤.

[3] مصنف ابن ابي شيبة (١٥/٣١٢).

[4] الخوارج للسعودي، لا (١٩١-١٩٢).

[5] ظاهرة الغلو في الدين، لا ١٠٦.

٤- بەکافر کردنی خەڵکی لەسەر گوناه کردن و حەڵاڵ کردنی خوێنیان:

(ابن تیمیة) دەڵێت یەکێکی تر لە نیشانەکانی خەواریج و (بیدعە) چی یەکان ئەوەیە کە خەڵکی بەهۆی گوناهەوە بەکافر دەزانن و ئیتر خوێن و ماڵ و سامانیان بە حەڵاڵ دەزانی و هەموو (دار الاسلام) یان بە (دار الکفر) دادەناو ئەو شوێنەی خۆیانیان بە (دار الإیمان) دادەناو زۆربەی ڕافیزەکانیش وا دەڵێن،

تەنانەت عبداللە ی کوڕی خبابی کوڕی ئەرەتیان شەهید کرد بەس لەبەرئەوەی ڕای لەگەڵ ڕایاندا نەبوو، هەر بەوەوە نەوەستان سکی ـ سریە ـ شیان ڕادا کە لەگەڵ عبداللە دا بوو.

(ابن تیمیە) دەفەرموێت: (خراپ تێگەیشتنیان لە قورئان بەرەو گومڕایی بردن وەگەرنا مەبەستیان نەبوو دژایەتی قورئان و موسڵمانان بکەن).

٥- هەڵە دەدەنە پاڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ):

(ابن تیمیة) دەڵێت: خەواریجەکان بەدووریان نەدەزانی کە پێغەمبەر (ﷺ) لە سوننەتی ژیانیدا بەهەڵەدا چووبێت (پەنا بەخوا) بۆیە لەلای ئەوان دەبێت لەو شتانەدا شوێن پێغەمبەر بکەون کە لەگەڵ قورئاندا یەك دەگرنەوەو بەڵام ئەگەر فەرمانێ دەربکات پێچەوانە بێت لەگەڵ قورئاندا ئەوە بەقسەی ناکرێت، و لەم بۆچوونەیشدا زۆری لە موسڵمانە سادەکانیان بۆلای خۆیان ڕاکێشتبوو، ئیتر بەهەر هۆیەك بووایە خۆیان لە جێ بەجێ کردنی سوننە دەدزیەوە چ بە تەئویل کردنی یان بە لاوازکردنی سەنەدەکەی یان دەقەکەی و بەم کارەشیان کەوتوونەتە گەورەترین هەڵەوە چونکە قورئان خۆی فەرمان دەکات کە لە هەموو شتێکدا گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا بکەن ((وَمَا آتَاكُمْ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا)).

٦- تانەو تەشەردان و بەگومڕاکردن پیشەیان بووە:

تانەو تەشەردان لە پێشەوایانی هیدایەت و بەگومڕاکردنیان و تۆمەتبارکردنیان بەوەی کە لە عەدالەت و ڕێگەی ڕاست لایان داوە، و ئەم هەڵوێستە هەر لە سەردەمی پێغەمبەری خواوە ڕووی داوە، کاتێك (ذو الخویصرة) بە پێغەمبەری خوای ووت: ئەی پێغەمبەری خوا دادپەروەربە،

بەم کارە (ذو الخويصرة) خۆی پیاوێکی بەرزو ئامۆژگاری کەر دایە قەڵەم و پێغەمبەری ئەکرەمیش (ﷺ) بە ناڕەواو نادادپەروەر دانا، و ئەم سیفەتە بۆگەنەش بەدرێژایی مێژوو لەگەڵ خەواریجەکانـدا هات و زۆر مەسەلەیان لەسەر بنیات دەنا[1].

٧- گومانی خراپ بردن:

گومانی خراپ بردنیش یەکێکی ترە لەو سیفەتە ناشیرنانەی کە خەواریج لەسەری بـوون و یەکەم کەسیش (ذو الخويـصرة) ی تێکەوت کە گومانی خراپی بە پێغەمبەری خوا برد ووتی پیّ ی: ئەمە بەش کردنێکە نە دادپەروەری تێدا بەدی کراوە و نە لەبەر خوایش ئەنجام دراوە[2].

(گومانی خراپیش سەرچاوەکەی گوێڕایەڵی شەیتان و نەزانکاری یـە، چـونکە مرۆڤێکـی سادەیەو نازانێـت کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هـەر کارێـك بکـات دووربینـی تێـدا دەکـات، و حیکمەتێکی گەورەی لەپـشتەوەیە و مەبەسـتی بـەرەو پـێش بردنـی بانگـەوازی ئیـسلامە نـەك مەبەستی فەرق و جیاوازی کردن لەنێوان هاوەڵێـك و هـاوەڵێکی تـردا، و دڵنـەوایی کردنـی ئـەو دەوڵەمەندانە زۆر پێویست بوو، چونکە لەداهاتوودا پارەو سامانی ئەوان بوو کـاروانی فتوحاتیـان بەهەموو دنیادا بڵاو کردەوە)[3].

٨- توندو تیژ بوون لەگەڵ موسڵمانانـدا:

خەواریج بەوە ناسراون زۆر توندڕەو و کەللە ڕەق و توندوتیـژن، بـەڵام نەگبـەتی خـەواریج لەوەدابوو کە لەگەڵ ومسڵمانانـدا توندوتیژ بوون و کەللە ڕەق، بەپێچەوانەی ئایەتەکانی قورئانـەوە کە وەسفی موسڵمانان دەکات بەوەی لەگـەڵ ئیمانداراننـدا نـەرم و نیـانن و لەگـەڵ بـیّ باوەڕانـدا توندوتیژ وەك دەفەرموێت ((أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ)).

ئیتر بەو توندو تیژیەیانەوە موسڵمانانیان تۆقاندبوو، خۆ موسڵمانان ناهـەقیان نـەبوو کـە دەترسان لێیان چەنکە لەلای ئەوان هەمووی کافرەو دەبێت خوێنیان بڕژن و مـاڵ و سـامان و ژن و کچەکانیان بگرن و بیان بەن بۆ خۆیان!،

---

[1] البخاري، فتح الباري (١٢/٢٩٠).

[2] البخاري ـ كتاب استتابة المرتدين ، فتح البخاري (١٢/٢٠٩).

[3] ووتەی وەرگێڕ.

و نمونوکەشی ئەوەیە کە بەسەر کوڕەکەی خەبابی کوڕی ئەرەتیان هێنا (ﷺ) و بەو جۆرە ناشایستەیە خۆی و (سریە) ی خێزانیان کوشت و بەڵام لەگەڵ ئەهلی ذمە و کافراندا نەرم و نیان بوون و بەیەکتریان دەووت ئەو بەرازە مەترسێنە کێ دەڵێ هی موعاهیدێك نی یە؟!!.

# جێباسی دووەم

# کۆتا ڕۆژەکانی ژیانی ئەمیری باوەڕداران و شەهیدکردنی (ﷺ)

## یەکەم/ دوا بەدوای جەنگی نەهرەوان:

جەنگ کردنی ئەمیری باوەڕداران عەلی (ﷺ) لەگەڵ ئەو خەواریجە لەدین دەرچوانەدا بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە عەلی (ﷺ) لەسەر هەق بووە کاتێك جەنگی دژی موعاویەو شامی یەکان ڕاگەیاند، و لەموعاویە زیاتر لە هەق و ڕاستی یەوە نزیك بوو، و لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ((تمرق مارقة عند فرقة من المسلمين يقتلها أولى الطائفتين بالحق))[1]

واتە: کۆمەڵێك لە موسڵمانان لە ئیان دەردەچن و کۆمەڵێك لەگەڵیان دەجەنگن کە لە کۆمەڵەکەی دووەمیان زیاتر لەسەر هەقن.

خوێنەر لێرەدا هەست بەوە دەکات کە ئەو سوپایەی توانی سەرکەوێت بەسەر خەواریجەکانداو فەرمودەکان وەسفی چاکەی دەکەن و بە سوپایەکی حەق بێژی دەزانن و لەدوای ئەوەی شەهیدبوونی عەماری کوڕی یاسر (ﷺ) لە ڕیزەکانی سوپاکەی عەلیدا زیاتر خەڵکەکەی دڵخۆش کردو بۆیان ڕوون بوویەوە کە علی لەسەر هەقە و کۆمەڵێك شەهیدی دەکات کە کۆمەڵێکی یاخی و باغی یە کە موعاویە و شامی یەکان شەهیدیان کرد.

خەڵکەکە چاوەڕوان بوون کە ئەمیری باوەڕداران ـ دوای سەرکەوتنی لە جەنگی نەهرەواندا و توندو تۆڵ کردنەوەی ئاسایشی ناوخۆ کە خەواریجەکان کرمنیان کردبوو، هەروەك

---

[1] مسلم (٢/٧٤٥-٧٤٦).

کەسیش لەوە ئەمین نەبوو کە ئەگەر بڕوات بۆ جەنگ لەگەڵ شامی یەکاندا لێرە ماڵ و منداڵی بە سەلامەتی دەمێنێتەوە و خەواریج نایان کەن بە کەنیزەك و دابەشیان ناکەن بەسەر خۆیاندا!!

هەموو ئامادەی ئەوە بوون کە لەوانەیە عەلی (ﷺ) فەرمان دەربکات بۆ دووبارە لەشکرکێشی بۆ گەڕاندنەوەی زەوی پانوپۆڕی شام بۆ ژێر دەستەڵاتی خەلیفە، بەڵام هەندێ جار هەوا بەئارەزووی کەشتی ناڕوات. ((إن الرياح لا تجري بما تشتهي السفن)). و ئەمیری باوەڕداران ئەم کارە قورس و گرانەی بۆ نەچووە سەر و پێش ئەوەی پێ ی هەستێت دەستێکی ڕەش و چڵکن شەهیدی کرد[1].

دەرچوونی خەواریجەکان لەناو سوپاکەی عەلیدا (ﷺ) کەلێنێکی گەورەی کردە ناو سوپاکەی و توانی تا ڕادەیەك لەهەیبەتی سوپاکە کەم بکاتەوە.

هەروەك ئەو سێ جەنگە ـ جمل و صفين و نەهرەوان ـ عێراقیەکانیان بێ تاقەت کردبوو، لە جەنگ بێزاری کردبوون بەتایبەتی جەنگی صفين کە لەگەڵ برا شامی یەکانیاندا کریان، ئەوە جەنگێ نەبوو وەك جەنگەکانی ترو ئەوە وەك ئاش وابوو هەموو لایەکی هاڕی و هەرگیز لە خەیاڵیان دەرنەدەچوو، و ئەگەر (صوڵح و تەحکیم) نەهاتایەتە ئاراوە و عەلی (ﷺ) ڕازی نەبوایە پێ ی، بەڕاستی کارەساتێکی گەورە ڕووی لە جیهانی ئیسلام دەکرد کە شوێنەوارە خراپەکانی بەخەیاڵدا نایەت ...

ئەم جارە خەڵکەکە ساردی و سستی نواندنیان پێ خۆشتر بوو تا دەرچوون جارێکی تر بۆ جەنگی ـ شام ـ خۆ دەشیان زانی عەلی (ﷺ)لەسەر هەقە[2].

ئەمیری باوەڕداران علی (ﷺ) ڕۆژانە کێشەی نوێ ی بۆ دەهاتە پێش کە بە باس کردنیان موو گرژ دەبێت و هەر ئەو پیاوە مەزنە بوو کە خۆی گرتووە لەبەردەمیدا، هێشتا لەکێشەی ـ خەواریج ـ ڕزگاری نەبوو بوو بەتەواوەتی کە بە کافرو بێ باوڕ دایانە قەڵەم ـ پەنا بەخوا ـ کەچی لە بەرامبەردا کۆمەڵێکی تر (قوت) بوونەوە و ئەمان (١٨٠) پلە پێچەوانەی خەواریج بوون و

[1] خلافة علي بن أبي طالب، عبدالحميد، لا ٣٤٥.
[2] خلافة علي بن أبي طالب، لا ٣٤٥.

ئەمان دەیان ووت عەلی (ﷺ) زۆر زۆر پیرۆزەو لەئاستی بەشەر بارز ترەو تەنانەت هەندێکیان جورئەتی ئەوەیان کرد ـ پەنا بەخوا ـ بلێن خوایە!![1]

ئەوانەش بەو کارەیان کۆمەڵێ بیروباوەڕی خراپیان لەگەڵ خۆیان هێناو ئاخنیانە ناو بیروباوەڕی پاکی موسڵمانان بۆیە ئەمیری باوەڕداران زۆر بەقورسی دابەزی بە سەریان وەك پێشتر باسمان کرد هەندێکی بەزیندوویی لێ سوتاندن.

ئەمانە کاریگەریان هەبوو لەسەر ساردبوونەوەی خەڵك لە علی (ﷺ) و بەتایبەت پاش جیابوونەوەی ـ خریت ی کوڕی ڕاشید ـ کە والی عەلی بوو بەسەر ئەهوازەوە و بانگەشەی لابردنی عەلی دەکرد و زۆرێ لە خەڵکە سادەکەش هاتن بە دەمی یەوە و دواتر توانی زەکات و سەرانە بۆخۆی بنچێتەوە لە ناوچەی فارسەکاندا، بەڵام علی (ﷺ) سوپایەکی نارده سەری بە فەرماندەیی ـ معقل ی کوڕی قەیس ـ توانی بیشکێنێت و خۆیشی بکوژرێت[2].

لەکاتێکدا ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) ڕووبەڕووی ئەم کێشانەو چەندان کێشەی تر دەبوویەوە وەك وازهێنانی (بنی ناجیە) و نەدانی (خەراج) لەلایەن فارسەکانەوەو ڕاپەڕینی خەڵکی (ئاواز) کە ئەزمەیەکی سەربازی و دارایی بۆ هاتە پێش، و لە بەرامبەریشدا ـ موعاویە ـ و سوپای شام لە زیادبوونی دەستەڵاتدا بوو هۆکارەکەشی دەگەڕایەوە بۆ چەند خاڵێك لەوانە:

١- کوشتنی وزەو تواناکانی عەلی و سوپاکەی بە جەنگی لابەلایی وەك (نهروان) و خەواریجەکان.

٢- والی علی (ﷺ) لە میسر محمدی کوڕی ئەبو بەکری صدیق بوو (ﷺ) وەك والی پێشوو لێزانانە هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکوژانی عثمان و داواکارانی خوێنی عثماندا نەدەکردو وەك باسمان کرد پێشتر بەم کارەی زیاتر خەڵکەکەی لەخۆی ئاڵسکاندو موعاویەیش لە بەرامبەردا توانی پەیوەندی بکات لەگەڵ داواکاری خوێنی عثماندا و دواتر توانی میسر بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی و بەوەش کۆمەکی و پاڵپشتێکی سەربازی و دارایی چاکی دەستکەوت و عەلیش ـ شتێکی ئاوا چاکی لەدەست چوو.

---

[1] نظام الخلافة في الفكر الإسلامي، لا (١٥-١٦) مصطفى حلمي.

[2] تاريخ طبري (٦/٢٧).

٣- میسر زیاتر بەشام دەیخوارد لەبەر نزیکی و هاوسنووری نێوانیان بەپێچەوانەی عێراقەوە کە دووربووو لێ یەوە. و تا وایشی لێ هات کە بیر لە جەزیرەی عەرەبی و مەککە و مەدینە بکاتەوە بەڵام علی (ﷺ) توانی نەهێڵێ توخنی ئەو ناوچانە بکەوێت[1].

بۆیە علی (ﷺ) زۆر گلەیی لە دۆست و دەست و پێوەندەکانی خۆی دەکات و لە یەکێ لە ووتارەکانیدا لەوبارەیەوە دەڵێت: ((دەرکەوتن و بەرزیەك لەلای موعاویەدا دەبینم و هەرچی سەیر دەکەم ئەوانە سەردەکەون بەسەرتاندا چونکە ئەوان لەگەڵ ناڕەوایی یەکەیاندا یەکن بەڵام ئێوە لەسەر هەقن کەچی پەرتەوازەن، و ئەوان گوێ ڕایەڵی ئەمیرەکەیانن و ئێوەش سەرپێچی کاری ئەمیرەکەتانن، و ئەوان ئەمانەت پارێز بوون، و بەڵام ئێوە ناپاك دەرچوون، و هەرکەسێ دەکەم بە بەرپرسی جێگایەك خێرو خێراتی ئەو ناوچەیە کۆ دەکاتەوە و دەیبات بۆ موعاویە و فلانم بەکارهێنا هەرچی کۆکردەوە بردی بۆلای موعاویە، تا وام لێهاتووە متمانەیان پێ نەکەم قاپێکیان بدەمە دەست، دەی سا خوای گەورە تۆ ئاگاداری ڕقم لێیانەو ئەوانیش ڕقیان لە منە، و دەی خوایە گیان ڕزگارم کە لێیان و ڕزگاریان بکە لێم))[2]

---

[1] تاریخ خلیفة، لا (٦٩٨) بدون سند.

[2] التاریخ الصغیر، بخاري (١/١٥).

## دووەم/ ئەمیری باوەڕداران ورەی سوپاکەی بەرز دەکاتەوە بۆ کشان بەرەو شام و پاشان هودنە و ئاگربەست:

بەڵام ئەمیری باوەڕداران لەبەردەم ئەم نەهامەتیانەدا چۆکی دانەدا، و هەموو هەوڵێکی خستەوە کار بۆ جوڵاندن و بەرزکردنەوەی ئاستی ورەی سوپاکەی، و بۆ ئەو مەبەستە هەموو زیرەکی و ژیری و ڕەوانبێژی خۆی بەکارهێنا، و توانی ووتارە بەناوبانگەکەی بدات بۆیان، و کە بە کەلەپورێکی گەورە دادەنرێت و لەخۆڕایی ئەو وتارەی نەدا بەڵکو دوای چەشتنی تاڵاوێکی زۆر لە واقیعی سەردەمەکەی خۆیدا و ئەمەش بەشێکە لە ووتارەکەی:

((پاشان .... جیهاد دەرگایەکە لە دەرگاکانی بەهەشت و خوای گەورە خستویەتی یە سەر پشت بۆ دۆستانی خۆی، و بەرگی تەقوایە و قەڵغانی بەتینی خودایە بۆیان، و هەرکەسێك پشتی لێ هەڵبکات و وازی لێ بهێنێ، ئەوا خوای گەورە جل و بەرگی سەرشۆڕی لەبەر دەکات و دووچاری کۆمەڵێ بەڵای دەکات، و دەیکات بە پاشکۆی بچوك و بێ نرخەکان، و دڵی دادەخات لەئاستی ڕێنموونی و پێکان، بە وازهێنانی لە جیهاد کوێر دەبێت لەئاستی ڕاستی، و دەبێتە جێگەی لاقرتی و گاڵتە جاڕی، و لە دادپەروەریش بێ بەش دەبێت.

ئەوا من بەشەو و بەڕۆژ، بە نهێنی و بەئاشکرا بانگم کردوون بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەوانە، و پێم ووتن با بدەین بەسەریاندا پێش ئەوەی بدەن بەسەرماندا، دەی سا وەڵڵاهی هیچ گەلێك جەنگ و هەرا نەهێنراوەتە نێوماڵەکەیەوە و سەرشۆڕ نەبوو بێت، و سستیتان نواندو دانیشتن، و تا واتان لێهات پەلامارتان بدەن لەهەندێ لاوە، و وڵاتانیان لەدەست سەندن، و ئەوە (برای غامیدە) و بەسوارکانی یەوە دای بەسەر ئەنباردا و حەسانی بیکری لەناوبرد و سوپای ئێوەی لەو ناوەدا نەهێشت،

هەواڵم پێ گەیشتووە کە یەکێ لە چەکدارەکانیان هەڵی کوتاوەتە سەر ژنێکی موسڵمان و ژنێکی ئەهلی ذمە، و ویستوویەتی هەموو خەڵخاڵ و گوارەو بازنەکانی دەستیان دابکەنن پێیان تا هاواریان کردووە و داوای بەزەییان کردووە ئینجا لەکۆڵیان بوونەتەوە، و کەس ووشەیەکی بە یەکێکیان نەوتووە و قەترەیەك خوێنیان نەڕشتوون،

دەی ئەگەر موسڵمانان دوای ئەوە لە داخاندا بمرێت ناهەقی نی یە لەلای من بگرە زۆر شایانی مردنیشە ...

ئای کە جێگەی سەرسامی یە دڵ دەتەقێ و خەفەتبار دەبێت کاتێك دەبیستیت ئەوانە لەسەر ئەو لە یاسا دەرچوونەیان کۆبوونەتەوە و کەچی ئێمە لەسەر یاسا و هەقین کەچی ناکۆك و جیا جیاین دەی ناشیرینی و خەم وو خەفەت بۆ ئێوە کە واتان لێهاتووە ئەتان کەن بە نیشانەو پێتان دەوێرن و ئێوە بەوان ناوێرن، و ئەوان دەدەن بەسەرتاندا و ئێوە هیچتان دیار نی یە، و سەرپێچی خوا دەکرێت و ئێوەش پێ ی ڕازین.

ئەگەر بەهاویندا فەرمان دەرکەم بۆتان کە بڕۆن بۆیان خێرا دەڵێن: بەم چلەی هاوینە بۆ؟ ئەی چی تێدایە ئارام بگرین تا دنیا کەمێك فێنك دەکات!؟.

و ئەگەر بڵێم بە زستان بڕۆن بۆیان، ئێوە هەر دەڵێن: بەم چلەی زستانە بۆ؟ ئەی بۆ کەمێك ئارام نەگرین تا سەرما دەشکێت!!.دیارە مەسەلەکە سەرماو گەرما نی یە، بەڵکو خۆدزینەوەیە لە جیهاد و کوشتار لەپێناوی خوادا، وەڵڵاهی هەرچی سەیرتان دەکەن لە شمشێر دەترسن وەك منداڵ وان بەڵێ شێوەتان لەپیاو دەکات بەڵام پیاو نین، ئاوەتە خواز بووم هەر نەم بینینایەو هەر نشم ناسینایە، ئاسراویەك وەڵڵاهی تا سەر ئێسقان پەشیمانم لێ ی،

خوا لەناوتان بەرێت دڵتان تەقاندم، و سنگتان پڕکردوم لە ڕق و کینە، ژەمی غەم و پەژارەتان کردۆتە گەرووم، و بەم سەرپێچیەشتان منتان سەرشۆڕ کردوە ئابڕوی منتان بردوە لەلای ودەڵێن قورەیش: عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) پیاوێکی ئازایە بەڵام هونەری جەنگ نازانێت! خوا لێیان هەڵنەگرێت، و بۆ کەسیان هەیە لەو مەیدانەدا ئەوەندەی من لەو کارەدا دەوری بووبێت؟ و لەمن کۆنتر بێت لەو بوارەدا؟ چونکە من لەسەردەمێکەوە لەگەڵ ئەم کارەدا بووم کە (٢٠) ساڵم پڕ نەکردبوویەوە، و وا ئێستا خەریکە پێ دەنێمە (٦٠) شەستەوە بەڵام لەگەڵ کەسێکدا بڵێم چی کە چواردەورەکەی بە قسەی نەکەن))[1]

---

[1] البيان والتبين، جاحظ، لا (٢٣٨،٢٣٩).

ئەم ووتارە بە ووتارە ئاگرینەکانی ئـەمیری بـاوەڕداران دادەنرێـت کـە تەقانـدی یـە ئـەو کەسانەی بە چواردەوریدا بوون، ئەو کەسانەی کە نەیان هێشت بەروبوومی جیهادەکەی کۆ بکاتەوە و ئەو سەرکەوتنە بەدەست بهێنێت کە هەوڵی بۆ دەدا، و ئەم ووتارەشی بەشێوازێکی ئەدەبی جوان رێك خستبوو، کە دەستەواژەکانی هەست و نەست و لایەنە نادیارەکانی مرۆڤەکانی دەهەژاند، زۆر سادەبوو دووربوو لە ووتارە فەلسەفی یە قورس و گرانەکان کە کەس لێی تێناگات، و هەروەك لـە سەجع و بەهێزکردنی دەستکرد بۆ ووشەکانی[1].

لەم ووتارەدا عەلی (ﷺ) هەندێ باسی نەبەردی و چاکەی خۆی دەکات بۆ ئامادە بووان و ئەمەش ئەو بەرگری کردن و باس کردنەی ـ عثمانمان ـ وەبیر دەخاتەوە کە لەکاتێکدا گێرەشێوێنان هەموو مەدینەیان پڕکردبوو، چواردەوری ماڵەکەیان دابوو، ئەمیش بۆ ئەوەی کە ئەو بێ ئاگایانـە کەمێ بەئاگا بێنەوە و کەتنی خراپ نەنێنەوە هەندێ لە چـاکی و کـارە مەزنـەکانی خـۆی بـاس دەکرد کە لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) کردبوونی بەهـەمان شـێوەیش عـەلی (ﷺ) وادەکـات تـا تێیان بگەیەنێت کە کەسێك ئا بەو جۆرە بوبێت کـەی شایـستەی ئەوەیـە ئـاوا خـوێن سـاردانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

بەڵام لەگەڵ ئەم هـەمووە هەوڵانەشـدا کـە ئـەمیری بـاوەڕداران (ﷺ) دەیـدا لـەپێناوی هێنانەوەی شام بۆ ژێر دەستەڵاتی خیلافەتی ئیسلامی بەڵام نەیتوانی ئاواتەکانی بێنێتەدی و ئـەو کارە ئەنجام بدات، ئەمەش بەهۆی ئەو پەرتەوازەبوون و لێکترازانەی دووچاری سوپاکەی بوو بوو.

بۆیە لەساڵی (٤٠) ی کۆچیدا ناچار بوو لەگەڵ موعاویـەدا پەیماننامەیـەك مۆربکـات و تیایدا بڕیار بدات ناوچەکانی شام لەژێر دەستی موعاویەدا بمێننەوەو ئەمیری باوەڕدارانیش عێراق و باقی ناوچەکانی تری لەژێر دەستەڵاتدا بێت و کەس دەست نەخاتە ئیش و کاری ئـەوی تـرەوە و کەسیش بەسوپاوە هەڵنەکوتێتە سەر ئەوی تر[2].

---

[1] الأدب الإسلامي، نايف معروف، لا ٥٩.

[2] تاريخ الطبري (٥٦/٦).

### سێ یەم/ ئەمیری باوەڕداران داوای شەهیدبوون و گەڕانەوەی بەپەلە لەخودای خۆی دەکات:

تا بەو شێوەیە کە باسمان کرد عەلی (ﷺ) زۆر ناڕەحەت بوو کە لەگەڵ والی یەکی خۆیدا صولح بکات و ڕازی بێت بە لەت کردنی دەوڵەتی ئیسلامی و تەسك کردنەوەی سنوری دەستەڵاتی خەلیفە کە بەجۆرێ دەستە نەڕوات بەسەر نزیکترین وڵاتی ئیسلامدا کە وڵاتی شام بوو! لەکاتێکدا دەبوایە هەموو موسڵمانان بەتایبەت ئەوانەی چوار دەوری ئەوەندە بەهێزیان بکردایە کە کەس نەیتوانیایە داوای جیابوونەوە و لەت کردنی دەوڵەتی ئیسلامی بکردایە و دەبوایە موعاویە (ﷺ) لەسەر کار لابرایەو (والی) یەکی تر بخرایەتە شوێنی کە ئەمیری باوەڕداران بەدڵی بوایەو خۆی دای بنایە و هەموو فەرمان و کارێکی لەپایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی یەوە وەربگرتایە کە عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ) سەرۆکایەتی دەکرد ..

ئێستایش دوای (١٤) سەدە بەسەر ئەو ڕووداوانەدا هەموو وڵاتانی دنیا ئەوەیان لەلا ڕوونە کە دەبێت سەرۆك کۆمار دەستەڵاتی تەواوی هەبێت و هیچ هەرێمێك داوای جیاخوازی نەکات و لەو پێناوەشدا چ ئەمریکاو چ رووسیاو چ چین و وڵاتانی تریش کە لەکۆمەڵە ویلایەتێك پێك هاتوون و کەسیان جورئەتی ئەوە ناکات لە دەستە خوشکەکانی جیابێتەوەو ئەو کاتە پاروویەکی بەچێژ بۆ دوژمنان و بەئاسانی قوتیان بدەن.

بۆ ئەو مەبەستە عەلی (ﷺ) زۆر خەمبارو بێ تاقەت بوو، تەنانەت وای لێ هاتبوو لە دواساتەکانی ژیانیدا دەیووت: ئەی پەروەردگارم من لەگەڵەکەم زۆر بەگلەیی و وەڕەسم، و ئەوانیش لەمن بێتاقەتن، دەی خودایە ڕزگارم بکە لێیان وئەوانیش ڕزگار بکە لێم) تاوای لێهات چەند ڕۆژێك پێش شەهید بوونی یارو یاوەر و شوێن کەوتوانی دەهاتن بۆلای، و دەکەوتن بەسەر قاچ و دەستیدا تاماچی بکەن، بەلاّم ئەو بەردەوام و زۆر بەتاسەوە داوای لەخوای گەورە دەکرد بیگەڕێنێتەوە بۆلای خۆی و شەهیدی پێ ببەخشێت.

و ـ جندب ـ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئیتر موسڵمانان دەهاتن و دەکەوتن بەسەر پێیەکانیدا و ماچیان دەکرد و ئەویش دەیووت: بەڕاستی من بێ تاقەت بووم لێیان و بێ تاقەتیان کردووم، و

ڕقم لێیانه و ڕقیان لێمه، دەی نەجاتم بده لەدەستیان و نەجاتیان بـده لەدەسـتم، و خـوای گـەورە بمکوژێت ڕزگارم بکات له دەستتان[1].

حسن ی کوڕی عەلی (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عەلی (ﷺ) پێی ووتم: ئەم شـەو پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی له خەودا۔ وپـێم ووت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) توشـی گـەلێك دەردی سـەری بـووم بەدەسـت ئومەتەکەتـەوە؟ و پێغەمبـەریش(ﷺ) فـەرمووی "ادع علـیهم"، "دوعایان لێ بکە" و منیش ووتم: "خوایە بیانگۆڕە بۆم بـه گـەلێکی چـاکتر لـەوان، و منـیش بگۆڕە بەکەسێکی خراپتر لەمن بۆ ئەوان " و حەسەن (ﷺ) دەڵێـت : هـەر ئـەوەی ووت و لـەماڵ دەرچوو ـ بەرەو مزگەوت ـ بۆ نوێژی بەیانی و شەهید کرا[2].

چوارەم / ئەمیری باوەڕداران دەیزانی شەهید دەکرێت:

( کۆمەڵێك فەرموودەی پێغەمبەری خوا هەیە(ﷺ) کـەوەك بەڵگەیـەکی بـەهێزە لەسـەر پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ) و ڕاستی ئـەو هەواڵـە پاشـەڕۆژیانەی کـە هـەموویان هاتنـەدی ئـەوە دەسەلمێنن کە هەرگیز لەخۆیەوە قسەیەکی نـەکردووە، بـەڵکو نیگـاو وەحـی یـە لەلایـەن خـوای گەورەوە ئاگادارکراوەتەوە، (سبحان الله) ئەگەر ئـەمیری بـاوەرداران لەسـەر جێگـەو بەنەخۆشـی بمردایە هەموو ئەو فەرموودانە (حاشـا لله) بـەدرۆ دەخرانـەوە، و بـەڵام خـوای گـەورە بەهـەموو شـێوەیەك دەیـەوێت پێمـان بڵێـت بـچوکترین گومانتـان نـەبێت لـە ڕاسـتی پێغەمبەرایـەتی پێغەمبەرەکەمدا).[3]

عەلی (ﷺ) زۆر دڵنیابوو لەڕاستی ئەو فەرمودانەو باوەڕی تەواوی پێیان هەبوو، تەنانەت لەناو خەڵکیدا باسی دەکردن، و (ابو الاسود الدؤلی) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گویم لـە عـەلی (ﷺ) بوو دەیوت: پێم خستە سەر زینی وڵاخەکەم و نیازی عێراقم کرد، عبـدالله ی کـوڕی سـەلام(ﷺ) هات بۆلام و پێ ی ووتم: بۆ عێراق دەڕۆیت؟ ووتم: بەڵـــێ، ووتی: ئەی زانیوتە ئەگەر بڕۆیت بۆ ئەوێ شمشێری عێراقیەکانت بەردەکەوێت؟ عەلی (ﷺ) ووتـی: سـوێندم بـەخوا منـیش خـۆم لـە

---

[1] الآحاد و المثانی ـ ابن ابی عاصم(۱/۳۷)باسناد حسن.
[2] تاریخ الاسلام ـ عهد خلفاء الراشدین لا ٦٤٩.
[3] ووتەی وەرگێر.

پێغەمبەری خودام بیستووە وێنەی ئەم ووتەیە، و (ابو الاسود) یش ووتی: سەرم سوڕما لێ ی، پیاوێکی جەنگاوەر شتی وایش بزانێت دەربارەی خۆی ـ کەچی هەر بڕوات بۆ عێراق ـ وەك عەلی.[1]

ئەم دڵنیایی یەی عەلی ـ لەڕاستی شەهید بونی خۆی ـ پێش بوون بە خەلیفەیش زانیویەتی ، وەك یەکێ لەهاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە جارێك عەلی (ﷺ) نەخۆش دەکەوێت و ئەوان دەچن بۆ سەردانی کە ناوی (ابوفضالة الانصاری البدری) (ﷺ) دەڵێت: لەلای عەلی بووین کاتێك نەخۆش بوو، ووتی: من بەم نەخۆشی یەم نامرم، یان بەم ئازارەوە ناڕۆم، بەڵکو پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێ ی فەرمووم کە نامرم تا ئێرەو ئێرەم خوێناوی دەبێت مەبەستی سەرو مل و شانی بوو.[2]

عبدالله ی کوڕی داود دەڵێت: لە (أعمش)م بیستووە، کە ئەویش لە موسلمەی کوڕی سەهل و ئەویش سالم ی کوڕی ابن حجده وە و ئەویش لە عبدالله ی کوڕی سبع ەوە دەڵێت: گوێم لە (علي) بوو لەسەرمینبەر دەیووت: ئێمە چاوەڕوانی نەگبەتێك دەکەین کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێ ی ڕاگەیاندوم کە ئێرە و ئێرەم بەخوێن سوور دەکات، و خەڵکەکەش ووتیان: پێمان بڵێ ئەو بکوژە نەگبەتە کێ یە با لەناوی بەرین، و ئەویش ووتی: پەنا بەخوا کە کەسێك بکوژن،کە بکوژەکەی من نەبێت.[3]

لە ڕیوایەتێکدا دەڵێت: عەلی(ﷺ) بە عبدالرحمن ی کوڕی مەلجەمی ووت: ئا ئەمەیە بکوژەکەم، ووتیان: دەی بۆ وەستاوی بۆ نایکوژیت؟ عەلی(ﷺ) فەرمووی: دەی هێشتا نەیکوشتووم.[4]

## پێنجەم/ شەهید کردنی ئەمیری باوەڕداران (ﷺ):

جەنگی نەهرەوان و ئەو تێك شکانەی بەسەر خەواریجەکاندا هات تیایدا کارێکی وای کردە سەر دڵیان کە بەشەو و ڕۆژ لە بیریان نەدەچوویەوە و هەر هەناسەیان هەڵدەکێشا، و ئەو بڕە کەمەی

---

[1] تاريخ الذهبي عهد الخلفاء الراشدين (٦٤٨).

[2] خلافة على بن ابى طالب ـ عبدالحميد لا ٤٣٣ طرقه صحيحة بمجموعها.

[3] كتاب الشريعة للآجري (٤/٢١٠٥) إسناده حسن.

[4] الاستيعاب (١٢٧/٣).

کەما بوونەوە هەر بەرق و کینەو دەیـان ڕوانـی یـە ئـەمیری بـاوەڕداران و لەمەلاّسـدا بـوون بـۆ سەندنەوەی تۆڵەی برادەرەکانیان کەلە (نەهرەوان) کوژرا بوون.

ژیان نووس ومێژوونوسەکان هەموو باس لە ڕیوایەتێکی مەشهور دەکـەن[1]. بـەلاّم هـەمو ئەو ڕیوایەتانە ڕەخنەیان لەسەر وەك هەموو ڕووداوەکانی تر بەدوور نی یە لەزیاد کردن بـۆی یـان کەم کردن لیَ ی و بەلاّم هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە کـرداره چـەپەڵەکە لەسەردەسـتی هەنـدێ کەس لە تاقمەکەی (خەواریج) ئەنجام دراوە وەك تۆڵە سەندنەوەیەك بۆ کوژراوەکانی نەهرەوان.

## با بەخاڵ لەسەر کرداری پلانی کوشتنەکەی بڕۆین:

١ـ پیلان گێڕان کۆدەبنەوە:

لەمەسەلەی (ابن ملجم)دا دەڵێن ڕۆژێك (ابن ملجـم) و (بـورەك ی کـوڕی عبـدالله) و ( عەمری کوڕی بیکری تەمیمی) کۆبوونەوە و باسی خەڵکیان دەکرد، و پیتکیان( واتە عەیبەیان لیَ دەدۆزنەوە) لەوالیەکان دەهێنایەوە، و پاشان باسی کۆمەڵی نەهرەوان هاتە ئاراوە، سۆز و بـەزەیی و داوای لێخۆشبونیان بۆ دەرکردن، ووتیان: ئیتر ژیـان دوای ئـەوان بۆچـی باشـە، برایانمـان بـوون خەڵکیان بۆلای خواناسی بانگ دەکرد و لەبەر خاتری خوا گوێیان نەدەدا بـە لۆمـەی لۆمـەکاران، چۆنە بەلاتانەوە ئەگەر ئێمە تۆڵەیان بۆ بکەینەوە لە پیشەوایانی گومڕایی !! ـــ پـەنا بـەخوا لـەم ووتەیە ـ و بیانکوژین و ولاّتیان لیَ ڕزگار بکەین و هەقی براکانیـشمان بکەینـەوە، (ابـن ملجـم) ووتی: علی کوڕی ئەبو طالیـب دانێن بۆمن ـ کە پیاوێکی خەڵکی میسر بـوو، و بـورەکی کـوڕی عبدالله یش ووتی: عـەمری کوڕی عاصیش دابنێن بۆمن، وعەمریش بڕیاری کوشتنی مەعاویـەی دا هەرسێکیان بەڵێنیان دا بەخوا نەگەڕێنەوە تا کارەکانیان ئەنجام نەدەن یان سەری خۆیان دابنـێن لەو پێناوەدا و ئەم دانیشتنە ـ شومە ـ لە حەڤدەی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی ساڵی ٤٠ی کۆچـیدا بوو.[2]

---

[1] وفيات الاعيان (٥/٢٦٨)، البداية والنهاية (٧/٣٢٥)، طبقات ابن سعد(٣/ ٣٥) هتد....

[2] تاريخ الطبرى (٦/٥٩).

٢- (ابن ملجم) لەماڵ دەرچوو بۆ کارەکەی:

(ابن ملجم) چوو بۆ کوفە و ئەم مەسەلەیەی لە هاوڕێکانی شاردەوە لەترسەی ئەوەی نەوەك دەمیان نەوەستێت و باسی بکەن و پیلانەکەیان کەشف بێت و ڕۆژێك لە (تیم الرباب) بوو کە علی (ﷺ) لە نەهرەواندا نزیکەی (١٠) کەسی لێ کوشتبوون و لەگەڵیان دانیشتبوو و باسی کوژراوەکانی خۆیانیان دەکرد لە نهروان، هەر لەو ڕۆژەدا چاوی کەوت بە ئافرەتێکی ـ هۆزی (تیم الرباب) و حەزی لێ کردو ئەوەندە جوان بوو خەریك بوو شێت بێت بۆی ـ ئەو کچە لەڕۆژی نەهرەواندا باوکی و برایەکی کوژرابوون ـ و کاتێ چاوی پێ ی کەوت هەموو شتێکی بیرچوویەوە کە لەپێناویدا هاتبوو،

هەستاو چوو داوای ئەو کچەی کردو کچەکەش بەتەنها قسەی لەگەڵ کردو پێی ووت: شووت پێناکەم هەتا دڵم ئاو نەدەیت، (ابن ملجم) ووتی: جا دڵت بەچی ئاو دەخواتەوە؟ ووتی: (٣) هەزار دینارو بەندەیەك و گۆرانی بێژێك و کوشتنی عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ﷺ)! مارەیی یەکەم بێت!

(ابن ملجم) ووتی: هەموو ئەو شتانەت بۆ دێنم، بەڵام کوشتنی عەلی بۆچی ئەگەر تۆ بەمن ڕازیت؟ ووتی: من چاوەڕوانی ئەو مژدەیە دەکەم، و ئەگەر ئەو کارە بکەیت منیش و خۆیشت خۆشحاڵ دەکەیت و پیرۆزت بێت ژیان لەگەڵ من و ئەگەر لەو پێناوەشدا کوژرایت ئەوا ئەوەی لەلای خوا دەستت دەکەوێت لە هەموو دنیاو جوانی یەکانی باشترە. (ابن ملجم) یش ووتی: دەی با بزانیت وەڵڵاهی هەر بۆ ئەو کارە هاتووم بۆ ئەم شارە و داواکاریەکانت جێ بەجێ دەکەم،

(ابن ملجم) بۆ ئەو کارەی داوای هاکاری کرد لە پیاوێکی (بنی أشجع) کە ناوی شبیب ی کوڕی بجرە بوو پێ ی ووت: کارێك هەیە دەیکەیت کە شەرەفی دنیاو ئاخیرەتت دەست بکەوێت؟ کابرا ووتی: ئەو کارە چی یە؟ ووتی: کوشتنی عەلی کوڕی ئەبو طالیب، کابرا ووتی: دایك ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات شتێکی زۆر گەورەو گران داوا دەکەیت، و پێم ناڵێیت: چۆن بە عەلی دەوێریت؟ ووتی: لەرێ ی مزگەوت لەپێش نوێژی بەیانی بۆی دادەنیشم و کاتێ دەرکەوت بەخەنجەر هەڵدەکوتمە سەری، و ئەگەر سەرکەوتنمان بەدەست هێنا ئەوە دڵمان ئاو دەخوات و تۆڵەی خۆمانمان سەند، و ئەگەر کوژرایشین ئەوەی لەلای خوایە زۆر باشترە لە هەموو دنیاو جوانی

یەکانی. کابرا ووتی: بێ قەزابی، کەسێکی تر بێت قەیناکە! بەڵام علي ـ نەء، چونکە خزمـەت و لێهاتوویی لە ئیسلامدا ئاشکرایەو پێشینەی ڕوناکی هەیە لەگـەڵ پێغەمبـەردا (ﷺ) قـەت دڵـم نایەت بیکوژم.

بەڵام ئەو فێڵبازە وازی نەهێناو پێ ی ووت: ئەی نازانیت لە نەهرەواندا چی هێنا بەسـەر بەندە صالحەکانی خوادا؟ ووتی: بەڵێ، ووتی: دەی با لەتۆڵەی ئەوانـدا بیکوژینـەوەو دواتـر ئـەو کابرا داماوەی ناچار کرد بێت بەدەم داواکاریەکەیەوە.

لەکاتی دیاری کراودا ڕۆشتنە ڕێ ی و لە بەرامبەر ئەو کۆڵانەدا خۆیان مڵاس دا کە علی (ﷺ) لەوێ وە دەچوو بۆ مزگەوت، و هەرکە عەلی دەرکەوت، شەبیب پـەلاماری داو شمـشێرێکی بۆ هێنایەوە بەری نەکەوت و دای کەمـەی دەرگاکـەدا، و (ابـن ملجـم) یـش لـەدواوە بەخەنجـەر دایکرتەوەو وەردانیش لەدواوە شمشێرێکی کرد بەسکیداو ڕایان کرد.

و هاوار هاوار هەستاو خەڵکی هاتن بەدەم مەسەلەکەوەو دوانیان ڕایان کردو خۆیان کـرد بەناو قەرەباڵغی خەڵکەکەداو خۆیان وون کرد بەڵام (ابن ملجم) یان گـرت و پیـاوێکی هەمـەدانی پەلاماری شمشێرەکەی داو لێ ی سەندو بەدزی عەلی یەوە (ﷺ) شمشێرێکی کێشا بەقاچیدا.

ئیمام عەلیش (ﷺ) نەیتوانی خۆی بگرێت تا (جەعدەی کوڕی هەبیرە) چـووە ژێربـاڵی و بردیە ناو مزگەوت و بەدانیشتنەوە بەرنوێژی کرد بۆ موسڵمانان و پاشان داوای کرد ئەو کابرایـەی بۆ بانگ بکەن و ئەوانیش (ابن ملجم) یان هێنا، و عەلی (ﷺ) پێ ی ووت: ئەی دوژمنـی خـوا، من چاك نەبووم لەگەڵ تۆدا؟ ووتی: بەڵێ، ووتی: دەی کەواتە بۆچی وات کرد؟ ووتـی: (٤٠) ڕۆژە تیژی دەکەم و داوا لە خوا دەکەم خراپترین کەسی پێ بکوژم! و عەلی (ﷺ) پێ ی ووت: دەی هەر بەو خەنجەرەیش دەکوژرێیت، و کەسێکیش ناناسم لەتۆ خراپتر هەبێت[1].

### ٣- محمدی کوڕی حەنەفی یە کارەساتەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە:

من و کۆمەڵێك جەنگاوەر ئەو شەوەی کە ـ علي کوڕی ئەبو طالیب ـ ی تێدا شەهید کرا ولە نزیکی ئەو کۆڵانەدا ئێشکمان دەگرت و تابەیانی خەریکی شەو نوێـژ بـوون و خـەو لەچـاویان

[1] تاریخ الطبري (٦٢/٦).

تۆرابوو و عەلی لەماڵ دەرچوو بەرەو (جامع الآعظم) ڕۆیشت و بەرێگاوە دیووت: خەڵکینە، نوێـژ - نوێژ،ئیتر نازانم ووتەکانی تەواو کرد یان نا بریقەی شمشێرێکم هاتە بەرچاو لەگەڵ هاوارێکدا کـە دەی ووتم: حوکم تەنها بۆ خوایە نەك بۆتۆ و هاوڕێکانت و شمشێرێکم دی بەرزبوویەوە و شمشێرێکی تریشم بینی و ئاگام لێ بوو، عەلی هاواری کرد: بیان گرن لەدەستتان دەرنەچن و خەڵکی لەهەموو لایەکەوە پەلاماریان دان و هەر ئەوەندەمان زانی (ابن ملجـم) گـیرا و هێنایـان بـۆلای عـەلی، و منیش لەگەڵ خەڵکەکەدا چوومە ژوورەوە و گوێم لێ بوو عەلی دەیووت: سـەر بەسـەر، و ئەگـەر مردم لەتۆڵەی مندا بیکوژنەوە و ئەگەر مایشم خۆم چارەی دەکەم.[1]

کاتێ (ابن ملجم) دەستەکانی بەسترابوونەوە، و (ام کلثوم)ی کچی عەلی هاواری کردو بەگریانـەوە دەی ووت: ئەی دوژمنـی خـوا، خـۆ بـاوکم زەرەری نـەکردووە، بـەلاّم سەرشـۆڕی بۆتـۆ، و (ابـن ملجم)یش ووتی: بۆ کێ دەگریت؟ وەللاّهی خەنجەرەکەم بەهـەزار کڕیـوە و بەهـەزاریش ژەهـراویم کردوەو وایش لێم داوە ئەگەر لەهەموو ئەم شارەم بدایە کەسیان دەرنەدەچوون.[2]

٤ـ وەسیەتی ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) بۆ (حەسەن وحوسێن) (ﷺ):

ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) بانگی حەسەن و حوسینی کرد، وپێ ی ووتن: "وەسـیەتتان پـێ دەکەم لەخوا بترسن، باوەش مەکەن بەدونیادا ئیتر با دونیایش بێت بۆلاتـان، و هـەرگیز مـەگرین بەسەر شتێکدا لەدەستتان دەردەچێت، و ڕاست بڵێن، و بەزەییتان بـە هـەتیودا بێتـەوە، و فریـای داماوان بکەون، وکار بۆ ڕۆژی دوایی بکەن، و هاوکار بن بۆ ستەم کـارو ستەم لێکـراو، و کـار بەئایەتەکانی قورئان بکەن و لەلۆمەی لۆمەکاران مەترسن".

و پاشان سەیرێکی محمدی کوڕی حەنەفی یەی کرد ووتی پێ ی : ئایا ئەو ئامۆژگاریانـەی براکانتم کرد تۆش لەبەرت کردن؟ ووتی: بەڵێ، ووتـی: دەی هـەمان ئامۆژگـاری تـۆش دەکـەم و پێشت دەڵێم کە ڕێزی ئەم دو برایەت بگرە، چونکە هەقیان زۆرە بەسەرتەوە، و شوێنیان بکەوە، و بەبێ ئەوان هیچ بڕیارێك مەدە.

[1] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەرە.
[2] تاریخ الطبری (٦٣/٦).

و پاشان بەوانیشی ووت: ووەصیەتتان بۆ دەکەم ئاگاتان لیٚ ی بێت، چونکە کوڕی باوکتانــە، و چاکیش دەزانن کە باوکتان خۆشی ویستووە.

و بەحەسەنیشی ووت: ئەی کوڕی خۆم وەسیەتت پیٚ دەکەم لە خوا بترسە، نوێژەکان لەکاتی خۆیــدا بکە و زەکات لە شوێنی خۆیدا بدە، دەستنوێژ جوان بگرە، چـونکە نوێــژ دروســت نــی یــە بــەبیٚ دەستنوێژ، نوێژیش بیٚ زەکات دروست نی یە، وەسیەتت پیٚ دەکـەم لـەگوناه تەوبــە بکــە، ورقــی خۆت بخۆرەوە، و سەردانی خزمەکانت بکە، و نەرم و نیان بە لەگــەڵ نــەفام کارانــدا، ولــەدین تــیٚ بگە، لەکار دڵنیابە ئەوجا بیکە، پەیمان بە قورئان بدە ، ولەگەڵ دراویشدا زۆر چاك بــە، وفــەرمان بە چاکە بدە و بەرگری لە خراپە بکە و خۆت لە خراپەکاری بپارێزە.

و کاتێك مردنی نزیك بوویەوە، دواین وەسیەتی خۆی کردو ووتی:

((بسم الله الرحمن الرحيم، ئەم وەسیەتنامەیە لەلایەن عــەلی کــوڕی ئــەبو طالیــب ەوە نووســراوە، وەسیەت دەکات کە شایەتی دەدات هیچ خوایەك نی یە جگە لە (الله) و بــیٚ هــاوەڵ و هاوتایــە و محمدیش بەندەو پێغەمبەری خوایە، و بەڕێنموونی ناردوویەتی و بە ئاینێکی ڕاست و دروستەوە تا بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا سەری بخات با بت پەرستانیش پێیان ناخۆش بێت،

و پاشان نوێژو خوا پەرستی و ژیانن و مردنم بۆ پەروەردگاری جیهانە و هیچ هــاوەڵێکی نــی یــە و بەوەش فەرمانم پیٚ دراوە و منیش یەکێکم لە وسڵمانان.

و پاشان ئەی (حسن) وەصیەت بــۆ تــۆو هــەموو ئەنــدامانی خێزانەکــەم دەکــەم بــەوەی لــەخوای پەروەردگارتان بترسن و تا مردن لەسەر بەرنامەکەی خوا بەردەوام بن، و دەست بگــرن بــە حــەبلی خوداوە و جیاوازی و ناکۆکی دروست مەکەن، چونکە من خۆم لــە (أبــو القاســم) م بیــستووە کــە فەرموویەتی: ((چاکسازی کردنی ناو خــەڵکی لــە نوێــژو ڕۆژو گــەورەترن لــەلای خــوا، و ســەیری خزمەکانتان بکەن و سەردانیان بکەن تا لێپرسینەوەی ڕۆژی دواییتان ئاسان بێت))..

٥- دکتۆرەکان نائومێدن لە چاك بوونەوەی علي (ﷺ):

عبدالله ی کوڕی مالیــك دەڵێــت: کۆمــەڵێك دوکتــۆر بــانگ کــران بــۆ چارەســەرکردنی ئــەمیری باوەڕداران، و زاناترینیان دوکتۆرێك بوو بــەناوی (أثیری کــوڕی عــەمر الــسکونی) و داوای کــرد حەیوانێکی بۆ سەربڕن و سی یەکەی دەرهێنا بە گەرماو گەرمی و ڕەگێکی تێدا دەرهێنــاو کــردی

به ناو برینەکەداو فوی پێداکرد و پاشان دەری هێنایەوە دەبینێ برینەکە گەیشتۆتە ناو مێشکی سەری، و بۆیە بەڕاشکاوانە بە عەلی ووت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، وەسیەتی خۆت بکە تۆ دەمریت[1].

جندب ی کوڕی عبدالله دەڵێت: چوومە لای خەلیفەو پرسیارم لێ کرد: ئایا ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر تۆمان لەدەست دەرچوو، بەیعەت بە (حەسەن) بدەین؟ ئەویش ووتی: نەدەڵێم بەڵێ نەدەڵێم نەخێر، ئێوە خۆتان باشتر دەزانن[2].

## ٦- ئەمیری باوەڕداران (ﷺ) ناهێڵێ جەستەی بکوژەکەی بشێوێنن:

عەلی (ﷺ) ووتی: ئەو پیاوە بکەنە زیندان، ئەگەر مردم بیکوژن، و ئەگەر ژیاشم تۆڵەی بریندارکردنی لێ دەکەمەوە[3]. و لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: نان و ئاوو خواردنی پێبدەن و لەگەڵیدا چاك بن، و ئەگەر چاك بوومەوە خۆم خاوەنی خوێنی خۆمم و یان عەفوی دەکەم یان تۆڵەی لێ دەکەمەوە[4].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: ئەگەر مردم منی چۆن کوشت، ئێوەش وا بیکوژنەوە لەوە زیاتر نەکەن چونکە خوای گەورە زیادەڕەوانی خۆش ناوێت[5].

لە ڕیوایەتێکی تردا ڕووی کردە حەسەن و ووتی: ((ئەی نەوەکانی عبدالمطلب، من وانازانم ئێوە دەستتان هەبێت لەخوێنی موسڵمانانداو بڵێن: ئەمیری باوەڕداران کوژراوە، ئەمیری باوەڕداران کوژراوەو هەرگیز بەشێوەی خراپ نەیکوژن و جەستەی نەشێوێن، چونکە من لەپێغەمبەری خوام بیستووە کە فەرموویەتی: ((إياكم والمثلة ولو إنها بالكلب العقور)) واتە: دەخیلتان بم دووربن لە کوشتن بە شێواندنی جەستە ئیتر با سەگێکی هاریش بێت)).

---

[1] الأستيعاب (١١٢٨/٣).
[2] تاريخ الطبري (٦٢/٦).
[3] فضائل الصحابة (٥٦٠/٢) بسند حسن.
[4] المحن لأبي العرب، ص، خلافة علي بن أبي طالب، لا ٤٣٠.
[5] الطبقات (٣٥/٣).

## ٧- (ابن ملجم) کێ یە؟

(الذهبی) دەڵێت: ناوی (عبدالرحمن ی کوڕی مەلجەم) ەو یەکێکە لە خەواریجە درۆزنەکان، لە فەتح کردنی میسردا بەشداری کردووە، و قورئان و فیقهی ئیسلامی خوێندووە و سوارچاکێکی میسر بووە، لەلای موعازی کوڕی جەبەل قورئانی خوێندوە، و یەکێك بووە لە عابدو خواناسەکان، و لەلای خەواریجەکان یەکێکە لە باشترین کەسەکانی ئوممەت ئیسلام!! و لەلای شیعەکان خراپترین دروستکراوی خوایە، بەڵام لەلای ئەهلی سوننە لەو کەسانەیە کە ڕجایان وایە خوا بیخاتە ناو ئاگرەوە، بەڵام بەدروشمی نازانن خوا لێ ی خۆش بێت، یانی ڕایەکی وەسەت و ناوەند لەنێوان ڕای شیعەکان و ڕای خەواریجەکان و دەڵێت: بکوژی عەلی (ﷺ) هەروەك بکوژانی عثمان و طلحة و زبیر و سەعدی کوڕی جوبەیرو عماری کوڕی یاسر و بکوژی حوسەین وایە.

## ٨- دوو هاوڕێ کەی تری (ابن ملجم) چیان کرد:

بورەکی کوڕی عبدالله لە هەمان شەودا کە دایان لە عەلی (ﷺ) چووە ڕێگەی موعاویە لەکاتێکدا بۆ مزگەوت دەچوو، بورەك پەلاماری داو شمشێرێکی لێدا بەڵام خەتەری نەگرت، و موعاویە پڕی دایەو گرتی، و ئەویش ووتی: هەواڵێکی زۆر خۆشت پێ بدەم، و ئەگەر پێت خۆش بوو سودی دەبێت بۆ من؟ ووتی: بەڵێ، ووتی: برایەکی ترم لە هەمان شەودا عەلی کوشت، موعاویە ووتی: لەوانەیە نەیتوانیبێت، ووتی: بەڵێ دەتوانێت چونکە عەلی بەبێ پاسەوان دەڕوات بۆ نوێژ، و موعاویە فەرمانی دا بەکوشتنی.

و موعاویەیش ناردی بەدوای (الساعدی) دا کە پزیشك بوو، ئەویش هات و پاش سەیرکردنی وردی برینەکەی پێ ی ووت: دوو چارەسەرت هەیە، یەکێکیان هەڵبژێرە، یەکەم/ یەك ئاسنی گەرم دەخەمە سەر شوێنی برینەکەت، دووەم/ دەرمانێکت دەدەمێ کە چاکت دەکاتەوە بەڵام ئیتر منداڵت نابێت، و موعاویەیش دووەمی هەڵبژارد ووتی: بەخوا تەحەمولی ئاگر ناکەم بۆ منداڵ نەبوونیش گۆی مەدەرێ عبدالله و یەزیدم بەسە، خوا نەیان برێت و دەرمانەکەی خواردەوە و چاك بوویەوە و دوای ئەوە موعاویە ئاگاداری خۆی دەکرد و پاسەوانی بڵاودەکردەوەو لەکاتی سەجدەو ڕکوعدا ئاگاداری سەری بێت.

بەڵام عەمری کوڕی عاص (ﷺ) ئەو شەوە سك ئێشەیەکی گرتبوو نەیتوانی بڕوات بۆ مزگەوت و لەباتی خۆی سەرۆکی پۆلیسی نارد نوێژ بۆ موسڵمانان بکات و ئەو کابرایە وای زانی عەمرەو پڕی دایەو کوشتی، بەڵام خۆیشی گیراو بردیان بۆلای عەمرو سڵاوی ئەمیریان لێ کرد، کابراسەری سوڕما ووتی: بۆ ئەمە کێ یە؟ ووتیان: عەمری کوڕی عاص ە، ووتی: بۆ من کێم کوشت؟ ووتیان: خارجەی کوڕی حوذافە سەرۆکی پۆلیس، ووتی بەعەمر: وەللاهی ئەی فاسق بۆ تۆ هاتبووم بتکوژم، و عەمریش ووتی: (أردتني وأراد الله خارجه) واتە: مەبەستی من بوو بەڵام خودا مەبەستی خاریجە بوو، پاشان فەرمانی دەرکرد کە بیبەن بیکوژن[1].

٩- ئەمیری باوەڕداران چەند ساڵ خەلیفەی پێغەمبەری خوا بووە؟

خەلیفەی کوڕی خیاط ماوەی خیلافەتەکەی بە چوار ساڵ و نۆ مانگ و شەش ڕۆژ مەزندە دەکرێت، و وادیارە چوار ساڵ و نۆ مانگ و (٣) سێ ڕۆژ ڕاستترە چونکە لە (١٨) ی ذی الحجة ی ساڵی (٣٥) ی کۆچی بوو بە خەلیفە و لە (٢١) ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٤٠) ی کۆچی شەهید کرا[2].

حەسەن و حوسەین و عبدالله ی کوڕی جەعفەر (ﷺ) شۆردنیان گرتە ئەستۆو حەسەن (ﷺ) نوێژی لەسەر کرد،

١٠- لەکوێ نێژراوە؟

شوێنی ناشتنەکەی لەنێوان مێژوونووساندا جێگای مشت و مڕو جیاوازی یە و (ابن جوزی) کۆمەڵێ ڕیوایاتی هێناوە و لەدواییدا دەڵێت: خوا خۆی دەزانێت کامەیان ڕاستە، لەو ڕیوایەتانە:

* حەسەنی کوڕی عەلی (ﷺ) لەلای مزگەوتی (الجماعة) لە (رحبة) ناشتوویەتی لەلای دەروازەی کندەوە لەپاش نوێژی بەیانی[3].

* لە کوفە لەلای کۆشکی ئەمارەدا و لەنزیك مزگەوتی (الجامع) دا نێژراوە لەکاتی شەوداو جێگەی گۆڕەکەی وون بووە لەخەڵکی[1].

---

[1] تاريخ الطبري (٦/٦٥).

[2] التاريخ الكبير للبخاري (١/٩٩) سنده صحيح.

[3] الطبقات (٣/٣٨).

* ڕیوایەتێکیش دەڵێت حەسەن (ﷺ) گوێزاویەتیەوە بۆ شاری مەدینە بۆ گۆڕستانی بەقیع[2].
* ڕیوایەتێکی تریش دەڵێت ئەو گۆڕە دیارەی ئێستا کە لە نەجەفە ئەوە گۆڕی ئیمام عەلی یە (ﷺ) بەڵام هەندێ لە زانایانی وەك شەریك ی کوڕی عبدالله الحنفی کە قازی کوفە (ت ١٧٨) و محمدی کوڕی سلیمان الحضرمي (ت ٢٩٧ك) قبوڵی ئەو ڕیوایەتە ناکەن و ڕەدی دەکەنەوە[3].

بەڵام لەڕاستیدا ئەو جێگایەی کە ئێستا ناوی لێنراوە (مشهد علی) لەشاری نەجەف، لەسەردەمی (بني بويه) ی دەوڵەتی عەباسیدا داهێنرا، و شیعەکان لەسەدەی چوارەمی کۆچیدا دایان هێنا، و شارەزایان لەسەر ئەوەن کە ئەو گۆڕە گۆڕی عەلی نی یە (ﷺ) بەڵکو گۆڕی هاوەڵی پێغەمبەری خودایە کە ناوی (مغیرەی کوڕی شوعبە) یە.
و (ابن تیمیه) دەڵێت: ئەو جێگایەی کە پێ ی دەڵێن (مشهد علی) لە شاری نەجەف، هەموو شارەزایان لەسەر ئەوەن کە گۆڕی عەلی نی یە (ﷺ) بەڵکو گۆڕی (مغیرەی کوڕی شوعبە) یە، تا (٣٠٠) ساڵیش تێپەڕی بەسەر شەهیدکردنی عەلیدا (ﷺ) و یەك کەس نەیدەووت ئەوە گۆڕی عەلی یەو یەك کەسیش نەدەکەوتە ڕێ بۆ سەردانی کردنی، لەگەڵ بوونی ئەو هەموو ژمارە زۆرەی موسڵمانان لە ئالی پێغەمبەر و شیعەکان کە حوکمی شاری کوفەیان کردوە،
بەڵکو یەکێك لە مەلیکەکانی (بنی بویه) ئەو جێگایەی ناونا (مشهد علی) لەدوای (٣٠٠) ساڵ لە شەهیدکردنی عەلیدا[4].
و دەڵێت: بەڵام ئەو جێگایەی کە نویان ناوە (مشهد علی) زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەی کە گۆڕی عەلی نی یەو بەڵکو گۆڕی موغیرەی کوڕی شوعبەیە، و ئەو مەسەلەیە لەدوای عەلی (ﷺ) بە (٣٠٠) ساڵ و لە سەردەمی حوکمڕانی (بنی بویه) دا هاتەکایەوە[5].

---

[1] المنتظم (٥/٧٧) تاريخ الإسلام في عهد الخلفاء، لا ٦٥١.
[2] تاريخ بغداد (١/١٣٧).
[3] خلافة علي بن أبي طالب، لا ٤٤١.
[4] الفتاوى (٤/٥٠٢)،دراسات في الأهواء والفرق والبدع (٢٨٠).
[5] الفتاوى (٢٧/٤٤٦).

